# براكوژی

## شەڕی ناوخۆی کورد

( پەلامارییەکانی پەدەکە، یەنەکە و سوپای تورک بۆسەر پەکەکە )

نوسینی / فەیسەڵ داغلی

لە تورکییەوە / ڕێبوار هەمەوەندی

# براكوژی

## شەڕی ناوخۆی كورد

### ( پەلامارییەكانی پەدەكە، یەنەكە و سوپای تورك بۆسەر پەكەكە )


**نوسینی / فەیسەڵ داغلی**

**لە توركییەوە / ڕێبوار هەمەوەندی**



- ناوی كتێب / براكوژی
- نوسەر / فەیسەڵ داغلی
- وەرگێڕ / ڕێبوار هەمەوەندی
- پێداچوونەوە و پێشەكی نووسین: نیاز حامید برایم
- دیزاین / هۆگر ئامەد
- تابلۆی سەر بەرگ: یاسین حەسەن
- بابەت / مێژوو. دۆكۆمێنتاری
- تایپ / وەرگێڕ
- ژمارەی سپاردنی نێودەوڵەتیی دراوەتێ: 434427 - 781838 - 9

# ناوەڕۆک



## بەشی یەکەم

# بەشی دووەم

## بەشی سێیەم

## بەشی چوارەم



## بەشی پێنجەم

# هەڵدانەوەی لاپەڕە گرژ و خوێناوییەکانی

# ڕۆژنامەکانی سەردەمی شەڕی ( براکوژی )

## پێشەکی

### نیاز حامید برایم

کتێبی (براکوژی) کتێبێکی دۆکۆمێنتارییە و زۆر گرنگە خەڵکی ئاگاداری وردەکاریی ئەو شەڕانە دەبێت کە هەر دوو حزبی دەسەڵاتدار، پارتی و یەکێتی، بەتایبەتی پارتی، بۆ داگیرکەرانی ئەنجامداوە و چۆن تێوەگلاوە لە پیلانی داگیرکەران بۆ کوردکوشتن وئاستەنگ خستنە بەردەم بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان. نوسەری ئەم کتێبە بەناهەق ناوی لێناوە براکوژیی، لە بناغەدا ئەم شەڕانە شەڕی نێوان براکان نییە، بەڵکو شەڕی داگیرکەرانە. هەردوو بەناو سەرکردەی پارتی و یەکێتیان بەکاربردووە بۆ کوردکوشتن، شەڕێک بووە کوردی بێناموس تێیدا بۆتە داردەستی داگیرکەران بۆ کوشتنی کوردی بەناموس و بەرخۆدەر. (تانسو چیللەر)ی سەرۆک وەزیرانی پێشووتری تورکیا، لە لێدوانێکی فەرمیدا دەڵێت (ئێمە وەک دەوڵەت توانیمان مەسعود بارزانی وجەلال تاڵەبانی لە دژی پەکەکە بەکاربهێنین، لێ هێشتا لێیان رازی نین، دەبوو باشتر کارەکانیان بکردایە. لێدوانەکەی تانسۆ چیلەر راستە، ئەو دووە زوریان هەوڵدا بۆ لەناوبردنی پەکەکە، لێ سەرکەوتوو نەبوون، هۆکاری سەرنەکەوتنەکەیشیان دەگەڕێتەوە بۆ (مۆراڵی گەریلا و باوەڕی بوون بەخۆیان و بە گەل)، بێ مۆراڵی چەکدارانی (پێشمەرگەکانی) یەکێتی وپارتی بۆشەڕکردن لە دژی گەریلا چونکە دەیانزانی ئەم شەڕە خێری بۆ گەلی کورد تێدانییە بەڵکو بۆ بەرژەوەندی داگیرکەرانە، چەکدارەکان باش تێگەیشتبوون ئەوەی دەیکەن جاشایەتی ومورتزەقەییە بۆ داگیرکەران، بۆیە خۆیان نەدایە شەڕەکە و شەڕیان نەدەکرد.

هەر لەم کتێبەدا ماهییەتی هەردوو بەناو سەرکردە بەرامبەر داگیرکەران، بەتایبەتی داگیرکەری تورکیا زۆر باش وێنادەکات، کە چۆن بەشەڕێکن . دەردەکەوێت دەوڵەتی تورکیا توانیویەتی تەواو کۆنترۆڵی هەموو

جوڵەیەکی پارتی بکات، کەسانی دەستڕۆیشتووی هەبوو وهەیە ، بێ ئاگاداریی تورکیا پارتی نەیتوانیوە ونـاتوانێت یەک جوڵەی بچووکیش بکات.
لەم کتێبەدا پارتی وەک گروپێکی تیرۆریستی بەدەردەکەوێت ، کە هەمیشە تیرۆر و تۆقاندنی بەرامبەر ئازادیخوازان پەیڕەو کردووە و دەیەها بەڵگە دەخاتەڕوو سەبارەت بەم مژارە. هەر لەم کتێبەدا باس لە چەواشەکاریی میدیاکانی سەر بەدەوڵەتی تورکیا دەکات، تەنانەت خودی فەرماندەکانی سوپای تورکیا لەبەردەم میدیا جیهانییەکان ئیحراج دەبوون ، کاتێک باسیان لەسەرکەوتنە بۆشەکانیان لە میدیای تورکیا دەکرد و بەنمونە دەیانهێنایەوە. پێش شەڕی ئۆکتوبەری ١٩٩٢ کە بەشەڕی خیانەت ناسراوە ، دەوڵەتی تورکیا ئاگای لە هیچ نەبوو، لەسەرداوای بەناو هەردوو سەرکردەکەی پارتی و یەکێتی ئەنجامدرا، ئەوان دیدارییان سازکرد لەگەڵ سوپا و جەندرمە و هەواڵگری تورکیا بۆ ئەوەی ئۆپەراسیۆنی (سەندەویچ) ئەنجام بدەن، لە باکور سوپای تورکیا بێت لە باشوریش چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی، گەریلاش لە ناوەراست بن و لەناویان ببەن. هەردوو سەرکردەی پارتی و یەکێتی بەڵێنیان دابووە سوپای تورکیا کە لەناوبردنی گەریلا لە ٣بۆ٤ رۆژێک زیاتر ناخایانێت، تەنانەت ئیتفاق لەگەڵ ئێران کرابوو سوپاکەی لەسەر سنور ئامادە بکات ئەگەر گەریلایەک لەو شەڕە دەربازبوو بچێت بۆ سنورەکانی ئێران ئەوا سوپای ئێران دەیگرێت و تەسلیم بەتورکیای دەکاتەوە، لێ ئەوەی روویدا هیچی نەهاتەدی ، گەریلا زەربەیەکی گەورەی لە سوپای تورکیا و چەکدارەکانی پارتی و یەکێتیدا، لە دەرئەنجامدا لە ٣٠ ی ئۆکتوبەری ١٩٩٢ئیتفاقێکی لێئیجاد بوو، حکومەتی هەرێم شەرعییەتی بە بوونی پەکەکەدا، ئەوەندەی دیکە گەریلا لە سەکۆیەکی بڵندتر بەرخۆدانی بەگوڕتر کرد.
هیوادارم ئەم کتێبە کە کتێبی شەڕی خیانەتە، ببێتە مایەی هەڵدانەوەی زیاتری رووی قێزەوەنی چەتەکان ،کە هەمیشە لەخزمەت داگیرکەران بوونە و لە دادگاییەکی عادیلانە ئەم کتێبە دۆکۆمێنتارییە وەک بەڵگە بەکاربهێنرێت بۆ سزادانیان و ریسواکردنیان.

١٥/٠٤/٢٠٢١
Canada

## پێشەکی نوسەر

ئێمەی کورد لە سەدەی ٢١دا دەژین و لەپێناو مافی رەوای گەلەکەمان سێ بەشی ساڵەکانی ئەم سەدەیەمان بە خەبات و تێکۆشانەوە بردەسەر، کەچی گەلانی تر گەشتی گەردونی دەکەن و خۆیان گەیاندووەتە سەر مەریخ. ئەی باشە بۆچی بەشی ئێمە هەمیشە مەرگەسات و دەردەسەری بێت؟، ئەی بۆچی دوانەی ( بەرگری و مەرگ ) ببن بە خوێن و بچنە ناو جەستەی ئەم میللەتەوە؟. ئەمەی بەسەر کوردا دێت لەهیچ شوێنێکی دونیا نمونەی نییە ئەگەر هەشبێت زۆر دەگمەنە. ئەمەی ئێستا لە رۆژانی ئێمەدا روودەدەن نەک لەم چاغە بەڵکو لەهیچ چاغێکی کۆنی مرۆڤایەتی بەدیناکرێت. مێژووی کورد کەلەچاو مێژووی گەلانی تر شارستانی تر و دێرینترە بۆچی ئەم بەختەی پێبرا ؟! .

کاتێک چاو بە لاپەڕەی مێژووی کوردا دەخشێنرێت ئەم بەتبەختییە بەدیدەکرێت. کەسانێکی زۆر مێژووی کورد بەوە هەڵدەسەنگێنن کە پڕە لە سەروەری و قارەمانێتی، لەهەمانکاتیشدا کەسانێکی تر هەن کە دەڵێن مێژووی کورد پڕاوپڕە لە خیانەت!. لەڕاستیدا مێژووی هەموو گەلێک خیانەت و قارەمانێتی تێدا نوسراوەتەوە، بەڵام مەخابن لەناو مێژووی کوردا چەمکی خیانەت زیاتر رەنگی داوەتەوە و بە زەقی دیارە، ئەمەش راستییەکی حاشاهەڵنەگرە. مێژووی کورد لەچاو میللەتانی تر کارەسات و رووداوی دڵتەزێنی زیاترە . سەرەڕای ئەوەی ئەم مێژووە پڕ لە تراژیدیا و ئەو قەدەرەی کەجارێکی تر خۆیمان نیشان دەداتەوە مەخابن خاڵی کۆتاییەکەی بەهیچ شێوەیەک دیارنییە .

سنوری نەخشەی کوردستانەکەی گەلی کورد مەخابن بە چوار لوغمی چینراو لەیەکیان جیاکردووەتەوە و ئەوکاتەی لەدوای شەڕی جیهانی یەکەم جیهان سەرلەنوێ شکڵێکی نوێیان

به بەریدا کێشا بەبێ ئەوەی بیرلە کورد و خاکەکەی بکەنەوە زلهێزەکان لە نێوان خۆیان کوردستان و گەلەکەیشییان دابەشکرد. ئەم کارەشیان هەروەکو تەڵەموویەک لەناو ماست دەرکردبێت ئاسان بوو. وەڵاتە زلهێز و کۆلۆنیاکان عێراق هەتا فاس و بە عەرەبەکانیشەوە کرد بە (١٧) پارچەوە. هەروەڵاتێکیاندا بە شێخێک و بە بنەماڵەیەک. کوردیش تەنها ٤ پارچەبوونی پێبڕا. لەکاتی ئەو دابەشکردنەوە هەتا ئێستا جگە لە فرۆشیار کە قازانجی کرد هەردوو فرۆشرا و کڕیار پەشیمان بوونەوە کە عەرەب، فارس و تورکە .

لەدوای پەرەسەندنی هزری نەتەوەی تێکۆشانی سەربەخۆیی گەلان گەشەی کرد، بەڵام ئەوکاتەی مێژووی سەربەخۆیی لەم جوغرافییە نوسراوەیە ئەو ڕێگایەی کە دەبوایە کورد بەسەریدا تێپەڕێت وەکو (سوراتولموستەقیم) درێژ و زەحەت بوو. لە جیهاندا میللەتێکی زۆر کەم هەن کە ووشەی (**براکوژی**) ببێت بە ووێردی سەر زمان و لاپەڕەی سووری مێژوویان، بەڵام کورد ئەو خوێنەی ڕشتویەتی لەپێناو سەربەخۆی و ئازادیدا دووقات ئەوەندە قوربانی شەڕی (**براکوژی**)ی داوە.

مەخابن هەر لە سەردەمی ( هابیل و قابیل)وە کورد چارەنوسی (**براکوژی**) پێبڕاوە، هەتا ئەم برینە قوڵ و سەختەی دەردی (**براکوژی**)یە گەلی کورد تیماری نەکات مەحاڵە بگاتە مەرامی خۆی. سەرەڕای هەموو نەهامەتی و بەدبەختی کە کوردی تێدا دەژی کەچی (**براکوژی**)یشی زیادی کرد. ئەم کەشکوڵی نەهامەتی و تراژیدیایەش مەخابن لە کۆڵی چارەنوسی کورد نەبووەتەوە. لەوەدەچێت قەدەری شەڕی (**براکوژی**) خەڵاتی کورد کرابێت لە ( باشور) و مەخابن لە باکوریش لە سەرەتای تێکۆشانی ئازادی هەندێک تەقەی دەنگی (**براکوژی**) بیسترا. شەڕی (**براکوژی**) لە باشور سەرەتا لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٢) لە نێوان (پەکەکە) و (یەنەکە و پەدەکە و سوپای تورک ) دەستی پێکرد و هەروەها لە نێوان ( پەکەکە و پەدەکە) چڕتر بووەوە. ئەم شەڕە لە مێژووی شەڕی (**براکوژی**)دا بە مۆدرێنترین شەڕی (**براکوژی**) ناوزەند کرا. مەخابن کۆتایشی نەهات. ئەو ڕۆژەی واژۆی کۆتایی هێنانی شەڕی (**براکوژی**) کرا، مەخابن کۆتایی نەهات، دوایش شەڕێکی نوێی (**براکوژی**) پیلانسازی بۆکرا و شێوازێکی تری لەخۆی گرت.

ئاشکرایه شاعیری ناوداری کورد ( حاجی قادری کۆیی ) زۆر له ناخەوه درکی به ئازاری شەڕی (**براکوژی**) کردووه، لەوەدەچێت هەرلە (١٨٠٠)وە شەڕی (**براکوژی**) یەخەی کوردی بەرنەدابێت، هەربۆیە (حاجی قادری کۆیی ) هاواری لێبەرز بووەتەوە و وتویەتی :

هەتا وەک ئاگری بن (کا) لەگەڵ یەک

ئەگەر تۆفان بێت لەشکرتان بێ پوشەک

تارێک نەکەوین قەومی ئەکراد

هەروا دەبینە خراپە ئاباد .

لەدوای راپەڕین هەرێمی باشوری کوردستان له ساڵی (١٩٩١) بوو بە چەقێکی سەرنجراکێشەری دەزگا راگەیاندن و پەیامنێرە ناوخۆیی و جیهانییەکان. دوای ئەوەی زلهێزه جیهانییەکان هێرشی سەر سەدام حوسێنیان کرد و ناویانا شەڕی (کەنداو)، راپەڕینی کورد ئەم هەرێمەی هەژاند، ئێمە وەکو رۆژنامەوان چەندینجار چووینە خاکی باشوری کوردستانەوە، بەسەرکردەکانیشەوە لەگەڵ خەڵکانێکی زۆردا دیمانەمان ئەنجامدا. تەماشای درامای رۆژگاری شەڕی براکوژی نێوان باکوری و باشورییەکانمان کرد. لەکاتی شەڕەکاندا لەبەر ئەوەی پیشەمان رۆژنامەوان بوو کە کارمان بۆ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) دەکرد هەموو هەواڵی هەرێمەکە دەگەیشتە دەستمان و بەگشتی زانیارییەکانمان پێدەگەیشت. ئەگەر ئەڵقەی رووداو و بەسەرهاتەکانی ئەو کاتە بدەینە دەم یەکەوە درامایەکی زۆر دڵتەزێنی لێدەردەچێت، ئەم دراما و تابلۆیانە مێژووی راستەقەینەی (یەنەکە و پەکەکە) و بەتایبەتی (پەدەکە) دەخاتە روو.

سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کەبۆ بە بەرهەم هێنانی ئەم کتێبە هاوکارییان کردووم .

فەیسەڵ داغلی .

## هەرێمی بادینان

بادینان هەرێمێکی گرنگە و خاوەن تایبەتمەندی خۆیەتی، هەروەها خاوەن شوێنەوارێکی زۆرە و خاوەن ناوچەیەکی زۆری ستراتیژییە و بەگشتیش هەموو ناوچەکانی سوود بەخشن، لەبەر ئەو هۆکارە گرنگییانەوەی بووە کە ماوەیەک کراوە بە پایتەختی ئامێدییە. ئەم هەرێمە ئەو زنجیرە چیایانە لە خۆدەگرێت کە سنورەکانی کوردستان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، ئەم زنجیرە چیایانە لە سنوری سوریاوە دەگاتە ئێران و هەروەها لە باکور و باشوریشەوە تورکیا و عێراق بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بادینان لە باشوری کوردستان بە درێژایی سنوری تورکیا بەسەر زاخۆ، دهۆک، ئامێدییە، باتوفە و ئاکرێوە درێژدەبێتەوە، لەهەندێک جێگاش بەسەر سنوری باکوردا تێدەپەڕێت و هەروەها کولتور و نەریتی دانیشتوانی هەککاری، چوکورجە و بەیتولشەبابی گردووەتەخۆی.

لەم هەرێمەدا عەشیرەتەکانی وەک (بەرواری، هەرکی، رێکانی، شێخانی، برادۆست، بەرگارەیی، نێروەیی، سیندی، گولی، زێباری، سورچی، دوسکی، بارزانی، مزووری، سلێڤانەیی، میرانی، کۆخی، لۆلانی، ئاشوری، پینیانیشی، ئەرتوشی و ژیرکی) دەژین و بەگوێرەی داتاکانی سەرەتای ساڵی (١٩٩٠)کانْ سەرژمێری دانیشتوانی هەرێمەکە دەگاتە ملیۆن و نیوێک. بادینان بەیەک پارچەیی تاکو دوای شەڕی یەکەمی جیهانیش لەژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکاندا بووە، هەروەها بەشێکی تری باشوریش کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەکانەوە، زێیەکانی (هەزیل، زاپ و خابور) کە شوێن بە شوێن سنوری دەستکردی تورکیا، عیراق و سوریایان پێکهێناوە، لەهیچ سەردەمێکدا سنوری دەستکرد و بوونی لوغم و تەلەزییەکان نەیانتوانیوە پەیوەندییەکانی ناو خێڵەکانی ئەم ناوچەیە لەیەک دابپرێت

## یەکەم دەستەی گەریلای پەکەکە

پێش کودەتا سەربازییەکەی تورکیا کە لە ساڵی ١٩٨٠ روویدا، لەگەڵ دەرچوونی سەرکردایەتی پەکەکە بۆ دەرەوەی تورکیا، پەیتا .. پەیتا دەستەی گەریلایان ئامادەکرد بۆ دەستپێکردنی شەڕی چەکداری نەتەوەیی و هەروەها بڕیاریاندا ئەو گەریلایانەی لە دەرەوەی تورکیا مەشقیان پێکرابوو رەوانەی تورکیا و کوردستانیان بکەن. لە لوبنان لە بەرواری ١٥و٢٦ی تەموزی ساڵی ١٩٨١ کۆنفرانسی یەکەمی پەکەکە بەسترا و بەگشتی لەسەرئەوە هاوبیربوون لە باشوری کوردستان گەریلاکانیان جێگیرببن، لەسەر بڕیاری کۆنگرەی دووەمی پەکەکە کەلە ٢٠و٢٥ی ئابی ساڵی ١٩٨٢ بەسترا یەکەمین دەستەی گەریلایان لە هەرێمی بادینان جێگیرکرد. بەگشتی فەرماندەی دەستە سەرەتاییەکانی گەریلا پێکهاتبوون لە (مەعسوم کۆرکماز، محەمەد قەرەسنگۆر، عەبدوللە ئێکنجی، رەمەزان قاپلان و وەلی یەشار)، لەهەمانکاتدا چەند دەستەیەکی تریان بۆ ناوچەی (بۆتان) بەرێکرد[١]، شایەنی باسە کەسانی وەک (حەمید ئاقچی و حەسەن) کەلە ساڵی ١٩٨٠ لە (سۆسان)ەوە گەیشتبوونە رۆژهەڵاتی کوردستان لەناو ئەو دەستە گەریلایەدا بوون، ئەم گەریلایانە لە دەستپێکدا لە پێشمەرگەکانی (پدک) ی ئێران نزیک دەبنەوە، پاشان پەیوەندی لەگەڵ پێشمەرگەکانی (پدک)ی عێراق دەبەستن، واتا پارتەکەی بارزانی، لەهەمانکاتیشدا لە کەمپەکانی (زیڤە و راژان)ی سەربە (پدک) عێراق دەمێننەوە.

شایەنی باسە ئەو سەردەمە (پەکەکە) لە لوبنان سەرقاڵی مەشقکردنی گەریلاکانیان بوون و ئامادەیانیان دەکردن بۆ گەڕانەوەیان بۆ وەڵات، لەهەمانکاتیشدا سەرقاڵی کۆکردنەوەی زانیارییبوون بۆ شارەزابوونی هەرێمەکان، بەڵام پارتە باشورییەکان ئەو سەردەمە لەجیاتی ئەوەی رووی چەکەکانیان لە دوژمن بکەن و شەڕیان لەگەڵ بکەن مەخابن شەڕی یەکتریان دەکرد. شەڕی نێوان یەکێتی، پارتی، حزبی شیوعی و حسک ببووە مایەی زیانێکی زۆری

---

١گێڕانەوەی (جەمیل بایک)

نیشتیمانی و نەتەوەیی، بەردەوامی شەڕی (براکوژی) نێوان یەکێتی و پارتی هەتا نیوەی ساڵی (١٩٨٠)کان بەتەواوەتی گەلی باشوریان هەرەسان کردبوو، بەهۆی شەڕی بەردەوامی نێوان (یەکێتی و پارتی) و شەڕی نێوان (عێراق و ئێران)، شەڕی نێوان (پارتی گەلی و حزبی شیوعی و حسک) و سیخوڕی عەشیرەتەکانیش لەلایەک و شەڕی نێوان (کۆمەڵە و پدک ئێران و موجاهیدینی خەڵک) هەموو ئەم شەڕانە کوردستانیان وەک لوبنان لێکردبوو ()[٢]، ئەم

---

[٢] ()شەڕی براکوژی لە باشوری کوردستان لە سەرەتای ساڵی (١٩٦١) دەستی پێکرد، دوای گەڕانەوەی (مەلا مستەفا بارزانی) لە سۆڤییەت دژ بە ڕژێمی عێراق دەستی کرد بە شۆڕش و سەبارەت بە سەرۆکایەتی پارتەکەیان لەگەڵ (ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی) کێشە کەوتە نێوانیانەوە، لەئاکامدا بەهۆی کێشەی قوڵی ئەم دوو بەرەیەوە لە کۆتایی ساڵی (١٩٦١) زۆرکەس کوژران، شۆڕشی کورد بە سەرۆکایەتی پارتی و مەلا مستەفا لە ساڵی (١٩٧٥)هەرەسی هێنا، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە سەرۆکایەتی (جەلال تاڵەبانی) دامەزرێنرا، لەگەڵ پارت و ڕێکخراوەکانی تری وەک (پارتی گەلی و حسک) و هەروەها پارتەکانی تریشی وەک (پاسۆک و حزبی شیوعی) مەخابن جارێکی تر شەڕی براکوژی لە باشور دەستی پێکردەوە، لە ساڵی (١٩٧٨) لە نزیک بەیتولشەباب ئەوکاتەی گروپێکی یەکێتی دەیانەوێت بچن بۆ سوریا، پارتی لە ڕێگای پیاوی هۆزەکانی وەک (سۆڤاری و خەلیلی) و چەند ئاغایەکی تری ناوچەکە بۆسە بۆ کادێر و پێشمەرگەکانی یەکێتی دادەنێنن و لەئاکامدا پێشمەرگەیەکی زۆری یەکێتی نیشتیمانی دەکوژن، ئەم کوشتارە بە کوشتاری (هەککاری) ناوبرا و ئەم ڕووداوە بە گەورەترین کارەساتی شەڕی ناوخۆ تۆمار کرا، لەهەمانکاتدا گەریلاکانی (پەکەکە) هەوڵیاندەدا لە هەرێمەکە جێگیرببن. لە کۆتایی مانگی شوباتی (١٩٨٣) شەڕی ناوخۆ لە هەرێمی سۆران دەستی پێکرد، یەکێتی نیشتیمانی بۆ باڵادەست بوونی هێزەکانیان لە هەرێمی سۆران چنگیان بە هێزەکانی (حسک) هەڵچنیبرو، یەکێتی نەیدەهێشت لەهەرێمی سۆراندا هیچ هێزێکی چەکداری تر گەشە بکات جگە لە خۆی، هەمان ڕفتاری یەکێتی، پارتی لە هەرێمی بادینان دووبارەی دەکردەوە. لە٢٨/ ١٩٨١/١١ (پارتی، پاسۆک، حسک و حزبی شیوعی) بەرەی جودیان دامەزراند، لەراستیدا ئەم بەرەیە لە دژی یەکێتی نیشتیمانی دروستکرابوو، یەکێتی هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە لە ١٩٧٥/٦/١ دەیویست لە هەرێمی سۆران بە تایبەتی و بە گشتی لە کوردستاندا باڵا دەست ببێت، هەر ئەم خواست و ئارەزووە پاوانخوازییەی یەکێتی بوو کە ببێتە هۆکار پارتی لە ترسی گیانی خۆی پەنا بۆ دروستبوونی بەرەی جود بەرێت. حزبی شیوعی کە یەکێک بوو لە ئەندامانی بەرەی جود لە ١٩٨٣/٢/١٩ دژ بە شەڕی براکوژی لەگەڵ یەکێتیدا ڕێککەوتن نامەیەکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە، دوای بڵاوکردنەوەی ئەم ڕێککەوتنە بە دوو ڕۆژ، لە گوندێکی نزیک لە شاری هەولێر یەکەم پێکدادان لە نێوان پێشمەرگەکانی یەکێتی و حسک هاتەئاراوە و لەئاکامی ئەم شەڕەدا (١١) پێشمەرگەی حسک کوژران، دوای چەند ڕۆژێکیش لەدوای ئەم ڕووداوە پێشمەرگەکانی حسک و حزبی شیوعی لە نزیک کۆیە بە هاوبەش بۆسەیەکیان بۆ دەستەیەک پێشمەرگەی یەکێتی دەنێننەوە و لەم هێرشەدا دوو ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بەناوی (شێخ شەماڵ و سەریان) و ١٥ پێشمەرگەی تر دەکوژن، لە وەڵامی ئەم ڕوودلوەدا یەکێتی لە ڕادیۆکەی خۆیەوە دەیوت (تۆڵە بەسەبرە بەڵام بە زەبرە). لە نەورۆزی ساڵی ١٩٨٣ (پارتی، حسک و حزبی شیوعی) لە بالیسان هێرشێکی فراوانیان کردە سەر (٣) بارەگای یەکێتی و لە ئەنجامدا (٦) پێشمەرگەی یەکێتی دەکوژرێت، لەم شەڕەدا پێشمەرگەکانی یەکێتی ناچار دەبن پاشەکشێ بکەن، بەم هۆیەوە کڵپەی شەڕی براکوژی زیاتر گڕی گرت، زۆرجار ئەم شەڕی

رەوشە و ئەم خوێن رشتنانە و ئەم شەڕی براکوژییانە لەناو گەلی کورددا باوەڕی و متمانەییان لەئاستی بزاڤی کوردیدا نەهێشتبوو. (یەکێتی و پارتی) لەپێناو بەرژەوەندی خۆیان و مانەوەیان لە گۆڕەپانەکەدا و بۆ نەمانی یەکتری لەشکری وەڵاتانی عێراق و ئێرانیان دەهێنایە سەر یەکتری.

ئەم نەگونجاندنە لەناو میللەتی کوردا ڕێگای بۆ بڕوا پێنەمانی بزاڤی کوردی خۆشکرد، ئەم دوو پارتە بەهۆی بەرژەوەندی ستراتیژی خۆیانەوە بۆلەناودانی یەکتری پەنایان بۆ لەشکری دوژمن دەبرد، دەیانویست ئەم ئەو و ئەو ئەم تەواو بکات. بەتایبەتی (پەدەکە) لەناوچەکانی (حاجی ئۆمران، مەندەلی و گەلاڵە) وەکو سیخوڕ کاریان بۆ سوپای ئێران دەکرد، دەکەوتنە پێش لەشکری فارسەوە ([2]).

---

براکوژییە بەهۆی هۆکاری سادەوە دەهاتە ئاراوە کە ببووە مایەی کوژرانی گەلێک لە رۆڵەی کوردستان، یەکێک لە هۆکاری هاتنەئاراوەی شەڕی براکوژی لەوانەیە بڕوا نەکرێت بەڵام جارێکیان بەهۆی قوتویەک کۆکا کۆلاوە بووە، ئەم شەڕە لە ساڵی (١٩٨٣) لە گوندێکی نزیک شاری هەولێر روویدابوو، لەم شەڕەی هاتبووە ئاراوە بەهۆی کۆلایەکەوە پێشمەرگەیەک دەکوژرێت بە ناوی جەواد، خەڵکی ناوچەکە گوتوبویان (ئەرێ ئەی هاوار بەم زستانە لەسەر قوتویەک کۆلا شەر دەکرێت ؟!) .

[2] بەگوێرەی (مەسعود بارزانی) ئەم شەڕەی کە دەیکرد گوایە خەڵکی عێراق بونەتە قوربانی شەڕی ئیمپریالیزم و بێ دەسەڵاتی خودی گەل ، (پەدەکە) لە دژی عێراق بەتایبەت لە شەڕی (مەندەلی) رابەرایەتی بۆ سوپای ئێران دەکرد، لە ئەنجامی شەڕی ئەو ناوچەیەدا لە نێوان حاجی ئۆمران و رەواندوز (٥٠٠) گوند سوتێنرا و چۆڵکران، لە ١٩٨٠/٩/٢٢ کە شەڕی عێراق و ئێران دەستی پێکرد، لەو سەردەمەدا یەکەمین کەس کە بەخۆی و هێزەکەیەوە یارمەتی رژێمی تەهرانی دەکرد شێخ محەمەد خالید بوو کە مامی مەسعود بارزانییە، شێخ محەمەد لە باشوری کوردستان وەکو دەزگایەکی ئێرانی بەناوی (حزب الله)وە کاری دەکرد و بەهۆی هێز و توانای (پەدەکە)وە لەناوچەکە دەسەڵاتی خۆی سەپاندبوو، ئێران سەرەڕای هەموو خزمەتێکی (پەدەکە)ش کەچی رێکخراوێکی بەناو (شۆڕشگێڕانی ئیسلامی) کارتۆنییان بۆ شێخ محەمەد دلمەزراندبوو، هەروەها رێزێکی تایبەتیان لێدەگرت، لەهەمانکاتدا شێخ محەمەد دەسەڵاتدارییەکی باشی ناوچەکانی دەکرد، (مەسعود بارزانی) لە وتنێکیدا دەڵێت (ئەمەریکا بەهۆی سوود وەرگرتن لە کۆنەپەرستی ناوچەکە و لە پێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەهەموو توانایەکیانەوە یارمەتی سەدام حوسێن دەدەن)، هەروەها بە توندی ئیدانەی ئەم شەڕەی دەکرد، بە بۆچونی (مەسعود بارزانی) گەلی عێراق بونەتە قوربانی شەڕی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان. یەکێتی نیشتیمانی و پارتەکانی تر بەهۆی ئەم رابەرایەتییەی (پەدەکە) بۆ سوپای ئێران رەخنە و تولنجێکی زۆریان دەکردن و دەیانوت (نابێت دوژمن بهێننە کوردستانەوە)، لەوکاتەدا خەڵکی بە پارتییان دەوت (کەوە سوورەی بەر لەشکری دوژمن)، هەروەها دەیانوت (لە پێش دوژمن رێدەکات و پەلاماری وەڵاتەکەی خۆی دەدات)، لەوکاتەدا (یەنەکە) لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئیسلامیدا و بەهاوکاری (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) دژ بە رژێمی ئێران شەڕیان دەکرد، (خومەینی) لە ١٠و١١ی مانگی

له ساڵی (١٩٨٢) بەهۆی شەڕی نێوان عێراق و ئێرانەوە رژێمی عێراق لاواز ببوو، ناوچەیەکی زۆری باشوری کوردستان هێزێکی ئەوتۆی سوپای عێراقی لێنەبوو، زۆرینەی درێژاییەکانی سنورەکان لەژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەدا بوو، بارەگایەکی زۆری سەربازی رژێمی عێراق چۆڵیان کردبوو، سەدام حوسێن پاراستنی بەشێکی زۆری هەرێمی بادینانی رادەستی جاشەکان کردبوو، بەگشتی هەرێمەکانی هەردوو بەشی عێراق و ئێران لەناو ئاڵۆزیدابوون، ئەو سەردەمەش واتا له ساڵی (١٩٧٩) ئێران توانایەکی ئەوتۆی سەربازی نەبوو کۆنترۆڵی شۆڕشی کورد بکات هەربۆیە له هەردوو بەشدا ناوچەیەکی زۆر کەتبوونە ژێر کۆنترۆڵی هێزە کوردییەکانەوە، لەکاتی دەست پێکردنی شەڕی کوردی ئێران لەسەر داخوازی رژێمی ئێران (پەدەکە) بەگژ کورد و پێشمەرگەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) بوونەوە، ئەم دژایەتییە بەتایبەت له ساڵەکانی ١٩٨٢ بۆ ١٩٨٣ زیاتر چڕبووەوە، لەکاتی هێرشەکانی پێشمەرگەکانی بنەماڵەی بارزانی بۆسەر پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەسەدان پێشمەرگەی دیموکرات کوژران، بەهۆی شەڕی عێراق و ئێرانیشەوە ئەو دەرفەتەی بۆ هێزە سیاسییەکانی کورد رەخسابوو لەجیاتی ئەوەی دەرس له هەرەسی ساڵی (١٩٧٥)

---

شوباتی ١٩٧٩ گەڕایەوە بۆ ئێران، لەبارەی کوردەوە هیچی نەوت، کوردیش له مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٩ به رابەرایەتی (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) راپەڕین، توانییان شارێکی زۆر ئازاد بکەن، لەئاکامی ئەم رووداوانەدا خومەینی وتی (داخوازی کورد ئۆتۆنۆمییە، ئۆتۆنۆمیش له قورعاندا بوونی نییە)، بەمشێوەیە یەکەم شەڕی گەورەی کورد له شاری (نەغەدە) دەستی پێکرد، ئازەرییەکان لەبەرئەوەی لایەنگری خومەینی بوون کەوتنە شەڕ له دژی کورد و له ئاکامدا له نێوان کورد و ئازەرییەکاندا به سەدەها کەس کوژران، شەڕێکی گەورەی تریش له شاری (پاوە) هاتە ئاراوە کە دەکەوێتە نزیک سنوری عێراق، شەڕی نێوان کورد و پاسدار (٢٠) رۆژی خایاند، لەو شەڕانەدا پێشمەرگەکانی (یەنەکە) لەگەڵ پێشمەرگەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) لەیەک سەنگەردا بوون، رێککەوتنی نێوان (یەنەکە و پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) هەتا ساڵی (١٩٨٣) ی خایاند، (یەنەکە) لەو ساڵانەدا تەنها شەڕی لەگەڵ سوپای ئێران دەکرد و سوپای عێراقی فەرامۆش کردبوو، ئەم کارەی (یەنەکە) ببوو به مایەی تولنجی گەل کە پێیان وابوو پێویستە له پێشدا دژ به دوژمنی خۆت شەڕ بکەیت، لەم کاتەدا پێشمەرگەکانی (مەسعود بارزانی) پەلاماری پێشمەرگەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستان ئێران)یان دەدا، تێکچونی دانوساندنی نێوان یەنەکە و رژێمی بەغداد له ساڵەکانی ١٩٨٣ بۆ ١٩٨٤ بووە هۆی ئەوەی یەنەکە له رژێمی ئێران نزیک بکاتەوە، هەروەها ئەویش هەمانشێوەی سیاسەتی (پەدەکە)ی گرتەبەر بۆ نزیک بونەوەی له ئێران، پێشمەرگەکانی جەلال تاڵەبانی له هەرێمی سۆراندا وەکو سیخوڕێکی رژێمی ئێرانیان لێهاتبوو، وە یەکێ له هۆکارە سەرەکییەکانی کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە ئەم سیخوڕییەی (یەنەکە) بوو، هێنانی پاسدار لەلایەن (یەنەکە)وە بۆ لێدانی شارە گەورەکانی وەک (کەرکوک و موسڵ) بوو بەهۆی ئەوەی دوژمن درندەتر پەلاماری کورد بدات.

وەربگرن، کەچی یەکیان دەکوشت و هەریەکەیشیان دوژمنێکی کوردیان وەک دۆست بۆ خۆیان هەڵبژاردبوو.

لەم رەوشەدا بەچونی گەریلاکانی (پەکەکە) بۆ هەرێمەکە لەناکاو خۆیان لەناو شەڕی (براکوژی)دا بینییەوە، بۆ ئەم مەبەستەش (پەکەکە) کەوتە هەوڵدان تاکو شەڕی براکوژی لەنێوان پارتەکان نەهێڵێت و بتوانن بەیەکەوە (بەرە)یەک و یەکێتییەکی نەتەوەیی پێکبهێنن[٤]، تەنانەت پێش ئەوەی گەریلاکانی (پەکەکە) بچنە خاکی باشوری کوردستانەوە سەرکردایەتی (پەکەکە) لە بەیروت و شام پەیوەندییان لەگەڵ (یەنەکە و پەدەکە) بەستبوو، پاشان بە چوونیان بۆ باشور کادێرەکانی (پەکەکە) تێکەڵی لەگەڵ فەرماندەکانی (حزبی شیوعی) و (حسک) دروست کردبوو، (پەکەکە) بۆ جێگیربوونی باشتری گەریلاکانی و شارەزا بوونیان لەبارەی ناوچەکەوە کەوتنە ناو کاروخەبات و بۆ ئەنجامدانی یەک ریزی نێوان لایەنە سیاسییەکان و نەهێشتنی شەڕی براکوژی ئەندامی سەرکردایەتییان (محەمەد قەرەسونگور) لە هەرێمی سۆران و بادینان رۆڵێکی بەرچاوی بینی بوو، محەمەد قەرەسونگور ئاشنایەکی باشی لەگەڵ لایەنە باشورییەکان بەدەست خستبوو، هەر ئەویش ئەندازیاری رێککەوتنی نێوان پەکەکە و (پەدەکە) بوو، (محەمەد قەرەسونگور) کە ناسراوە بە (خالید) لەگەڵ دوو هەڤاڵیدا بەناوی (ئیبراهیم بیلگین و سەید) لە (لۆلان) لە شەڕێکی نێوان (یەنەکە) و (بەرەی جود)دا لەلایەن پێشمەرگەکانی (یەنەکە)وە لە ٤/٢/ ١٩٨٣ شەهید دەبێت، لەبارەی ئەم شەهادەتەوە سەرکردایەتی (پەکەکە) پێیانوایە ئەمە رووداوێکی بە ئەنقسەت بووە، ئەم رووداوە بەمشێوەیە روویداوە، پێشمەرگەکانی یەکێتی گەمارۆی گرووپێک لە پێشمەرگەی (بەرەی جود) دەدەن ([٥])،

---

[٤] تشرینی یەکەم ساڵی ١٩٩٣ ژمارەی تایبەتی (سەرخوەبون )

[٥] حزبی شیوعی ئەندامێکی بەرەی جود بوو، بارەگای سەرکردایەتییان لە گوندی (قرناخە و پشتاشان) بوو، ئەم جێگایە جێگایەکی ستراتیژییە و لەوێدا نەخۆشخانە و شوێنی پەروەردە و شوێنی رادیۆ و چاپخانەی لێبوو، جگە لە هێزی حزبی شیوعی پارتەکانی تری وەک (پەدەکە و حسک و پاسۆک) یش لەوێدا بوون، یەکێتی بە هاوکاری پێشمەرگەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆمەڵە لە ٢ی نیسان لە مەرگە هێرشیان کردە سەر بارەگای سەرکردایەتی حزبی شیوعی، لەئاکامی ئەم هێرشەدا (٦٠) پێشمەرگەی حزبی شیوعی کوژران و (٦٠)یش بە برینداری و بە ساغی بە دیلی گیران، زۆربەی کوژراوەکان وەک باسدەکرێت لەکاتی دیلبونیان کوژراون کەلە ناویاندا ژنیش هەبووە، یەکێک لە دیلەکان ئەندامی سەرکردایەتی حزبی شیوعی (کەریم ئەحمەد) بوو، جێی باسە ئەم هێرشە بە فەرماندارێتی خودی نەوشیروان مستەفا ئەنجامدراوە کە ماوەی ٢ رۆژی خایاندووە، کەریم ئەحمەد

محەمەد قەرەسونگور و هەڤاڵەکانی بۆئەوەی ئەم شەڕە راگرن دێنە بەینییانەوە، دوای ئەوەی خۆیان پێدەناسێنن کە گەریلان و فەرماندەی (پەکەکە)ن و داوایان لێدەکەن شەڕەکە رابگرن و پێشمەرگە نەکوژرێت، بەڵام پێشمەرگەکانی (یەنەکە) هەرلەوێدا (محەمەد قەرەسونگور) و هەڤاڵەکانی دەکوژن و تەنانەت دەچنە سەر تەرمەکانیان و جزدان، سەعات، چەک و ئەو شتومەکەی پێیانە کە بەنرخن هەمووی دەبەن، بەڵێ مەخابن شەڕی ناوخۆ و (براکوژی) هەستی دۆستایەتی و برایەتی لە مێشک، هزر و دڵی مرۆڤدا ناهێڵێت و مرۆڤ دڕندە دەکات. دوای ئەم کارەساتە کەسی دووەمی ناو (یەنەکە) (نەوشیروان مستەفا) چاوی بە کادێرەکانی (پەکەکە) دەکەوێت و پێیان دەڵێت (لە ساڵەکانی ١٩٧٧ و ١٩٧٨ پەکەکە لە پێناو پاراستنی خۆیان چییان کرد ئێستاش ئێمە هەمانشت دەکەینەوە)، بەمشێوەیە (نەوشیروان مستەفا) زۆر بە ئاسانی بازی بەسەر رووداوەکەدا. (یەنەکە)یش بۆ دڵدانەوەی (پەکەکە) لە رادیۆکەی خۆیان سووکە ماتەمینییەکی دانا[٦].

بەگشتی خاکی باشوری کوردستان ببوو بە مەڵبەندێکی ململانێی لایەنەکان کەلەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان و لەم پێناوەدا هەموو شتێکیان دەکرد، ئەم رووداوە لە ناوچەکەدا ببوو بە دووەمین زیانی (پەکەکە)، لە کۆتایی بەهاری ساڵی (١٩٨٢) دەستەیەک لە گەریلاکانی (پەکەکە) بە فەرماندارێتی (شاهین کلاڤۆز) لە سوریاوە دەپەڕینەوە و تێکەڵ بە گرووپێک لە پێشمەرگەی (پەدەکە) دەبن، ئەم هێزە لە (هێزیلچایی) نزیک چیای (جودی) دەکەونە بۆسەی سەربازی تورکەوە و ئەوانیش بۆ پاراستنی گیانی خۆیان دەچنە ناو ئاوی زێیەکەوە و لەئاکامدا (٨) گەریلا و (٦) پێشمەرگەی (پەدەکە) لە ئاوەکە دەخنکێن، سەرچاوەکانی (پەکەکە) دەیانوت ئەم رووداوە لە ئاکامی خیانەتی رێبەری گرووپەکەوە روویداوە، دوای لێکۆڵینەوە لە رووداوەکە بۆیاندەردەکەوێت ئەوکاتەی دەگەنە نزیک شوێنی

---

کە لەلای یەکێتی دیل بوو بەزۆرە ملێیی لە رادیۆی (یەنەکە) لەگەڵ (جەلال تاڵەبانی)دا دیمانەیەکیان پێسازکرد، لەم دیمانەیەدا کەریم دەیوت (دەبێت کۆتایی بە شەڕی ناخۆ بهێنرێت)، بەڵام هێرشەکان بەردەوام بوون، لەهەمان رادیۆی (یەنەکە)وە لەهەمانکاتدا (نەوشیروان مستەفا) بە شانازییەوە باسی لە سەرکەوتنەکانی خۆیانیانی دەکرد، دوای ئەم کارەساتە پارتە کوردییەکان ناوی نەوشیروان مستەفایان نا (قارەمانی شەڕی براکوژی)، (نەوشیروان مستەفا) ئەم شەڕەی کە لەگەڵ (پەدەکە) دەیکرد بە شەڕی چینایەتی دەبینی و لەمبارەیەوە دەیوت (پارتی نوێنەرایەتی گرووپێک لە ئاغا و کۆنەپەرستان دەکەن، بەهەر شێوەیەک بێت دەبێت ئەم پارتە نەمێنێت).

[٦] سەرگوزەشتەی رۆژنامەوان ( سەردار چەلیک ).

بۆسەکە ڕێبەرەکەیان خۆی دەشارێتەوە و لەبەر نەشارەزایی گەریلاکان سەریان لێدەشێوێت و نازانن بۆکوێ بچن و ناچار دەچنە ئاوەکەوە، کابرای ڕێبەر کە کەسێکی سقیلە و لە جزرە، قامیشلۆ و زاخۆ خاوەن ماڵە و بەگوێرەی زانیارییە وردەکان بەدەست خراون ئەم کابرایە پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ سەرۆکی پارتی گەل (سامی عەبدولرەحمان) هەیە[٧]، بەهۆی ئەم ڕووداوانەوە لەکاتی جێگیربوون لە باشور (پەکەکە) زیانێکی زۆری لێدەکەوێت، لەبەر نەبوونی هێز و نەبونی لایەنگر و نەشارەزایش، (پەکەکە) ناچار بوو لەهەمبەر ئەم ڕووداوە دڵتەزێنانە بێدەنگی هەڵبژێرێت.

[٧] سەرگوزەشتەی ڕۆژنامەوان ( سەردار چەلیک )

## چیای (جودی) یەکەم لانەی گەریلا

سەرەڕای سەختی و ترسناکی بارودۆخەکە لە ساڵی (١٩٨٢) لە لوبنان (پەکەکە) دووەمین کۆنگرەی خۆی بەست، لەم کۆنگریەدا بڕیاردرا گرووپی گەریلای مەشقپێکراو لەسەر هەرێمی (بۆتان) ەوە ڕەوانەی باشوری کوردستان بکەن، بێشک باشوری کوردستان بۆ (پەکەکە) تایبەتمەندی خۆی هەبوو، بەهۆی ناڵەباری ڕەوشی باشورەوە (پەکەکە) زۆر بە ووريايانە و بە حەزەرەوە هەڵسوکەوتی دەکرد، بەلای (پەکەکە) وە باشوری کوردستان پێگەو گرنگی خۆی هەبوو، سنورەکانی هەرێمی بادینان لەژێر دەسەڵاتی ڕژێمی عێراقدا نەمابوون، بەهۆی هێرشەکانی ئێرانەوە حکومەتی عێراق ناچار ببوو هەموو سوپاکەی خۆی بە سنورەکانی ئێرانەوە سەرقاڵ بکات، هەربۆیە عێراق نەیدەتوانی هەموو سنورەکانی خۆی بپارێزێت، ئەو ناوچانەی کەلە ژێر دەسەڵاتی عێراقدا نەمابوون زۆربەی خەڵکەکەی وەڵاتپارێز بوون، ناوچە شاخاوییەکان بارەگای پێشمەرگەی لێنەبوو، بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بە ناوچەی ڕزگارکراو هەژماردەکرا، جگە لە هاتنە ئاراوەی جارناجارەی ئەو شەڕەی کە خێڵە جاشەکان بۆ ڕژێمی سەدامیان دەکرد دژ بە پێشمەرگە بەگشتی هەرێمەکە ئارام بوو، پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەو ناوچانەدا بەگشتی ڕووبەڕووی هێرش و شەڕێکی ئەوتۆی جدی نەدەبوونەوە، هەروەها خۆیشیان شەڕیان نەدەکرد و لە شەڕو پێکدادانیش خۆیان دەپاراست، سنوری نێوان عێراق و سوریا تاکو نزیک شاری زاخۆش خاڵی پشکنینێکی پتەوی سەربازی لێنەبوو، بەشێوەیەکی گشتی هاتوچۆ زۆر ئاسان بوو.

هەرێمی (بۆتان) بەهۆی بادینانەوە بۆ شەڕی گەریلا زۆر گەنجاو بوو، سەختی و ڕەوشی کەشوهەواکەی سوودێکی باشی بە گەریلا دەبەخشی، ئێرە سرووشتێکی زۆر دژوارە و ئاڵۆزە تەنانەت دەوترێت سوپای مەرکەزیش ناتوانێت بە ئاسانی لەم ناوچەیە هەڵبکات، هەربۆیە سوپای تورک لەم ناوچەیە هەیبەتێکی ئەوتۆی نەبوو. سنورەکانی ئەم هەرێمە بۆ هاتوچۆی گەریلا و پێشمەرگە و بۆ قاچاخچییەکانیش زۆر گونجاو بوو، هەربۆیە بەرێژەیەکی

زۆر خەڵکی ئەم ناوچانە بە کاری قاچاخچێتییەوە سەرقاڵن. بەهۆی شەڕی کوردایەتی باشوری کوردستانەوە لە دێرزەمانەوە هاتووچۆی ئەم دیو و ئەو دیوی سنور درووست ببوو، لە ناوچەکەدا ستراتیژیترین شوێن زنجیرە چیاکانی دڵی باکوری کوردستانە، چیای (جودی)ش لەم خاڵەوە دەستی پێدەکرد، ئەم چیایە لە مێژووی ژیان و تێکۆشانی گەلی کورد و وەک جوگرافییای کوردستانیش دەورێکی سەرەکی بینیوە، بۆهاتووچۆ باشترین و گونجاوترین شوێن بێشک ئەم زنجیرە چیایەیە کەهەر چوار پارچەی کوردستان دەگرێتەوە. ئەم زنجیرە چیایە لە نزیک شاری (زاخۆ)وە دەست پێدەکات هەتا دەگاتە (شرناخ، هەککاری، سێرت، بیتلیس، دیاربەکر و بینگۆل)، ئەم زنجیرە چیایانە ئەشکەوتێکی زۆری گەورە و بچوکیان هەیە کە هەمیشە بوونەتە پشتوپەنا بۆ شۆڕشگێڕ و ئەو گرووپ و کەسانەی کە لە دەست دەسەڵات هەڵاتوون، کۆمەڵە چیایەکی سەر کەش و بڵند و هەوراز و نشێوێکی زۆر و گرد و گردۆڵەکەیەکی زۆری هەیە، بێگومان لەگەڵ رووبار و زێشدا کە مرۆڤ مەست دەکەن. زۆربەی ئەو خانەوادانەی لەم دەوروبەرە دەژین لەبەر خۆشەویستی ئەم ژینگەیە زۆربەی منداڵەکانیان ناو ناوە (جودی)، لەدێر زەمانەوە هەموو دەسەڵاتدارانی هەرێمەکە بۆ گرتنی هەڵاتوانانی ژێر دەستەڵاتیان بەردەوام هێرشیان هێناوە بۆ ئەم دەڤەرە، لە زۆربەی شوێنەوارەکانی ئەم هەرێمە تاکو ئێستاش ناوی چەندین هەڵاتوان وەکو خۆیان ماون کەلە دیواری ئەشکەوت و لەسەر بەردەکاندا هەڵکۆڵراون [^]، ناوی چیای (جودی) بە داستانی تۆفانی (نوح) پشەوە لکاوە، ئێستاش باوەشی بۆ تۆفانێکی نوێ کردووەتەوە.

لەگەڵ دەستپێکردنی جموجۆڵی گەریلاکانی (پەکەکە)، چیای (جودی) بوو بە یەکەم لانەی گەریلا، دوای خۆناساندنی گەریلا بە گەل و دوای ئەنجامدانی یەکەم چالاکی چەکداری (پەکەکە) لە (شەمزینان و روحا) گەریلاکان پاشەکشێیان کرد بۆ چیای (جودی)، لەهەمانکاتیشدا یەکەم ئۆپەراسیۆنی سەربازی دەوڵەتی تورک لەهەمبەر گەریلا هەربۆ چیای (جودی) بوو هەروەها یەکەمین بەکرێگیرا و جاش هاوشانی دەوڵەتی تورک هەر لە چیای (جودی) شەڕی دژ بە گەریلایان کرد. لەگەڵ هاتنە ئاراوەی شەڕوپێکدادانەکاندا هەموو

---

[^] یەکێک لەوانە چەتەیەکی بەناوبانگ بوو بەناوی (حاکیمۆ)، ئەم زاتە لەلایەن پیاوەکانی سەر بە عەشیرەتی (باتویان) بەهۆی پارەکەیەوە دەکوژرێت، ئەم عەشیرەتە هەتا ئەم ساتەوەختەش هەر جاشن، حاکیمۆ بە ئامانجی کوشتنی بانگهێشی دەکەن بۆ ئێوارە خوانێک و بە نامەردی دەیکوژن، تاکو ئێستاش گۆڕەکەی حاکیمۆ لەژێر دارێکی گوندی (دارکولە) یە کە کەوتووەتە نێوان جزرە و شرناخەوە.

لایەنەکان ترسی ئەوەیان هەبوو ئەم ناوچەیەیان لەدەست بچێت، هەربۆیە دەوڵەتی تورک و هێزەکانی (پەکەکە)ش بەهەموو توانا و هێزی خۆیانەوە خۆیان دابووە سەر ئەم ناوچەیە، گەریلا بەشێوەی پارتیزانی خۆیان لەم ناوچەیە جێگیرکرد، لە سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی چەکداری (پەکەکە) دەوڵەتی تورک پێینەشاردرابووەوە کەلە ناوچەی (جودی) گەریلای (پەکەکە) بونیان هەیە، (پەکەکە) بنکە و بارەگایەکی زۆریان لە ناوچەی (جودی) دروست کردبوو، تەنانەت دەزگا راگەیاندنەکانی تورکیش ئەم دیمانانەیان بڵاوکردبووەوە، گەورەترین زیانی گەریلا و دەوڵەتی تورکیش هەر لێرە هاتبووە ئاراوە، دەروازەی چیای (جودی) بۆ گەریلاکانی (پەکەکە) بێشک بادینان بوو کەلە لەژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەکانی (پەدەکە)دا بوو، هەربۆیە پێویست بوو گەریلاکانی (پەکەکە) مامەڵەیەکی درووست و گونجاو و بەجێ لەگەڵ پێشمەرگەکانی (پەدەکە)دا بکەن.

## له بادینان شەڕکردنیش بە پارەیە

له ناوچەی بادینان (پەکەکە) هێزێکی ئەوتۆی کاریگەری نەبوو کە ببێتە مایەی نیگەرانی بۆ (پەدەکە)، بوونی چەند گرووپێکی گەریلا لە سنورەکە کێشەیەکی ئەوتۆی دروست نەدەکرد، (پەدەکە) زیاتر چاوی خۆی بڕیبووە شەڕی نێوان (عێراق و ئێران)ەوە هەربۆیە تاڕادەیەک خۆی بە سنورەکانەوە سەرقاڵ نەدەکرد، (پەدەکە) ئەم ناوچەیەی بۆ هاتوچۆ بەکار دەهێنا، بۆئەوەی خۆیان لە شەڕی سوپای عێراق بپارێزن بۆ هاتووچۆ لە بادینانەوە بۆ ئێران لە نێوان (شەمزینان و یوکسەکئۆڤا) خەتی خۆیان دروست کردبوو، تورکیاش لەکاتی هاتوچۆی پێشمەرگە و کادێرەکانی (پەدەکە) چاوپۆشییان دەکرد، (پەدەکە) قورسایی خۆیان زیاتر بەلای ئێراندا دابوو، جگەلەمەش پەیوەندییەکی باشیشیان لەگەڵ ڕژێمی ئێراندا هەبوو، ئەو سەردەمە (پەدەکە) گرنگییەکی ئەوتۆی بە ناوچەی بادینان نەدەدا، زیاتر خۆیان بە کاروباری (بەرەی جود)ەوە سەرقاڵ کردبوو، هێزەکانیان لەگەڵ هێزەکانی (بەرەی جود)دا لە (ڕاژان و شنۆ) و زێیەکانی (خواکورک)ی بەشی نزیکی ئێران جێگیر ببوون، زۆربەی فەرماندەکانی (پەدەکە) لەگەڵ ئەفسەری بارەگا تورکییەکانی سنوری بادینان پەیوەندییەکی تۆکمەیان هەبوو. بژێوی خەڵکی ناوچەکە لەڕێی قاچاخچێتییەوە بەدەستیان دەخست، خەڵکی ناوچەکە لەڕێی قاچاخچێتییەوە بازرگانیان دەکرد و لەکاتی ئاودیوکردنی شتومەکدا جەندرمە و ئەفسەرەکان سەرانەیان وەردەگرت و چاوپۆشییان لەکاری قاچاخچێتی دەکرد. خەڵکی ناوچەکە چەندێک پەیوەندییان لەگەڵ بارەگا سنورییەکاندا باش بوو، ئەوەندەش پەیوەندییان لەگەڵ (پەدەکە) باشتربوو، هاوکاریشیان دەکردن و هەمووڵایەک لەیەککاتدا چاوپۆشییان لەیەک دەکرد. زۆربەی فەرماندەکانی (پەدەکە) لە سنورەکە سەرانە و باجیان لە قاچاخچییەکان وەردەگرت و هەمووشیان وەک بازرگانی سەر سنوریان لێهاتبوو، زۆرینەیەک لە فەرماندەکانی (پەدەکە) هەربەهۆی ئەم کارەیانەوە لە (بەیتولشەباب، چوکورجە، ئولودەرە و شەمزینان) ماڵوحاڵیان هەبوو، هەربۆیە ئەم فەرماندارانە بەردەوام هاتوچۆی باکور و باشوری کوردستانیان دەکرد کە ئەمەش بەرژەوەندییەکی هاوبەش بوو.

ئەم بازرگانییە هەرلە کەسانی سادەوە تا سەرۆک هۆز و سەرۆک جاش و فەرماندەی سیاسیشی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو تا دەگەیشتە ئیستیخباراتی عێراقیش، یەکێک لەو کەسانەی کە ئەم هەموو بازرگانییە و ئەم کارانەی رێکدەخست و لەسایەیدا پارەی دەست دەکەوت بەرپرسی لیژنەی ناوچەی (پەدەکە) بوو بە ناوی (دکتۆر سەید ئەحمەد بارزانی)، هەر ئەم زاتەش بەهۆی ئەوەی چەندینجار دژایەتی (پەکەکە)ی کردبوو لە دەزگا راگەیاندنەکانی تورکیا ناویهێنرابوو، قاچاخچێتییەکانی ناوچەکانی (شەمزینان) و دەشتی (بەرەزا) لەلایەن (سەید ئەحمەد بارزانی) یەوە سەرپەرشتی دەکرا، (سەید ئەحمەد بارزانی) بۆ ئەوەی رەوشی بازرگانییەکەی و دەستکەوتەکانی لەدەست نەچێت هیچ کاتێک لایەنگری ئەوە نەبوو شەڕ و پێکدادان لە ناوچەکە بێتە ئاراوە کە لەژێر رکێفی ئەودابوو، ئەو پەیوەندییە ئاساییەی کەلەگەڵ بارەگا سەربازییەکانی تورکیادا بەستبووی زۆرجار بۆ کۆنترۆل و چاودێریکردنی کوردی باکور بەکاری دەهێنا. دوای کودەتای سەربازی تورکیا کەلە ١٩٨٠/٩/١٢ ئەنجامدرا زۆرێک لە شۆڕشگێرانی کورد ناچارمابوون روو لە باشوری کوردستان بکەن، دەوڵەت لەهەمبەر هەر یەکێک لەو شۆڕشگێرانە پارەیەکی باشیدەدا، بەهۆی ئەو زانیارییانەی بازرگانە قاچاخچییەکان و فەرماندە و پێشمەرگەکانی (پەدەکە) دەیاندا بە بارەگا سەربازییەکانی تورکیا ببووە هۆکار کەلە نێوانیاندا پەیوەندییەکی باش دروست ببێت. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بە شێوەیەکی گشتی لە ناوچەی بادینان هیچ چالاکییەکیان ئەنجام نەدەدا، وەک ئەوە وابوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە نێوان ئەوان و رژێمی عێراقدا ئاگربەست هەبێت، جگەلەوەی جارناجارێک لەنێوان جاشەکانی هۆزەکان و پێشمەرگەکانی (پەدەکە) ئاڵۆزی دروست دەبوو هیچی تر روونەدەدا، ئەگەر تەقەیەکیش لە نێوان جاشەکان و پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ش بهاتایەتە ئاراوە زیاتر بۆ خۆقایمکردن بوو لە سەنگەردا، (لە **بادینان شەڕکردنیش بە پارە بوو**)، بۆنمونە کۆنترۆڵکردنی شوێنێک یان بۆ گرتنەوەی شوێنی بارەگایەک جاشەکان بە مقابیلی پارە شەڕیان بۆ رژێمی عێراق دەکرد، لەحاڵەتی وەرگرتنەوەی شوێنێک لە دەستی پێشمەرگە، جاشەکان پارەیان لە رژێمی عێراق وەردەگرت و پاشان لەگەڵ پێشمەرگە رێکدەکەوتن بەبێ تەقە ناوچەکە چۆڵبکەن و لەهەمبەر ئەم رێککەوتنە ئەو پارەیەی وەریان دەگرت نیوەیان دەدایەوە بە فەرماندەکانی پێشمەرگە.

سوپای عێراق لەبەرئەوەی سەرقاڵی شەڕی ئێران بوو پاراستنی سنوری تورکیای رادەستی جاشەکانی هەرێمی بادینان کردبوو، هەربۆیە عێراق ناچاربوو چاوپۆشی لەوجۆرە کارانەی جاشەکان بکات. کاروبار و شێوازی رێکخستنی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەوناوچەیە وەک کارەکانی جاشەکان وابوو، بۆ نمونە پێشمەرگەکان لەگەڵ خێزانەکانیاندا جەولەیان دەکرد، لەحاڵەتی هاتنە ئاراوەی تەنگاویدا فەرماندە و پێشمەرگەکان لەپێناو پاراستنی ژیانی خێزانەکانیان دەستبەرداری شۆڕش دەبوون و لە سنورەکانەوە هەڵدەهاتن بۆ تورکیا و ئێران. لەو ساڵانەدا لەو ناوچەیە جگە لە گەریلاکانی (پەکەکە) چەند گرووپێکی تری رێکخراوی باکوری هەبوون، ئەوانیش لە ئاکامی هاتنە ئاراوەی کودەتا سەربازییەکەی تورکیا هەڵهاتبوون، ئەمانەش پێکهاتبوون لە (ئاڵای رزگاری، رزگاریخوازانی نەتەوەیی کوردستان، رێگای ئازادی و کۆمەڵەی شۆڕشگێرانی کولتوری رۆژهەلات)، ئەندامانی ئەم رێکخراوانە بەناچاری لە ناوچەکە لەگەڵ پێشمەرگەکانی (پەدەکە) جەولەیان دەکرد، ئەگەر هەلیشیان بۆ برەخسایە هەموویان دەیانویست لەرێگای تاران و شامەوە بچن بۆ ئەوروپا، بەهۆی مەیلی چەپڕەوییانەوە زۆرینەیان مەیلیان بەلای (یەنەکە و حزبی شیوعی) دەچوو.

لە چوارچێوەی چەند سەد کیلۆمەترێک خاکدا بە هەزاران خێزان دەژیان، ئەمانیش کێشەیەکی زۆری سەرەکییان هەبوو، رژێمی عێراق ئابلوقەیەکی توندی خستبووە سەریان، بەرهەمە دەستکرد و بەرهەمە کوشتوکاڵییەکان بەتەواوەتی نەدەگەیشتە ناوچەی ژێر دەسەلاتی رژێمی عێراق و نەدەفرۆشران، پێداویستییەکانی وەک پەروەردە و تەندروستی و پێداویستییە کۆمەلایەتییەکان بوونیان نەبوو، ئەوەیشی هەبوو خۆجێی بوو بەواتایەک تەواوکەر نەبوون[٩]، بەگشتی ناوچەکە لەژێر بوارێکی سەخت و دژواردا بوو، ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی خەڵکانێکی زۆر خۆیان پێڕانەگیرێت و خۆیان رادەستی حکومەتی عێراق بکەنەوە، جموجۆڵی بەردەوامی سوپای تورک لە ناوچەکە و تۆپ بارانکردن و بێدەنگی بوونی (پەدەکە)ش لەهەمبەر ئەم رووداوانەدا بوونە هۆکار کە گوند چۆڵبکرێت و خەڵکیش لەهەمبەر (پەدەکە) هەڵوێست وەربگرن، بەم هۆیەیشەوە کاری قاچاخچێتی زۆر کز ببووەوە و زۆربەی قاچاخچییەکان ناچارمابوون بگوازنەوە بۆ ناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی رژێمی عێراق.

---

[٩] ٤ ئەیلولی ١٩٨٦ دیمانە لەگەڵ فەرماندەی لقی یەک (رەشید عارف) کوردستان پرێس.

سوپای تورک بۆئەوەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە سنورەکان دوور بکاتەوە هەوڵیاندەدا نەهێڵن پەیوەندییان لەگەڵ (پەدەکە) ببەستن، (پەدەکە)ش بەهۆی زەختی تورکیاوە بەڵێنیدابوو کە ناهێڵێت گەریلای (پەکەکە) لەسەر سنورەکان جێگیر ببن و ناشهێڵن بەئارەزووی خۆیان هاتوچۆ بکەن، بۆئەم مەبەستەش تەنانەت فەرماندەکانی ناوچەی (خواکورک و ئامێدییە)ی سەر بە (پەدەکە) چاویان بە فەرماندەکانی بارەگا سەربازییەکانی تورکیا کەتبوو، دەنگۆی ئەوە بڵاوببووەوە بەرپرسیارانی لقی یەکی (پەدەکە) بەشێوەیەکی جدییانە لەگەڵ فەرماندەکانی سوپای تورک کۆبونەوەیان ئەنجامداوە، لەهەمانکاتیشدا بەرپرسیارانی (پەدەکە) ئەم ئیدیعایەیان بەدرۆ نەدەخستەوە، بەڵام ئەوەیان بەرپەچدەدایەوە هۆکاری ئەم کۆبونەوانەیان (پەکەکە) بوبێت، کەچی بەرپرسیارانی (پەدەکە) دەیانوت هەوڵدەدەن بە خۆراک و پێداویستی گرنگی تر و فیشەک و چەک یارمەتی (پەکەکە) بدەن، بەڵام لەهەمانکاتدا هیچ یارمەتییەکی جدی گەریلاکانی (پەکەکە) یان نەدەکرد، بەهۆی نەبونییەوە جیاوازییەکی بەرچاوی ژیان هەبوو لەنێوان گەریلاکانی (پەکەکە) و پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە، پێشمەرگە لەناو لیفە و بەتانیدا دەنوستن و دۆشەکیان لەژێردابوو، لەدەریشەوە قەمسەڵەی چاکییان لەبەردەکرد و خواردنی چەوریان دەخوارد، بەڵام گەریلا خاوەنی هیچ لەوشتانە نەبوو، ئەوان برسی دەمانەوە و زۆرجاریش بە جلی پینەکراوەوە جەولەیان دەکرد[١٠].

هەموو ئەمانە بۆ (پەدەکە) پروپاگەندەی ئەوەی دەرەخساند بە ئاشکرا بڵێت (پەکەکە) توانای شەڕ و خەباتی نییە، لەو سەردەمەدا پارە ببووە هۆکاری دروستبوونی شەڕ، (پەدەکە) دەیویست ئەم هەلی شەڕانە بقوازێتەوە و هەوڵیدەدا کەسانی تێگەیشتو و رۆشنبیر و خێڵەکانی سەر سنوریش لە (پەکەکە) دوور بکاتەوە.

---

[١٠] سەرگوزەشتەی رۆژنامەوان ( سەربار چەلیک ).

## یەکەم هێرشی سوپای تورک بۆناو خاکی باشوری کوردستان

ئەوکاتەی دەوڵەتی تورک درکی کرد گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەرێمی (بۆتان) بەهێزن و جێگیر بوونە راستەوخۆ کەوتنە جوڵەوە، لەسەرەتای ساڵی (١٩٨٣) لە نێوان دەوڵەتی عێراق و تورکیا دژ بە بزاڤی کورد لەسەر (پاراستنی سنور و هاوکاریکردنی یەکتری)، لە نێوان خۆیاندا رێککەوتنێکیان واژۆکرد[١١]، بەگوێرەی ئەم رێککەوتنە هەردوولا بۆیان هەیە (١٠) کم بێنە ناو خاکی یەکترەوە و دژ بە چەکدارانی ئۆپۆزسیۆنی خۆیان ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدەن. سوپای عێراق ئەو سەردەمە لە باشوری عێراق خۆیان سەرقاڵی شەڕی ئێران کردبوو، بەگوێرەی ئەم رێککەوتنە سوپای تورک بۆی هەبوو بۆ ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن بێنە ناو خاکی باشوری کوردستانەوە، رژێمی عێراق بە رادەستکردنی ئاسایشی سنورەکان بە سوپای تورکیا خۆیان لە سەرئێشەیەک رزگار کردبوو، مەترسی هاوبەشی هەردوو وەلاتەکە گەشەکردنی بزاڤی رزگاری گەلی کورد بوو لە باشوری کوردستان، رژێمی عێراق ناوچەکانی بادینانی پێکۆنترۆڵ نەدەکرا، بێشک جاشەکانی هەرێمەکەش شەڕی راستەوخۆی پێشمەرگەیان نەدەکرد، بەهۆی خزمایەتییەوە پێشمەرگە و جاش دەستیان نەدەچووە خوێنی یەکتری، تەنانەت ئەو پارەیەی جاشەکان لە حکومەتی عێراقیان وەردەگرت بەشی پێشمەرگەشیان لێدەدا. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) دەستیان بۆ جاش نەدەبرد و تەمەنی پێشمەرگایەتی خۆیان درێژ دەکردەوە و جاشەکانیش لەسایەی ئەو پارەیەی وەریان دەگرت ژیانێکی خۆشیان دەبردەسەر، لەئاکامی ئەم ئاگربەستەی نێوان جاشەکان و پێشمەرگەکانی (پەدەکە) هەردوو حکومەتی عێراق و تورکیا ترسی لەدەستدانی کۆنترۆڵی نەوتی موسڵیان هەبوو، هەربۆیە هەردوولا درکیان بەوە کردبوو ئیتر کاتی لاوازکردنی هێزی پێشمەرگە هاتووە. بەگوێرەی رێککەوتنی نێوان هەردوو وەڵات ئەرکی پاراستنی ناوچەکان بە سوپای

---

[١١] ئەموزی ساڵی ١٩٨٣ ( سەرخوەبون )

تورکیا درابوو، ئەوەی راستی بێت دەوڵەتی تورک ترسێکی ئەوتۆیان لەبارەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە نەبوو، ئەوەی گرنگ بوو لەلای ئەوان ئەوەبوو بەشێوەیەکی جدی کۆنترۆڵێکی باشی ناوچەکە بکەن، بەرژەوەندی هاوبەش و گرنگی بۆرییە نەوتەکان ببوونە هۆکار کە تورکیا پاڵپشتی حکومەتی عێراق بکات، هەر ئەو هۆکارانەش بوو سیاسەتمەدارانی تورکیا لەبارەی ئێرانەوە بەشێوەیەکی روون بیروبۆچونی خۆیان نەهێننە زمان. بە رووخانی شا و هاتنی خومەینی بۆسەر دەسەڵات ئەمە ببووە کێشەیەکی جدی بۆ ئەمەریکا و ناتۆ، هەربۆیە ناتۆ و ئەمەریکا تورکیایان بە هاوپەیمانی عێراق هەژمار دەکرد[12] ، وەک ئاشکرایە هۆکاری رێککەوتنی نێوان عێراق و تورکیا بێشک بزاڤی رزگاری گەلی کورد بوو بەلام ئەم رێککەوتنە رژێمی ئێرانی نیگەران کردبوو، ئێران پێیانوابوو سەرقاڵ نەبوونی رژێمی عێراق بە پارتە کوردییەکان و سنورەکانەوە سوپای عێراق زیاتر بەهێزتر دەمایەوە.

لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٢) لەبارەی گەشەکردن و جموجۆڵەکانی گەریلاکانی (پەکەکە) وە (میت)ی تورک لە ناوچەکە کەوتە زانیاری کۆکردنەوە. سوپای عێراق لە ساڵی (١٩٨٣) بەدواوە تا دەهات لەهەمبەر شەڕی سوپای ئێران لاوزتر دەبوو، لەهەمانکاتدا سوپای تورکیش تا دەهات لە ناوچەکانی (ئولودەرە و چوکورجە) خۆیان جێگیر دەکرد، تیمەتایبەتەکانی سوپای تورک ئەچونە سەر خەڵکی گوندەکان و خەڵکیان بێزار دەکرد و ناحەقییان بەرامبەر بە خەڵک دەکرد. جارێکیان تیمێکی تایبەتی سوپای تورک ئەشکەنجەی خەڵکی ئاوایی (هێدریش) ی سەربە (ئولودەرە) دەکەن، خەڵکی ئەم ئاواییە خزمی هۆزی (سیندی)ن کەلە نزیک شاری (زاخۆ) دەژین کە سەرقاڵی قاچاخچێتین، ئەندامانی ئەم هۆزەش لایەنگری (پەدەکە)ن، سوپای تورک لەژێرناوی گەڕان بەدوای چەکی قاچاخدا لەناوچەکە ئۆپەراسیۆن ئەنجام دەدەن، پێش هاتنی جەندرمە بۆ گوندەکە هەرچی گەنجە گوندەکە چۆڵدەکەن و تەنها ژن و منداڵ و پەککەوتە دەمێننەوە، دوای پشکنین و نەدۆزینەوەی هیچ شتێک جەندرمەکان لەداخاندا خەڵکەکەیان رووت کردبووە و ئەشکەنجەیان کردبوون، ئەمەش نارەزاییەکی زۆری لێکەوتەوە، لە (١٠) ی مانگی ئادار دوای ئەوەی گەنجەکانی

---

[12] عێراق لە شەڕەکانی ساڵی (١٩٨٣) بەرامبەر بە سوپای ئێران زۆر لاواز ببوو، هەرلەبەر ئەم هۆکارەیەش بوو ئەمەریکا و رووسیا و وەڵاتانی ئەورووپا دەستیانکرد بە هاوکاریکردنی زیاتری حکومەتی عێراق، رووسیا کە هەمیشە پاڵپشت و یاریدەدەری عێراق بوو بەهۆی نزیک بونەوەی عێراق لە ئەمەریکاوە خۆی لە عێراق بە دوور گرت و رووی خۆی بەلای ئێراندا وەرگێڕا.

ئاوایی گرددەبنەوە پەلاماری جەندرمە ئەدەن و لە ئاکامدا (٣) جەندرمە دەکوژرێت، ئەمە بوو بە هۆکار و بەهانە بۆ دەوڵەتی تورک ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدەن و لە (٢٥)ی ئادار سوپای دەوڵەتی تورک چوونە ناو خاکی بادینانەوە[١٣].

سوپای تورک بە (٥) هەزار جەندرمەوە لە (ئولودەرە)وە هاتنە بادینانەوە و لەهەمانکاتیشدا هێزێکی سوپای عێراق کەبۆ پاسەوانی نەوت و بۆرییەکانی موسڵ جێگیرکرابوون ئەوانیش هێرشیان ئەنجامدا، بەمشێوەیە باکوری هەرێمی بادینان سوپای تورک و باشورەکەیشی لەلایەن سوپای عێراقەوە گیردرا، بەو شێوەیە یەکەم هەنگاوی پراکتیکی رێککەوتنی نێوان هەردوو وەڵاتیاننا، لەم هێرشە دوولایەنە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) زیانیان بەرکەوت و لەیەکێک لە پێکدادانەکانیشدا جەندرمەیەکی تورک و گوندنشینێک کوژران و بە دەیان کەسیش بریندار بوون، بەهۆی ئەم هێرشەوە گوندێکی زۆری سنورەکە چۆڵکران، دانیشتوانی گوندەکانیش ناچارمان بگوازنەوە بۆ شار. سەرکردایەتی (پەدەکە) لەهەمبەر ئەم هێرشەی سوپای تورک نارەزاییەکی توندیان دەربڕی، یەکێک لە دێرەکانی لێدوانەکەی (پەدەکە) بەمشێوەیە بوو **(لەئاکامی لاوازی و بەزینی سوپای عێراق بەرامبەر بە ئێران، حکومەتی عێراق ناچارماوە تورکیا بە کرێ بگرێت، ئامانجی حکومەتی عێراق ئەوەیە دەوڵەتی تورک بدەن بە گژی ئێمەدا و ئەمەش پیلانێکی گشتییە دژ بە بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردستان)**[١٤] .

سەرەڕای ئەم لێدوانە توندەی (پەدەکە) کەچی تادەهات سوپای تورک دەهاتنە پێشەوە و پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ش بەبێ هیچ بەرگرییەک پەیتا.. پەیتا پاشەکشێیان دەکرد، بەگوێرەی سەرکردایەتی (پەدەکە) بڕیاردان بۆشەڕکردن لە دژی تورکیا دەبێت (بەرەی جود) بڕیاری لەسەربدات، بەڵام (پەدەکە) لەناو (بەرەی جود)دا خاوەن بڕیاری یەکەم و موتڵەق بوو، سەرەڕای ئەوەی (پەدەکە) ناوی تورکیای بە (کرێگیراو) ناوزەند دەکرد بەڵام لەهەمبەر تورکیا هیچ کاردانەوەیەک و بەرگرییەکی نەبوو. لەساڵی ١٩٨٣ بۆ ١٩٨٤ دکتۆر (جرگیس

---

[١٣] ٢٦ی مانگی گوڵان ١٩٨٤ ( حورەییەتی تورکی)

[١٤] ١٩٩٣ ( سەرخوەبون )

قادر جەباری)[١٥] کە ئەودەمە بەرپرسی لقی یەکی (پەدەکە) بوو لەمبارەیەوە دەیووت (**بڕیاری پاشەکشێی پێشمەرگەکانمان لە سەرکردایەتییەوە هاتووە، هەرکێیەک بەرامبەر بە سوپای تورک تەقە بکات وەکو ئەوەوایە خیانەتی لە میللەتی کورد کردبێت**).[١٦]

لەهەمبەر ئەم گۆڕانکارییانە دژ بە سوپای تورک (پەکەکە) پێشنیاری بەرخودان و بەرگریکردنی دەکرد بەڵام (پەدەکە) لەئاست ئەم پێشنیارەی (پەکەکە) خۆی لە گێلیدەدا، ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە ئەو ڕۆژەی سوپای تورک هێرشی بۆ بادینان ئەنجامدا ئەو ڕۆژەبوو کە گرووپێک لە گەریلاکانی (پەکەکە) بۆ ئەنجامدانی چالاکی پەڕیبوونەوە بۆ هەرێمی (بۆتان)، ئەودەمە (پەکەکە) هێزێکی ئەوتۆی گەریلای نەبوو کەبتوانن ڕووبەڕوی سوپای تورک ببنەوە، (پەدەکە) بۆماوەیەک پێشمەرگەکانی خۆی لە ناوچە سنورییەکان کشانەوە، ئەم کشانەوەیە لە ناوچە سنورییەکاندا هەلێک و دەرفەتێکی باشی بە گەریلاکانی (پەکەکە) بەخشی کە بتوانن بە ئارەزووی خۆیان لەناوچەکە جێگیرببن و جەولە بکەن و هەروەها کۆتایی بەو کێشانەیشی دەهێنا کە جارناجارێک لە نێوان فەرماندەی گەریلا و پێشمەرگەدا ڕوویاندەدا.

ئەو زوڵم و ناڕەحەتی و ئەشکەنجانەی جەندرمەی سوپای تورک لە خەڵکی گوندەکانیان دەکرد و بێدەنگی و بێ هەڵوێستی و بێ بەرگریکردنی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەهەمبەر ئەم ڕەوشەدا بوونە هۆکار کە گەریلاکانی پەکەکە پروپاگەندەیەکی باش بۆ خۆیان بکەن و بەمشێوەیە توانییان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە ئاشنایەتییەکی باشیش پەیدا بکەن، دەتوانین بڵێین تاماوەیەک (پەدەکە) لە ناوچەکە کاریگەری نەما و جگە لە (پەدەکە) چەند ڕێکخراو و پارتە باکورییەکانی تریشی وەک (کوک، ئاڵای ڕزگاری) ناوچەکانیان چۆڵکرد.

---

[١٥] دکتۆر جرگیس ئەندامی عەشیرەتی دوسکییە، لە مۆسکۆ لە زمانی کوردیدا دکتۆرای تەواو کردووە، ئەوکاتە لەناو (پەدەکە)دا بە لایەنگری (سامی عەبدولرەحمان) دەناسرا، هەروەها زۆر گرنگی دەدا بە پەیوەندیکردن لەگەڵ حزبی شیوعیدا، جرگیس ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) و یەکێکە لەو کەسانەی کەلەناو بزاڤی باشوری کوردستان خاوەن مێژووە، ئەو سەردەمە سەرۆکی لقی ١ی (پەدەکە) بوو هەروەها لە دهۆک و موسڵ و زاخۆ بەردەوام لەگەڵ تورکیا پەیوەندی باشی هەبووە و بەردەوامیش خۆی لە (پەکەکە) بەدوور گرتووە.

[١٦] سەرگوزەشتەی ڕۆژنامەوان ( سەردار چەلیک )

## رێککەوتنی نێوان (پەکەکە و پەدەکە)

ئەوکاتەی شەڕی ناوخۆی پارتەکانی باشور بەردەوام بوو، دوابەدوای سەختبوونی شەڕی نێوان عێراق و ئێران (پەکەکە و پەدەکە) لەنێوان خۆیاندا لە مانگی تەموزی ساڵی (١٩٨٣) پرۆتۆکوڵێکیان واژۆکرد، دەوڵەتی تورک بەنیازبوون بە چونیان بۆ بادینان هەموو باشوری کوردستان داگیربکەن، ئەمە بەمانای بەهێزبوونی سوپای عێراق دەهات، ئەم پێشهاتەیە ئێران و (پەدەکە)یشی نیگەران کردبوو، ئەم هێرشانەی تورکیا بۆسەر ناوچەکە ترسی خستبووە دڵی (پەدەکە)وە و وای لە سەرکردایەتی (پەدەکە)کرد ئەگەر بۆماوەیەکی کاتیش بێت خۆی لە (پەکەکە) نزیک بکاتەوە.

بەهۆی چەند رەوشێکی تایبەتییەوە تاڕادەیەک ئەم پرۆتۆکوڵە پێویست بوو، رێککەوتن لەگەڵ (پەکەکە) هۆکاری خۆی هەبوو کە (پەدەکە)ی ناچارکردبوو ئەمە بکات، هۆیەکەیشی ئەوەبوو هەتا پێش ئەنجامدانی کودەتای سەربازی لە تورکیا (پەدەکە) لەگەڵ چەندین پارت و رێکخراوی باکوری کوردستان پەیوەندییان هەبوو بەڵام ئێستا هیچ لەم پارت و رێکخراوانە بوونیان نەمابوو، بەمشێوەیە تەنها (پەکەکە) لە گۆڕەپانەکەدا مابووەوە، کادێر و رێبەرەکانی (پارتی دیموکراتی کوردستانی تورکیا) بڵاویان لێکردبوو، تەنانەت چەندینیشیان گیرابوون یاخود چوبوون بۆ ئەوروپا، پارت و رێکخراوەکانی تریش بەهیچ شێوەیەک لە گۆڕەپانەکەدا بونیان نەمابوو، زۆرینەیەک لە ئەندامانی ئەم رێکخراوانە هاتبوونە باشور و مەیلایان بەلای حزبی شیوعیدا هەبوو، هەربۆیە دەتوانین بڵێین (پەدەکە) لە باکوری کوردستان جگە لە (پەکەکە) کەسێکی تری دەست نەدەکەوت کە خۆی لێنزیک بکاتەوە و رێککەوتنی کاتی لەگەڵدا بکات. هەتا ئەم ساتەوەختە (پەدەکە) بەشێوەیەکی راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ (پەکەکە)دا

نەبوو، لەم هەلومەرجەدا (پەکەکە) لە ناوچەکانی بادینان و ناوچەکانی تر بۆ شەڕی چەکداری سەرقاڵی خۆئامادەکردن بوو، (پەکەکە) پەیوەندییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ ئەو پارت و ڕێکخراوە باکوریانەی کە هانایان بۆ باشوری کوردستان هێنابوو، (پەکەکە) دەیویست لەناوچەکەدا پەیوەندییەکی تۆکمە و دۆستانە و برایانە ببەستێت بەڵام (پەدەکە) بەشێوەیەکی ژیرانە دەیویست ئەم نییەتەی (پەکەکە) بقوازێتەوە تاکو بتوانێت لەسایەیدا خۆی لە دەوڵەتی تورک نزیک بکاتەوە. کۆمەڵێک هۆکار هەبوون کە ڕێخۆشکەربوون (پەدەکە) لە (بەرە)ی شۆرشگێڕیدا ببینرێت، هاوپەیمانێتی (پەدەکە) لەگەڵ ئێرانێکی دژ بە ئیمپریالیزم و دژ بە عێراقێکی لایەنگری ئەمەریکا و ئەورووپا و لەپەنای ئێراندا بۆ تۆڵەسەندنەوەی هەرەسی ساڵی (١٩٧٥) پاڵپشتی کردنی رژێمی نوێی ئێران و مەیلنیشاندان بەلای رووسیادا ئەوەیان نیشاندەدا کە گوایە (پەدەکە) پارتێکی ئانتی ئیمپریالیزمە[١٧]، هەربۆیە بەهۆی گۆڕانکارییە ئیقلیمییەکەوە دەبوایە (پەدەکە) خۆی لە (پەکەکە) نزیک بکردایەتەوە.

(پەدەکە) بە حزبێکی خێڵەکی و کۆنەپەرست ناوزەند دەکرێت، ڕێککەوتنیان لەگەڵ (پەکەکە) پێدەچێت تاکتیکێکی کاتی بوبێت، بەهاتنی پارت و ڕێکخراوە جیاوازەکانی پارچەکانی تری کوردستان بۆ شام و بەیروت لە نێوان ئەمانە و (پەدەکە)دا پەیوەندی هاتبووە ئاراوە، خەبات و بەرخودانی خەڵکی فەلەستین و شەپۆلی شۆرشگێڕێتی رۆژهەڵاتی ناوین هەموو ئەمانە هۆکاربوون کەوا لە پارتە کوردییەکان بکات لەیەک نزیک ببنەوە. پارت و ڕێکخراوەکانی باشوری کوردستان لەگەڵ شۆڕشی فەلەستین و رژێمی سوریا پەیوەندییان هەبوو. لە ساڵی (١٩٦٠) رژێمی سوریا ئەو هاوکارییە مادی و چەکدارییەی بڕی کە دەیدا بە بەعسییەکانی عێراق کە تەنانەت بەرامبەر بە کوردیش بەکاریان دەهێنا، رژێمی سوریا لەکاتی شەڕی نێوان عێراق و ئێراندا لایەنگری ئێران بوو، هەموو ئەو دەوڵەتانەی دژ بە رژێمی سەدام بوون پەیوەندی خۆیان لەگەڵ کوردی باشور باشدەکرد، رژێمی شام لەگەڵ دەسەڵاتی ئەنقەرە کێشەیەکی قوڵی هەبوو، لەکاتی دژایەتیکردن و ململانێی نێوان وەڵاتانی عەرەب و ئەمەریکا، تورکیا ببوو بە لایەنگری ئەمەریکا، تورکیا لایەنگر و پشتگیری (ئیخوانی موسلمین) یان دەکرد کە دژ بە سوریا بوون و لەهەمانکاتیشدا بەردەوام تورکیا ئاوی رووباری فوراتی وەک کارتێکی فشار بەرامبەر بە سوریا بەکار دەهێنا. ئەم کێشانە ببوونە هۆکار رژێمی

---

[١٧] نامەی ( مەلا مستەفا) بۆ ( کیسسینگەر) ٢٨ی ئەیلولی ١٩٧٧ رۆژنامەی (ئوزگورلوک یۆلو)

سوریا چاوپۆشی لە پەرینەوەی شۆڕشگێرەکانی باکوری کوردستان و تورکیا بکات بۆ سوریا، دوای ئەنجامدانی کودەتا سەربازییەکەی تورکیا، شام لە رووی شۆڕشگێرەکانی کورد و تورکدا وەک بەیروتی لێهاتبوو، شام وەکو قەلایەکی تۆکمەی شوێنی شۆڕشگێری لێهاتبوو، هەروەها لایەنگران و کادێرە فەلەستینییەکانیش سوریایان کردبوو بە لانکەی خۆیان.

دەوڵەتی تورک لەهەمبەر ئەم کارانەی دەوڵەتی سوریا نیگەران و نارەحەت ببوو، تورکیا جارناجارێک لەرێی تیمی تایبەتی خۆیانەوە لەناو خاکی سوریا دژ بە شۆڕشگێرانی کوردی باکور ئۆپەراسیۆنیان ئەنجام دەدا، یەکێک لەو ئۆپەراسیۆنانە لەهەمبەر گرووپێکی سەر بە پارتی (کاوە) کرا، گرووپێک لە ئەندامانی (کاوە) لە ساڵی (١٩٨١) لە ماڵێک لە گوندی (چیرنکەی) ی سەربە (قامیشلو) دەمێننەوە و تیمی تایبەتی سەر بە دەوڵەتی تورک هێرشیان بۆدەهێنن و لەئاکامدا (٦) ئەندامیان دەکوژرێت لەگەڵ (٣) منداڵی خاوەن ماڵەکە[١٨]، زیادبوونی ژمارەی شۆڕشگێرانی کورد و تورک لە سوریا دەوڵەتی تورکی نارەحەت کردبوو، هەربۆ ئەم مەبەستەش وەزیری دەرەوەی ئەوسای تورکیا (ئیلتەر تورکمان) لەگەڵ سوریا دەستیکرد بە کاری دیبلۆماسی و لەهەمانکاتیشدا میتی تورک لەبارەی کارە سیاسییەکانی کورد و تورک و ئەرمەنییەکانی سەر بە تورکیا کەوتنە زانیاری کۆکردنەوە و ئەنجامدانی چالاکیش، لەولاشەوە (پەکەکە) لە باشوری کوردستان بۆ دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ پارت و رێکخراوەکانی تردا سەرقاڵی کاروخەبات بوو، (پەکەکە) بەنیازی دەستپێکردنی خەباتی چەکداری بوو هەربۆیە پێویستی بە پشتگیری و لایەنگر و دۆست هەبوو بۆ ئەم مەبەستەش بیریان لە هەرێمی بادینان کردبووە چونکە ئێرە گرنگی و تایبەتمەندی خۆی هەبوو، بەگوێرەی (پەکەکە) پێویستی دەکرد دەروازەی هەرێمی (بۆتان) لە (بادینان)ەوە بکرێتەوە. بۆماوەیەک گەریلاکانی (پەکەکە) لەم ناوچەیەدا جێگیربوون، دوای ئەوەی ئەزمونی زیاتریان بەدەست خست بە ناوچەکانی تردا بڵاوەیان کرد، ئەو سەردەمەش ناوچەی بادینان لەژێر کۆنترۆڵی (پەدەکە)دا بوو، هەربۆیە ئەم رێککەوتنەی نێوان (پەکەکە و پەدەکە) لەسەر بناغەی بەرژەوەندی بوو، لەئاکامی دانوساندنەکاندا سەرۆکی پارتی کرێکارانی کوردستان

---

[١٨] کانونی یەکەم ١٩٨٦ ( کوردستان پرێس )

(عەبدوللە ئۆجالان) و سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق (مەسعود بارزانی) لە شام پرۆتۆکۆڵێکی (١١) خاڵییان واژۆکرد.

## پرۆتۆکۆلی نێوان (پەکەکە و پەدەکە)

## (بەرەی تێکۆشانی رزگاری نەتەوەیی کوردستان)

**مادەکان:**

١/ دەبێت لەهەمبەر هێزە ئیمپریالیزمەکان بوەستینەوە کە ئەمەریکا پێشەوایەتییان دەکات و بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە ئەم بەرەیە وەک هێزی سەرەکی هەژمار بکرێت و بۆ پەرەپێدانی ئەم خەباتەش تێکۆشانمان چڕ دەکەینەوە، هەروەها دەبێت روبەڕوی ئەو چەمک و هزرانەش بوەستینەوە کە مەیلدارن و دەیانەوێت لەگەڵ هێزە ئیمپریالیزمەکاندا پەیوەندی ببەستن، هەروەها دەبێت ئەم چەمکانە ناوزەند بکرێن و دەبێت لەناوچەکەدا لەهەمبەر پیلان و گەلەکۆمەی ئیمپریالیزم خەبات بکەین.

٢/ دەبێت ئەم بەرەیە بەچاوی هێزی رزگارکەر لە هێزە شۆڕشگێڕەکانی جیهان بڕوانێت و خۆیشی بە پارچەیەک لە بزووتنەوەی چینایەتی هەژمار بکات و بۆ ئەم مەبەستەش پەرەبە پەیوەندی گونجاو بدات و رێککەوتن لەگەڵ ئەو هێزانە بە بنەما بگرێت.

٣/ ئەمەریکا کە پێشەوایەتی وەڵاتانی ئیمپریالیزم دەکات لەلایەکەوە شەڕ لە هەرێمەکە بەرپا دەکات و لەلایەکی تریشەوە پەنجە دەخاتە ناو کاروباری وەڵاتە سۆسیالیستەکانەوە و لەهەمانکاتیشدا هەڕەشەی داگیرکردنی ئەو وەڵاتانە دەکات کە دژبەری ئیمپریالیزمن و بۆ رووخانی دەسەڵاتە پێشکەوتوو رادیکالەکانیش پیلان دادەڕێژێت و گەلەکۆمە ئەنجام دەدات و بۆ نەهێشتنیشیان سەرقاڵی رێکخستنی شەڕێکی گەورەی جیهانییە کە دەیانەوێت بۆمبی ئۆتۆمیشی تێیدا بەکار بهێنن کەئەمە دەبێتە هۆکاری لەناوچونی هەموو مرۆڤایەتی، هەربۆیە

دەبێت دژ بە سیاسەتی شەڕەنگێزانەی جیهانی ئیمپریالیزم بوەستینەوە و دەبێت لایەنگری وەڵاتانی دژبەری سیستەمی ئیمپریالیزم و چینی کرێکار بین و بۆ بونیادنانی دیموکراسی و بەرقەرارکردنی ئاشتی لە جیهاندا پێویستە تێبکۆشین.

٤/ پێویستە لەهەمبەر رژێمەکانی تورکیا و عێراق بجەنگین کە دوژمنی گەلانی ناوچەکە و ئەم بەرەیە و سەرکردایەتییەکانیشیانن و لەهەمانکاتیشدا دەبێت لەهەمبەر کۆنەپەرستی ناوچەکە و لەهەمبەر ئیمپریالیزمیش تێبکۆشین و هەروەها ئەم بەرەیە دەبێت خۆی بە پارچەیەک لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕ و وەڵاتپارێزانی هەرێمەکە بزانێت و بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە پەیوەندی و رێککەوتن لەگەڵ هێزی رزگاری فەلەستین و هەموو هێزە شۆڕشگێڕ و پێشکەوتوخوازەکانی هەرێمەکە ببەستێت.

٥/ پێویستە لەهەمبەر کۆنەپەرستییەتی هەرێمەکە و ئیمپریالیزم تێکۆشان بکرێت، هەروەها پێویستە پەیوەندیی و هەماهەنگییەکی وابێتە ئاراوە کەلە هەرێمەکە نەبێتە مایەی ناکۆکی نێوان دەسەڵاتە پێشکەوتوخوازەکانی هەرێمەکە و خودی ئەم بەرەیەش .

٦/ لە بنەڕەتدا پێویستە هێزی زاتی گەلی کوردستان بۆ بەرژەوەندییەکانمان و رێککەوتن و پێشخستنی بەرەکە بە بنەما بگیردرێت.

٧/ لەهەربەشێک کە ئەم بەرەیەی لێبوو بە پشتبەستن بە گەل و ئەو پارچەیەی لێیەتی گەشە بەخۆی ئەدات و ئەو چینی زەحمەتکێش و ئەو پرولیتا نەتەوەییەی لەژێر حاکیمییەتییاندا دەژین دەبێت خەباتی ستراتیژی دیموکراسیانە لەئاستیاندا رچاوبکرێت و وەلەسەر بناغەی ئەم چەمکەدا پەیوەندی و رێککەوتن و بەرە پێکبهێنرێت و بۆئەم مەبەستەش چالاکانە خەبات بکرێت.

٨/ ئەوەی گرنگە ئەوەیە هەر رێکخراو و پارتێک لە پارچەکەی خۆیدا کاروخەبات بکات و لە پارچەکانی تر هێز و گرووپی پابەند بەخۆی پێکنەهێنێت و دەبێت لە نێوان هێزەکانی (رزگاری نەتەوەیی ) هەموو پارچەکان پەیوەندی پتەو و رێککەوتن بە بنەما بگیردرێت و ئەم بەرەیە لە نێوان خۆیاندا لە ئاستی بەرز کۆبونەوە ئەنجام بدەن بۆئەوەی بڕیارە پێویستەکان بدەن، لەحاڵەتی ئەم کۆبونەوانەشدا بەشداری بە هێزە وەڵاتپارێزەکانی تر بکرێت و بۆ ئەم مەبەستەش کاروخەباتی گونجاو ئەنجام بدرێت و هەروەها دەبێت هیچ پەیوەندی و رێککەوتنێک لەگەڵ دوژمن ئەنجام نەدرێت کە زیان بە گەلی کوردستان دەگەهێنێت.

٩/ لەحاڵەتی هاتنەئاراوەی کێشمەکێشی ئایدۆلۆژیدا کە دەبێتەمایەی تێکچونی پەیوەندییەکانی نێوان پارت و ڕێکخراوەکانی کوردستان کەئەمەش بە قازانجی دوژمن دەشکێتەوە، پێویستە پابەندبین بە چەمکی خەبات و یەکڕیزی تێکۆشانەکانمان، هەروەها لەحاڵەتی هاتنەئاراوەی کێشە و ئەو کێشانەیشی لە رابوردودا هەبوونە لە نێوان پارت و ڕێکخراوەکاندا نابێت لەم حاڵەتانەدا پەنا بۆ چەک ببرێت و دەبێت کێشەکان لەسەر بنەمای دیدار و بەرژەوەندی باڵای گەل چارەسەر بکرێن.

١٠/ پێویستە موداخەلە لە کاروباری ناوخۆی هیچ پارتێک نەکرێت و دەبێت خۆمان بەدووربگرین لە هەڵسوکەوتی تێکدەرانەی ناو یەکڕیزی پارتەکان و هەروەها دەبێت ڕێز لە ئایدۆلۆژیا و سیاسەت و سەربەخۆیی کاری ڕێکخستنی پارتەکان بگیردرێت.

١١/ لەحاڵەتی بە پراکتیزەکردنی مادەکانی سەرەوە لەکاتی هاتنە ئاراوەی هەڵەدا دەبێت هەردوولا بۆ ئەنجامدانی ئەرکی بەرپرسیارێتی سەرشانیان و بۆ وەبیرهێنانەوەی پابەندبوونیان ووشیار بکرێنەوە، ئەگەر ئەم ووشیارکردنەوەیە بە جدی حیسابی بۆنەکرا لەو حاڵەتەدا هەردوولا لەبارەی کاروخەباتی یەکلایەنەی خۆیانەوە سەربەست و ئازادن.

**ئازادی بۆ گەلی کورد**

## مەسعود بارزانی (پەکەکە شۆڕشگێڕ و برایە)

لەکاتی جموجۆڵی سەربازی سوپای تورک لەسەر سنورەکانی باشوری کوردستان، ئۆرگانی سیاسی (پەکەکە) بەناوی (سەرخوەبوون)، دیمانەیەکیان لەگەڵ (مەسعود بارزانی) سازکرد، (مەسعود بارزانی) سەبارەت بە دەوڵەتی تورک دەیوت (**دەوڵەتێکی فاشیستە و لە هەرێمەکەدا باوەڕپێکراوترین وەلاتانی ئیمپریالیزمە**)، هەروەها دەیوت (**ئەگەر دەوڵەتی تورک لەپێناو بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی عێراق روبەڕوی گەلی کورد ببێتەوە شەڕیان لەگەڵ دەکەین**)، لەم دیمانەیەدا (مەسعود بارزانی) دەیوت (**بەرەی جود ئامادەیە هاوکاری و پشتگیری هەموو لایەنێک بکات کە روبەڕوی دەوڵەتی تورک بوونەتەوە**)، لەبارەی (پەکەکە)یشەوە (مەسعود بارزانی) دەیوت (**پەکەکە شۆڕشگێر و برایە و پارتێکی دۆستە**)[١٩]

بەلام ئەم قسانەی (مەسعود بارزانی) لە ناوچەی بادینان لەگەڵ رفتاریان بەرامبەر بە (پەکەکە) نەدەگونجا، بەرپرسیارانی (پەکەکە) دەیانوت پێشمەرگە و کادیرەکانی (پەدەکە) هاوکاری و پشتگیری ئەو کەسانە دەکەن کە دەیانەوێت لەناو (پەکەکە) ئاژاوەگێڕی بکەن و کێشە دروست بکەن، لەمبارەیەوە دەیانوت (**حزبی شیوعی راستەوخۆ لایەنگر و پاڵپشتی ئەو چالاکییانە دەکات کە بۆ وروژان و تێکدانی ریزەکانمان ئەنجام دەدرێن، پەدەکەش ئەم حزبە دەپارێزێت و لەلایەکی تریشەوە دژمان هانیان دەدەن، لە ساڵی ١٩٨٣ کاتێک بزوتنەوەکەمان کاروخەباتیان دەکرد بۆ فراوانکردنەوەی تێکۆشانی رزگاری نەتەوەیی لە**

---

[١٩] حوزەیرانی ١٩٨٣ ( سەرخوەبون )

ناوەوە و لە دەرەوەی وەڵات روبەرِوی هێرش بوینەوە و ئامانجی سەرەکییان پارچەکردنی ریزەکانمان و بڵاوەپێکردنی بزوتنەوەکەمان بوو، ئێمە دوای ماندوبونێکی زۆر کادێر پەروەردە دەکەین تاکو بیاننێرینەوە بۆ وەڵات و دەست بکەن بە خەباتی چەکداری و چارەنوسی میللەتەکەمان بگۆرِن کەچی بەوجۆرە کارە قێزەوەنانە دەیانەوێت فریویان بدەن، لەئاکامدا ئەوجۆرە کەسانە کە لەهەمبەر پارتەکەمان مەرامەکانیان بەدینەهاتووە پەنایان بردووە بۆ حزبی شیوعی و پەدەکە، ئەوانەی ئەمجۆرە کارانەیان ئەنجامداوە تاکو سەرۆکایەتیمان و پارتەکەمان لەکەدار بکەن وەک پاداشت رەوانەی ئەوروپا دەکرێن)، (پەدەکە) زۆر وورياىانە ئەم جۆرە کارانەيان ئەنجام دەدا، ئەگەر بە وتنيش بيت رێککەوتنێکی لەگەڵ (پەکەکە) واژۆکردبوو، هەربۆيە ئەوجۆرە کەسانەی بۆ ئەمجۆرە کارانە رادەسپێردران بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە دوای تەواوبوونی کارەکانیان بۆئەوەی کەس درک بە (پەدەکە) نەکات رەوانەی ناو حزبی شيوعييان دەکردن[٢٠].

---

[٢٠] گێرانەوەی ( جەمیل بایک ).

## ١٥ی ئابی ١٩٨٤ و جیابونەوە لە رێگای پەدەکە

پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) لە ١٥ی ئابی ساڵی (١٩٨٤) یەکەم فیشەکی خۆی لە رووی بارەگا سەربازییەکانی (سیرت، روحە، هەککاری و شەمزینان) تەقاند و شەڕی مێژووی نەتەوەیی خۆی راگەیاند، دوای ئەنجامدانی ئەم چالاکییە و دەنگدانەوەی شەڕوپێکدادانەکان دوای ماوەیەکی دووروودرێژ سەرلەنوێ کێشەی کورد کەوتە رۆژەڤی تورکیاوە. کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول بە شێوەیەکی زۆر فاشیستانە دژ بە گەلی کورد بەکارهێنرا، لەناو زیندانەکان بەتایبەتی زیندانی شاری (ئامەد) کەسانێکی زۆریان کوشت و ئەشکەنجەکرد، ئەمە جگە لە دەرەوەی زیندانیش کەسانێکی زۆری چالاکوان و کادێر و لایەنگرانی (پەکەکە)یان کوشت و دەستگیر کرد، رەنگدانەوەی رەنگی تۆخی کودەتا سەربازییەکە بە شێوەیەکی دڕندانە و بێ بەزەییانە و نەبوونی هیچ بەرەنگاربوونەوەیەکیش لە تابلۆی وەلاتێک دەچوو کە خۆڵی مردویان بەسەردا کێشابێت، دڕندایەتی گەیشتبووە ئاستێک بچوکترین جولانەوەش بە فیشک وەلام دەدرایەوە، لەئاکامی ئەم کودەتایەدا ژەنراڵەکان خاوەن بڕیاری موتڵەق بوون و جڵەوی دەسەلات بەدەست ئەوانەوەبوو، بچوکترین جولانەوەی ریکخراوەیی و پیشەیی و سیاسی دەبووە مایەی تورەبونیان و بە دژوارترین شێوە بەرەنگاری دەبونەوە و دەمکوتیان دەکردن، ئەم دڕندەییە ببووە مایەی چاو ترساندنی هەموو خەڵکی تورکیا، هەربۆیە چەند ریکخراوێکی کورد چوون بۆ ئەورووپا و لەوێدا لەگەڵ چەپی تورکدا یەکیان گرت و (یەکێتی چەپ)یان پێکهێنا، لەهەمانکاتیشدا رەخنەی ئەم کارەی خۆشیان دەکرد کە نەبادا ئەم یەکگرتن و یەکێتییەی پێکیانهێناوە ببێتە هۆکار بۆ دوورکەوتنەوەیان  و نەگەڕانەوەیان بۆ تورکیا و لە ئەورووپاش ببنە هۆکاری

ئەوەی تورکیا لە چاو ئەوروپا ناشرین بکەن و تورکیا لە دیموکراتی بوون دوور بخەنەوە. بەگوێرەی ئەوان بوونی (پەکەکە) لە گۆڕەپانەکەدا دەبێتە ڕێخۆشکەر کە تورکیا لە باشوری کوردستان ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدات، ئەوەی مایەی سەرنج بوو ئەم بۆچونەی خۆیان بەدەنگێکی بەرز نەدەهێنایە زمان و هەروەها بەشێک لە پارتە باشورییەکانیش لایەنگری ئەم بۆچونە بوون، هەموویان هاوبیربوون دەوڵەتی تورک فاشیست و دیکتاتورە، بکوژی مرۆڤایەتی و وەلاتێکی نادیموکراتە، باشە ئەی بۆچی ڕەخنەی خەباتی ڕەوای چەکداری (پەکەکە) یان دەکرد ؟ [21]، (پەکەکە)ش بەمشێوەیە وەلامی ئەوانی ئەدایەوە **(بەگوێرەی ئەوانەی پێیانوایە هەوڵی سۆسیال بەناو دیموکراتە بورژواکانی تورک کە کەسانی وەک ( بولاند ئەجەوید و ئەردال ئینینو) پێشەوایەتییان دەکەن گوایە بەشێوەیەکی قانونی چارەسەری کێشەی کورد دەکەن کە خودی خۆیان لەژێر چەپۆک و چەکوشی بەزەبی ژەنراڵەکاندان، ئەمە چاوەڕوانییەکی بێمانا و نا لۆژیکە، لەبارەی باشوری کوردستانیشەوە ڕەوشی پارتەکانیان لەبەرچاوە کە لەناو یەکدا تەبانین و شەڕی یەکدەکەن و توانای بەرگریشیان نییە و پابەندبونیان بە هێزە دەرەکییە بێ کەڵکەکان هەموو ئەمانە دەبنە هۆکار کە سوپای تورک بێخەمانە هێرشی باشور بکات، هەربۆیە دەڵێن هێرشی سوپای تورک بۆ باشور پەکەکە هۆکار نییە بەڵکو ڕێگرێکی جدیشە)** [22].

(پەدەکە) و هەموو پارتەکانی تری باشور لەئاستی ئەم چالاکییەی (پەکەکە) کەلە ١٥ی ئاب ئەنجامیاندابوو سەرسام ببوون، (پەکەکە) بەبێ ئەوەی کەس ئاگەدار بکاتەوە و هاوکاریش بخوازێت ئەم چالاکییەی ئەنجام دابوو، کەس چاوەڕێی چالاکییەکی لەو جۆرەی نەدەکرد. ڕێککەوتنەکەی نێوان (پەکەکە و پەدەکە) ئیدامەی هەبوو، بەگوێرەی ئەم ڕێککەوتنە دەبوایە (پەدەکە) هاوکاری (پەکەکە)ی بکردایە. لە هەمانساڵدا لە مانگی تشرینی یەکەم (مەسعود بارزانی) لە شام چاوی بە عەبدوللە ئۆجالان دەکەوێت و جارێکی تر پشتگیری خۆی بۆ ڕێککەوتنەکەی نێوانیان هێنابووە زمان، بەڵام لە بادینان هەڵوێستی (پەدەکە) جیاواز بوو. دوای ئەنجامدانی ئەم چالاکییەی (پەکەکە)، (پەدەکە) هەوڵیدەدا بارەگاکانی (پەکەکە) کە نزیک بوون لە گوندەکانی سەر سنور دابخات، هۆیەکەیشیان ئەوەبوو لە حاڵەتی هێرشی سوپای

---

[21] ئەیلولی ١٩٨٤ ( ڕێگای ئازادی )

[22] ئەیلولی ١٩٨٤ ( سەرخوەبون )

تورک بۆ سەر (پەکەکە) هێزێکی ئەوتۆی پێشمەرگەیان نییە کە بتوانن بەرگری بکەن، بەگوێرەی (پەدەکە) ئازووقە و پێداویستییەکانی پێشمەرگە و پارتەکەیان لە تورکیاوە دابیندەکرێت، هەربۆیە دەیانویست لەگەڵ تورکیا توشی کێشە نەبن، لەمبارەیەشەوە هێنابویانە زمان کە پێیان باشە گەریلاکانی (پەکەکە) روو لە هەککاری و بۆتان و دەوروبەری شارەکانی دیاربەکر و دەرسیم بکەن، (پەدەکە) ئەم داخوازییەی نەک بە تەنها بەناوی خۆیەوە بەڵکو دەیوت گوایە ئەمە داخوازی پارتەکانی بەرەی جودیشە و هەربۆیە دەیانویست لەم رێیەوە داخوازییەکەی خۆیان بەسەر (پەکەکە) بسەپێنن.

(پەکەکە) بە چڕکردنەوەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ عەشیرەتەکانی ناوچەی زاخۆ، ئامیدی و برادۆست (پەدەکە)ی نارەحەت و نیگەران کردبوو، سەرۆکی عەشیرەتەکانی سەر سنورەکان کە زیاتر بە کاروباری قاچاخچێتییەوە سەرقاڵ بوون لەبارەی چالاکییەکانی (پەکەکە)وە ئەوانیش نیگەران ببوون، بەرژەوەندی بازرگانییان کەوتبووە مەترسییەوە، لەئاکامی چالاکییەکانی گەریلاکانی (پەکەکە)دا دەوڵەتی تورک دەترسا و سوپای تورکیش زیاتر سنورەکانیان کۆنترۆڵ دەکرد، بەم هۆیەوە کێشە لەنێوان (پەکەکە و پەدەکە) هاتەئاراوە و بۆ ئەم مەبەستەش لە ئاستی سەرکردایەتییان کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا، بەڵام پێش ئەم کۆبونەوەیە (پەدەکە) بە بیانوی جۆراوجۆر چەندینجار ئەم کۆبونەوەیان دواخستبوو، هۆکاری دواخستنەکەیش (دکتۆر جرگیس) بوو. لەوماوەیەدا ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) دکتۆر (جرگیس) لە شاری (ئورمییە) لە ئێران چاوی بە بەرپرسیارانی باڵیۆزخانەی تورکیا کەوتبوو، دوای رەزامەندی وەرگرتن پاشان بەشداری لە کۆبونەوەکەی لەگەڵ (پەکەکە) کردبوو[٢٣] ،(کێنان ئێڤران) کە ئەندازیار و سەرۆکی کودەتا سەربازییەکەی تورکیا بوو، دوای خانەنشین بوونی لە یاداشتەکانی خۆیدا باسی ئەم مەسەلەیەی کردبوو، ناوبراو بۆ رۆژنامەی (میللییەتی) تورکی گێڕابووەوە کە خۆی و دەسەلاتەکەی داوایان لە ئێران کردووە فشار بخەنە سەر (پەدەکە) و بنەماڵەی بارزانی هەموو بارەگا و بنکەکانی (پەکەکە) کە نزیک

---

[٢٣] سەرگوزەشتەی رۆژنامەوان ( سەردار چەلیک )

سنورن دابخەن، لەم یاداشتەدا پەیوەندییە نا دۆستانەکەی (پەدەکە)مان بۆ دەسەلمێنێت لەهەمبەر (پەکەکە)( [٢٤]) .

لەدوای چالاکی ١٥ی ئاب و زیاد بوونی جموجۆڵ و چالاکییەکانی گەریلاکانی (پەکەکە)، (میت)ی تورکیش کەوتنە خۆیان و کاروباری خۆیان لە ناوچەی بادینان زیاتر کرد، ئەندامانی (میت) بۆ دۆزینەوەی شوێنی فەرماندەکانی (پەکەکە) وێنەی فەرماندەکانیان نیشان گوندنشینەکان دەدا تاکو سیخوڕییان بۆبکەن و شوێنی فەرماندەکانیان بۆ ئاشکرا بکەن، لەمبارەیەوە (پەدەکە)یش کەوتە خۆی و بۆئەوەی پەیوەندییەکانی (پەکەکە) لە ناوچەکە تەسک بکاتەوە و ئەو کادێر و پێشمەرگانەی لە زاخۆ، ئامێدی و دهۆک ناوبەریان لەگەڵ گەریلاکانی (پەکەکە) خۆش بوو بە بڕیارێکی تایبەت لە ناوچەکە دوور خرانەوە و ڕەوانەی ئێرانیان کردن، تەنانەت ئەو کۆمیتە و بارەگانەی خۆیان کەلە سنورەکانی تورکیاوە نزیک بوون بەرپرسیارێتییەکەیان دەدایە ئەوکەسانەی کە لەخۆیانەوە زۆر نزیک بوو یاخود بەوکەسەی کە لەگەڵ ئەفسەرەکانی تورکدا بەینییان خۆش بوو، بەم هۆکارەوە بە درێژایی سنور بەشێوەیەکی فەرمی فەرماندەکانی (پەدەکە) پەیوەندییەکی باشیان لەگەڵ بارەگاکانی تورکیا بەست. یەکێک لەو فەرماندانە (سەلمان سندی) بوو، کە بەرپرسی کۆمیتەی ناوچەی زاخۆی (پەدەکە) بوو. دوای ئەنجامدانی چالاکی ١٥ی ئاب، پەیوەندی نێوان (پەکەکە و

---

(٢٤) لە ئەرشیفی سوپای تورک سەبارەت بە ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٨٣ بۆ ١٩٨٧ لە لێکۆڵینەوە نهێنییەکانیان هاتووە کە

١ / بەڵگەی تەواومان لەلایە هەندێک لەو فەرماندارانەی پێشمەرگەی (پەدەکە)ن و جارناجارێک دژ بە ڕژێمی عێراق دەجەنگن، لەگەڵ هەندێک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەکەش دژ بە ڕێکەوتنی نێوان (پەدەکە و پەکەکە)ن. بنەماڵە و کەسوکاری پێشمەرگەکانیش کەلە سەر سنور دەژین و قاچاخچێتی دەکەن ئەوانیش حەزیان بە چارەی (پەکەکە) نییە. هۆکاری ئەم حەزلێنەکردنەشیان تورکیایە کە لەوانەیە لە حاڵەتی چوونە ژوورەی سوپاکەمان بۆ باکوری عێراق ئەمان کاری قاچاخچێتییان نەمێنێت.

٢/ دروستبوونی پەیوەندی (پەدەکە) لەگەڵ وەڵاتانی عێراق و ئێران و تورکیا، هەروەها جموجۆڵی سوپاکەشمان بۆ باکوری عێراق دەبنە هۆکار (پەدەکە) ناچار بکرێت دەستبەرداری پەیوەندی بێت لەگەڵ (پەکەکە).

ئەو سەردەمە پارتی دەگەڕا بەشوێن دەرفەتێک کە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ (پەنەکە) چاک بکەنەوە. [٢٤] .

پەدەکە) ئەوەندەی تەڵە موویەک تەنک ببووەوە، (پەدەکە) نەیدەویست بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی (پەکەکە) ببێتەوە، هەربۆیە (پەدەکە) بۆهێنانەوەی بییانوو ئاغاکانی بادینان و سەرکردایەتی حزبی شیوعی و چەند کەسێکی تری ناو بەرەی (جود)ی خستە ناو گەمەکەی خۆیەوە، (پەکەکە)ش درکی بەمە کردبوو، هەربۆیە ئەویش دەستی کرد بە پروپاگەندە دژ بە (پەدەکە)، بەمشێوەیە خەتی نێوانیان بەتەواوەتی پچڕا.

لەکۆتایی ساڵی (١٩٨٤) بەتایبەتی لە (هەککاری، سیرت و جزیر) هەندێک کەس بەناوی (پارتی دیموکراتی کوردستانی – تورکیا) دژ بە (پەکەکە) دەستییانکرد بە پروپاگەندەی خراپ، بەتایبەتی ئەندامی خێڵەکانی ناوچەکانی هەککاری و شرناخ دژ بە گەریلاکانی (پەکەکە) چەکدار کران، لە ئاستی ئەم گۆڕانکاری و ڕووداوانەدا گومان لە (پەدەکە) دەکرا لەوانەیە بەم کارە هەڵسابێت یاخود هاوکاری کردبێت. لە ساڵی (١٩٨٩) لە شاری (وان) لە ئاکامی دیمانەیەک لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتی (ئێزدینان) کە ناوی (عەبدولرەحمان ئۆزبێک) بوو کە سەرۆک جاشە هەروەها لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتی (ئالان) کە ئەویش سەرۆک جاشە، لەکاتی پرسیاری ئەوەی ئایا چۆن پڕ چەک کران، هەردووکیان زۆر بە شانازی و سەرفرازییەوە باسیان لە هاوکارییەکانی (پەدەکە و مەسعود بارزانی)یان دەکرد، (تاهیر ئەدیەمان) کە سەرۆک عەشیرەتی (جیرکی)یە و بکوژی (٦) جەندرمەی تورک بوو هەروەها کە هەڵاتبوو لە دەستی یاسا، بەهۆی ناوبەری و تکای (پەدەکە) و بنەماڵەی بارزانییەوە حکومەتی تورکیا لە تاوانەکەی خۆش بوون و کرا بە سەرۆکی جاش.

لە ساڵی (١٩٨٥) سەرۆکی پارتی گەل (سامی عەبدولرەحمان)، سکرتێری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (جەلال تاڵەبانی) و سەرۆکی پەدەکە (مەسعود بارزانی)، لەدوای ساڵانێکی دوورودرێژ پەیوەندییان بەیەکەوە بەست، ئەم پارت و ڕێکخراوانە چەندین ساڵ سەرقاڵی کوشتنی یەکتر بوون، بەڵام لە ساڵی (١٩٨٦) پێکهاتن و بەرەیەکی کوردستانییان دروستکرد، ئەمەش بووە هۆکار بۆ نەمانی شەڕی (براکوژی) و پەیتا.. پەیتا ئارامی باڵی بەسەر باشووری کوردستاندا گرت، سەرەڕای ئەم گۆڕانکارییە جەوهەرییانەش کەچی هیچ لایەنێکیان دەستبەرداری سیخوڕیکردن نەبوون بۆ ئێران، لە (لۆلان) لە ساڵی (١٩٨٥) لە شەڕێکی نێوان عێراق و ئێراندا کە پێشمەرگەش لایەنگری سوپای ئێران بوون بەهۆی بۆردۆمانەوە هێزی پێشمەرگە زیانێکی زۆریان بەرکەوت.

## دژایەتیکردنی (پەکەکە) لەلایەن (حزبی شیوعی)یەوە

لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٤) دا دەوڵەتی تورک بەهۆی مەترسی گەشەکردنی (پەکەکە) وە دەستیان کرد بە پەیڕەوکردنی بەرنامەیەکی نوێی سەربازی، ئەویش ناردنی سەربازی زیاتر بوو بۆسەر سنور، حکومەت قانونی (پەشیمانی) دەرکرد و بە هەزارەها گوندنشینیان کرد بە جاش و تیمەی تایبەتی سەربازی سەر بە دەوڵەت و جاشیان دروست کرد. کاتێک دەوڵەتی تورک سەرقاڵی هێرشکردن بوو بۆسەر (پەکەکە) و هەوڵی نەمانی گەریلاکانی دەدا لەلایەکی تریشەوە دەیویست لەمبارەیەوە (پەدەکە) بەلای خۆیدا رابکێشێت. (پەدەکە)ش دەیزانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان بۆ (پەکەکە) گرنگە و شوێنی هاتوچۆکانیش تایبەتمەندی خۆیان هەیە بۆ گەریلاکان هەربۆیە دەیانویست ئەم هەلە بقوازنەوە و بۆ نزیک بونەوەیان لەگەڵ تورکیا وەک کارتێک بەکاری بهێنن.

زستانی ساڵی (١٩٨٥) لە هەرێمەکەدا زستان زۆر بە سەختی بەسەرچوو، بەم هۆیەوە چەند گەریلایەکی (پەکەکە) لە سەرماندا رەق ببوونەوە و چەند گەریلایەکیش بەهۆی لاوازی ئیرادە و خۆڕانەگرییان بەرامبەر بەم سەرمایە وازیان لە گەریلایەتی هێنا و پەنایان بۆ (پەدەکە) بردبوو، بەڵام (پەدەکە) بەهۆی ئەو رێککەوتنەی واژۆی کردبوو لەگەڵ (پەکەکە) ئەم گەریلا

هەڵاتوانەی لەلای خۆی گلنەدایەوە و ناردبویانی بۆلای (حزبی شیوعی)، هەرلە سەروبەندی ئەو رۆژانەدا گروپێک لە گەریلاکانی (پەکەکە) لەکاتی پەڕینەوەیان لەسەر سنور دەکەونە ناو بۆسەی جەندرمەی تورکەوە و لەئاکامدا هەموویان شەهید دەبن، فەرماندەکانی (پەکەکە) دەیانوت گوایە لە ئاکامی ئیخبارچێتی پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ەوە ئەم کارەساتە بەسەر ئەو گروپەیاندا هاتووە، ئەمە پرسیارە و دەکرێت، ئایا بۆچی (پەکەکە) لەمبارەیەوە بیریان لە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) دەکردەوە؟، لەمبارەیەوە بەرپرسێکی (پەدەکە) بەناوی (سەلمان سندی) بەوە تۆمەتبار دەکرا کە دەستی لەم کارەدا هەبوبێت و لە ئاکامی ئەم ئیخبارچێتییەی سەلمان لە (٨) گەریلا یەکێکیان دەکوژرێت و(٧) یان بە دیلی دەکەوێتە دەست دەوڵەتی تورک، ئەم رووداوە لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٨٥) هاتبووە ئاراوە، لە هەرێمەکەدا سەرۆکی عەشیرەتی دوسکی (عارف یاسین) و سەرۆکی عەشیرەتی نێروەیی و بەرپرسی لیژنەی (پەدەکە) (دکتۆر سەعید) لەلایەن (پەکەکە) وە بە سیخوڕ تۆمەتبار دەکران[٢٥].

پەیتا.. پەیتا لەهەمبەر (پەکەکە) پەلاماری و بە شێوەیەکی فەرمی شەڕی سارد دەستی پێکردبوو، بەتایبەتی (حزبی شیوعی و پەدەکە) بە شێوەیەکی ئاشکرا دەستیان کردبوو بە ئانتی پروپاگەندەی دژ بە (پەکەکە)، (حزبی شیوعی) هیچ کاتێک پەیوەنییەکی پۆزەتیفانەیان لەگەڵ (پەکەکە) نەبوو، هۆیەکەیشی کێشەی ئایدۆلۆژی بوو، هەمیشە (حزبی شیوعی عێراقی) لەگەڵ حزبە شیوعییەکانی تورکیا، لوبنان، ئێران و سوریا مامەڵەیان دەکرد، بەگوێرەی (پەکەکە) حزبی شیوعی عیراقی نەک (سۆشیال دیموکرات) بەڵکو (سۆشیان شۆڤێن)ەو بە گوێرەی (حزبی شیوعی عیراقی)ش (پەکەکە) (تێکدەر)ە، حزبی شیوعی عێراقی گرێدراوی سۆڤییەت بوو هەروەها لە رۆژهەڵاتی ناوین بە چەکێکی بەهێزی کۆمۆنیستی دەبینرا، بەڵام بانگراوندی (حزبی شیوعی) عێراقی لەبارەی دۆزی کوردەوە پاک نەبوو، (حزبی شیوعی) هەتا ساڵی (١٩٧٩)ش لەگەڵ سەدامدا لەبەرەی دژی کورددا بوو، مێژووی ئەم سیاسەتەشیان دەگەڕایەوە بۆ ساڵی (١٩٦١) و هاوشانی رژێمی عێراق لەهەمبەر بزاڤی کوردی باشور لە سەنگەردا بوون، ئەم حزبە کە ئەمە رفتار و کردەوەیان بوو بەرامبەر بە کورد بەڵام ئەوکاتەی لێیان دەقەوما هانایان بۆ چیاکانی کوردستان دەبرد و لە گەڵی کورد داوای

---

[٢٥] سەرگوزەشتەی رۆژنامەوان ( سەردار چەلیک )

هاوکارییان دەکرد، (حزبی شیوعی) بەگوێرەی سیاسەت و تێڕوانینەکانی سۆڤیەت لە باشور سیاسەتیان دەکرد، سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەیانویست سەرۆکایەتی بەرەی کوردستانی بکەن، دەیانویست لەگەڵ هاوپەیمانەکانیاندا روبەڕوی (پەکەکە) ببنەوە، حزبی ناوبراو لەگەڵ هەرپارت و رێکخراوێکدا هاوپەیمانییەکی جیاوازیان هەبوو، لەگەڵ (پەدەکە) و ئەندامانی بەرەی (جود)دا هاوپەیمان بوو هەروەها بەشێوازێکی تری جیاوازیش پەیوەندی لەگەڵ (یەنەکە) و هاوپشتییەکانی (یەنەکە)دا هەبوو، هەروەها روانگەیەکی جیاوازتریشیان هەبوو لەگەڵ حزبی سۆسیالیستی عەرەبی و کۆمەڵەی دیموکراتی عێراقدا و حزبی بەعسی عێراقی و سوریدا، لەمێژووی ئەم حزبەدا دەردەکەوێت کە هەڵبەستنی درۆ و گێرەشێوێنی و تێکدەری نێوان حیزبەکانی کردووە بە نەریت بۆخۆی.

(حزبی شیوعی) هەتا ساڵی (١٩٧٩)ش بە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقی دەوت (کۆنەپەرست و دەسکەلای ئیمپریالیزم) کەچی روویان ئەوەندە ئەستوربوو کە دەیانتوانی بەبێ هیچ مەرجێک لەگەڵیاندا رێکبکەون، ئەمجارەیان رووی تفەنگی خۆیان لە (یەنەکە) وەرگێڕابوو، ئەم سیاسەت و هەڵوێستەی ئەم حزبە کە بەرامبەر بە (یەنەکە) دەینواند لە هەمانکاتدا بەرامبەر بە (پەکەکە) و پارتەکانی تری باکوریش رچاویدەکرد. ئەوکاتەی بەهۆی گرژی و ئاڵۆزییەوە بەرامبەر بە (پەکەکە) لاواز دەبوو هانای بۆ رێککەوتنەکەی نێوان (پەکەکە و پەدەکە)ی دەهێناو وەک ئەندامێکی بەرەی (جود) داوای لە (پەدەکە) دەکرد (پەکەکە) لە ناوچەکە دوور بخاتەوە. یەکێک لەوانەی لەناو (پەکەکە) هەڵاتبوو پەنای بۆ (حزبی شیوعی) هێنابوو کە بەهۆی بێ ئیرادەیی و بەهۆی دانبەخۆدانەگرتنییەوە لەهەمبەر بەفر و سەرما هەڵاتبوو ناوی (عەسکەر) بوو کە خەڵکی دەرسیم بوو، ئەم عەسکەرە لە نیسانی ساڵی (١٩٨٥) لە ناو (پەکەکە) هەڵدێت، (پەکەکە) ناوی ئەم هەڵاتوانەی وەک (تاوەنباری شەڕ) راگەیاندبوو، هەربۆیە داوای لە (حزبی شیوعی) دەکرد ئەو جۆرە کەسانەیان رادەست بکەنەوە، بەڵام (حزبی شیوعی) دەسی دەنا بەڕوی داخوازییەکەی (پەکەکە )وە، بەهۆی ئەم گرژییەی نێوانیان (حزبی شیوعی) دەیویست لەرێی ئەو زانیارییانەی لە هەڵاتووەکان بەدەستی دەخات (پەکەکە) گۆشەگیر بکات، ئەوجۆرە کەسانەش کە زانیاریان دەدا بە (حزبی شیوعی) کەسانی وەک سلێمان، ناسراو بە باقی و مەحمود کۆکتای ناسراو بە

نەبیل بوون، بەهۆی ئەم هۆکارانەوە گرژی و شەڕ لە نێوان (پەکەکە و حزبی شیوعی) هاتە ئاراوە.

پێشمەرگەکانی (حزبی شیوعی عێراقی) لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٨٥) لە هەفتانین لە بۆسەیەکدا (٨) گەریلای (پەکەکە) دەکوژن، لەدوای ئەم ڕووداوە تاکو ساڵی (١٩٨٧) بەهۆی شەڕی نێوانیانەوە بە گشتی (٨) گەریلا و (١٠) پێشمەرگەی حزبی شیوعیش دەکوژرێت، هەروەها (٥) لە ئەندامانی (پارتی رزگاری نەتەوەیی کوردستان) کە هاوپەیمانی شیوعی بوون دەکوژرێن، پارتی رزگاری هەرلە ساڵی (١٩٨٣) وە کادیرەکانیان لە بادینان پەیوەندی لەگەڵ (حزبی شیوعی) دەبەستن و دۆستایەتییەکی باش لە نێوانیاندا دروست دەبێت، (پارتی رزگاری) لە سوریا پێداویستییان بۆ (حزبی شیوعی) دابین دەکرد و بۆیانیان دەهێنا بۆ باشور، گرژی و شەڕی نێوان (پەکەکە و حزبی شیوعی) هۆکار بوون کە پارتە لایەنگرەکانی (حزبی شیوعی) شەڕی (پەکەکە) بکەن، هەربۆیە (پارتی رزگاری) بەهۆی نزیک بوونەوەیان لە (حزبی شیوعی) دژ بە (پەکەکە) هەڵوێستیان نیشان دەدا، (پارتی رزگاری) لە باکوری کوردستان و لە ناو تورکیا هیچ چالاکییەکیان نەبوو، ئەمەش بەهۆی ڕووخانی سۆسیالیستی بونیاد نرا و چوونی کادیرەکانیان بوو بۆ ئەوروپا.

پێکدادانی نێوان پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) و (حزبی شیوعی عێراقی) ببووە مایەی خۆشحاڵی (پەدەکە) و بەم هۆیەوە لە گوشارەکانی تورکیا رزگاری ببوو، بەگوێرەی مادەیەکی ڕێککەوتنی نێوان بەرەی (جود)، کێشەی هەرلایەنێک کێشەی بەرەی (جود)ە، بەگوێرەی پێشبینییەکانی (پەکەکە) بێت (پەدەکە) بۆئەوەی دەستی لە یەخەی (پەکەکە) ببێتەوە هانی (حزبی شیوعی) دەدات تاکو شەڕی (پەکەکە) بکات، بۆئەم مەبەستەش هەوڵی ئەوەیان داوە (حزبی شیوعی) دژ بە (پەکەکە) بوروژێنێت و تەنانەت بۆ ئەم مەبەستە گوشاریشی بۆهێناوە[٢٦].

بەتایبەت (پەدەکە) بەهۆی هاتنە ئاراوەی ڕووداوەکانی مانگی نیسانی ساڵی (١٩٨٥) وە بە بیانوی ئەوەی گوایە گەریلاکانی (پەکەکە) پەلاماری ئەندامێکی بەرەی (جود)یانداوە بۆهاتنە جواب لە سەر (حزبی شیوعی) بە فەرمانداریتی (ساڵح مەحمود خالید) مەفرەزەیەک پێشمەرگە دەنێرن هێرش بکەنە سەر (پەکەکە)، بەڵام بەهۆی هاتنە ئاراوەی هەڵوێستی تەبایی و برایانەی

---

[٢٦] سەرگوزەشتەی ڕۆژنامەوان ( سەردار چەلیک )

هەردوو فەرماندەکانی پێشمەگە و گەریلاوە ئەم شەڕە ڕوویەدا، لەناو (پەدەکە)دا کەسانێک هەبوون کە لەهەمبەر (پەکەکە) هەڵویستی جوامێرانەیان هەبوو، بۆنموونە (سادق عومەر) کە سەر بە عەشیرەتی (سندی) بوو، ئەم پیاوە هەمیشە ڕەتی دەکردەوە شەڕی (پەکەکە) بکات، بە بیانوی ئەوەی گوایە لایەنگر و دۆستی (پەکەکە)یە لە ساڵی (١٩٩٢) سادق عومەر لەلایەن (پەدەکە)وە کوژرا. گەریلا و فەرماندەکانی (پەکەکە) بەدرێژایی مانەوەیان لە هەرێمەکە توانیبویان کاریگەری بخەنە سەر خەڵکی ناوچەکە و کەسانی باڵای ناو عەشیرەتەکانیش.

(پەدەکە) بۆئەوەی هەست و سۆزی خەڵکی هەرێمەکە لەهەمبەر (پەکەکە) نەهێڵێت کەوتە ناو کاری گێرەشێوێنییەوە، بۆئەم مەبەستەش لە نزیک بنکەیەکی گەریلا لە شوانێکی سەربە عەشیرەتی (سندی) دەدەن و دەیانەوێت (پەکەکە) لەچاو خەڵکی ڕەش بکەن، بەلام خەڵکی باشیان دەزانی (پەکەکە) ئەمجۆرە کارانە ناکات و ئەمە کارێکە بۆ ئەنجامدانی تێکدەری کراوە، هەربۆیە عەشیرەتی سندی لەهەمبەر ئەم کارە هەڵویستی نیشاندا بوو. فەرماندە (مەعسوم کۆرکماز) کە لە ساڵی (١٩٨٣) بەدواوە زوو.. زوو سەردانی باشوری کردووە توانی بووی کاریگەری بخاتە سەر خەڵکی هەرێمەکە بەتایبەتی (سادق عومەر) و عەشیرەتی سندی، (عومەرساڵح مالی عەجەم) کە دەکاتە باوکی (سادق)، لە ساڵی (١٩٩١) لە دیمانەیەکی دۆستانەدا باسی لە دۆستایەتی کۆنی خۆی و نێوان (مەعسوم کۆرکماز) و هەڤاڵەکانی دەکات، (پەکەکە) جگە لە عەشیرەتی سندی، دۆستایەتی لەگەڵ عەشیرەتەکانی وەکو (گولی، بەرواری، نێروەیی، ڕێکانی و لۆلی) هەبوو، تەنانەت ئەم نزیک بونەوەیان ئەوەندە پەرەی سەندبوو کە ڕۆشنبیرەکانیشیان هاوکاری (پەکەکە) بکەن. عەشیرەتەکان لەناو خۆیاندا بۆچونەکانیان جیاواز بوو، بۆنموونە لەناو عەشیرەتی سندی لایەنگری (پەدەکە) و لەلایەکی تریشەوە تیایاندا هەبوو لایەنگری (پەکەکە) بوون، هەروەها جاشیشیان هەبوو، لەناو عەشیرەتی (بەرواری)دا تیایاندا هەبوو لایەنگری (پەدەکە) و (پارتی گەل) و (حزبی شیوعی) بوون، هەرهەمووشیان پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکی ئەو دیو سنوری تورکیا هەبوو، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەی کە ئەم عەشیرەتانە لە (پەکەکە) نزیک ببوونەوە ئەوەبوو خزمایەتییان لەگەڵ بنەماڵە و عەشیرەتەکانی باکوری کوردستاندا هەبوو.

(پەدەکە) سەرەڕای ئەوەی بەشێوەیەکی فەرمی ڕێککەوتنەکەی خۆیان لەگەڵ (پەکەکە) هەڵنەوەشاندبووەوە، کەچی لە باشور کار و چالاکی (پەکەکە) ی قەدەغەکرد، تەنانەت بڕیاریان دەرکردبوو هەندێک لە کادیرەکانی (پەکەکە) دەستگیریش بکەن، لە ١٧ی ئابی ساڵی (١٩٨٥) فەرماندەیەکی گەریلا بەناوی (حەمید ئاڤجی) لە نزیک گوندی (ئێدیلبا) ی باشوری سنوری (گەوەر)ی سەربە (شەمزینان) لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ەوە دەکوژرێت و تەرمەکەیشی ڕادەستی بارەگای سەربازی تورک دەکەن[٢٧].

لە ساڵی (١٩٩١) (پەکەکە) لە (خواکورک) لقێکی ئاکادیمیای (مەعسوم کۆرکماز)ی کردەوە، ناوی ئەم لقەیاننا (حەمید ئاڤجی)، لەهەر دەرفەتێکدا ڕادەستکردنەوەی گەریلای ساغ و بریندار بە تورکیا لەلایەن (پەدەکە)ەوە ببوو بە پیشە و کارێکی ڕۆتینی، سەرەڕای هەموو ئەمانەش کەچی ئەندام سەرکردایەتییەکانی ناو (پەدەکە) وەک (دکتۆر سەعید ئەحمەد بارزانی و دکتۆر کەمال کەرکوکی) نکوڵی ئەوەیان دەکرد پەیوەندییان هەبێت لەگەڵ بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک، لە ساڵی (١٩٨٥) پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بۆ ئەوەی ڕێنەدەن گەریلاکانی (پەکەکە) لەناوچەکە کەمپی زستانە دروست بکەن کەوتنە پەلاماردانیان، فەرماندەکانی (پەکەکە)ش بۆئەوەی خۆیان لە شەڕ بەدوور بگرن ناچارمابوون ناوچەکە بۆ ماوەیەکی کاتی چۆڵ بکەن، گەریلاکانی (پەکەکە) لەلایەکەوە لەهەمبەر بە سوپای تورک شەڕیان دەکرد، لەلایەکی تریشەوە لەهەمبەر پێشمەرگەکانی (پەدەکە) خۆیان دەپاراست، هەربۆیە نەیاندەویست لەناوچەی

---

(٢٧) (حەمید ئاڤجی) میوانی خیزانێکی وەلاتپارێزی دەوارنشین دەبێت لە نزیک گوندی (ئیدیلبا)، لەوێ حەمید دەیکوژن، تەرمەکەی لە نزیک بارەگای جەندرمە فڕێدەدەن پاشانیش هەواڵ بە بارەگاکە دەدەن کە لاشەیەک لەوێ کەوتووە، هەواڵی دەزگا ڕاگەیاندنەکانی تورک بەمەیان زانی و بۆ پڕوپاگەندەی سوپاکەیان وابڵاویانکردەوە گوایە (حەمید ئاڤجی) لەلایەن جەندرمەوە کوژراوە. هەمان بەسەرهات لە ساڵی (١٩٦٨) بەسەر (پارتی دیموکراتی ئێران)دا هاتبوو، (سلێمان موعینی) کە سەرۆکی دیموکراتی ئێران بوو، بە فەرمانی (مەلا مستەفا) دەستگیر دەکرێت و دوای کوشتنی تەرمەکەی ڕادەستی ڕژێمی ئێرانی دەکەنەوە، سوپای شا بۆ عیبرەت وەرگرتنی خەڵکی چەندین ڕۆژ تەرمەکەیان بە شارەکاندا گێڕا، بەسەرهاتێکی تری لەم چەشنە بەسەر (سادق ئاشوری) دا هات کە ماوەیەکی زۆر لەناو ریزەکانی (پەدەکە)دا ڕۆڵی بینیبوو، بەهۆی ناکۆکی ئەم زاتەوە لەگەڵ بنەماڵەی بارزانی، بە بڕیاری (مەلا مستەفا) لە ساڵی (١٩٦٣) ڕادەستی دەوڵەتی تورکی دەکەن و زیندانی دەکرێت، (پەدەکە) کوشتنی (حەمید ئاڤجی)ی دەخستە ئەستۆی (شێخ محەمەد خالید) وە کە ئەوسەردەمە سەرۆکی (حزبوللە) بوو کە ناکۆکی لەگەڵ (مەسعود بارزانی)دا هەبوو، (شێخ محەمەد خالید) لایەنگر و کاری بۆ ئێران دەکرد، یەکێک لە هۆکارەکانی کێشەی نێوان شێخ محەمەد و مەسعود بارزانی ئەوەبوو دایکی مەسعود لە عەشیرەتی زێباری بوو، (پەدەکە) نەک تەنها تاوانی کوشتنی حەمید ئاڤجی خستبێتە ئەستۆی خۆی بەڵکو هەرگیزا و هەرگیز تاوانێکی لەمجۆرەی قەبوڵ نەکردووە.

بادینان خۆیان دەربخەن. بەشێوەیەکی بەرچاو پێشمەرگەکانی (پەدەکە) خوازیاری ئەوە نەبوون شەڕی گەریلاکانی (پەکەکە) بکەن، بەڵام فەرماندەکانیان نەیاندەشاردەوە دژ بە گەریلا لەگەڵ بارەگا سەربازییەکانی تورک شەریکن، هەربۆیە (پەکەکە و پەدەکە) بەردەوام روبەڕوی یەک دەوەستانەوە، دەوڵەتی تورکیش بۆئەوەی زیاتر گەشە بەم ناکوکی و دووبەرەکییە بدات بەردەوام لەناو هەوڵداندابوو، بۆ ئەم مەبەستەش ئەوەی لە دەستیان بهاتایە دەیانکرد، گرژی و شەڕی نێوان (پەکەکە و حزبی شیوعی) تاکو ساڵی (١٩٨٧)ی خایاند، ئەمەش بووە هۆکار کە حزبی شیوعی وەک هێز لاواز ببێت[٢٨].

---

[٢٨] لەگەڵ ئەوەی (حزبی شیوعی) دەیزانی سوپای عێراق لەهەمبەر سوپای ئێران لاواز بووە، کەچی هیچ چالاکییەکی سەربازییان بەرامبەر بە حکومەتی عێراق ئەنجام نەدەدا، ئەم حزبە زەختی لە بەرەی (جود) دەکرد دەستبەرداری شەڕی عێراق ببن، بۆئەوەی ناویان نەیەتە ناوانەوە و ناویان نە زڕێت سەرەڕای ئەوەی ئەندامی بەرەی (جود)یش بوون کەچی لە دژی ئێران کەمپینێکیان دەست پێکرد، سۆڤییەت نەیدەویست ئێران ئەم شەڕە بەرێتەوە بەمشێوەیە (حزبی شیوعی) دڵسۆزی خۆی بۆ سۆڤیەت دەسەلماند.

## فڕۆکە جەنگییەکانی تورک

## شوێنی ڕێککەوتنەکەی نێوان (پەکەکە و پەدەکە) دیاریدەکەن

گەریلاکانی (پەکەکە) لەناو باکوری کوردستان و تورکیادا پەرەیان بە چالاکییەکانی خۆیان دەدا، سەرەڕای هەموو پەرچدانەوەیەکی سوپای دەوڵەتی تورک کەچی (پەکەکە) ڕۆژ بە ڕۆژ سەرکەوتنی بەدەست دەخست، بەهۆی چڕبونەوەی چالاکییەکانی گەریلا و نارەزاییەکانی گەلیش دەوڵەتی تورک وایلێهات سەرپێیانە باس لە بوون و کێشەی کورد بکەن، بەگوێرەی لۆژیکی دەوڵەت دەبوایە ئۆپەراسیۆنی سەربازییان چڕبکەنەوە و ئەو تاخمە بچوکەی کە ئەوەندەی ژمارەی پەنجەکانی دەستن لەناو بدرێن. هەتا سوپای تورک ئۆپەراسیۆنیان زیاتر بکردایە، چالاکییەکانی گەریلاش چڕتر دەبووە و داستانیان دەخوڵقاند. دوای چەند ساڵێک ئەو گروپەی کە بە ژمارەی پەنجە هەژماریان دەکردن ببوون بە گەورەترین کێشەی دەوڵەت، زهنییەت و سیاسەتی دەوڵەتی تورک ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی دەرسیم و زیلانیان وەک وێنەیەکی کاریکاتۆر لێکردبوو، ئەمەش بۆ چاوترساندن و بە عیبرەتکردن و ئابڕوبردنی مێژووی شۆڕشەکان ئەو کاریکاتۆرەیان دروست کردبوو، بۆ گاڵتەجاڕیپێکردن دەوڵەت گۆڕی جەنگاوەرە کوردەکانیان دەستنیشان کردبوو، سەرەرای

هەموو شتێکیش ئایدۆلۆژی فەرمی دەوڵەت گاڵتەیان بە مێژووی شۆڕشەکان دەکرد و بەفەرمی دەیانوت (خەیاڵی دامەزراندنی کوردستان لێرە لەگەڵ مردووەکاندا نراوەتە ناو ئەم گۆڕانەوە)، بەڵام ئێستا نەوەکانی ئەو مێژووە تاڵە هەستاونەتە سەرپێ و دوای (٥٠) ساڵ ئەو خەیاڵەیان لە گۆر دەرهێنا و وشەی قەدەغەکراوی کورد و کوردستانیان هێنایەوە ناو باسانەوە، دەوڵەتی تورک لەهەمبەر ئەم پێشهات و گۆڕانکاریانە و لەهەمبەر قودرەتی دەوڵەتەکەیان، لەهەمبەر ئەم مشتە گەنجانە سەریان سوڕمابوو، لەخۆیان دەپرسی باشە ئەم مردووانە چۆن توانیان جارێکی تر لە گۆڕ هەڵسنەوە و بکەونەوە سەرپێی خۆیان؟!.

لە ساڵی (١٩٨٦) سوپای ئێران لەهەمبەر سوپای عێراق بەردەوام بوو لە سەرکەوتن،(٣) ساڵ پێش ئەم بەروارەش ئێران جلەوی شەڕەکەی لەدەستی خۆی گرتبوو، دەوڵەتی تورکیش لەرێی سوپاکەیانەوە بۆ بەدیهێنانی ئاوات و پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان هاتە ئاراوە و ددانی تیژی خۆیان نیشان ئێراندا، ئەمەش بۆ بەدەستخستنی کەرکوک و موسڵ بوو کەلە هەموو حاڵەتێکدا ئامادەباشیان بۆدەکرد، ئەم ئامانجەی تورکیا لەلایەن هەموو کەسێکەوە درکی پێدەکرا. لە هەرێمەکە روودا و گۆڕانکارییەکان سات بە سات دەگۆڕدران، هەرگیزا و هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەدەکرا ئەمەریکا و تورکیا رێگا بەوە بدەن ئێران لە نەوتی بەسرە و ئێسکەندەرون و کەرکوک نزیک ببێتەوە، دەوڵەتی تورک لەرێی دەستوەشاندن لە (پەدەکە)ی هاوپەیمانی ئێران هەڵوێستی خۆیان نیشان ئێراندەدا. تورکیا دەیوسیت بە لێدانی (پەدەکە) بە ئێران بڵێت نەکەی لە نەوت نزیک ببیتەوە، بێگومان هۆکاری ئەنجامدانی ئەم کارەیشیان (پەکەکە)یان وەک هۆکار نیشاندەدا.

لە ساڵی ١٩٨٦ و ١٩٨٧ باس لەوە دەکرا لەوانەیە رژێمی عێراق بروخێت، هەربۆیە چاوەکان لەسەر تورکیا بوون نەبا بچێتە عێراقەوە و کەرکوک داگیربکات، دوابەدوای ئەم گریمانە، سوپای تورک لە سنوری دەریای رەش مانۆرایەکی سەربازی ئەنجامدا و ٥٠ هەزار سەربازیشیان لە نزیک هەککاری جێگیر کرد، سوپای تورک لە نزیک شاری (باتمان) فڕۆکەخانەیەکی سەربازییان دروستکرد، لەم سەروبەندەدا لە ١٩٨٦/١١/١٧ یاریدەدەری وەزیری بەرگری ئەمەریکا (ولیەم تافت) هات بۆ ئەنقەرە، لەهەمانکاتدا لەبارەی ئەگەری داگیرکردنی باکوری عێراق (باشوری کوردستان) لەلایەن تورکیاوە، ئەکادیمیایەکی

ئەمەریکی سەبارەت بەم مژارە لە تورکیا وانەی دەووتەوە[٢٩]، (کامەران) کە یەکێکە لە کارمەندەکانی دەوڵەتی تورک، لە روونکردنەوەیەکیدا بۆ (بی بی سی)، هەرچەندە بە شەرمیشەوە قسەی دەکرد، بەلام ناوبراو دەیوت (لەحاڵەتی هاتنەئاراوەی گۆڕانکاری لە ناوچەکەدا و ئەگەر ئێران بەرامبەر بە عێراق سەرکەوتن بەدەست بخات، ئەوا ئێمەش هەروەکو مەسەلەی قوبرس قسەی خۆمان دەبێت) .
یەکێک لە مەترسییە گەورەکانی دەوڵەتی تورک کە نەیاندەویست بیهێننە زمانیش ئەوەبوو ئەگەر رژێمی عێراق لە باکوری عێراق پاشەکشێیان کرد ئایا هەل بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەێتە ئاراوە یاننا، بۆ ئەم مەبەستەش دەوڵەتی تورک سوپای خۆیان خستبووە ئامادەباشییەوە، هەربۆ هەمان ئامانج سوپای تورک لە ١٥ی ئابی ساڵی ١٩٨٦ لە (ئولودەرە و چوکورجە) بۆردۆمانێکی چڕی بنکە و بارەگاکانی (پەدەکە)یان کرد و لە ئەنجامدا (١٠٠) پێشمەرگە و خەڵکی سڤیلی گوندەکان کوژران، شایەنی باسە (٣٠) فرۆکەی جەنگی بەشدارییان لەم بۆردۆمانە کردبوو، لەمێژووی سوپای تورکدا ئەمە گەورەترین و چڕترین بۆردۆمان بوو، لەهەمانکاتیشدا سەربازی پیادەی سوپای تورک گەیشتبوونە خاڵی سفری سەر سنوری باشوری کوردستان[٣٠].
گەریلاکانی (پەکەکە) چەند رۆژێک پێش ئەم بۆردۆمانە چڕەی سوپای تورک لە (چوکورجە) ٢ ئەفسەر و ١٢ جەندرمەیان کوشتبوو، بەگوێرەی رونکردنەوە فەرمییەکانی دەوڵەتی تورک گوایە بەهۆی جموجۆڵی گروپە تیرۆریستەکانەوە هێرشە ئاسمانییەکان ئەنجامدراون کە ویستویانە هێرشبەرن بۆ بارەگا سەربازییەکانی سەر سنور و سنور ببەزێنن. سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی تورکیا (تورگوت ئۆزال) کەمی مابوو لەژێر لێوانەوە هەڕەشە لە کوردی باشور بکات و داوای لە کوردی باشور دەکرد جێگای گەریلاکانی (پەکەکە) نەکەنەوە، لەمبارەیەوە تورگوت ئۆزال دەیوت (**تۆڵەی سەربازە کوژراوەکانمان کردووەتەوە، هیوادارم کوردی عێراق دەرگای ماڵەکانیان لە رووی تیرۆریستان نەکەنەوە، ئێمە چارەی ئەو تیرۆریستانە دەکەین کەلەناو خاکی تورکیادان**[٣١]).

---

[٢٩] ٤ی ئاب ١٩٨٦ رۆژنامەی ( میللییەتی تورکی )
[٣٠] ١٧ی ئاب ١٩٨٦ رۆژنامەی ( حوررییەتی تورکی)
[٣١] ٢٣ی ئاب ١٩٨٦ هەمان رۆژنامە

هێرشەكان بە چڕوپڕی بەردەوام بوون، یەكێك لە شەڕە هەرە سەختەكان لە مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٧ ڕوویدا، لە ١٩٨٧/٣/٥ گوندەكانی (سینهەت، ئەلانس، ئوری و كیساند) كە نزیك زاخۆن لەلایەن سوپای توركەوە بۆردۆمان كران و لەئاكامدا گوندنیشینێك كوژرا و چەند كەسانێكیش بریندار بوون و چەندین ماڵیش وێران بوون، لەمبارەیەوە وتەبێژی حكومەتی توركیا (حەسەن جەلال گوزال) وتی (**٣٠ فڕۆكەی جەنگیان ٩ خاڵیان بە هەدەف گرتووە**[٣٢])، لەهەمانكاتیشدا بیرۆی (پەدەكە) لە ٧ی ئادار ئەم بۆردۆمانانەی دەوڵەتی توركی ئیدانە كرد، لە ئیدانە كردنەكەی (پەدەكە) هاتبوو (ئەم بۆردۆمان و دەست درێژییە بە ئامانجی هێشتنەوەی ڕژێمی سەدام ئەنجامدراوە[٣٣])، بیانوی ئەمجارەی دەوڵەتی تورك بۆ ئەم بۆردۆمانانەیان هەروەكو هەمووجارێكیان بێشك گەریلاكانی (پەكەكە) بوو، لە ٢ی شوباتدا گەریلاكانی (پەكەكە) هێرش دەبەنە سەر جاشەكانی گوندی (تاشدەلان) ی سەربە (ئولودەرە) و لە ئاكامدا ١٤ جاش دەكوژن، لە هەمانكاتیشدا لە باشور پێشمەرگەكانی یەكیتی نیشتیمانی كوردستان (یەنەكە)، لە ١٣ی ئاداردا لە نزیك (تاسوجە) بۆسەیەك دادەنێن و لە ئاكامدا ئەندازیارێكی تورك بەناوی (ئەتیلا چەلیكان) بە دیل دەگرن كە كارمەندی كارگەی چیمونتۆی (تاسوجە) بووە، لەمبارەیەوە (یەنەكە) ڕونكردنەوەیدابوو كە بەمشێوەیە بوو (لەهەمبەر زوڵموزۆری توركیا بەرامبەر بە گەلی كورد و ئەشكەنجەدانی گەلەكەمان لە زیندانەكانیاندا و بۆ نارەزای دەربڕین لەهەمبەر پشتگیری كردنی توركیا بۆ ڕژێمی فاشیستی عێراق وەك یەكێتی پرۆتیستۆی توركیا دەكەین و ئەم ئەندازیارەیانمان لەلای خۆمان دەهێڵینەوە[٣٤])، وەڵامی ئەم لێدوانەی (یەنەكە) درایەوە.

كاتێك چالاكی گەریلاكانی (پەكەكە) لەناوچەكان زیادیان كرد، دەوڵەتی توركیش بە تەكنیكی سەربازی ئیسرائیلی هێرشەكانیان بۆسەر گەریلا چڕتر كرد، لەكاتی بەزانی سنوری توركیا و بۆردۆمانی عەشوایی فڕۆكە جەنگییەكانی تورك، توركیا دەیوت گوایە بۆردۆمانی بنەكە و بارەگاكانی گەریلاكان دەكەن، بەگوێرەی ئەوەی دەوڵەت باسی دەكرد باوەڕ نەدەكرا زیانێكی ئەوتۆ بە گەریلا كەوتبێت چونكە گەریلا لەهەمبەر ئەم ئۆپەراسیۆن و بۆردۆمانانە

---

[٣٢] ٦ی ئاداری ١٩٨٧ هەمان ڕۆژنامە

[٣٣] ١١ی ئاداری ١٩٨٧ ( كوردستان پرێس)

[٣٤] ٢٥ی شوبات هەمان ساڵ و هەمان سەرچاوە

دەیانزانی چۆن بەرگری بکەن و خۆیان بپارێزن، گەریلا لەو ناوچانەدا شوێنێکی دیاریکراویان نەبوو، هەروەها خۆشیان لە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بەدوور دەگرت، خاڵی سەرەکی بۆ سیخوڕی راکاڵی فرۆکەکانی سوپای تورک بێشک (پەدەکە) بوو[٢٥].

سەرەڕای ئەو هەموو رەوشە ناڵەبارانە (پەدەکە) لەبارەی هێرشەکانی دەوڵەتی تورک هیچ لێدوانێکی نەدا، بەڵام دیاربوو بەهۆی فشاری تورکیاوە بووە لە ئاداری ساڵی ١٩٨٧ (پەدەکە) رایگەیاند بەشێوەیەکی فەرمی و یەکلایەنە رێککەوتنی نێوان خۆیان و (پەکەکە) یان هەڵوەشاندووەتەوە، (پەدەکە) لەراگەیاندنەکەیاندا هۆکاری هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتنەکەیان بە ٧ خاڵ هێنایە زمان :

١/ بەگوێرەی بەندەکانی رێککەوتنەکەی نێوانمان دەبوایە لەبارەی گۆڕانکاری ناوچەکە و چۆنییەتی کاری ستراتیژییەت و سیاسەتی گشتیش پارتیمان ئاگەدار بکرایەتەوە بەڵام (پەکەکە) ئەمەی نەکرد .

٢/ لەبارەی کاری هاوبەش و تەکنیکی و هەنگاوە پراتیکییەکانی نێوانمان کۆمیتەکانی پارتیمان بەهیچ شێوەیەک ئاگەدار نەکراونەتەوە.

٣/ لەبارەی هاوکاریکردنی کاروبارەکانی سیاسی لە ناوە و لە دەرەوەی وەڵات بەهیچ شێوەیەک دەستی هاوکاری بۆ پارتیمان درێژ نەکراوە.

٤/ (پەکەکە) کێشەیەکی زۆریان لە ناوچە ئازادکراوەکاندا دروست کردووە، هەروەها کێشەیەکی زۆریان بۆ هێزەکانمان لەسەر سنور دروستکردووە و گەریلاکانیان کێشەیەکی زۆریان بۆ پێشمەرگەکانمان و بەرەی جود و هێزە عێراقییەکانی تر دروست کردووە.

٥/ گرنگی نەدراوە بە بڕیارەکانی بەرەی جود و ئەو بڕیارانەیشی دراون لەلایەن (پەکەکە) وە جێبەجێ نەکراون.

---

[٢٥] رژێمی سەدام لەهەمبەر گەلی کورد چەکی کیمیاوی بەکارهێنا و هێرشێکی فرلوانی بۆسەر باشوری کوردستان دەست پێکرد و لەئاکامدا هەزارەها گوندیان سوتاند، (عەلی حەسەن مەجید) ناسراو بە (عەلی کیمیاوی) کە ئامۆزای سەدام حوسێن بوو کرا بە بەرپرسی کاروباری باشوری کوردستان و لەماوەی دەسەڵاتەکەیدا بە هەزارەها کوردی بێگوناحی کوشت، رژێمی سەدام لەهەمبەر تێرلندنەکەی سوپاکەی بەرامبەر بە ئێران تۆڵەی لە کورد دەکردەوە، لەمبارەیەوە (مەسعود بارزانی) و بەرەی جود بڵاوکراوەیەکیان بڵاوکردەوە کە داوای پشتیوانی جیهانیان دەکرد و داوایان دەکرد رێگری لەهەمبەر کۆمەڵکوژییەکانی سەدام بگرن، لەهەمانکاتیشدا هێرشەکانی پێشمەرگە بۆسەر سوپای عێراق زیادیان کردبوو، لە ئەنجامی ئەم هێرشانەدا پێشمەرگە توانیان چەند ناوچەیەکی سۆران و بادینان رزگار بکەن و زیانیش بە سوپای عێراق بگەهێنن.

٦/ زۆر راشكاوانە (پەكەكە) تۆمەتی نارەوا دەدەنە پاڵ رابەرانی پارتیمان و چۆنییەتی سیاسەتمان و هەروەها هێرش دەهێننە سەر دۆستەكانیشمان.
٧/ (پەكەكە) لە دەرەوە و ناوەوەی وەڵات كاری تیرۆریستی ئەنجام دەدەن و كەسانی بێ تاوان دەكوژن، ئەم جۆرە كارانە دژی مرۆڤایەتی و دیموكراسییەتە، بەهیچ شێوەیەک ئەم كارانە لەگەڵ روحی شۆڕشگێڕیدا یەک ناگرنەوە، لەم سۆنگەیەوە پێیان دەڵێن پابەندی پرانسیپ و ئەو بڕیارە هەرێمیانە بن كە پارت و رێكخراوە شۆڕشگێرەكان دەریدەكەن[٣٦].
ئەنقەرە یەكەم دەرەنجامی خۆیان لەئاكامی ئۆپەراسیۆنەكان بەدەست خستبوو. بەگوێرەی ئەوان چەندێک هێرش بۆ سەر (پەدەكە) زیاد بكرێت ئەوا دوژمنایەتی و ناحەزی (پەدەكە) بەرامبەر بە (پەكەكە) زیاتر و زیاتر دەبێت. لەدوای بۆردۆمانەكانی سوپای تورک یەكێک لە سەرانی (پەدەكە) بەناوی (دكتۆر سەعید ئەحمەد بارزانی) دەیوت (ئێمە دەوڵەتی تورک وەک دۆستی خۆمان دەبینین، پێویستیمان بە توركیا هەیە، بەڵام چالاكی گەریلاكانی (پەكەكە) دەبنە هۆكار كە پەیوەندی نێوان ئێمە و توركیا خراپ ببێت، ئەوەی بڵێت من (پەكەكە) م بابزانێت دوژمنی ئێمەیە ![٣٧]).
سەرۆكی (پەدەكە) مەسعود بارزانی لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی رێككەوتنەكەی نێوانیان هۆكارێكی تری دەهێنایە زمان، مەسعود بارزانی دەیوت (**بەڵگەیەكی نهێنی (پەكەكە) كەوتووەتە ژێر دەستمان كە باس لە ئەنجامدانی كۆمەڵێک پیلانی نهێنی دەكات. لەم بەڵگەیە ئەوە دەردەكەوێت (پەكەكە) بەنیازە زەمینەی ئەوە برەخسێنێت كە سوپای توركیا بهێنێتە خاكەكەمانەوە، ئەمەش بۆئەوە دەكەن كە ئەوان پێیانوایە لەحاڵەتی هێرشی دەوڵەتی تورک بۆ هەرێمەكەمان گوایە (پەدەكە) هەڵدێت و ئەو بۆشاییەی دێتە ئاراوە دەیانەوێت خۆیان پری بكەنەوە، بەڵێ لەو بەڵگەیەی كەوتووەتە دەستمان باس لەو پیلانەیان دەكات، بەڵێ بەهۆی ئەو بەڵگەیە و ئەو رووداوانەی بەهۆی ئەوانەوە لە هەرێمەكەماندا روویاندا سەرەڕای ئەوەی ئێمە سەبریشمان بەرامبەریان گرت، بەڵام لێرە بەدواوە ئەڵێین بەسە و**

[٣٦] ١٠ی گوڵان ١٩٨٧ (خدر گۆكتاش) گۆڤاری (نۆقتا )
[٣٧] ٢٨ی گوڵان ١٩٨٧ رۆژنامەی ( میللیەتی توركی)

**ڕێککەوتنەکەمان هەڵوەشاندەوە، باش بزانن لێرە بەدواوە ناهێڵین هێزەکانی (پەکەکە) لە ناوچەکانمان جێگایان ببێتەوە**[38].

بەڵێ بارزانی دەیوت بەهیچ شێوەیەک ڕێگانادەین لە هەرێمەکەماندا (پەکەکە) بونیان هەبێت.

**(براینە لەوەدەچێت مەسعود بارزانی لە فڕۆکەکانی تورک زۆر ترسابێت)** .

## ئەنفال و هەرەسێکی نوێ

لە ساڵەکانی ١٩٨٤ بۆ ١٩٨٨ گەریلاکانی (پەکەکە) بەهۆی فشارەکانی (پەدەکە)وە ناچارمابوون لە ناوچەی (هەفتانین) کاروخەباتی خۆیان بەشێوەی نهێنی ئەنجام بدەن، گەریلاکانی (پەکەکە) بەتایبەتی لەو ناوچانە جێگیردەبوون کە جموجۆڵی پێشمەرگەی تێدانەبوو، هەروەها خۆشیان لە شەڕ و کێشە بەدوور دەگرت، دوای ئەوەی هەموو جیهان بۆیان روونبووەوە ئێران شەڕی عێراق دەباتەوە ئینجا (نەتەوە یەکگرتووەکان) بانگەوازی کرد کۆتایی بە شەڕی نێوان عێراق و ئێران بهێنرێت، بەهۆی داڕمانی ئابوری هەردوو وەڵات و کەمبونەوەی ژمارەی سەربازییان و بەهۆی زەرەرو زیانیان هەردولا بەدەنگ بانگەوازییەکی نەتەوە یەککرتووەکانەوە هاتن، کاتێک شەڕی نێوان عێراق و ئێران کۆتایی پێهات، رەوشی پارتە کوردییەکانی باشوریش کەوتنە خراپییەوە.

رژێمی عێراق لەماوەی (٨) ساڵی شەڕ لەگەڵ ئێراندا هەموو جۆرە ئامراز و شێوازی مردن و وێرانکارییەکی تاقیکردبووەوە، لە ١٦ی ئاداری ساڵی ١٩٨٨ رژێمی سەدام بەرامبەر بە

---

[38] ١٦ی تشرینی یەکەم ١٩٨٧ ( کوردستان پرێس) .

شاری (هەڵەبجە) و دەوروبەری چەکی کیمیاوی بەکار هێنا و بووە هۆکاری کوشتنی زیاتر لە ٥٠٠٠ هەزار مرۆڤ، مەخابن جیهان لەهەمبەر ئەم کۆمەڵکوژییەی سەدام بەرامبەر بە کورد هیچ هەڵویستێکی جدی و مرۆییان نیشان نەدا، جارێکی تر گەلی کورد بە بەرچاوی جیهانەوە کۆمەڵکوژ دەکران. دوای تێپەڕبوونی ٢ ڕوژ بەسەر ئەم کۆمەڵکوژییەدا ئێران مادەکانی ئاگربەستەکانی قەبوڵ کرد واتا لە ١٩٨٨/٣/١٨، ئێران ڕایگەیاند پابەندی ڕێککەوتنەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەبن، دوای هاتنە ئاراوەی ئاگر بەست، حکومەتی عێراق لە سنورەکانی ئێران سوپاکەی خۆی کێشایەوە و بەرەو کوردستانی بردن، سەدام لەهەمبەر پارتەکانی باشور ئۆپەراسیۆنێکی فراوانی دەست پێکرد بە ناوی (ئەنفال)[39].

لە سەروبەندی هێرشەکەی سوپای ئەنفالدا دوای ساڵانێکی دوور و درێژ سوپای سەدام یەکەم جاریان بوو بتوانن بچنە ناوچەی (خواکورک)ەوە، هێزی پێشمەرگەی پارتە کوردییەکان کە بەدرێژایی ٩ ساڵ بوو پشتیوانی ئێرانیان دەکرد جارێکی تر سودیان لە وانەکانی مێژوو وەرنەگرت و بێ پشتیوانی ئێران مانەوە و بڵاویان لێکرد، سەرلەنوی شۆڕشی کورد ڕوبەڕوی هەرەس بووەوە، بەڵام ئەوەی سەیروسەمەرە بوو ئەوەبوو سکرتێری (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی چەند مانگێک پێش ئەم هەرەسەیان واتا لە ساڵی ١٩٨٧ دەیوت (ساڵی داهاتوو)، واتا ساڵی ١٩٨٨، **(لە سلێمانی کۆبونەوەی ڕۆژنامەوانی دەکەم)**، لەگەڵ ئەم قسەیەشیدا مژدەی سەرکەوتنی دەبەخشی[40]، بەگوێرەی سەرکردەکانی باشورلە کلکی سەرکەوتن گەڕاونەتەوە، بەڵام دوای ماوەیەک بۆ ئەوان و بۆ خەڵکیش روونبووەوە ئەم بیروبۆچونەیان هەڵەبووە.

---

[39] قینی شەڕی ٨ ساڵەی ڕژێمی سەدام بەرامبەر بە ئێران بە کوردی ڕشت، هەموو ئەم زوڵمەیان بە شێوەیەکی بێ شەرمانە لەبەر چاوی جیهانەوە دەکرد، دەوڵەتی ئێران و (پەدەکە و یەنەکە) و هەموو هاوپەیمانەکانیش تەماشای ئەم شانۆ پڕ لە تراژیدیایەیان دەکرد، دوو ڕۆژ پێش کارەساتەکە پێشمەرگەکانی (یەنەکە) و سوپای ئێران شاری هەڵەبجەیان گرت، لە ساڵی (١٩٩٢) حکومەتی هەرێم بۆ ئاماری ژمارەی قوربانیانی ئەنفال لیژنەیەکیان پێکهێنا، سەرۆکی ئەم لیژنەیە (میرزا عەزیز) بوو، میرزا دەیوت (لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانمان دەرکەوت قوربانیانی پرۆسەی هێرشی ئەنفال ١٨٢٠٠٠ هەزار کەسە، سەرەڕای ئەمەش حاڵی حازریش ناوی ونبوانمان بۆدێت، زۆرینەی قوربانییەکان لەئەنجامی کوشتنی بە کۆمەڵ شەهید بوونە، بەشێک لەو قوربانیانە لە دەۆک لە ٤ جێگای جیاواز دۆزراونەتەوە، بەشێکی زۆریش لە عەرەبستان خراونەتە ژێر لمەوە)، ئەندامی لیژنەی مافی مرۆڤی کوردستانیش پارێزەر (محەمەد ساڵح ئامێدی) دەیوت (ناوی هەزارەها قوربانی ئەنفالمان دۆزیوەتەوە، هەروەها وێنەی ٢٥ هەزار قوربانیشمان لەبەردەستدایە) .

[40] ٢٧ی تشرینی دووەم ١٩٨٧ ( کوردستان پرێس ).

به هەزارەها کەس ئەوانەی لە دێوزمەی کیمیای عێراق هەڵاتبوون بە ڕەوشێکی زۆر زەحمەت و بە برسی و زەلیلییەوە خۆیان گەیاندە سنورەکانی ئێران و تورکیا، لەبەشی تورکیا ئەوانەی توانیان لە سنور بپەڕێنەوە بە درێژایی (٤) ساڵ لەو کەمپانە مانەوە کە تورکیا لە دەوروبەری (دیاربەکر، موش و قزلتەپە) بۆیان تەرخان کرابوو کە ڕەوشیشیان زۆر خراپ بوو، کۆمەڵێکی زۆری پێشمەرگە و خەڵکی سڤیل هانایان بۆ ئێران بردبوو، ئەوانەیشی نەچوون بۆ ئەو دوو وەڵاتە گەڕانەوە ژێر دەسەڵاتی سەدام و بوون بە جاش، دوای ئەم هەرەسە نوێیە هەرێمەکان بەتەواوەتی چۆڵ ببوون، ئەو ناوچانەی (پەدەکە) چۆڵی کردبوون گەریلاکانی (پەکەکە) پڕیان کردنەوە، (پەکەکە) لەو شوێنانە بناغەیەکی وایدانا کە هەرگیز هەڵنەتەکێنرێن .

## بە مردوو لە دایک بووی ڕێککەوتنی (پەکەکە و یەنەکە)

(جەلال تاڵەبانی) سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (یەنەکە) لە ساڵی (١٩٨٤) لە هاوپەیمانی (الجبهە الوطنییە القومییە الدیمقراطیە) جیابووەوە و دوای گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێمی سەدامدا لەبارەی چارەسەکردنی کێشەی کورد لەگەڵ عێراق پێکنەهاتن و لە ساڵی (١٩٨٥) لە بەرەی (جود) خۆی نزیک کردەوە، بەگوێرەی بۆچونەکانی (جەلال تاڵەبانی) نەگەیشتنە ئەنجام لەگەڵ سەدام هۆکارەکەی دەوڵەتی تورک بووە، گوایە دەوڵەتی تورک بە سەدامیان وتووە ئەگەر ئۆتۆنۆمی بە کورد بدەیت ئەوا (یەنەکە) کوردەکانی سەر سنور دەوروژێنێت و ئەمەش ڕێ بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی خۆشدەکات، بەهۆی ئەم مەترسی و کاریگەرییەی تورکیاوە بووە سەدام ئۆتۆنۆمی بە کورد نەداوە،[٤١].

---

[٤١] بەگوێرەی (جەلال تاڵەبانی) ئەو سەردەمە یەکێتی سۆڤیەت لەبارەی دانی مافی ئۆتۆنۆمی لەلایەن سەدامەوە بە کورد عێراقیان ئاگەدارکردبووەتەوە، ڕۆژنامەی (ئیزڤەتییە) لەبارەی هەوڵی (یەنەکە) بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن لەگەڵ عێراق بە سەرکەوتن ناوزەند کردبوو، حکومەتی فەرەنسا بە ڕژێمی عێراقییان گوتبوو هەوڵ بدەن لەگەڵ کوردا ڕێکبکەون، لەهەمانکاتدا حکومەتی ئەمەریکا حکومەتی عێراقیان ئاگەدار کردبووەوە ئەگەر لەبارەی ئۆتۆنۆمییەوە لەگەڵ (یەنەکە) ڕێکبکەون ئەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵیان

دانوساندنی نێوان (یەنەکە) و عێراق بۆ رێککەوتن لەسەر چارەسەری پرسی کورد بووە هۆکار کە (جبهە وطنی) هەڵبوەشێتەوە، ئەندامانی (جبهە وطنی) ئەم دانوساندنەی (یەنەکە)یان پێقەبوڵ نەبوو، هەربۆیە ئەم جبهەیە پێش ئەوەی دەست بەکار بێت هەڵوەشایەوە، لەناو ئەم جبهەیەدا جگە لە (یەنەکە) کەسێکی تریان خاوەن هێزێکی ئەوتۆ نەبوو، یەکەمیان پەیوەندی نێوان (یەنەکە) و بەرەی (جود) لە رێی ئێرانەوە دەستی پێکرد، لە مانگی ئاداری ساڵی (١٩٨٦) لە نێوان (یەنەکە) و ئەندامانی بەرەی (جود)دا یەکەمین بەیاننامە بڵاوبووەوە، لەدوای راگەیاندنی ئەم بەیاننامەیە لە ١٩٨٧/١١/٨ یەکەمین دانیشتن لە نێوان (یەنەکە و پەدەکە) هاتەئاراوە[٤٢].

دەتوانین بڵێین شەڕی درێژخایەنی **(براکوژی)** لە باشوری کوردستان بەمشێوەیە کۆتایی پێهات، بەڵام ئەم نزیک بوونەوەیەی (یەنەکە و پەدەکە) بۆ بزاڤی کورد زۆر گرنگ نەبوو، ئەوان تەنها کۆتاییان بە شەڕی دژ بەیەک هێنابوو، لایەنەکان باوەڕییان بەیەک نەبوو، لەبارەی ماف و بەرگری و پاشەرۆژی کوردەوە ستراتیژییەکی هاوبەشیان نەبوو.

هەریەکەیان لەئاستی خۆیەوە و لە ناوچەکەی خۆیان بەردەوام بوون لە رابەرایەتیکردن بۆ رژێمی ئێران، ساڵەکانی ١٩٨٥ بۆ ١٩٨٨ بەو شێوەیە بەسەرچوو، هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتنی نێوان (پەکەکە و پەدەکە) رێکخۆشکەری بۆ نزیک بونەوەی نێوان (پەکەکە و یەنەکە)ی کرد، لەڕاستیدا نێوان (پەکەکە و یەنەکە) هیچ کاتێک تێکنەچوبوو، بەڵام بەباشیش هەژمار نەدەکرا، هۆکارەکانیش ئەوەبوون هەردوولایان لە دوو هەرێمی زۆر دوور لەیەک بوون. لە ساڵەکانی (١٩٨٠) بەدواوە لە شام و لوبنان لە نێوان (پەکەکە و یەنەکە) چەندینجار دانوساندن و چاوپێکەوتن هاتبووە ئاراوە، تاڵەبانی و ئۆجالان لە سوریا و لوبنان چەندینجار یەکتربیان بینی بوو، بەڵام ئەو رێککەوتنەی (پەکەکە) لەگەڵ (پەدەکە) کردی بووە هۆکار

---

نەپچڕن، هەروەها حکومەتی تورکیاش هەڕەشەی لە عێراق کردبوو ئەگەر ماف بدەیت بە کورد ئەوا هەموو بۆڕییە نەوتییەکان دادەخەین، لەکاتی دیدارەکاندا سەدام حوسێن پێشنیاری کردبوو لە نێوان حزبی بەعس و یەنەکە و حزبی شیوعیدا بەرەیەک دروست بکرێت، بەهۆی ئەم پێشنیارەی سەدامەوە دەرکەوت حزبی شیوعی پەیوەندی و نزیکایەتییان لەگەڵ رژێمی عێراقدا هەبووە، لەبارەی هەڵوێستی ئەمەریکاوە جەلال تاڵەبانی بە هەڵوێستی نەگونجاو و نا دۆستانە وەسف دەکرد و هەروەها حزبی شیوعی بە هاوپەیمانی سۆڤیەت دەهێنایە زمان، بەگوێرەی تاڵەبانی ئەمەریکا پێی وایە لەحاڵەتی نزیک بونەوەمان لە سۆڤیەت عێراقیش دەکەوێتە ژێر کاریگەری سۆڤیەتەوە.

[٤٢] ١٩ی تشرینی یەکەم ١٩٨٤ ( کوردستان پرێس )

هەتا ساڵی (١٩٨٤) نێوان (پەکەکە و یەنەکە) بگەهێنێتە ئاستێکی نزم، لەهەمانکاتدا کوشتنی (محەمەد قەرەسونگور) لەلایەن (یەنەکە) وە ببووە هۆکار باوەڕی بە (یەنەکە) نەهێنرێت، دوای ئەوەی بە فەرمی ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە و پەدەکە) هەڵوەشایەوە، (پەکەکە) بۆ ئەوەی لە باشوری کوردستان بەشێوەیەکی جدی باریان لێژنەبێت لە ساڵی (١٩٨٧) توانی ڕێککەوتنێک لەگەڵ (یەنەکە) دروست بکات، (یەنەکە)ش بۆ ڕێککەوتنێکی لەم جۆرە مەیلداربوو، دوای ئەوەی چەندینجار لەم بارەیەوە دیدار لە نێوان بەرپرسیارانی (پەکەکە) و (یەنەکە) هاتە ئاراوە و تاماوەیەکیش لەیەک دابڕان بەڵام لە ئاکامدا لەمانگی ئاداری ساڵی (١٩٨٨) لە نێوانیان ڕێککەوتنێک واژۆکرا، لەهەمان ئەو ڕۆژانەدا لە نێوان (پەدەکە، یەنەکە، حزبی شیوعی، پاسۆک، پارتی گەلی و حسک) ڕێککەوتن هاتەئاراوە و بەهەموویانەوە (بەرەی کوردستان)یان پێکهێنا، ئەم هاوپەیمانییە نوێیە لەکاتێکدا ڕوویدا کە خەڵکی باشور لە سەختترین ڕەوشدا دەژیان، ڕژێمی سەدام بێبەزەییانە بست بە بستی خاکی باشوری کوردستانی کردبوو بە خۆڵەمێش.

پرۆسەی ئەنفال هەرەسی شۆڕشی باشوریشی بەدوای خۆیدا هێنا، لە ١٩٨٨/٥/١ ڕێککەوتنێک لە نێوان (پەکەکە و یەنەکە) واژۆ کرا، ئەم ڕێککەوتنە لەلایەن هەردوو سەرۆکەوە واتا (عەبدوللە ئۆجالان و جەلال تاڵەبانی)یەوە واژۆکرا، ئەم ڕێککەوتنە لە ١٠ مادده پێکهاتبوو کە ئەمانە بوون :

١/ بەرپەرچدانەوەی هەموو هێرشێکی دوژمنانە بە بنەما دەگرین و تێکۆشانیش لەپێناو بەدیهێنانی یەکێتی نەتەوەیی دەکەین و تاج لەسەر هەموو دەستکەوتەکانی نەتەوەییمان دەنێین، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانیش پێویستی بە یەکڕیزی و بەرەیەکی فراوانی نەتەوەیی هەیە و چی لەئاستی هەرێمی یاخود ناوچەیی بێت پێویستە پردێک لە نێوان هەموو بەرە جیاوازەکاندا دروست بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە هاوکاری یەکتر بین و خەباتێکی هاوبەشیش پەیرەو بکەین .

٢/ پێویستە لە هەموو پارچەکاندا پەرەبە خەباتی چەکداری بدرێت، هەروەها پێویستە دژ بە چەمک و هزری خوڵقێنەری دووبەرەکی نێوان گەلەکەمان بوەستینەوە و بنبڕیان بکەین.

٣/ پێویستە لەگەڵ هێزە دیموکرات و شۆڕشگێڕە نەتەوە ژێردەستەکان کاربکەین و بۆ پشتگیریکردنی یەکتریش گەشە بە پەیوەندییەکان بدرێت.

٤/ پێش هەموو شتێک پێویستە بەشێوەیەکی هاوبەش هەنگاو بۆ ئاشتی و برایەتی و تەبایی بنێین و دەبێت هەوڵبدەین کێشە و گرفتی نێوان پارت و رێکخراوەکان نەهێلین و لەپێناو دۆزینەوەی چارەسەریش پەرەبە گفتۆگو بدەین، هەروەها پێویستە کۆتایی بە تۆمەتبارکردنی یەکتری بهێنین و ئەو تۆمەتبەخشینەوەی دژ بە یەکتری دەکرێت لە رێی دەزگا راگەیاندنەکانەوە کۆتاییان پێبهێنرێت، بۆ ئازادی گەلەکەشمان پێویستە گەل جۆشبدەین بۆ دەستپێکردنی سەرهەڵدان و بۆ ئەم مەبەستەش دەبێت پەرە بە شەڕی چەکداری بدەین، هەربۆیە داوا لە هەموو هێز و لایەنەکان دەکەین بێنە گۆرەپانی تێکۆشانەوە، بۆ بەدیهێنانی ئەم دەستکەوتانەش پێویستیمان بە روحی بەرپرسیارێتی و هەڤالایەتی هەیە و پێویستە ئاڵوگۆڕی هزری و بیربۆچونمان بکەین، لەم سۆنگەیەوە پێویستە هەموو ناتەبایی و ناحاڵیبونێک لەئاستی یەکتری وەلا بنێین، هەربۆیە بۆبەدەست هێنانی خواستەکانمان بانگەوازی دەکەین هەموو لایەنە شۆڕشگێرەکان بەدەم ئەم داخوازییەمانەوە بێن.

٥/ ئێمە تێکۆشان و خەباتی گەل و خەباتی چەکداری کۆمەڵان و بزووتنەوەی دیموکراتی نەتەوەیی کە هیوای راستەقینەی گەلەکەمانە بە مافێکی رەوا دەبینین، لەئاستی هەرە بەرز و بە شۆکدارییەوە پەرە بەم تێکۆشانە دەدەین و ئەم چەمکەشمان کردووە بە بەردی بناغەی شۆڕشەکەمان، بۆئەم مەبەستەش و بۆ یەکڕیزی نێوانمان بانگەوازی بۆ هەموو هێزە کوردستانییەکان دەکەین بێن بەدەنگمانەوە و شانبەشانی یەکتری ئامانجەکانمان بپێکین، بۆ ئەم مەبەستەش هەوڵی پێشخستنی خەباتی کۆمەڵایەتی، کولتوری، سیاسی و ئابوری دەدەین.

٦/ پێمانوایە کە پێویستە پەرە بدەین بە شەڕی دژ بە کۆنەپەرستی و سیاسەتی تۆقێنەری دوژمن و پەرە بدرێت  بە یەکڕیزی هێزە نەتەوەییەکان و بۆ ئەم مەبەستانەش پشت بە پەیوەندی و رێککەوتنی نێوان هێزەکان دەبەستین، پێمان باشە پەیوەندی بێ بنەما و بێ کەڵک دروست نەکرێت، هەربۆیە پێویستە پەیوەندییەکان لە چوارچێوەی رێزگرتنی ئایدۆلۆژی سەربەخۆ و سیاسی و رێکخستنیدا بێت و لەهەر پارچەیەکی کوردستان بێت دەبێت موداخەلە و دەستوەردان لە کاروباری ناوخۆی یەکتری نەکەین و رەوشی تایبەتمەندی هەرێمایەتی یەکتری رەچاو بکرێت و ئەگەربتوانین بەم شێوەیە مامەڵە بکەین ئەوا دەتوانین پەیوەندی پتەو لەناو یەکتردا دروست بکەین.

٧/ هێزە دەرەکییە کۆلۆنیالیستەکان هەوڵی ئەوە دەدەن تێکۆشان و شۆڕشە ڕەواکەمان نەهێڵن و بۆ ئەوەی لەئاستی ڕای گشتی و گەلەکەیشمان شۆڕشەکەمان ڕەش بکەن لەناو خەباتێکی چڕدان، لەژێر ناوی ئەوەی گوایە ئێمە ' سیخوڕی فلان هێز و وڵاتین و خەباتەکەمان خەباتێکی تیرۆریستانەیە، دەیانەوێت بەم تۆمەتانە لەبەرچاوی جیهان ڕەشمان بکەن و نەک ئێمە بەڵکو خۆیان بە پارێزەری مافی مرۆڤ لە جیهاندا لەقەڵەم بدەن، ئێمە لەئاستی خۆمان ئەم درۆ و تۆمەتە بێ بنەمایانەی هێزە دەرەکی و کۆلۆنیالیستەکان بە درۆ و بوختان دەزانین و بە ڕەوا نابینین، هەربۆیە پێمان باشە لەهەمبەر ئەم هێزە چەواشەکاریانە و بۆ شەرمەزارکردنیان بەشێوەیەکی چڕتر و باشتر تێکۆشانی ڕزگاری نەتەوەییمان پێشبخەین و بۆئەم مەبەستەش پێویستە هاوکاری و پشتگری هەموو چینی چەوساوە بکەین و خەبات و شۆڕشی کوردستان پێشتر بخەین.

٨/ بەهۆی ئاڵۆزی و گرژی و ئەو شەڕەی لە هەرێمەکەماندا هەیە پێویستە خۆمان لە هەموو جموجۆڵێک بە دوور بگرین کە دەچێتە خزمەتی ناحەز و دوژمنانەوە، هەربۆیە پێویستە هەموو هێزە کوردستانییەکان بە سەرنجەوە مامەڵە بکەن، پێمان وایە دەبێت بەیەک دەنگی و بە هاوبەش دژی هێزە کۆلۆنیالیستەکانی کوردستان هەڵویست بگرین.

٩/ ئێمە دڵنیاین هێزە کۆنەپەرست و کۆلۆنیالیستەکان بۆ ئەوەی نەمانهێڵن بە هەموو شێوەیەک دژ بە بزووتنەوەی کورد دەجەنگن تاکو گەلەکەمان بێ پشتیوان و لەناو تاریکی کۆنەپەرستییەدا بهێڵنەوە، هەمان ئەو هێزانە بۆئەوەی سەربەخۆیی و ئازادی گەلەکەمان بەدەست نەیەت ئەوەی لەدەستیان بێت لەهەمبەرمان تاقیدەکەنەوە، چونکە دەزانن ئەم تێکۆشانەمان شۆڕشێکی ڕەوایە و ئاشتی سەرتاسەری بەرقەرار دەکات، ئەو ڕەوشەی ئێستا تێیداین و لەحاڵەتی ئەو ڕەوشانەی کە لەوانەیە بێنە ئاراوە و دەبنە هۆکار بۆ نەهێشتنی دەستکەوتەکان، بێگومان ئێمە درک بەم ڕەوشە ناسک و هەستیارە دەکەین، لەم قۆناغی ڕزگاری نەتەوەییەدا کە چەمکی ڕاستەقینە و خواستی هەموو لایەکە، داوا لە پارت و ڕێکخراوەکان دەکەین با کاتی خۆیان بە کاری لاوەکی و تێکدەری خەرج نەکەن و سەرقاڵی تێکۆشانی نەتەوەیی بن، ئێمە هەست بە بەرپرسیارێتی مێژووی دەکەین هەربۆیە خەباتی چەکداری بە بنەما دەگرین، لەم سۆنگەیەدا بانگەوازی دەکەین بەرەیەکی فراوانی نەتەوەیی پێکبهێنرێت و لە هەموو پارچەکانی کوردستان تێکۆشانی ڕاستەقینە بە بنەمان بگیردرێت.

١٠/ دەرەنجام پێمانوایە پێویستە هەموو هێزە دیموکرات و شۆڕشگێڕەکان لەپێناو دامەزراندنی بەرەی نەتەوەیی بکەونە ناو دانوساندنێکی کوردستانییەوە و بۆ ئەم مەبەستەش دانوساندن لەگەڵ هێزە تورک و عەرەب و گەلانی تری شۆڕشگێڕەکان بکرێت، ئێمە لە هەرێمەکەماندا دژ بە هەموو هێزێکی هاوبەش و کۆنەپەرست و ئیمپریالیست دەبینەوە، هەوڵدەدەین مافی چارەنوسی گەلەکەمان بەدەست بخەین تاکو بتوانن ئازادی و هەڵبژاردەی ژیانیکی ئازاد بۆ خۆیان بەرقەرار بکەن.

**لە کۆتایدا دەڵێین سەرکەوتن بۆ هەموو شۆڕشێکی ئازادیخواز.**

بەڵام دوای واژۆکردنی ئەم رێککەوتنە لەگەڵ (پەکەکە)دا (جەلال تاڵەبانی) چوو بۆ ئەمەریکا و لە کۆبونەوەیەکی رۆژنامەوانیدا وتی (**دەتوانم قەناعەت بە پەکەکە بکەم دەستبەرداری خەباتی چەکداری ببێت**)، ئەم قسەیەی (جەلال تاڵەبانی) لەگەڵ ناوەڕۆکی رێککەوتنەکەیان لەگەڵ (پەکەکە) ناکۆک بوو. یەکێک لە مادەکانی رێککەوتنەکە باسی لە پەرەپێدانی خەباتی چەکداری دەکرد، بەگوێرەی (جەلال تاڵەبانی) ئەگەر وەلاتانی رۆژئاوا بەهانای خواستەکانی کوردەوە بێن ئەوا کورد دەتوانێت دەستبەرداری خەباتی چەکداری ببێت [٤٣]، (جەلال تاڵەبانی) کە سکرتێری (یەنەکە) بوو، بەهۆی ئۆپەراسیۆنی ئەنفالی سەدامەوە رێکخراوەکەی بوونی نەمابوو، تەنانەت هێزی چەکداریشی نەمابوو، بۆیە ئێستا بە سنگێکی فراوانەوە تێکۆشانی دیبلۆماسی دەخستە سەر مێز، ئەم بۆچونانەی (جەلال تاڵەبانی) لەلای (پەکەکە) ببووە مایەی گومان چونکە (پەکەکە) خەباتی چەکداری کردبوو بە بنەمای شۆڕشەکەی و لەهەمبەر ئەم گۆڕانکاریەی (جەلال تاڵەبانی)یەوە (پەکەکە) پێیوابوو روبەڕوی گەلەکۆمە بووەتەوە[٤٤].

لە پاریسی پایتەختی فەرەنسا بە سەرپەرشتی حکومەتی فەرەنسا لەبارەی دۆزی کوردەوە لە ١٤و١٥ مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٨٩) کۆنفرانسێک بەسترا، لەم کۆنفرانسەدا (جەلال تاڵەبانی)ش بەشداربوو، تاڵەبانی هەمان بیروبۆچونە کۆنەکەی خۆی هێنایەوە زمان و دەیوت خەباتی چەکداری کاریگەری نەماوە هەربۆیە خۆیان وەکو (یەنەکە) بایەخ بە خەباتی چەکداری نادەن[٤٥].

---

[٤٣] حوزەیرانی ١٩٨٨ ( سەرخۆەبون )

[٤٤] حوزەیرانی ١٩٨٨ ( سەرخۆەبون )

[٤٥] تشرینی یەکەم ١٩٩٢ کورد لە کۆنفرانسی (پاریس) دەزگای (دۆز ) .

ڕێككەوتنی نێوان (پەكەكە و یەنەكە) بە مردووی لەدایک بوو، سەركردایەتی (پەكەكە) جەلال تاڵەبانییان بەوە تۆمەتبار دەكرد گوایە (جەلال تاڵەبانی) لەسەر پشتی ئەوان لەگەڵ حكومەتی توركیا و (سی ئا ئەی)ی ئەمەریكی مامەڵە دەكات، بەمشێوەیە ئەم ڕێككەوتنەی نێوانیان بەبێ ئەوەی كاری پێبكرێت لەسەر كاغز بە ووشكراوەیی مایەوە. ماوەیەكی دوورودرێژ پەیوەندی (پەكەكە) لەگەڵ كوردانی باشور بەو شێوەیە درێژەی خایاند، ئەوكاتەی شاخەكان لەلایەن پێشمەرگەوە چۆڵكران (پەكەكە) لەناوچەكە كێشەیەكی ئەوتۆی بۆ نەدەهاتە ئاراوە و كاتیان وەک ئاو بەسەردەبرد، گەورەترین كێشە هاتبێتە ئاراوە ئەوەبوو لە ساڵی (١٩٨٩) كوشتنی (٦) پێشمەرگەی (پەدەكە) بوو لەلایەن گەریلاكانی (پەكەكە)وە، پارتەكانی باشور خەباتی ناو وەلاتیان وەلا نابوو، لەجیاتی چەک ئالای تێكۆشانی كاری دیبلۆماسییان هەڵكردبوو، دەیانویست لە دەرەوەی وەلات زوڵم و درندەیی سەدام حوسێن بە جیهان بناسێنن، كەچی ئەو وەلاتانەی كە پارتە كوردییەكانی باشور سكالای سەدامیان لەلا دەكردن فەرەنسا و ئەڵمانیا بوون كە هەردووكیان لە هەموو وەلاتانی تر زیاتر هاوكاری سەدامیان دەكرد، ئەو چەكە كیمیاییەی سەدام هەڵەبجەی پێبۆردۆمانكرد لە ئەڵمانیای كڕیبوو، ئەو فڕۆكەیەی كە بۆمبە كیمیاییەكەیان هەڵگرتبوو و بۆردۆمانی هەڵەبجەیان كرد فەرەنسی و رووسی بوون. لەهەمانكاتدا (پەكەكە) خەباتی چەكداری لەناو وەلات پەرە پێدەدا و چڕتری دەكردەوە، هەربۆیە تا دەهات ئەو بارەگایانەی لە نزیک سنورەكانی نێوان باكور و باشور بوون كە لەلایەن سوپای توركەوە دروستكرابوون بە شێوەیەكی ئاشكرا ببوونە هەدەفی گەریلاكانی (پەكەكە) .

## نەهاتنەدی خەونی یەکێتی نەتەوەیی و راپەڕینی ساڵی (١٩٩١)

نەمانی سۆسیالیزم لە سۆڤیەت و رۆژهەڵاتی ئەوروپا بووە هۆکار ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانیان لە جیهاندا هەژمونی خۆیان زیاد بکەن، لەدوای ئەم گۆڕانکارییە ئەمەریکا سوور بوو لەسەر ئەوەی نەخشەی جیهانێکی نوێ بنەخشێنێت و شکلێکی نوێی بە بەردا بکات.

دوای هاتنەئاراوەی ئەم گۆڕانکارییانە و نەمانی سۆسیالیزمی بونیاد نراو کێشەی نەتەوەیی بڵێسەی گرت، شەڕێکی زۆر لەناوچە جیاوازەکان و لە ئاسیای ناوەند و قەفقاس و بالکان لەپێناو ئازادی نەتەوەییدا هاتنە ئاراوە، ئەم ئاڵۆزی و گرژییانە بوونە هۆکار ئەمەریکا بەبیانوی بەرگریکردن لە مافی مرۆڤ لە هەرێمەکانی ئەو وەڵاتانە موداخەلە بکات و جێگیرببێت. رۆژهەڵاتی ناوین بەردەوام کێشەی هەبوو، ئەم کێشانەیەش کۆتاییان نەدەهات، هەموو ئەمانە بوونە هۆکار کە ئەمەریکا چاویان لێببڕێت و لەسایەیاندا لە هەرێمە خۆی جێگیر بکات. لە ٢ی گەلاوێژی ساڵی (١٩٩١) عێراق وەڵاتی کوێتی داگیر کرد و ئەمەش بوو بە بەهانەیەک ئەمەریکا روو لە رۆژهەڵاتی ناوین بکات و لەو شوێنانەی دەیەویست جێگیر ببێت، لەسەر داخوازی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاردرا ئەمەریکا پەلاماری عێراق بدات، ئەم

بڕیارەی نەتەوە یەکگرتووەکان عێراقی توشی شۆک کرد، لەم شەڕەدا تورکیا لایەنگر و پشتیوانی ئەمریکا بوو، بێشک تورکیا لەهەمبەر ئەم پیاوەتییەیدا داوای پشکی خۆی دەکرد. ئەو سەردەمە لە تورکیا پارتی (دایکی نیشتیمان) بە سەرۆکایەتی (تورگوت ئۆزال) لەسەر دەسەلات بوو، ئەم حکومەتەی تورگوت ئۆزال هەتا بیناقاقای لە قەرزدا بوو، هەروەها ڕوبەڕوی قەیرانێکی گەورەی دارایی ببووەوە، ئەمەی ئێستا ڕوویدابوو بۆئەوان دڵخۆشکەرە بوو کە چاو لە داهاتی نەوتی کەرکوک و موسڵ ببڕن و لەلایەکیشەوە لەهەمبەر پشتگیریکردنی ئەمەریکا بتوانن پارە لە ئەمەریکاوە بەدەست بخەن، لەلایەکی تریشەوە دەیانویست (پەکەکە) لە هەرێمەکە دەربکەن. شەڕی کەنداو بۆ کوردی باشور هەلێکی زێڕینی مێژوویی بوو، ئەگەر بیانتوانیایە ئەم هەلە بەباشی بقوازنەوە ئەوە پێشکەوتنێکی باشیان بەدەست دەخست و سودێکی باشیان دەبینی. (پەکەکە) چاوی لە گۆڕانکارییەکان بڕی بوو هەربۆیە بۆ ئەم مەبەستە بانگەوازیی کرد سوود لە ڕەوشەکە وەربگیردرێت و بانگی هەموو هێزە کوردی و کوردستانییەکانی کرد لەسەر مێزی یەکێتی نەتەوەیی دابنیشن [٤٦]، هێزە کوردییەکان بە گشتی ڕەزامەندی خۆیان بۆ پێکهێنانی یەکێتی نەتەوەیی نیشاندا، لە مانگی شوباتی ساڵی (١٩٩١) سەرکردایەتی (پەکەکە) بە ئامانجی بەدیهێنانی یەکێتی نەتەوەیی بەجیا کۆبونەوەیان لەگەڵ بەرەی کوردساتنی و (پدەکە و یەنەکە) و (پەدەکە ئێران) کرد، لەئاکامی ئەم کۆبونەوانەدا کۆمیەتی ئامادەکاری یەکێتی نەتەوەیی دروستکرا[٤٧] ، پێکهێنانی ئەم کۆمیتەیە بۆ گەلی کوردستان تیشکی هیوایەکی نوێ بوو بەڵام مەخابن مێژووی هەموو کورد لە هەموو قۆناغەکاندا لەیەک دەچن، مەخابن مێژووی کورد یەکێکی تر دیاری دەکات و یەکێکی تریش دەینوسێتەوە، ئەمجارەیشیان هەر وایلێهات، ئەو دیمەن و تابلۆیانەی هاتنە ئاراوە مەخابن ئەوەیان نیشان دەدا یەکێتی نەتەوەیی وەلا نرابێت، ئەو کۆبونەوانەی بە مەبەستی یەکێتی نەتەوەیی هاتبوونە ئاراوە یەکەمجار بوو هەرچوار پارچەی کوردستانی گرتبێتەوە، پارتەکانی باشور هەموو خەیاڵ و خەونی دێرینی گەلی باشوریان لەناو بوخچەیەک پێچایەوە، ئەو بارودۆخە نوێیەی لە عێراق و ناوچەکاندا هاتبوونە ئاراوە

---

[٤٦] ای ئاداری ١٩٩١ ( سەرخوەبون )

[٤٧] هەمان سەرچاوە

وایپێویست دەکرد بەرپرسیاریتییەکی زیاتر لە ئەستۆ بگرن هەروەها پێویستی دەکرد بەرامبەر بە ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی سیاسەتێکی حەکیمانە و دروستانە رچاو بکەن.
سەدام کورسییەکەی ژێری شکابوو وە شلۆقی کەوتبووە دەسەڵاتەکەیەوە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش وازی لە کورسییەکەی نەدەهێنا، بەهۆی هێرشەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانەوە سوپای عێراق بەتەواوەتی لاواز و پەرتەوازە ببوو، لاوازی و نەمانی سوپای عێراق کەلێنێکی باشی بۆ کورد و شیعە دروستکرد و لەئاکامدا لە مانگی ئاداری ساڵی (١٩٩١) راپەڕینی جەماوەری دەستی پێکرد، ماتۆڕی هێزی راپەڕینەکەش بە گشتی ئەو جاشانەبوون کە رۆژێک پێش راپەڕینەکە جاشی سەدام بوون.
دوای ئەوەی گەل لەسایەی راپەڕینەکەیاندا رژێمی سەدامیان لە باشوری کوردستان وەدەرنا (پەدەکە و یەنەکە) بوون بە حاکمی موتڵەقی کوردستان، بەمشێوەیە کاروبارەکانی پێکهێنانی یەکێتی نەتەوەیی وەلانران، خەیاڵ و خەونی یەکێتی نەتەوەیی جارێکی تر بەبێ ئەوەی بێتە دی کەوتە ژێر خاک، لەبارەی کۆنفرانسی یەکێتی نەتەوەییەوە لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩١) جەلال تاڵەبانی وتی (**ئەگەر قسمەت بێت یەکێتی نەتەوەیی لە کوردستانی ئازاد دەبەستین**)،[٤٨] ، بەڵام لە رواڵەتدا لەوە دەچوو خەونی یەکێتی نەتەوەی بە قسمەتی گەلی کورد نەبێت.

[٤٨] دیمانەی فەیسەل داغلی لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا ١٩ی گوڵانی ١٩٩١

## راپەڕینی مەزن لە نەورۆزی (١٩٩١) دا

لە سەروبەندی شەڕی کەنداوی دژ بە عێراقدا بوو لە باشوری کوردستان خەڵکی شاری (رانیە) یەکەم فیشەکەی راپەڕینیان تەقاند، ئەم راپەڕینە لە ٥ ی ئادار دەستی پێکرد و بوو بە هەوێن خەڵکی بە گشتی لە شارەکانی تریشدا راپەڕین بکەن، رۆژێک پێش راپەڕینەکە واتا لە ٤ ی ئادار لە بازاڕی رانیە چەند لاوێک لەگەڵ سەربازەکانی ناو شار دەبێتە شەڕیان و بۆ رۆژی دوایی ئەم راپەڕینەی لێهاتە ئاراوە، بە گشتی خەڵکی بەگژی سەربازەکانی رژێمدا هاتن و سەربازەکانیش ئەو توانا و هێزەیان نەبوو لەهەمبەر خەڵکیدا خۆیان راگرن، سەربازەکانی رژێم بەتەواوەتی وورەیان روخابوو هەروەها رادیۆکەی (یەنەکە) رادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان) پەخشێکی زۆرباشی حەماسی کرد و خەڵکی پێوروژا و لەئاکامدا لە ٧ی ئادار خەڵکی بەتەواوەتی راپەڕین و رانیەیان ئازاد کرد، (فەرهاد سەنگاوی)ش کە بێژەری رادیۆکە بوو بە دەنگە زولاڵەکەی توانی تینوێتی تۆڵەی خەڵکی دابمرکێنێتەوە و وورەیەکی باشی بە خەڵکەکە بەخشی، راپەڕین سەرتاسەری رانییە و ناوچەکانی دەروبەری گرتووە و خەڵکی دەستیان گرت بەسەر هەموو باڵەخانە حکومی و دامودەزگای ئەمنیەت و ئیستیخباراتی رژێمی عێراق.

لە ناو شاری رانیە شوێنە فەرمییەکان سوتێنران و خاپور کران، تەنانەت لە سلێمانیش ئەو باڵەخانەیەی بە ناوی (ئەمنە سوورەکە) کە ببووە مایەی تۆقین و شوێنی مەترسی بۆ خەڵک لە ئەنجامی راپەڕینی خەڵکدا دەستی بەسەردا گیرا و هەموو ئەمن و سەرباز و ئیستیخباراتی ناویان کوشت. دوای راپەڕینی خەڵکی سلێمانی ئەمجارەیان سرە هاتە سەر شاری هەولێر، لە ١٠ی ئادار حکومەتی عێراق قەدەغەی هاتوچۆی راگەیاند، بە سوود وەرگرتن لەم بڕیارە ئەفسەر و پیاوە پلە بڵندەکانی ئیستیخبارات توانیان لەناو شاری هەولێرهەڵبێن و خۆیان لە چنگی خەڵک رزگار کرد، سەرۆک عەشیرەتەکان کە سەرۆک جاشیش بوون، لەناویاندا (کەریم خانی برادۆست، عومەر سورچی و قادر بەگ) لە شەوی ١٠ی ئادار ئەو چەکانەی

که هەیانبوو بەسەر خەڵکدا دابەشیان کرد و بۆ سبەی لەڕێی ئەو شفرە نهێنییەی لە رادیۆی (دەنگی گەلی کوردستان)وە راگەهێنرا گەل بە گشتی راپەڕین، لەو شەڕو پێکدادانەی لە نێوان گەل و پیاوانی رژێمی سەدامدا هاتە ئاراوە نزیکەی (٢٠٠) کەس گیانیان لەدەستدا، بنکە سەربازییەکانی چواردەوری شارەکان کە ژمارەی سەربازەکانیان نزیکەی ٥٠٠٠٠ هەزار سەربازێک دەبوو هەموویان بەبێ تەقە خۆیان دابەدەستەوە، دوای دوو رۆژ بەسەر راپەڕینەکەدا ئەو یەک دوو دەستە پێشمەرگەی لە سنورەکان جێگیرکرابوون گەڕانەوە ناو شاری هەولێر.

دوای ئەم راپەڕین و ئازادکردنەی شارەکان ئەمجارەیان گەل خۆیان سازدا بۆ ئازادکردنی شاری کەرکوک، لەئاکامی ئەم راپەڕینە ژمارەیەکی زۆری ماشێن و چەک بەدەست کەوتن، گەل لە ١٢ی ئادار هێرشیان کرد بۆ شاری کەرکوک، ئەو دوو فرۆکەخانەی کەلە کەرکوکدا بوونیان هەبوو لە ١٩و٢٠ی ئادار کەوتنەژێر دەستی خەڵکی راپەڕیو، لەئاکامی ئەم شەڕانەدا خەڵکێکی زۆر گیانیان لەدەستدا، هێزی سوپای عێراقیش زیانێکی زۆریان بەرکەوت، لەکاتی هێرشەکان بۆسەر کەرکوک لاشەیەکی زۆر لەسەر شەقامەکان کەوتبوون، گەلانی وەک (کورد، عەرەب و تورکمان) کەلە کەرکوک دەژیان هەموویان تێکڕا بەشداریان لەم راپەڕینە کرد، پێش راپەڕینەکەش کەسانێکی زۆری شاری کەرکوک لەترسی گیانی ماڵ و منداڵیان بۆ شاری هەولێر و سلێمانی و شارەکانی تر هەڵاتبوون، دەتوانرێت بوترێت دوای ئازادکردنی شارەکانی تری وەک (خانەقین، کفری، کەلار، دوزخورماتو، شێخان، دوبس، سەیدسادق و چەمچەماڵ) هەموو هەرێمی سۆران ئازادکرا. راپەڕین لە هەرێمی بادینان درەنگتر دەستی پێکرد، لەدوای سەرهەڵدانی (ئامێدییە و سەرسەنگ) لە ١٥ی ئادار راپەڕین دهۆکیشی گرتەوە، دوای سەرهەڵدانی شاری دهۆک شارۆچکەی زاخۆ لە سووپای عێراق پاککرایەوە، لە خاکی باشوری کوردستان تەنها شاری موسڵ بەدەست عێراقەوە بوو، پاشان خەڵک بۆ ئازادکردنی شاری موسڵ قۆڵی خۆیان لێهەڵماڵی.

لە ٢٠ و ٢٢ ی شوبات دوای راگرتنی هێرشەکانی ئەمەریکا بۆ سەر عێراق لە باشوری عێراق راپەڕین لە شاری (بەسرە) دەستی پێکرد کە شیعە نشینە و دوایش شارەکانی تری وەک (ناسرییە، کوت، عیمارە، سەماوە، نەجەف و کەربەلا)ی گرتەوە، سەربازی سوپای عێراق و ئیستیخباراتی عێراقیش لەهەمبەر ئەم راپەڕینانە خۆیان پێڕانەگیرا و لە شوێنەکانی

خۆیان هەڵاتن، بەمشێوەیە ناوچەکان بەتەواوەتی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی شیعەوە. ئەمەریکا قەدەغەی فڕینی فڕۆکە و کۆپتەری عێراقی ڕاگەیاندبوو، لەم کاتوساتەدا زۆرینەی پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی لە ئێران بوون و دوای ئەم گۆڕانکارییە مەزنە هێواش.. هێواش گەڕانەوە بۆ کوردستان، بێشک دوای پرۆسەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفالی سەدام حوسێن پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی هێزێکی ئەوتۆیان نەمابوو، هەروەها ئەوانەیشی مابوون بەتەواوەتی لە ئێران بوون و هەندێکیشیان خۆیان گەیاندبووە ئەوروپا، تەنانەت فەرماندە و پلە بەرزەکانی ناو (پەدەکە و یەنەکە) لە ئێران و سوریا دەژیان، تەنانەت خودی (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) بەردەوام لە ئێران و سوریا و ئەوروپا بوون. دوای پرۆسەی ئۆپەراسیۆنی ئەنفال هێزی پێشمەرگەی (یەنەکە) زیاتر قورسایی خۆیان دابووە (زەڵێ و ناوزەنگ)، هەوڵیان دەدا جارێکی تر خۆیان کۆبکەنەوە بەڵام نەیاندەتوانی، تەنانەت پارتەکانی تری وەک (پەدەکە)ش هەمان شێوەبوون. لەدوای هاتنە ئاراوەی گۆڕنکاری لە کەنداوی عەرەبی و شەڕی ئەمەریکا دژ بە عێراق، بە درککردن بە گۆڕانکارییەکان بەرەی کوردستانی زووتر کەوتەن جوڵە و نامەی شۆڕش و بەرەی کوردستانیان نارد بۆ سەرۆک جاشەکان و پێیانیان وتبوو رژێمی سەدام لەسەر دەسەڵات نامێنێت و ڕاپەڕین دێتەئاراوە و داوایان لێدەکردن بێنە ریزی گەلەوە و ئەگەر ئەمە قەبوڵ بکەن ئەوا بەرەی کوردستانیش لەئاستی هەر شتێک کردبێتیان لێیان خۆش دەبن، لە سەرەتای دەستپێکردنی هێرشەکانی هاوپەیمانان روو لە عێراق رادیۆی (دەنگی گەلی کوردستانی)ی سەربە (یەنەکە) بەردەوام پەیامی هەڵگیرسانی ڕاپەڕین و سەرهەڵدانی پەخشدەکرد و شفرەی نهێنی شانەکانی پێشمەرگە و ڕێکخستنی ناوشاری بڵاو دەکردەوە.

## ڕەوی مەزن

سەرەڕای قەدەغەکردنی فڕینی فڕۆکە و کۆپتەری عێراقی لەلایەن ئەمەریکاوە بەڵام عێراق بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕینەکان چەند کۆپتەریکیان هەڵساند بەڵام سوپای ئەمەریکا لێیاندا و خستییانە خوارەوە، بەڵام نازانرێت چۆن و لەبەرچی لەناکاو ئەمەریکا بڕیاریدا بە ئامانجی فریاکەوتنی کاروباری مرۆیی عێراق دەتوانێت کۆپتەر هەڵسێنێت، بێشک ئەمە پەیامێک بوو بۆ رژێمی عێراق، ئەمەریکا هەلی بۆ عێراق رەخساند ئامانجە گرنگەکانی خۆی بەدیبهێنێت، بەم پەیامەی ئەمەریکا بۆ عێراق توانرا لەلایەن عێراقەوە خەونی سەربەخۆیی کورد و شیعە تارادەیەک لەچاڵ بنرێت، (جۆرج بووش)ی سەرۆکی ئەوسای ئەمەریکا کە خۆی وەک پارێزەری مافی مرۆڤ لە قەڵەم دەدا، دیاربوو لەئاستی دەرکردنی ئەم بڕیارە زۆری لەخۆی نەکردبوو، بەمشێوەیە لەبارەی کۆتایی دەرەنجامەکان هەموو شتێک سەروبن بوو، ڕووخانی سەدام لەلایەن ئەمەریکاوە وەکو دەرکردنی تاڵەمویەک بوو لەناو ماستدا، ئەمەیان نەکرد چونکە پێیان وابوو کەسێکی گونجاو نابینرێت کەلە شوێنی سەدام دایبنێن، هەربۆیە بەگوێرەی حیسابی سیاسی و بەرژەوەندی خۆیان ئەمەریکا پێی باشبوو تاڕادەیەک سەرهەڵدانە گشتییەکەی عێراق کۆنترۆڵ بکرێت و عێراق کەمێک هۆشی بهێنێتەوە سەرخۆی. لەگەڵ ئەم پەیامەدا سەدام حوسێن بەبێ لەدەستدانی کات کەوتە جوڵە، سەرەتا لە شیعەکانەوە دەستی پێکرد، لە شارەکانی (نەجەف و کەربەلا) بە هەزارەها شیعەی کوشت، دوای ئەم کوشتارە ڕووی سەربازەکانی لە کوردستان کرد، یەکەم هەنگاویشیان کەرکوک بوو، بەهۆی کەمبونەوەی ژمارەی سڤیلی بەرگری و پێشمەرگە شاری کەرکوک توانی تەنها ٣ بۆ ٤ ڕۆژێک بەرگری بکات، لە کەرکوک جگە لە کورد ئەوانی تری وەک (عەرەب و تورکمان) بەرگرییان نەکرد، دوابەدوای ئەم شکستە لە کۆتایی مانگی ئادار لە کەرکوکەوە ڕەوی مەزن دەستی پێکرد و لە ٣٠ ئاداریشدا هەولێریشی گرتەوە، سوپای سەدام لەدوای گرتنەوەی کەرکوک و مەخمور پەلاماری هەولێریاندا، لە ڕۆژی ٣١ ی ئادار سوپای سەدام

به پشتیوانی کۆپتەری سەربازی خۆیان کرد بە ناو هەولێردا، سەرەتا ناو شاریان بە چڕی بۆردۆمانکرد، پێشمەرگەش بەرگری کرد، بەڵام لە پێدەشتەکانی هەولێر پێشمەرگە نەیتوانی خۆڕاگری بکەن و کشانەوە، ئەم کشانەوەیە بوو بە مایەی شڵەژاوی و نیگەرانی خەڵکی و بەم هۆیەشەوە ڕەوی مەزن دەستی پێکرد.

گەنجێکی زۆری چاونەترس بە چەکەوە لەناو شار مابوونەوە، بەڵام فەرماندەیەکی پێشمەرگە نەبوو بتوانێت فەرمانداریتییان بکات و شەڕ بکەن، فەرماندە و پێشمەرگەکانیش بۆ رزگارکردنی ژن و منداڵ و خێزانەکانیان لەگەڵ خەڵکی سادەدا دەستیان بە ڕەو کردبوو، بەمشێوەیە هێزی پێشمەرگە و خەڵکی بەرگریکەر لە مەیدانەکاندا نەمان، هەموویان سەرقاڵی رزگارکردنی گیانی خۆیان و خانەوادەکانیان بوون، تەنانەت سەرکردەی پێشمەرگە (کۆسرەت ڕەسول)یش ئەوکاتەی هەڵاتبوو یەک پاسەوانی لەگەڵدا مابوو، لەبارەی جێهێشتنی خەڵکی لەلایەن سەرکردە و فەرماندەکانی پێشمەرگەوە، نوسەرێک دەڵێت (**ئەوکاتەی خەڵکی هەڵدەهات فەرماندەکانی پێشمەرگە بە دزیکردنەوە سەرقاڵ بوون**) .

سەرژمێری دانیشتوانی ئەوکاتەی شاری هەولێر بە ٦٠٠ یان ٧٠٠ هەزار کەس مەزەنە دەکرا، بەڵام دوای دەستپێکردنی ڕەو نزیکە ٥٠٠٠ هەزار کەسێک لەناو شار مابونەوە کە زۆربەیان گەنج بوون، لەئاکامی هێرشەکانی سوپای سەدام ژمارەیەکی زۆر لەو گەنجانە کوژران، سەربازەکانی سەدام تەنانەت دیلیشیان دەکوشت، ئەو نەخۆش و بریندارانەی کەلە نەخۆشخانەکانیشدا بوون دەستییان لێنەپاراستن، ئەو خەڵکەی بە پێ لە نێوان شارۆچکەی (کۆیە و سڵاحەدین) ڕێیان دەکرد لەلایەن کۆپتەرەکانی سەدامەوە دەسترێژیان لێدەکرا، بەگوێرەی سەدام دەبوایە ئەوەی کورد بێت بکوژرێت، تەرمی سەدان کەس هەتا چەندین مانگ لە پێدەشتەکان مابوونەوە، تاکو ئێستاش لە هەولێر لە گۆڕستانی (مەعمەل قیرەکە) بە سەدان گۆڕی کوژراوانی ئەو سەردەمەی لێیە.

## پەیوەندییەکانی نێوان هەولێر و ئەنقەرە

لە ١٩٩١/٣/٨ بۆیەکەمجار و بە شێوەیەکی نافەرمی و کتوپڕ سکرتێری (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی پێی نایە خاکی تورکیاوە، جەلال تاڵەبانی لەگەڵ موحسین دزەیی بە فڕۆکەیەکی سوری هاتن بۆ ئیستەنبوڵ، پاشان دەچن بۆ ئەنقەرە و سەرەتا چاویان بە سەرۆکی (میت)ی ئەوسا (تیۆمان کۆمان) کەوت و پاشان چاویان کەوت بە راوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی تورکیا (توگای ئۆزچیری) .

ئەم کۆبونەوانە لە هۆتێلی (پالاس) زۆر بە نهێنی ئەنجامدران، بەگوێرەی بۆچونەکان وادیاربوو ئامانجی سەردانەکان پێکراون و لە نێوانیاندا بڕیاری هاوپەیمانی دراوە نەدەخوازرا ئاشکرا بکرێت، لە دوایشدا ئەم دیدارانە ستاتۆیەکی فەرمی وەرگرت، سەرۆک کۆماری ئەوسای تورکیا (تورگوت ئۆزال) لەناو فڕۆکە کە دەچوو بۆ مۆسکۆ هاتنی (جەلال تاڵەبانی) بۆ تورکیا پشتڕاست کردەوە، ئەم سەردانەی (جەلال تاڵەبانی) بۆ ئەنقەرە وای لەو هێزانە کرد بکەونە خۆ کە سیاسەتێکی تایبەتییان هەبوو لەبارەی مەسەلەی کوردەوە، تەنانەت بالیۆزی ئەمەریکا لە ئەنقەرە (مۆرتۆن ئەبرەمۆویتز) لە رێگای هەوڵی بەرپرسیارانی تورکەوە چاوی بە (جەلال تاڵەبانی) کەوتبوو، لەهەمانکاتدا لە ١٣ی کانونی دووەم جێگری راوێژکاری وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا (دایڤید کۆرە) خۆی دەگەهێنێتە ئەنقەرە و بە هاریکاری بەرپرسیارانی تورک ئەویش چاوی بە جەلال تاڵەبانی دەکەوێت[٤٩]. ئەوەی مایەی سەرنج بوو ئەوەبوو لەکاتی هاتنی (جەلال تاڵەبانی) کورد لە باشور ماوەی ٣ رۆژ بوو راپەڕینیان کردبوو، ئەو رۆژەی دیداری نێوان (جەلال تاڵەبانی) و (میت) ئەنجامدرا هەر ئەو رۆژە شاری سلێمانی رزگار کرا، دوای گۆڕانکارییەکان و هاتنە ئاراوەی یەک لەدوای یەکی رووداوەکان ئیتر (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) گەشتیان بۆ تورکیا دەستی پێکرد.

---

[٤٩] نوسینی (توران یەون) بەناوی (کورد وەک کارت بە دەستی ئەمەریکاوە)،رۆژنامەی (میللییەتی تورکی) ١٩٩٣

لەسەرەتای دەستپێکردنی ئەم هاتوو چۆیەی تاڵەبانی و بارزانی بۆ ئەنقەرە، سەرکردایەتی (پەکەکە) بەزمانێکی شیرین دەیانوت (**ڕێگا بەکەس نادەین لەسەر خوێنی ئێمە بازرگانی بکات!**)[٥٠] ، بەمشێوەیە (پەکەکە) سەرکردەکانی باشوریان هۆشیار دەکردەوە کە نەکەونە ناو فروفێڵی تورکەوە و باوەڕ بە دەوڵەتی تورک نەکەن. کاتێک هەموو ئەمگۆڕانکاریانە دەهاتنە ئاراوە کەچی هێشتا گەلی باشور بلێسەی گڕی ڕاپەڕینیان دانەمرکابووە و هێشتا قوڕی ڕەوەکەیان بە پێیانەوە بوو، سەرەڕای هەموو نەهامەتییەکیش باشور ڕوبەڕوی ئابلۆقەی ئابوری ببووەوە و سەرکردەکانی باشوریش داوای هاوکارییان لە ئەنقەرە دەکرد، لەکاتێکی ئاوادا سەردانەکانی (جەلال تاڵەبانی) دەستیان پێکردبوو، دوای واژۆکردنی ڕێککەوتنی نێوان ئەنقەرە و بەغداد لەسەر پاراستنی هاوبەش و پەیوەندی تۆکمەی هەردوولا ئینجا سەرۆک کۆماری تورکیا ناوی کوردی هێنایە زمان. سیاسەتی دەوڵەتی تورک و (تورگوت ئۆزال) ئەوەبوو لەسایەی سەرکردەکانی کوردەوە باشوری کوردستان بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە و دەست بگریشن بەسەر بۆرییە نەوتەکانی کەرکوک و موسڵەوە، بەگوێرەی ئەو پیلانەی کە ئەمەریکاش پشتگیری دەکرد تورکیا سووکە مافێک دەدا بە کورد و سەرکردە کوردەکان و سەرۆک عەشیرەت و سەرکردە تورکمانەکانیان بانگ دەکرد بۆ ئەنقەرە و دەیانویست لەگەڵیاندا ڕێکبکەون، ئەم پیلانەی ئەنقەرە بێشک جیاوازتر بوو لەچاو پیلانەکانی سوریا و ئێران، هەروەها ئەنقەرە چاوی لەوانەش بڕی بوو کە بەرژەوەندییان لە هەرێمەکە هەبوو، ئێران بەهۆی سەرژمێرە زۆرەکەی شیعەکانەوە حیسابی سیاسەتی خۆی هەبوو لە عێراق و بۆ هەموو گۆڕانکارییەکان و تێکچوونی ڕەوشی هەرێمەکە ئامادەباشی خۆی دەکرد، یەکێک لە سەردانەکەی (جەلال تاڵەبانی) بۆ ئەنقەرە ئەو ڕۆژە بوو کە سیاسەتمەداری کورد و بەرپرسی مەڵبەندی پارتی ڕەنجدەرانی گەل ( وەدات ئایدن) لە دیاربەکر کوژرا، لەو ڕۆژە تاڵەی کوردانی باکور (جەلال تاڵەبانی) بازی بەسەر ئەم ماتەمینییە گەورەیەدا و چوو دیداری لەگەڵ والی هەرێمی قەدەغەکراو (خەیری کۆزاکچیئۆغلو) سازدا، هەروەها دەوڵەتی تورک بڕیاریدا کە (یەنەکە و پەدەکە) لە ئەنقەرە ئۆفیسی نوێنەرایەتی خۆیان بکەنەوە [٥١] .

---

[٥٠] مانگی ئادار و نیسانی ١٩٩١ ( سەرخوەبون )

[٥١] دوای مانگێک بەسەر تێپەڕبوونی سەردانی (جەلال تاڵەبانی) بۆ ئەنقەرە، ئەمجارەیان چوو بۆ بەغداد، بوگوێرەی نەریتی عەرەب (جەلال تاڵەبانی) ٤جار ئەملاوئەولای (سەدام حوسێن)ی قەسابی کوردی ماچکرد، لە هەموو ڕەوش و بوارێکی سەخت و سادەدا

جگە لە سەردانی یەکەمیان، سەرکردەکانی باشور چونیان بۆ ئەنقەرە کە زیادییان کرد و ئەم گەشتانەیان کرد بە خوو ئیتر توانجکردنی سەر (پەکەکە)شیان زیادیکرد، ئەم رەخنە و توانجانەیان بەتایبەتی دەزگا چاپەمەنی و راگەیاندنەکانی تورک بۆخویان کردبویان بە مەزە و بەردەوام دەیانووتەوە، هەتا سەردانەکان بەردەوام بونایە و پەیوەندییەکان چڕببونایەتەوە توانج کردن لە (پەکەکە) زیادیان دەکرد و پەرەیان دەسەند، دەرەنجام سەرکردەکانی باشور بە ئاشکرا وتیان (**پێویستە پەکەکە لە خاکەمان دەربچن و ئەگەر دەرنەچن ئەوا ئێمە دەریان دەکەین**).

سەرکردەکانی باشور پرسیاریان ئاراستەی رایگشتی کورد و جیهان دەکرد و دەیانوت (**ئایا پەکەکە لە عێراق کاریان چییە؟!**) [52]، بەرامبەر بەم قسانەش (پەکەکە) (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی)یان بەوە تۆمەتبار دەکرد (**لەناو خیانەتدان و لەسەر خوێنی ئەوان سیاسەت دەکەن**) [53].

بەرپرسیارانی تورک لەماوەی سەردانەکانی (جەلال تاڵەبانی) بۆ تورکیا پاسەپۆرتی دیبلۆماسییان پێبەخشی، (جەلال تاڵەبانی) لە تورکیا لە ١١ و ١٢ی حوزەیران لە کۆبونەوەیەکی (سۆسیال ئەنتەرناسیونال)دا بەشداربوو کەلە ئەستەنبوڵ بەسترابوو وتی (**لەبارەی سیاسەتمان لەهەمبەر پەیوەندیمان لەگەڵ تورکیا و ولەبارەی پەکەکەشەوە لەگەڵ رێزدار مەسعود بارزانی هاوبیرین، ئەگەر لە شوێنی پەکەکە بومایە ماوەی ساڵێک شەڕی چەکداریم رادەگرت و دەگەڕام بەشوێن رێگە چارەی دیبلۆماسیدا و ئەگەر ئێمە لە تورکیا بوینایە بەدڵنیاییەوە دەستبەرداری ئیرادەی میللی خۆیشمان دەبوین**)، جەلال تاڵەبانی دەیوست بیسەلمێنێت کە چەنێک دەست بڵاوە [54]، جەلال تاڵەبانی لەکاتی وێنەگرتنیدا لەگەڵ

---

چاوپێکەوتنی سیاسی ئەنجام دراوە بەڵام ئەم ماچوموچەی (جەلال تاڵەبانی) سەرنج راکێشەر بوو هەربۆیە دەزگا راگەیاندنەکانی عێراق رۆژانە چەندینجار ئەم دیمەنەی (جەلال تاڵەبانی)یان نیشان دەدا، (جەلال تاڵەبانی) بۆ دواجار لە دیدارەکانی موفاوەزاتەکەی ساڵی ١٩٨٣ چاوی بە سەدام کەتبوو، بەڵام دوای ئەوەی بە ئەنجام نەگەیشتن جارێکی تر لە نێوانیان شەڕ دەستی پێکردبووەوە، لەدوای سەردانەکەی (جەلال تاڵەبانی) بۆ بەغداد سەرکردەکانی تری باشوریش دەستیان کرد بە چوون بۆ دیتنی سەدام حوسێن ..

[52] ١و١١حوزەیران ١٩٩١ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی)

[53] تەموزی ١٩٩١ (بەرخودان)

[54] ١٦و٢٢ حوزەیران ١٩٩١ رۆژنامەی (یەنی ئولکە)

کارمەندانی دەوڵەتی تورک پۆزی دۆستانەی لێدەدا، جەلال تاڵەبانی بەرامبەر بە ڕۆژنامەوانەکان سیاسەتێکی دوو ڕووانەی دەنواند، کاتێک قسەی بۆ ڕۆژنامەوانێکی تورک دەکرد بەرامبەر بە (پەکەکە) ڕەقی دەنواند و کاتێکیش بۆ ڕۆژنامەوانێکی کورد قسەی بکردایە بەرامبەر بە (پەکەکە) نەرمتر بوو، ئەوکاتانەی قسەی ڕەقی بە (پەکەکە) دەوت و ڕۆژنامەوانێکی کورد ئەمەی وەبیردەهێنایەوە (جەلال تاڵەبانی) دەیوت (**ڕۆژنامەوانەکان بە هەڵە لە قسەکانی من حاڵی بوونە**) [٥٥]، لەهەمانرۆژاندا سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لەبارەی (پەکەکە) وە وتی (**ئێمە لەگەڵ پەکەکە پەیوەندیمان نییە، لە کوردستانی تورکیا هەرچییەک دەکات پەیوەندی بە ئێمەوە نییە، هەروەها لەگەڵ ڕێزدار جەلال تاڵەبانیدا لەبارەی هەموو شتێکەوە هاوبیرین**) [٥٦].

هەتا پەیوەندییەکان پەرەیان بسەندایە پابەند بوون و هاوکارییەکانیش زیادیان دەکرد، سەرەتا (میت)ی تورک لە زاخۆ و دەوروبەری بەبێ هیچ ڕێگرییەک و دەست تێوەردانێک دەستیان کرد بە ئەنجامدانی کاروخەباتی نهێنی خۆیان و بەرامبەر بەمەش دەوڵەتی تورک هاوکاری دارایی سەرکردەکانی باشوریان کرد و لەگەڵ ئەمەشدا ئاسانکارییان بۆ کاروبارەکانی تریان دەکردن، یەکەمین دەروازە کە بۆ باشوری کوردستان لە ڕووی جیهان کراوەبێت بێشک دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) بوو، دەوڵەتی تورکیش ئەمەی دەزانی هەربۆیە ئەم دەروازەیەی وەک کارت بەکار دەهێنا، (میت)ی تورک بۆکاری هاوبەش لەگەڵ سەرکردایەتی (پەدەکە و یەنەکە) لە بارەگای فەرمانداریتی ئاسایشی سەربازی دیاربەکر لیژنەیەکی هاوبەشی پەیوەندییەکانیان دروست کرد، ئەم لیژنەیە بەشێوەیەکی سیستەماتیک کۆبونەوەی خۆیان ئەنجامدەدا، ئەم لیژنەیە لەژێر ناوی (پاراستنی خاڵی سنور) دامەزرێنرابوو، بەڵام لە ڕاستیدا لە باشوری کوردستان کاریان بۆ دەرکردنی (پەکەکە) دەکرد، بۆ ئەم مەبەستەش هەردوولا پەرەیان بە کارەکانیاندا و لەئاکامدا (میت) لە شارەکانی وەک (دهۆک، زاخۆ، هەولێر و سەلاحەدین) ئۆفیسیان کردەوە و چەند ئەفسەرێکیشیان کارەکانیان بەڕێوە دەبرد، هاروەها جارێکی تر فەرماندەی پێشمەرگەکان لە سەر سنور لەگەڵ بارەگا سەربازییەکانی تورک کەوتنەوە کار، ئەوەی مایەی سەرنج بوو ئەوەبوو

---

[٥٥] ١١ی حوزەیران ١٩٩١ ڕۆژنامەی ( گونەش)

[٥٦] ٢٣و٢٩ حوزەیران ١٩٩١ ڕۆژنامەی ( یەنی ئولکە)، دیداری سەعید ئارسۆی لەگەڵ بارزانیدا

نەیاندەتوانی ئەم کارانەیان بشارنەوە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەنقەرە کێشەی گرنگی هەبوو، تادەهات کێشەی کورد لە رایگشتی جیهاندا دەنگی دەدایەوە، لەلایەکی تریشەوە چالاکییەکانی (پەکەکە) لەناو تورکیا پەرەیان سەندبوو کە هەموو دونیا چاویان لێبوو ئەمەش ببووە هۆکار گرژی لەناو سیستەمی دەوڵەتی تورک دروست بکات. لە باکوری کوردستان هەرێمەکانی وەک (بۆتان، مێردین، ئامەد، سەرحەد و دەرسیم) بەتەواوەتی ببوونە گۆرەپانی ئەنجامدانی چالاکی گەریلاکانی (پەکەکە)، لەلایەکی تریشەوە شەڕ یەخەی شارەکانی گرتبوو، جموجۆڵ و چالاکی گەریلاکانی (پەکەکە) لە مەفرەزەی بچوکەوە گۆڕابوون بۆ گرووپی گەورە و دەیانتوانی بە گرووپێکی گەورەوە پەلاماری بارەگای گەورەی سەربازی تورک بدەن، (پەکەکە) بەرامبەر ئەو بارودۆخە نوێیە و چاوەڕوان نەکراوەی باشوری کوردستان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکانی بۆتان و بادینانی دەدا، دەتوانرێت بوترێت (پەکەکە) لەناو شەڕێکی بەرفراوانی سنوری بادینان بوو[٥٧] ، گەریلاکانی (پەکەکە) لەهەمبەر پەلاماری سەر بارەگا سەربازییەکانی تورکیا تەکنیکی تازەیان بەکار دەهێنا و دەیانتوانی لەماوەیەکی کەم وەختدا بە دەیان بنکەی سەربازی تورک بپێکن.

سیاسەتی ٧٠ ساڵەی (**لێدە و پارچەیکە و بیبە بەڕێوە**)ی کۆماری تورکیا جگە لە سەرکەوتنێکی هەناسە کورت قازانجێکی ئەوتۆ نەبوو، لە ئەنقەرە بۆ گۆڕانکاری لە سیستەم و سیاسەتی دەوڵەت سیاسەتمەدارێکی چاونەترس و بە توانا نەبوو قسەیەکی خێر بکات، دەوڵەتی تورک دەیویست لە سایەی سیستەمی رەگەزپەرستی و ئاسیملاسیۆن و لەژێر ئاڵای سوپا درێژە بە تەمەنی خۆیان بدەن و لەسەر پێ بمێننەوە.

لە روانگەی دەوڵەتی تورکەوە کوردانی ناوەوە (**لێدەدران و دەبران بەڕێوە**)، ئەوانەی دەرەوەیش (**بەیەکتری لێدەدران و دەبران بەڕێوە**)، کوردی باشور پێویستییان بە ئەنقەرە بوو هەربۆیە دەوڵەتی تورک دەیتوانی لە (پەکەکە)یانی پێبدەن کەلە سنورەکاندا هێزێکی کاریگەریان هەبوو، لە ساڵی (١٩٩٢) لە سەردانەکانی (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) بۆ ئەنقەرە دیاربوو بەردەوامییان بە رێچکەکەی خۆیان دەدا، لەلایەکی تریشەوە ژینگەی پارتەکانی کوردی باشور و ئەزمونی مێژووی خۆیان لەگەڵ ئەمجۆرە کارانەی کە دەیانویست لەگەڵ ئەنقەرە بیکەن دەگونجا، سەرکردەکانی باشور جگە لە ئەرێ کردنی

---

[٥٧] ١و٧ ئەیلول رۆژنامەی (یەنی ئولکە) دیمانەی فەیسەل داغلی لەگەڵ ئۆجەلاندا .

خواستەکانی ئەنقەرە چارەی تریان نەبوو، بێگومان هۆیەکی تری سەرەکی تر هەبوو کە ئەنقەرە خۆی بە هەرێمەکەوە سەرقاڵ بکات، بێشک تورکمانەکان بوون، دەیانویست بەرامبەر بە کورد بەکاریان بهێنن، تورکیا بەرامبەر بە کوردی باشور و بۆ مەسەلەی کەرکوک و موسڵ جارناجارێک بۆ چاوسورکردنەوە بەڵگەنامەکانی (میساقی میللی) خۆیان نیشاندەدان و هەڕەشەی وەبیرهێنانەوەیانی دەکرد. هۆکارێکی تری گرنگ هەبوو کوردی باشور ملکەچی تورکیا بکات ئەویش (هێزی چەکوش) بوو کە کوردی دەپاراست و بارەگای سەرەکیشیان لەناو تورکیا بوو، درێژە پێدانی سەردانەکانی (جەلال تاڵەبانی) بۆ تورکیا لەسەروبەندی تەواوبونی مۆڵەتی (هێزی چەکوش) بوو، لەئاکامی سەردانێکی (جەلال تاڵەبانی) بە یاوەری (هۆشیار زێباری) ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) لە ٨ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٢) پەرلەمانی تورکیا بڕیاریدا ماوەی مانەوەی (هێزی چەکوش) لە تورکیا درێژ بکاتەوە.

## ١٩٩٢ ساڵی ئەنجام وەرگرتنە!

هاوینی ساڵی (١٩٩١) تاکو زستانی ساڵی (١٩٩٢) سوپای تورک زنجیرە چیاکانی باشوری کوردستانیان بۆردۆمان کرد و کەوتنە پیلاندانان بۆ ویرانکردنی هەرێمەکە، گەورەترین چەکی دەستی دەوڵەتی تورک بۆ شەڕی (پەکەکە) بێشک شەڕ (**براکوژی**) بوو. هێزەکانی باشور بەتایبەتی (پەدەکە و یەنەکە) ئەو توانایەیان نەبوو کارێکی وابکەن هێرشی سەر (پەکەکە) بکەن، (ئەنقەرە)یش بۆئەوەی رازییان بکات و ئەوەی ئەم شەڕەیان پێبکات ئەوەی لە دەستیان بهاتایە دەیانکرد. بۆ بەدیهێنانی خواستەکانی خۆیان سوپای تورک زوو.. زوو بە فڕۆکە بۆردۆمانی ناوچەکانیان دەکرد و دەچوونە باشورەوە و تەنانەت وایلێهاتبوو چواردەوری گوندی بارزانیشیان بۆردۆمان دەکرد کە گۆڕی مەلا مستەفای لێبوو، تەنانەت بە پێویستیشیان نەدەزانی بڵێن بە هەڵە بۆردۆمان کراوە، هەموو ئەمانەشیان بۆیەدەکرد فشار بخەنە سەر (پەدەکە و یەنەکە) و شەڕی (پەکەکە) یان پێبکەن.

پێش دەستپێکردنی شەڕی باشور سوپای تورک لە ٦ی مانگی ئادار لە بادینان جموجوڵی سەربازییان دەست پێکرد و هەزارەها کۆماندۆ و تیمی تایبەت و جاش و سەربازیان هێنا و لە شوێنەکانی وەک (چوکورجە و هەککاری و شەمزینان) پەڕینەوە و چوونە باشوری کوردستانەوە[٥٨]، بە کۆپتەر هەزارەها سەرباز و کۆماندۆیان لە شوێنە ستراتیژییەکان داگرت، بەڵام زۆرینەیەک لە جاشەکان بە فشاری ئەوەی واز لە چەک دەهێنن ئامادەنەبوون بەشداری لەم ئۆپەراسیۆنەی سوپای تورک بکەن، کۆماندۆیەکی زور لە (چنارلی، کاڤاکلی و چایرلی) لە چاوەڕوانی ئەوەدابوون بچنە بادینانەوە، بەهۆی بەشدارنەبوونی جاشەکان پیلانەکەیان گۆڕی و کۆماندۆکانیش چاوەڕێی دەقەی سفریان دەکرد، فەرماندەکانی ناوچەی (هەککاری) چاوەڕێی فەرمانی تازەبوون ئایا بەبێ جاشەکان جوڵە بە هێزەکەی خۆیان بکەن یاننا،

---

[٥٨] ٧و٨ی گوڵان ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حوریەتی تورکی)

سەربازە تورکەکان ئەگەر جاشی کورد رابەرایەتییانیان بۆ نەکردنایە نەیاندەتوانی بە ئاسانی لە ناوچەکان بگەڕێن، لە (ئەزوملو، کردقۆز، قوشاک و چاغلی) سوپای تورک بەبێ ئەوەی روبەڕوی هیچ شەڕوپێکدادانێک ببنەوە ٥ کم چوونە ناو خاکی باشورەوە، لەبەرەیەکی ترەوە لە (زاپ و مەتینا) ئۆپەراسیۆنەکان پەنگیان خواردبوو.

سەبارەت بە پرسیاری رۆژنامەوانەکان لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکەوە وتەبێژی سوپا سالاری تورک دەیوت (**ئەگەر ئۆپەراسیۆنیش لەئارادابێت نابێت ئێوە باسی بکەن**)، نوێنەری (یەنەکە)ش (سەرچل قەزاز) لە ئەنقەرە دەیوت (**بەبێ ئاگەدار کردنەوەی ئێمە و بەبێ ئەوەی زانیاریمان هەبێت ئۆپەراسیۆنێک لە ئارادایە**)، دوای دوو بۆ سێ رۆژێک بەسەر ئۆپەراسیۆنی پیادەیی سوپای تورک لە نزیک سنورەکانی (چورکورجە و شەمزینان) بۆردۆمانی ئاسمانی دەستی پێکرد، کاتێک فڕۆکەکان (زیڤە و کەریگول) بۆردۆمان دەکرد و بەسەر (چوکورجە) و گوندی (جیڤار) نزم دەفڕین کە دەبووە مایەی ترس و تۆقینی خەڵک، زۆرجار بەهۆی زەختی دەنگی فڕۆکەکان شوشەی پەنجەرەی ماڵان دەشکان و خەڵکیش لە ترسی ئەگەری بۆردۆمانکردنیان لە دەرەوەی ماڵەکانیان خۆیان دەشاردەوە، فڕۆکەکان و کۆپتەرەکان فەرمانیان پێکرابوو دەست نەپارێزن هەربۆیە زۆرجار خەڵکی سڤیلیشیان دەکردە ئامانج. لە نزیک گوندی (بالاتی) نزیک (مێژن)ی سەربە (ئولودەرە) لە ئاکامی بۆردۆمانی کۆپتەر بۆسەر کاروانێکی خەڵکی سڤیل لە ئەنجامدا (حەیات تونجی) ١٢ ساڵە و (بەشیر بیلانی) ١٠ ساڵە کوژران و هەروەها ژمارەیەکی زۆری تریش بریندار بوون[٥٩].

سەربازی سوپای تورک لە (قەسرۆ)ی سنوری (ئولودەرە) و ناوچەی (گەلییەفەقییە) ی سنوری (چوکورجە) ٧ کم چوونە باشوری کوردستانەوە، هەروەها لە ٥ی ئادار بە هەزارەها کۆماندۆ و جەندرمە لە سنوری دەوروبەری گوندی (یەشلیورت) ی سەر بە (شەمزینان) لە سنور پەڕینەوە و چوونە باشوری کوردستانەوە، لەبەرئەوەی پێشوتر گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەر رێگاوبانەکان لوغمیان دانابوو سەربازەکان نەیاندەتوانی بە ئاسانی رێبکەن و بچنە پێشەوە، کاتێک جموجۆڵی سەربازی بەردەوام بوو گەریلاکانی (پەکەکە) لە ١٥ی ئادار لە نزیک گوندەکانی (ئشکفێران و تاشدەلان)ی سەربە ناوچەی (ئولودەرە)ی نزیک لە سنور هێرشیان کردە سەر بارەگایەکی سەربازی، ئەم هێرشە دەمەوبەیانی واتا لەکاتی سپێدەدا

[٥٩] ٢٤و٣٠ گولان ١٩٩٢ رۆژنامەی (یەنی ئولکە)

ئەنجامدرابوو، ئەم بارەگا سەربازییەی (تاشدەلان) نزیکەی (٢٠٠) سەربازێکی لێبوو، دوای ئەوەی هەتا نیوەڕۆ سەربازەکان لەهەمبەر هێرشی گەریلاکان خۆڕاگرییان کرد ئیتر لەوە زیاتر خۆیان پێڕانەگیرا و ئەوەی کوژرا. کوژرا و ئەوەی هەلات، هەلات و بارەگاکە کەوتە ژێر دەستی گەریلاکانەوە. هێرشەکانی سەر بنکە سەربازییەکانی تر زیاتر بەئامانجی تەکتیکی بوو، دوای هێرشەکە دەسەڵاتدارانی سوپا رایانگەیاند بەگشتی ٢٩ سەربازیان کوژراوە، ئەم چالاکییە لەلایەن گەریلاکانەوە بە کامیرەی ڤیدیۆ تۆمار کرابوو، دوای بڵاوبونەوەی ئەم گرتە ڤیدیۆیە لە تورکیا هەرایەکی زۆر هاتەئاراوە، بەڵام لەبارەی ئەم گەرتە ڤیدیۆیەوە وەزیری ناوخۆی حکومەتی تورک (عیسمەت سەزگین) دەیوت (**ئەم گرتە ڤیدیۆیە مۆنتاژە**)، ئەم داماوە بەناو وەزیرە هەوڵی دەدا لەدەستی ئەو راستییە خۆی قوتار بکات. ئەوکاتەی سوپای تورک گەورەترین ئۆپەرسیۆنی دوا ساڵی ئەنجامدەدا، پارتەکانی باشوری کوردستان بەرەو هەڵبژاردن دەچوون، ئەوەی راستی بێت ئەم ئۆپەراسیۆنەی سوپای تورک لەسەروبەندی هەڵبژاردنی باشوردا بەڕێکەوت نەبوو، ئەمە بەوە لێکدەدرایەوە سوپای تورک دەیانویست بەشداری لە هەڵبژاردنەکەی باشور بکەن و دەنگی خۆیان بدەن. کاتێک گەریلاکانی (پەکەکە) پەلاماری سەربازەکانی سەر سنوریاندەدا، سوپای تورکیش هەروەکو ئەوەی لەناو خاکی خۆیاندابن جەولەیان دەکرد، چیکاتێک بیانویستایە لە سنور دەپەڕینەوە، فڕۆکەکانی سوپای تورک وەکو ئەوەی راهێنانبکەن بە عەشوای بۆردۆمانیان دەکرد، هەندێکجاریش ئەم چڕبوونی بۆردۆمانانە دەبوونە هۆکاری کەوتنی کۆپتەریش، ([٦٠]).

ئەوکاتەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە بەرواری ١٩٩٢/٥/٢٦ لەهەمبەر بارەگای (دێشتان)ی (ئۆزوملی) سەر بە (چوکورجە) هێرشیان ئەنجامدا، فڕۆکە و کۆپتەریان لە شارەکانی (ئامەد و وان) هەڵساندبوو، لەئاکامی بۆردۆمەنەکانیان چەند کەسێکی سڤیل کوژران ، لە ئاکامی ئەم هێرشە ئاسمانییەدا گوندەکانی (سیزاران و بێدوهێ) و رەشماڵەکانی (کانی ماسی)

---

[٦٠] دەمەویەیانی ٢٩ی حوزەیران گوندی (باگالتە)ی سەر بە (شەمزینان) لەلایەن فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکەوە بۆردۆمانکرا، لەبەرئەوەی بۆردۆمانێکی عەشوایی بوو لە خێزانی جاشەکان ٦ کەس کوژران و ٢٥ گوندنشینیش بریندار بوون، لەمبارەیەوە قایمەقامی ناوچەکە (سەیفوللە حاجی موفتوئۆغڵو) دەیوت (ئەم بۆردۆمانە لەلایەن فڕۆکەیەکی نەناسراوەوە ئەنجام دراوە)، بەڵام دوای ماوەیەک ناچارمان بە شێوەیەکی فەرمی بڵێین ئەم بۆردۆمانە لەلایەن فڕۆکەی تورکیاوە ئەنجامدراوە، ئەوەشیان دەووت لە ئاکامی هەڵەیەک روویداوە، هەمانشوێن و هەمانناوچە لە ١١ی تەموزیشدا بۆردۆمان کرایەوە، لەم بۆردۆمانەش ٢ سڤیل کوژرابوون و ٢١ کەسیش بریندار ببوون.

زیانیان بەرکەوت، چەند کەسێکی شاهیدحاڵ لەبارەی بۆردۆمانە عەشوائییەکانەوە دەیانوت **(هەرلەبەرئەوەی لە خێمەکان کەس نەچووە دەرەوە ئێمەیان بۆردۆمان کرد، دوای ئەوەی چوارجار فڕۆکەکان بەسەرماندا سوڕانەوە ئینجا بۆردۆمانمانیان کرد، سەرەڕای ئەوەی بۆ سەلماندنی ئەوەی ئێمە تیرۆریست نین و پەڕۆی سپیشمان رادەوەشاند بەڵام ئەوان بەردەوام بوون لە بۆردۆمانکردنمان)**، لەئاکامی بۆردۆمانەکاندا (خالید حەسەن)ی ٨ ساڵە و (نزار رەمەزان) ی ١١ ساڵانە و (سەحەر ئەحمەد)ی ٦ ساڵانە مەخابن کوژران، هەروەها (مریەم زێدان)ی ٥٥ ساڵە و (شڤان خالید)ی ١٠ ساڵان و (عادل پیرۆز)ی ٥٢ ساڵە و (حەیران حەسەن)ی ٣٠ ساڵەش بریندار بوون[٦١].

لەکاتی بۆردۆمانەکاندا بارەگایەکی (پەدەکە) لێدرا و زیانی بەرکەوت، هەروەها فەرماندەی بارەگاکەش کە (حەیران حەسەن) بوو بریندار بوو، دیاربوو دەوڵەتی تورک بیەوێت دەرسێک بە کوردی باشور بدات. ئەوەی راستی بێت دەوڵەتی تورک بۆ پارتەکانی باشور ئەو شوێنانەی دەست نیشاندەکرد کە دەبوایە (پەکەکە)ی لێدەربکرایە. (حەیران حەسەن) کە فەرماندەی (پەدەکە) بوو ئەوکاتەی لە نەخۆشخانەی ئازادی بوو لە دهۆک رووداوەکەی بەمشێوەیە دەگێڕایەوە **(کاتژمێر ٤ی بەیانی لەدەنگی فڕۆکە جەنگییەکانی تورک بەئاگا هاتین، دیاربوون بە نزمی دەفڕین، پێمانوابوو دەماننناسن و زەرەریان بۆئێمە نابێت، پێمانوابوو ئەوان باش دەزانن گەریلای (پەکەکە) لەکوێن و بۆردۆمانی دەروبەری ئێمە ناکەن)**، لەبارەی ئەم بۆردۆمانەوە نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) حکومەتی تورکیای ئاگەدارکردبووە و لەمبارەیەوە (سەفین دزەیی) دەیوت **(بەگوێرەی ئەو وەڵامەی وەریدەگرینەوە هەڵوێستە دەکەین، ئەو شوێنەی بۆردۆمان کراوە شوێنی خەڵکی سڤیلە و مەخابن ٤ کەس ژیانیان لەدەستداوە و ٣ کەسی تریش برینداردن)**، بەمشێوەیە گوندەکانی (زیزاران و تورا) کە زوو.. زوو بۆردۆماندەکران چۆڵیان کرد. نوێنەری بەرەی کوردستانی لەسەر لیستی (یەنەکە) لە زاخۆ (جەلال تەها) بۆئەوەی ئەم بۆردۆمانانە بوەستێنرێن دەیوت **(لەبارەی ووردەکاری مەسەلەکانەوە نامەیەکمان ناردووە بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، ئامانجی دەوڵەتی تورک ئەوەیە شەڕی پەکەکە یان بۆبکەین، داوا لە پەکەکە دەکەین لە دەورووبەری**

---

[٦١] ٣١ی گولان و ٦ی حوزەیران رۆژنامەی (یەنی ئولکە)

**ناوچەکانمان کۆتایی بە چالاکییەکانیان بهێنن، ئێمە بە نیاز نین شەڕی پەکەکە بکەین و هەروەها لەو حاڵەتەشدانین بتوانین هاوکاری پەکەکە بکەین) .**

سەرۆکی (پەدەکە) (مەسعود بارزانی) لەمبارەیەوە دەیوت (**دەوڵەتی تورک خاوەن ئەو قودرەتەن کە دەتوانن سنورەکانی خۆیان بپارێزن، ئێمە لە تواناماندا نییە هەموو سنورەکان بپارێزین، ئەم بۆردۆمانانە قەبوڵ ناکەین**).

چڕبونەوەی بۆردۆمانە ئاسمانییەکانی سوپای تورک بوونە هۆکار گەریلا زیاتر چالاکی ئەنجام بدەن، تەنانەت لە ٢٤ و ٢٥ ی حوزەیران لە سنوری باشوری کوردستان گەریلاکانی (پەکەکە) هێرشیان کردە سەر چەند بارەگایەکی سەربازی لە (زینە)ی سەربە (شەمزینان) و (بێتونچە)و (هاکوزی)ی سەربە (ئولودەرە)، هەروەها هێرشیان کردە سەر بنەکەیەکی سەربازی لە (بالکایە)ی سەربە (سلۆپی) [٦٢]. لەدوای هەر هێرشێکی گەریلاکانی (پەکەکە) سوپای تورک کردبووی بە نەریتی خۆی بۆردۆمانی عەشوایی بکەن و لە ٢٩ی هەمان مانگ فرۆکە جەنگییەکانی تورک ناوچەکانی ئەو دیو سنور و ئەمدیو سنوریان بۆردۆمان کرد،[٦٣]..[٦٤]، بەمشێوەیە بۆ سوپای تورک جیاوازی لەنێوان خاڵی سنور نەمابوو، هەموو شوێنەکانی ئەمدیو و ئەو دیوی سنور ببوونە هەدەفی فرۆکەکانی تورک.

---

[٦٢] ٥و١١ی تەموزی ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە.

[٦٣] ٢٧ی گوڵان ١٩٩٢ رۆژنامەی ( سەباحی تورکی)

[٦٤] پارتە سیاسییەکانی پەرلەمان لە ١٩٩٢/٦/٢٠ لە باڵەخانەی پەرلەمان، دوور لە چاوان و بەبێ ئەوەی مۆڵەت بدەن دەزگا راگەیاندنەکان ئاگەداری گۆڕانکارییەکان ببن و دوای هاتنە ئاراوەی مشتومڕێکی زۆر وەزارەتەکانیان دیاریکرد، دوای دانیشتنێکی درێژخایەن بڕیاریاندا لە ١٩٩٢/٦/٢٨ بۆ پێکهێنانی کابینەی حکومەت دوا دانیشتن بکەن، دواییش پێکهاتن لەسەر شێوازی حکومەت، بڕیاریاندا ئەم وەزارەتانە هەبن (بەرگری، ناوخۆ، دەرەوە، دارایی، ئەوقاف، رۆشنبیری و مافی مرۆڤ)، دوای گەنگەشەیەکی زۆری نێوانیان بڕیاردرا وەزارەتی (دەرەوە، بەرگری، دارایی، رۆشنبیری و کوشتوکاڵ) بدرێت بە (یەنەکە) و وەزارەتی (ناوخۆ، پیشەسازی و ئەوقاف و کارەبا) بدرێت بە (پەدەکە)، ٥ وەزارەتەکەی تریش بەسەر پارتەکانی تردا دابەشکران، (فوئاد مەعسوم) کرا بە سەرۆک وەزیران کە سەربە (یەنەکە) بوو، هەروەها (جەوهەر نامیق) کرا بە سەرۆکی پەرلەمان کە سەربە (پەدەکە)بوو.

## ئەو هەڵبژاردنەی لە ژێر بۆردۆمانی فڕۆکەی سوپای تورک ئەنجامدرا

لە باشوری کوردستان لە ١٩ی ئاداری(١٩٩٢) نزیکەی یەک ملیۆن هاولاتی چوونە سەر سنوقی دەنگدان، لەم هەڵبژاردنەدا ١١ پارت و ٤ سەرکردە پێشبڕکێیان کرد، ئەم چوار سەرکردە کوردە کە خۆیان کاندید کردبوو موسڵمان بوون بەلام لە هەمانکاتیشدا دەیانویست نوێنەرایەتی ئێزیدی و کاکەیی و مەسیحییەکانیش بکەن، ئەو پارتانەی بەشداربوون هەریەکە و نوێنەرایەتی چەمکێکی جیاوازیان دەکرد، ئەو پارتانەی بەشدارییان لەم هەڵبژاردنەدا کرد پێکهاتبوون لە (یەنەکە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)، (پەدەکە پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق)، (پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان)، (حسک پارتی سۆسیالیستی کوردستان)، (پاسۆک پارتی سۆسیالیستی کورد)، (پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان)، (حزبی شیوعی عێراقی)، (بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق)، (فەیلییەکانی یەکگرتووی کوردستان )، (فەیلییە دیموکراتەکان)، (حەرەکەتی دیموکراتی ئاشوری)، (کلدانی و ئاشورییەکانی دیموکرات)، لەکۆی (١٦٤) سندوق (٩٨٢) هەزار دەنگ درا، بە ٥ مەسیحییەوە بەکۆی گشتی (١٠٥) پەرلەمانتار هەڵبژێردران، لەسەر هەر سندوقێک پۆلیسێک بە دەمانچەوە پاسەوانی دەکرد و هەروەها نوێنەری چاودێری هەموو پارتەکانیش ئامادەبوون، پێش هەڵبژاردن بە دوو رۆژ پروپاگەندەی هەڵبژاردن قەدەغە کرا.

لە سەرەتای مانگی ئادار لەنێوان لایەنگرانی (یەنەکە و پەدەکە) لە شەقلاوە بەهۆی گرژی سیاسییەوە شەڕ هاتەئاراوە و چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت، بەلام (یەنەکە و پەدەکە) ئەم رووداوەیان بە پاساوی کێشەی بنەماڵەیی پەردەپۆش کرد، دکتۆر (مەحمود عوسمان) لە دهۆک ویستی وەکو (حسک) کۆبونەوەی جەماوەری بکات بەلام لەلایەن لایەنگرانی (پەدەکە) وە رێگری لێکرا و دوای ئەوەی کادێرەکانی (یەنەکە) هاتنە ناوبەریانەوە مۆڵەتدرا (مەحمود عوسمان) گردبونەوەی جەماوەری بکات، ئەم هەڵبژاردنە لەماوەی ٢ مانگدا ٢جار

دواخرا، دواهەمینجار کە هەڵبژرادنەکە دواخرا بە بیانوی خراپ بوونی مرەکەبی هەڵبژاردنەکەوەبوو کە ئەمەش بێ بڕوایی و بێ متمانەیی لەنێوان پارتەکان نیشان دەدا، هۆکاری دواخستنی هەردوجارەکەی هەڵبژاردنەکە لەسەر خواستی (جەلال تاڵەبانی) بوو کە کێشەی لەگەڵ سڕینەوەی مرەکەبەکاندا هەبوو. کاتێک لە هەرێمی بادینان بۆردومانی فرۆکە جەنگییەکانی تورک بەردەوام بوون گەلی باشور لەسەر سنوقی دەنگدان بوون، ئۆپەراسیۆنی ئەو دیوسنوری سوپای تورک لە سەرەتای مانگی ئاداردا دەستی پێکردبوو وە ببوو بە کارێکی رۆتینی، هەرچەندە (پەکەکە) لەبارەی هەڵبژاردنەکەی باشورەوە سیاسەت و بیروبۆچونێکی تایبەتی نەبوو بەڵام لەبارەیەوە دەیانوت (کەسانێک و لایەنێک کە چەندین ساڵ بێت لەلایەن هێزی دەرەکییەوە بەکارهێنرابێن ناتوانن ببنە نوێنەری راستەقینەی گەل).

لە رۆژی هەڵبژاردنەکەدا سەرۆکی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی لە شەقڵاوە و سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لە سلاحەدین دەنگیاندا، مەسعود بارزانی بە خۆی و هەزار نەفەرەوە هاتە سەر سنوقی دەنگدان و وتی (**ئەمە رووداوێکی مێژووییە**)، لەم هەڵبژاردنەدا لە هەرێمی بادینان (پەدەکە) و لە هەرێمی سۆران (یەنەکە) رێژەی هەرەزۆری دەنگەکانیان بەدەست خست، سەرکردەکانی پارتەکان پێش هەڵبژاردنەکە لە سلێمانی کۆبونەوە و ئەوەیان هێنایە زمان ئەنجامی هەڵبژاردنەکە هەرچییەک بێت قەبوڵی هەموویانە، بۆئەم مەبەستەش هەر هەموویان دەستیان ناوەتە سەر قورعان، لە کۆتایی هەڵبژاردنەکەدا دەنگەکان ژمێردران و دەرەنجامەکەی بەمشێوەیە بوو (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان ٥٪، حزبی شیوعی عێراقی و پارتی گەلی و پاسۆک و حسک بەیەکەوە لە ٥٪ و نیویان هێنا و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (یەنەکە) لە ٤٤٪ و پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق (پەدەکە) لە ٪ ٤٦)یان دەنگەکانی بەدەست خست، پارتەکانی تریش لەبەرئەوەی رێژەی ٧٪ یان بەدەست نەخست دەنگەکانیان لەنێوان (یەنەکە و پەدەکە) دابەشکرا، بەمشێوەیە هەریەک لە (یەنەکە و پەدەکە) ٥٠ پەرلەمانتاریان بەدەست خست، پارتە مەسیحییەکان لە هەڵبژاردنەکەدا سنوقی تایبەتیان بۆ تەرخانکرابوو، ئەو سنوقانەی مەسیحییەکان کەلە ناو لیستی (یەنەکە و پەدەکە) دا بوون هەرەیەکەو ١ پەرلەمانتار و لە ناو لیستی ئاشورییەکانیشدا ٣ پەرلەمانتاریان بەدەست خست.

رژێمی عێراق ئەم هەڵبژاردنەی بە (گەمەی رۆژئاوا) و بە (نایاسایی) ناوزەند کرد، سەرکردەکانی باشوریش لەمبارەیەوە پێیانوابوو ئەم هەڵبژاردنە مەشروع و قانونییە و

پشتبەستراوە بە ڕێککەوتننامەی ساڵی (١٩٧٠) و میللەتی کورد مافێکی ڕەوای خۆیەتی بڕیاری چارەنوسی خۆی بدات، (یەنەکە و پەدەکە) نەک تەنها وەزارەت و پێگەکانی حکومەت بەڵکو هەموو جومگەکانی بەڕێوبردنیان لەنێوان خۆیان دابەشکرد، دوای پێکهێنانی حکومەت (یەنەکە) لە پشکی خۆی وەزیرێکیدا بە (زەحمەتکێشان) کەلە هەڵبژاردنەکەدا شەریکی (یەنەکە) بوو، مەسیحی و شیوعییەکانیش هەریەکە و وەزارەتێکیان بەرکەوت، دوای ئەوەی (بزووتنەوەی ئیسلامی) وەزارەتی کاروباری دینی ڕەتکردەوە درا بە (حزبی یەکگرتن)، دوای ئەوەی ئەم حزبە چووە ناو (پەدەکە)وە ئەم وەزارەتەش هەربۆ (پەدەکە) مایەوە، (زەحمەتکێشانی کوردستان) لەسەر دەمی دوو ئیدارەییدا لە پەرلەمان کشانەوە.

## فتیلی شەڕی باشور گڕ دەگرێت

ئەو هێز و لایەنانەی پیلانسازییان دەکرد بۆ دەستپێکردنی شەڕی باشور، کاتی دیاریکراویان ٢٧ی حوزەیرانی (١٩٩٢) بوو، جموجۆڵەکان پێنجی ئێوارە دەستییان پێکرد، ئەندامی کومیەتی (یەنەکە) (سادق عومەر) لەو بەروارە لە زاخۆ کوژرا، (سادق عومەر) لە نزیک شارۆچکەی (دێرکەر) کاتێک بەرەو ماڵەوە دەچوو لەلایەن ٤ کەسی نەناسراوەوە کوژرا. سادق جگە لە (پەدەکە) هەموو کەسێک خۆشی دەویست، دوای کوشتنی (سادق عومەر) بە رۆژێک پارتەکانی باشور حکومەتیان راگەیاند([٦٥]).

لە دوای بڵاوبونەوەی کوشتنی (سادق عومەر) لە زاخۆ و دەوروبەری گرژی هاتەئاراوە، لەبارەی کوشتنی سادقەوە (پەدەکە) نکوڵی دەکرد پەنجەیان لە کوشتنی سادقدا هەبێت، بەڵام لەهەمانکاتدا پروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد (سادق عومەر) جاش بووە، لەمرنییەوە (پەدەکە) دەیویست رێگری لە نارەزاییەکان بکات و خۆپێشاندانەکانیش بە گێرەشێوێنی لەقەڵەم بدات. ئەو سیاسەتەی (پەدەکە) پەیڕەوی دەکرد بێکاریگەریکردن و سرینەوەی عەشیرەتەکان بوو، (سادق عومەر)یش لە لوبنان سەردانی (عەبدوڵلە ئۆجالان)ی کردبوو، تەنانەت ئەو کاتەی

---

[٦٥] () (سادق عومەر) دوای ئاشبەتاڵی ساڵی (١٩٧٥)، دوای دەمەزراندنی (یەنەکە) بەشداری شۆڕش دەکات، باوکیشی پێشمەرگەی کۆن بووە، لەماوەی بزووتنەوەی کورد کەلە (١٩٤٣) وە دەستی پێکردووە، لەبادینان ئەو کاتەی عەشیرەتەکان کاریان بۆ رژێمی عێراق کردووە ئەمان وەک بنەماڵە شانبەشانی بارزانییەکان خەباتیان کردووە، سەرەڕای ئەوەی عەشیرەتەکان سەربە رژێم بوون بەڵام تیایاندا هەبوو لەناو ریزی پێشمەرگەدا بوون، عەشیرەتی (سندی) هەرچەندە کاریان بۆ رژێم دەکرد بەڵام کەسانێکی زۆریشیان لەناو خەباتی کوردایەتیدا بوون، (سادق عومەر) هەتا ساڵی (١٩٨٦) یش پێشمەرگە بوو، بەهۆی هاتنە ئاراوەی چەند کێشەیەک لەگەڵ (پەدەکە) لەم حزبە جیادەبێتەوە و ماوەی ساڵێک دەچێتە پاڵ رژێمەوە، لەهەمانکاتیشدا (پەدەکە) بە پیاوی ئێران تۆمەتباریان دەکرد، لە ساڵی (١٩٩١) وە (سادق عومەر) ئەچیتە ناو ریزەکانی (یەنەکە)وە، سەرەڕای ئەمەش بە جاش تۆمەتباریان دەکرد، ئەوکەسانەی رێکخستنەکانی (پەدەکە) یان لە بادینان دەبرد بەڕێوە زۆربەیان پێشوتر سەربە ئیستیخباراتی سەدام بوون، تەنانەت پێشمەرگەکانیش هەر ئەو کەسانە بوون کە مانگێک پێش راپەڕین جاشی سەدام بوون، ئەم نمونانە لەناو (یەنەکە)شدا بەدیدەکرا.

کوژرا ئەو دەمانچەیەی بەقەدەوە بوو کە (عەبدولله ئۆجالان) خەلاتی کردبوو، ئەم کوشتنە لە بادینان بووە هۆکاری هاتنەئاراوەی گۆڕانکارییەکی زۆر، یەکێک لەو گۆڕانکارییانە ئەوەبوو ڕێخۆشکەری دەکرد ئاگری فتیلی شەڕی نێوان (پەکەکە) و (بەرەی کوردستانی) گڕبگرێت. پێش کوشتنی (سادق عومەر) بە ٣ مانگ، سەرۆک عەشیرەتێکی ئامێدییە بەناوی (عەلی شەعبان) بە فیتی (پەدەکە) کوژرا، لەم بارەیەوە (پەکەکە) چاوەڕێی کاردانەوەی لە (یەنەکە) دەکرد چونکە عەلی سەربە (یەنەکە) بوو، بەلام (یەنەکە) لە ئاستی کوشتنی عەلی خۆی لەگێلیدا، (سادق عومەر)یش خەلکی زاخۆ بوو هەروەها یەکێک بوو لە ئەندامانی عەشیرەتی سندی، دوای کوشتنی (سادق عومەر) عەشیرەتەکەیان پەیوەندی خۆیان لەگەل (یەنەکە و پەدەکە) بڕی، مالی (سادق عومەر) کە لە گوندی (دەرکار) بوو، دوای ئەم کوشتنە نەیاندەهێشت ئەندامانی (یەنەکە و پەدەکە) بچنە گوندەکەیانەوە، کەسانێکی زۆری ناو عەشیرەتی سندی وازیان لە (پەدەکە) هێنا و داوایان دەکرد بکوژان ڕادەستیان بکرێت و بەپێچەوانەوە خۆیان تۆلە دەکەنەوە.

سەرۆکی (یەنەکە و پەدەکە) جەلال تالەبانی و مەسعود بارزانی هەردووکیان پەیامی سەرەخۆشی خۆیان بۆ عەشیرەتی سندی نارد و ڕووداوەکەیان شەرمەزار کرد و بەلێنی دۆزینەوەی بکوژانیان دەدا، بەلام کەسوکاری (سادق عومەر) نارەزاییان بەرامبەر بە (پەدەکە) و مەسعود بارزانی دەردەبڕی چونکە ئەوانیان بە ئەنجامدەری ئەم تاوانە لەقەلەم دەدا هەروەها پەیامی سەرەخۆشییەکەیان ڕەتکردەوە، لەئەنجامی بەدواچوونەکانی کەسوکاری (سادق عومەر) گومانیان لەسەر ٤ کەس هەبوو پەنجەیان هەبێت لەم کارە کە هەر ٤ یشیان سەربە (پەدەکە) بوون، ئەم ٤ کەسەش سەر بە عەشیرەتی دوسکی بوون کە ناوەکانیان بەمشێوەیە بوو (ڕەجەب، تەحسین کەمەکی، عەزیز و ئیسلام)، بکوژەکان ئەندامی (پاراستن)ی (پەدەکە) بوون، (ڕەجەب)یان بەرپرسی ئەو گرووپە بوو، ئەم گرووپە لە بادینان بەوە دەناسرێن کەلەبارەی کوشتنی خەلکییەوە پرۆفیشنالن، دوای ئەوەی سکالایان لەم ٤ کەسە کرد، هەرچواریان لەلایەن کۆمیتەی بەرەی کوردستانییەوە دەستگیرکران و دوای لێکۆلینەوەیەکی سەرپێی ئازاد کران، سەرۆکی بالای بەرەی کوردستانی لە دهۆک (فازل موطنی میرانی) بوو، فازل موطنی لەهەمانکاتیشدا ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) بوو، دوای

راپەڕین (فازل موطنی) لە ئەمەریکا گەڕایەوە و لەلایەن (پەدەکە)وە  کرا بە بەرپرسی شاری دهۆک.

لەماوەی دوو ساڵی حکومڕانی پارتەکانی باشور ئەو کوشتارانەی هاتبوونە ئاراوە زۆربەیان لەلایەن کەسانی باڵادەستەوە ئەنجام درابوون، بەهۆی تۆمەتبارکردنی (پەدەکە) لەلایەن (پەکەکە) و عەشیرەتی (سندی)ییەوە و زیادبوونی ئاڵۆزی و گرژییەکان (پەدەکە) هەموو بارەگاکانی خۆیانی لە چواردەوری دهۆک بە بلاجیکتۆر رۆشنکردەوە و چەکی قورسیشیان لێدابەست، ئەو ٤کەسەی کەبە بکوژی (سادق عومەر) تۆمەتبار کرابوون پیاوی (فازل موطنی) بوون، سەرەڕای ئەوەی جارێکیش دەستگیر کرابوون بەڵام هیچیان بەرامبەر نەکرا.

## فازل موطنی میرانی کێیە ؟؟

ناونیشانی ئەوانەی (سادق عومەر)یان کوشتبوو دەزانرا، لەبارەی کوشتنی (سادق عومەر) و (فازل میرانی)یەوە، بەرپرسێکی باڵای (یەنەکە) کە نەیدەویست ناوی بهێنرێت زۆر شتی دەزانی و دیمانەیەکی نهێنی لەگەڵ ئەم بەرپرسەی (یەنەکە) سازدرا و لەمبارەیەوە دەیوت :

پرسیار : **ئایا کێ بوون و لەبەرچی سادق عومەریان کوشت** ؟.

وەڵام : ئەوەی راستی بێت لەبارەی ئەم کوشتارەوە بە دەرەجەی یەکەم فازل میرانی بەرپرسیارە، من ئاگەدارم، فازل میرانی لە ٢٩ی حوزەیران ٤ پیاوی خۆی دەنێرێت بۆ سەر رێی دەرکار و بۆسە بۆ سادق دەنێننەوە و دەیکوژن، ئەوەی راستی بێت (میت)ی تورکیش عەودالی کوشتنی سادق بوو، سادق دۆستی پەکەکە بوو هەروەها هاوکاریشیانی دەکردن، ئەمەش دەوڵەتی تورک و (پەدەکە)ی نیگەران کردبوو، سادق لە ناوچەکەدا کاریگەری بەسەر خەڵکەکەوە هەبوو، ئەو رۆژنامەوان و بیانیانەی دەچوون بۆ ئەو ناوچەیە بێشک چای سادقیان دەخواردەوە، کەسێکی خۆشەویست بوو، هەموو ئەمانە فازل میرانی قڵێس کردبوو، فازل لە ناوچەکەی سادقدا سەرقاڵی کاری ناشیا و قێزەوەن بوو، نەک تەنها من بەڵکو هەموو کەسێک دەزانێت فازل میرانی بە پیاوەکانی خۆی سادقی دابەکوشت، فازل میرانی و پیاوەکانی پێیان وایە دهۆک موڵکی باوباپیرانیانە.

پرسیار : **ئایا کاری چیدەکەن و چۆن کار دەکەن** ؟.

وەڵام : ئەندامانی عەشیرەتی سندی دەیانوت ئەوانەی سادقیان کوشت رادەستی خۆیان نەکرێت ئەوا ئەو کەسە ئەدۆزنەوە کە فەرمانی کوشتنی سادقی داوە، بەڵام بەرەی کوردستانی دەستیان گرت بەسەر مەلەفەکەدا و مەسەلەکەیان پینەپەڕۆ کرد، بێگومان ئەم مەسەلەیە دوایی ئاشکرابوو کە بەرەی کوردستانی ئەم کارەیان کردووە، بەرەی کوردستانی

مەسەلەکەی بە شێوەیەکی کەمزیان پەردە پۆشکرد، حەزدەکەم نمونەیەکتان بۆبگێڕمەوە، کەسێک هەیە بە ناوی (محەمەد خالید ئامێدی)، خاوەن پێشەنگای سەیارەیە، لەبارەی کوشتنەکەی سادقەوە لەبازاڕ قسە دەکات، کاتێک محەمەد لە چواردەوری خۆی دەپرسێت ئەرێ راستە فلانکەس لە کوشتنی سادقدا بەرپرسیارە؟، لەوکاتەدا یەکێک لەوێ دەبێت کە سەر بە پاراستنی (پەدەکە)یە، ئەم کابرایە ئەم مەسەلەیە بۆ (عادل باوی) دەگێڕێتەوە کە بەرپرسی ئاسایشی دهۆکە و بەرپرسی ئۆفیسی پاراستنیشە، وەختی خۆی ئەم (عادل)ە لەسەر دزی لە بەغداد ٥ ساڵ زیندانی کرابوو، دوای ماوەیەک محەمەد کە قسەکانی کردبوو لەلایەن کەسانی نەناسراوەوە لە بازاڕ دەیخەنە ناو لانکرۆزەرێکەوە و دەیرفێنن.

پرسیار : **ناوی فازل میرانی لە شەڕیشدا بیستراوە ئایا ئەم فازل میرانییە کێیە ؟.**

وەڵام : ماوەیەکی دووردرێژە لەگەڵ (میت)ی تورک کاردەکات، ئەندازیاری پەیوەندییەکانی نێوان (پەدەکە) و تورکیایە و لەناو (پەدەکە) دا خاوەن پێگەیەکی تایبەتە، ئەو بەرپرسی بەرەی کوردستانییە لە دهۆک و ئەندامی بیرۆی (پەدەکە)یە و هەروەها زوو.. زووش چاوی بە دەسەڵاتدارانی تورک دەکەوێت، لەو ماوەیەی پێشودا دزییەکی زۆری کرد، فازل میرانی لەرێی (عەبدوللە گەرماڤی) کەکاتی خۆی پیاوی سەدام بوو هەرچی چەکی قورس و سوک و ماکینە گەورە و بچوکی سەردەمی سەدام بوو لە دهۆک و دەوروبەری فرۆشت بە ئێران، ٤ گرێدەری سەربە دائیرەی غاباتی دهۆکی لە رێی (عەبدوللە جونەیت) کە باوکی یەکێک لە ژنە دۆستەکانێتی فرۆشت بە ئێران، ٢ لۆری ناوچەی ئاشتاوە و ١ تانکەری ئاو لەرێگای (عبدولرەزاق)ەوە بردیانی بۆ زاخۆ و لەوێ فرۆشتیان، هەروەها گرێدەرێکی سەر بە سەرسەنگ لە هەولێر فرۆشتی بە کەسێک بەناوی (ئیسلام)، ٣ بلدۆزەری فرۆکەخانەی بامەرنی بە هاوکاری خزمێکی کە ناوی (شەهاب میرانی)یە فرۆشت، هەروەها هەرلەرێی شەهابەوە بەڵگەنامەی بۆ خەڵکی دەکرد کە شتومەک بگوازنەوە بۆ ئێران و لەهەمبەر ئەمەدا پارەیەکی زۆری وەرگرتووە کە باس لە ١ ملیۆن دیناری ئەوسا دەکرێت، فازل میرانی بۆکاروباری بازرگانی شەریکی (ئەحمەد دیلیمی)یە کە عەرەبە، ئەحمەد لە ئەوروپا ئەشیا دەبات بۆ تورکیا و لەوێوە دەیهێنێت بۆ زاخۆ و دوایش دەیبات بۆ بەغداد و ساغیان دەکاتەوە، باڵەخانەکانی بەریدی دهۆک و چەند باڵەخانەیەکی تری حکومی بە نرخێکی زۆر هەرزەلی فرۆشت بە (عەبدولا جونەیت)، دوای هاتنەوەی فازل میرانی بۆ دهۆک لەماڵی

(عەبدولا جونەیت) جێگیربوو کەبە (ئەبو رێکان) ناسراوە، بەراستی لە دهۆک سەرقاڵی کاری قێزەوەن و ژن بازین کە سنوریان نییە، ئەو هەیکەلە ئاسەوارییانەی لە دهۆک بوون هەموویانی دزی و بردیانی بۆ ئەمەریکا و لەوێ فرۆشتیانی، یەکێک لەو هەیکەلانە هەیکەلی باڵندەیەک بوو کە کاتی خۆی لە چاڵێکی نزیک موسڵ دۆزرا بووەوە، دەستی گرت بەسەر ئەو ماڵ و کێڵگە و باخە زۆرەی ئەوکەسانەی کە دوای راپەڕین کوردستانیان جێهێشتبوو دوایش هەموویانی فرۆشت، یەکێک لەو کێڵگانە کێڵگەی شێخ (موحمود) بوو، کە زانی دەستیان بەسەر کێڵگەکەیدا گرتووە پارەی قەرز کرد و دوو ماشێنی جۆری (مێرسیدس)ی کڕی و بە خەڵات ناردی بۆ فازل میرانی، بەڵام فازل میرانی دەستی گرت بەسەر دوو مێرسیدسەکەدا و سەرەڕای کێڵگەکەیشی کەچی شێخ (موحمود)ی دابەکوشت، ئەفسەرێکی پۆلیسخانەی سەردەمی سەدام کە کەسێکی باشیش بوو کە هاوکاری کەسانێکی زۆریشی کردبوو لە دهۆک کە بە رەچەڵەک عەرەب بوو، دەستی گرت بەسەر خانووەکەیدا و زەوتیکرد و لە بەرامبەریشدا پارەیەکی کەمی داپێ، ئەوەی راستی بێت ئەم خانووەی گرت بۆ برای ژنێکی دۆستی، نیوەی ئەو پارەیەشی گلدایەوە بۆئەوەی بەرامبەر بەو پارەیە برای ژنە دۆستەکەی رەوانەی تورکیا بکات، هەروەها فازل میرانی دەستی بەسەر خانووی (محەمەد حەسەن) گرت کە پێشمەرگەی کۆن بوو و لە ئێران کۆچی کردبوو، ئەم خانووەشی فرۆشت بە کۆنە بەعسییەک بەناوی (شەوکەت عابد الموزوری)، ئەم کابرایە بەرامبەر بە کورد هەزارەها تاوانی ئەنجامدا بوو.

ژن و منداڵەکانی فازل میرانی لە ئەمەریکان و خۆیشی زوو.. زوو سەردانیان دەکات، بەراستی چەتەیەکی زۆر تۆقێنەری پێکهێناوە و خەڵکییان پێدەکوژێت، ئەوەشی باشە جارناجارێک ژن بۆ پیاوەکانی خۆی دەهێنێت، کاتێک لە کوردستان منداڵانی باوک شەهید لە برساندا دەمرن فازل لە شاییەکانی پیاوەکانیدا بە هەزارەها دینار پارە خەرج دەکات، نمونەی ئەو کەسانەش ئەمانە (نێچیرڤان ئەحمەد مزوری) بەرپرسی ناوچەی (پەدەکە) یە، (فەهمی عەبدوللە هیمۆ) بەرپرسی تەلەفزیۆنی خەباتە، (رزگار ئەحمەد و نەجیب بەرواری)، ئێزیدییەکانی فیشخاپور کە لە دێرزەمانەوە لەوێ جێگیرن و هیچ کاتێکیش جاش نەبوونە ویستی لەوێ دەریان پەڕێنێت و خزمەکانی خۆی لە شوێنیان جێگیربکات کە هەمیشە جاشی سەدامیش بوونە، لەمبارەیەوە سەرۆکی ئێزیدییەکان (خەیری بەگ) سکاڵای لەلای بەرەی

کوردستانی کردبوو، خەیری بەگ وتبووی ئەگەر لە شوێنەکانی خۆیان دەریان بکەن ئەوا پەنا بۆ سەدام دەبەن، بەڵام مەخابن بەرەی کوردستانی ئەم کێشەیانی بۆ چارەسەر نەکرد. فازل میرانی ئەو بێ ئەدەبییەی خوا پێی ناخۆشە بەرامبەر بە ژن و کچانی شەهیدان دەیکات، لەمبارەیەوە لەمدواییەدا رووداوێکم بیست دەمەوێت بۆتانی بگێرمەوە، رۆژێکیان گەنجێک کچە مامەی خۆی دەبینێت دەچێتە ناو باڵەخانەی (پەدەکە) وە، گەنجەکەش لە پاسەوانەکان پرسیاری کچە مامەکەی دەکات بەڵام پاسەوانەکان پێی دەڵێن کچی لەو شێوەیەیان نەبینیوە و نەهاتووە بۆئێرە، دوای ئەوەی گەنجەکە پێداگری دەکات پاسەوانەکان دارکارییەکی باشی دەکەن، گەنجەکە ئەم مەسەلەیە بۆ مامەی دەگێڕێتەوە، دوای ئەوەی کچەکە دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە باوکی دارکارییەکی باشی دەکات، بۆسبەی یەکێک لە پیاوەکانی فازل میرانی بەناوی (ئاشتی کوچەر) باوک و ئامۆزای کچەکە دەگرێت و تیرووپریان لێدەدات و هەڕەشەی کوشتنیشیان لێدەکات، کچەکە دۆستی فازل میرانی بوو، لەناوچەکەدا (ئاشتی کوچەر و یونس پێداوی) خاوەن چەتەن، لەناو خەڵکیدا وەک پاراستن خۆیان نیشاندەدەن، کەس ناتوانێت تەداخولی ئەمجۆرە کەسانە بکات، ناتوانم باسی ژمارەیەکی دیاریکراو بکەم بەڵام پەنجەیان لەخوێنی زۆرکەسدا سوورە.

پرسیار : ئایا (پەدەکە) کەسێکی وەک فازل میرانی چۆن قەبوڵ دەکات؟

وەڵام : فازل میرانی لەگەڵ ئیستیخباراتی نیودەوڵەتی و لەگەڵ میتی تورک دەستی تێکەڵاوە ئەمەش ئاسانکاری دەکات بۆ فازل میرانی کە بە ئارەزووی خۆی ئەسپی خۆی تاوبدات، کەس ناتوانێت لەهەمبەریدا قسە بکات، هەموویان بەیەکەوە یەکتری دەپارێزن، کێ دەتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە؟، هەموو پەیوەندییە دەرەکییەکانی (پەدەکە) لە بەرژەوەندی خۆی بەکار دەهێنێت، تەنانەت خودی (مەسعود بارزانی)ش ئەگەر راپرسی بەونەکات زۆرکار ناکات، لەزۆر بوارەوە ئەگەر فازل میرانی نەبێت زۆر کاروباری (پەدەکە) نارِوات بەرێوە، کۆمەڵێک لە ئەندامانی پلەبەرزی ناو (پەدەکە) لەبەرئەوەی موچە و دەستکەوتیان کەم بوو ویستییان بچنە ناو (یەنەکە) وە، بەڵام فازل میرانی سەیارەی تازەی خەڵاتکردن و نەیهێشت بچنە ناو (یەنەکە) وە، ئەمەش ناوی ئەو کەسانەن کە فازل میرانی سەیارەی بۆکڕیوون (شێخ عەلو گەلۆ) لە ساڵی ١٩٧١ بەرپرسی ئۆفیسی ئیستیخباراتی عێراق بووە، حەمید بانی، جەمال ئەیمەن، حوسێن ئەبوو، یونس مام زووەینی، هەموو ئەمکارانە لەرێی بەرتیلەوە روودەدەن

که ئەم نەریتە لە ناو سیاسەتمەدارەکانی تورکیاشدا باوە، پەرلەمانتارێکی بەعسی بەناوی (ناسر بەگ) بەرامبەر بە ١٠٠ هەزار دینار چووە ناو بزووتنەوەی ئیسلامییەوە، لە دوایشدا (یەنەکە) ٧٠٠ هەزار دیناری داپێی و هێنایە ناو خۆیەوە، دوایش فازل میرانی سەیارەیەکی جۆری لاندکرۆزەری بۆکرِی هێنایە ناو (پەدەکە) وە، لەڕاستیدا فازل میرانی کارێکی زۆر گرنگ بۆ (پەدەکە) دەکات هەربۆیە لە ئاستی هیچ ناڵێن و پارەیەکی باشیشی دەدەنێ، بێگومان (بزووتنەوەی ئیسلامی و یەنەکە) داوای پارەکانی خۆیان کردبووەوە بەلام وەریان نەگرتەوە و تاکو ئەم ساتەش ئەم کێشەیە بەردەوامە، فازل میرانی (موزەفەر حاجی یونس) ی بەرامبەر بە لاندکرۆزەرێک هێنایە ناو (پەدەکە) و هەروەها پارێزەر (مەکی ئامێدی)یشی بەرامبەر بە ١٥٠ هەزار دینار هێنایە ناو (پەدەکە) وە.

## (پەکەکە و پەدەکە) یەکتری ووشیار دەکەنەوە

شەرمەزارکردنی تاوانی کوشتنی (سادق عومەر) یەکێک بوو لە سیناریۆی پیلانی کوشتارەکە، دوای ماوەیەک ئەندامانی عەشیرەتی سندی کەوتنە جوڵەوە، ئەو کۆمەڵگایەی قانونی نوسراوەی نەبێت بێگومان قانونی تۆڵە سەندنەوە و (سەر بە سەر)ی تێدا بەکار دەهێنرێت، لە ٢ی تەموز کاتژمێر ٩ی بەیانی ئەندامانی عەشیرەتی سندی لە زاخۆ تەقەیان کرد لە فەرماندەیەکی (پەدەکە) بەناوی (مەحمود شەفیق) و کوشتیان، لە کاتی ئەم هێرشەدا تەقە هاتە ئاراوە و لەئاکامدا ٢ پاسەوانی مەحمود و ٣ کەسی سەربە عەشیرەتی سندی کوژران، خواستی کوشتنی (فازل میرانی) لەلایەن عەشیرەتی سندییەوە لەلایەن (یەنەکە) وە رێگری لێکرا، دوای ئەم رووداوە (پەدەکە) هێزی خۆی نارد بۆ بەرزایەکانی چواردەوری زاخۆ و نزیک بە گوندی (دەرکار) چەکی قورسیان دابەست، پیاوەکانی سندیش چوونە سەر شاخ، هێزەکانی (پەدەکە) تەنانەت مۆڵەتی ئەوەشیان نەدەدا ئازوقە بچێت بۆ گوندەکە.

بەردەوام بوونی گرژییەکانی نێوان (پەدەکە) و سندییەکان و (پەکەکە)، بوونە هۆکار هەریەکە و لایەنگرانی خۆیان ووشیار بکەنەوە، سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی بۆ ماتەمینی (مەحمود شەفیق) لە ٥ی تەموزدا هات بۆ زاخۆ و (مەسعود بارزانی) وتی (**دەمانەوێت لە ماوەی ٢ رۆژدا سەعیدمان رادەست بکەن کە بکوژی مەحمودە بەپێچەوانەوە هێرشیان بۆدەکەین**)، ئەو شوێنەی (مەسعود بارزانی) ئاماژەی بۆدەکرد کە هێرشی بۆدەکات بێگومان ئەو شوێنانەبوو کە گەریلاکانی (پەکەکە) لێی جێگیربوون، بەڵام ئەوەی مایەی سەرنج بوو ئەوەبوو (مەسعود بارزانی) بەهیچ شێوەیەک باسی لە کوشتنی سادق و باسی تۆمەتبارەکانیشی نەکرد، (پارتی ئازادی کوردستان) پاک، جومگەیەکی (پەکەکە) بوو، لەدوای ئەم ووشیارکردنەوە کەلە ٥ی تەموز هاتە ئاراوە، گەریلاکانی (پاک) بە پێشمەرگەکانی

(پەدەکە) یان وت ئەگەر پێشمەرگەکانتان لە چواردەوری گوندی (دەرکار) نەکشێنەوە ئەوە ناچار دەبین دەستبگرین بەسەر رەوشەکەدا، لەسەرئەمە هەردوولا واتا (پاک) و (پەدەکە) لایەنگرانی خۆیان لەمەڕ ئالۆزی رەوشەکە ووشیار کردەوە، لەدوای ئەم ووشیار کردنەوەیەش رەوشەکە ئالۆز تر بوو، لەبارەی گرژی ئەم رەوشە دوو ئەندامی پلە بەرزی ناو (یەنەکە) بەناوی (عارف روشدی و حەسەن کوێستانی) هەردووکیان (پەدەکە) یان تۆمەتبار دەکرد، بۆئەم مەبەستەش ئامانجەکانی (پەدەکە) یان خستە روو، لەمبارەیەوە دەیانوت (بەناردنی پێشمەرگە بۆ بناری چیاکان و چواردەوری گوندی دەرکار و دروست کردنی گرژی و ئالۆزی بەرامبەر بە سندییەکان و ووروژانیان لەلایەن (پەدەکە) وە ئەوەی راستی بێت ئەمە بیانووە و خۆئامادەکردنە بۆ هێرشکردنە سەر (پەکەکە)، کوشتنی سادق عومەریش پیلانێک بووە بۆ رێکخۆشکەری ئەم پیلانە، پیلانیان وابووە سادق بکوژرێت سندییەکانیش رادەپەڕن و گرژی دروست دەبێت، لەدوایشدا بە بیانوی کپکردن و سەرکوتکردنی سندییەکان پەلاماری (پەکەکە) دەدرێت، ئاشکرایە (پەدەکە) ماوەیەکە خۆی بەم پیلانەوە سەرقاڵ کردووە، بەتایبەتی پیلانی ئەم مەسەلەیە لەلایەن فازل میرانییەوە داڕێژراوە کە ماوەیەکە هاتوچۆی سلۆپی دەکات، دەیانەوێت (پەکەکە) بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، بەنیازن ئەوکاتەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە ناوچەکە هێرشی سەر (پەکەکە) دەکەن فڕۆکەکانی تورکیاش بۆردومانی (پەکەکە) دەکەن، بەمشێوەیە دەیانەوێت گەریلاکانی (پەکەکە) لە سنورەکان دوور بخەنەوە[٦٦]).

کردەوەکانی (پەدەکە) لە بادینان و کوشتنی (سادق عومەر) و هەڵوێست دەرنەبڕینی (یەنەکە) لەئاستی باڵادا ببووە مایەی نارەزایی کۆمەڵێک لە کادیرانی ناو (یەنەکە)، دیاربوو ئەم کادیرە دڵسۆزانە لەوە بێ ئاگابوبێتن کە رێکخراوەکەی خۆشیان پەنجەیان هەبوو لەم پیلانە، تەنها چەند نمونەیەکی کادیری (یەنەکە) کەلەسەرەوە ناویان هاتبوو قسەیان لەبارەی رەوشەکەوە دەکرد، سەرەڕای ئەوەی (یەنەکە) دەستی کرد بە ناردنی هێزی پێشمەرگەی خۆی لە سۆرانەوە بۆ دهۆک کەچی دەیانوت لاحاڵەتی هاتنە ئاراوەی شەڕدا بێلایەن دەبین و ئێمە لایەنگری خوێن رشتن نین و بۆڕاگرتنی رژانی خوێنیش ئەوەی لەدەستمان بێت دەیکەین، هەروەها ئاماژەی ئەوەیاندەکرد گوایە (یەنەکە) رۆڵی ناوبژیوان دەگێرێت.

---

[٦٦] ٢ی گوڵان ١٩٩٢ رۆژنامەی (نوزگور گوندەم ).

کاتێک ئاڵۆزییەکان بەردەوام بوون، (پەدەکە) هێزەکانی خۆی لەسەر ڕێگای دەرکار و چواردەوری (باتوفە) چڕتر کردەوە، هێزدانان لەسەر ئەو خەتانەی کە سنورەکان بەیەکەوە گرێدەدەن بە ئامانجی ئەوەبوو لەحاڵەتی هاتنەئاراوەی شەڕ ڕێگری لە هاتوچۆکردنی گەریلاکانی (پەکەکە) بگرن، لەو ماوەیەشدا فڕۆکەکانی تورک بە ئامانجی کەشفکردن فڕینەکانیان زیاد کردبوو، لە ٦ی تەموزەوە فڕۆکەکانی تورک بە ئامانجی کەشفکردن و دۆزینەوەی شوێن و بنکەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە بەیانییەوە تاکو ئێوارە لە ناوچەکە دەفڕین، بەمشێوەیە فتیلی شەڕ گڕی گرت، هەرچییەک بکرایە و نەکرایە و هەرچییەک ببوایە و نەبوایە دەبوایە ئەم شەڕە ڕووی بدایە و ببوو بە ئەمری واقع، ئیتر هەدەفەکەش وەک ڕۆژی ڕووناک دیاربوو، ئەویش ئەوەبوو هێرشبکرێتە سەر (پەکەکە) و لە هەرێمەکە دەریان بکەن.

## (جەلال تاڵەبانی) لە ئەنقەرە

## ئۆپەراسیۆنی سەندویچ ئامادە دەکات

فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک بە شێوەیەکی عەشوایی خاکی باشوریان بۆردۆمان دەکرد، هەروەها سوپاکەشیان لە ناوچەکەدا سنورەکانیان دەبەزاند، لەهەمانکاتیشدا هێرشەکانی گەریلاکانی (پەکەکە) بۆسەر بنکە و بارەگای سوپای تورک بە چڕی بەردەوام بوو، لەم بارودۆخەدا سەرۆکی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی بە شێوەیەکی نهێنی چوو بۆ ئەنقەرە، ئەم سەردانەی (جەلال تاڵەبانی) سەردانێکی هەروا هاکەزایی نەبوو، وەزارەتی دەرەوەی تورکیا (جەلال تاڵەبانی)یان ناردبوو بۆلای فەرمانداریێتی سوپا سالاریان و ئەوانیش حەواڵەی (ئەشرەف بتلیس)یان کردبوو کە فەرماندەی گشتی هێزی پیادەیی سوپای تورک بوو، (ئەشرەف بتلیس) و کارمەندانی (میت) گوێیان بۆ (جەلال تاڵەبانی و سەرچڵ قەزاز) گرتبوو، (جەلال تاڵەبانی) شتی سەیروسەمەرەی بۆ گوێگرانی باس دەکرد، ئەوەی ڕاستی بێت (جەلال تاڵەبانی) باسی شتێکی دەکرد بۆ گوێگرانی کە ساڵەهای ساڵە پێیان نەکرابوو، هەروەها هیچ کاتێک هەلێکی واشیان چنگ نەکەوتبوو، هەوڵیشیان بۆ دابوو بەڵام پێیان نەکرابوو، (جەلال تاڵەبانی) بۆ لەناودانی هێزەکانی (پەکەکە) پێشنیاری ئۆپەراسیۆنی هاوبەش و داوای هاوکاریشی لێدەکردن، (ئەشرەف بتلیس) و کارمەندانی دەوڵەت و ئەندامانی (میت) هەموویان بەبێ هیچ دوودڵییەک ئەم پێشنیارەیان قەبوڵ کردبوو، بۆئەم مەبەستەش بە زووترین کات دەستیان کرد بە ئامادەباشی، بەگوێرەی پیلانەکە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە باشور و دەوڵەتی تورکیش لە باکورەوە لەیەککاتدا هێرشی (پەکەکە)یان دەکرد و گوایە هێزەکانی (پەکەکە) ریشەکێش دەکەن .

ناوی ئۆپەراسیۆنەکەشیان پەیداکردبوو (ئۆپەراسیۆنی ساندویچ)، بەگوێرەی پیلانەکەیان (پەکەکە) دەبێت بە (هەمبەرگر)ی ناو ساندویچەکە، سوپای تورک و پێشمەرگەش بە پارووییەک ئەم ساندویچەیان قووت دەدا، ئەم ساندویچەش لەلایەن (جەلال تاڵەبانی)وە وێژ کرابوو، ئی لەمەباشتر هەبوو بۆ دەوڵەتی تورک. دوای ئەم دیمانەیە بۆ لێکۆڵینەوەی ئایا

ئەم ساندویچە چۆن دەخورێت دەوڵەتی تورک وەفدێکیان نارد بۆ باشوری کوردستان کە پێکهاتبوون لە چەند ئەفسەرێکی سوپا و کارمەندانی میت[٦٧]، لەڕاستیدا ئەم پێشنیارە نوێ نەبوو، لەمانگی حوزەیراندا جارێکی تر لەرێی (سەرچڵ قەزاز)وە سەرۆکی عەشیرەتی برادۆست (کەریم خانی برادۆست)، بۆ دەوڵەتی تورک هەمان پێشنیاری کردبوو[٦٨].

لەهەمانکاتدا ئەو دیدارانەی لە باشور (مەسعود بارزانی و فازل میرانی) لەگەڵ کارمەندانی دەوڵەتی تورک ئەنجامیان دەدا هەرچۆنێک بێت بۆ هەمان مەبەست بوو.

[٦٧] ٩ حوزەیران ١٩٩٣ رۆژنامەی ( ئایدنلک )

[٦٨] گێڕانەوەی (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر ).

## (پەکەکە) ئابلۆقە دەخاتە سەر (پەدەکە)

کاتێک گرژی و ئاڵۆزییەکان بەردەوام بوون لایەنەکان بۆ ئەگەری هاتنەئاراوەی شەڕ ئامادەباشی خۆیانیان دەکرد، (پەکەکە) لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی باشور ساردبیووەوە و رایانگەیاند ئابلۆقەی خستووەتە سەر باشوری کوردستان، لەم بارەیەوە لە ١٧ی تەموزی ساڵی (١٩٩٢) لە شارۆچکەکانی وەک سلۆپی و جزرە بڵاوکراوەیەکیان بڵاوکردەوە کە واژۆی (فەرمانداریێتی بۆتان لە باکور) سەربە ئارگەکە (ئارتەشی رزگاری گەلی کوردستان)ی پێوەبوو، بەیاننامەکە کۆمەڵە کەس و لایەنێکی تۆمەتبار دەکرد کەلەسەر پشتی خەڵکی خۆیان کردووە بە ئاغا و رۆژلەدوای رۆژ خۆیان و ئاغا گەورەکانیان دەوڵەمەند دەکەن، ئەو کەسانەش هەر ئەو کەسانەن کەلەسەر خواست و فەرمانی (مەسعود بارزانی) دژ بە (پەکەکە) شەڕیان راگەیاندووە، هەروەها هەر ئەوجۆرە تاقم و کەسانەش لەناوچەکە کەسانی وەک (عەلی شەعبان و سادق عومەر)یان کوشت کە دۆستی ئێمەبوون، هەروەها لە بەیاننامەکە هاتبوو دەوڵەتی تورک بەتەنها بەرامبەر بە هێزەکانمان ئەنجامیان بەدەست نەخستووە، ئێستاش دەیانەوێت لەرێی (پەدەکە) و (مەسعود بارزانی)یەوە ئەنجام بەدەست بخەن[٦٩].

لەهەمبەر ئەم هەڵوێستەی (پەکەکە)، (پەدەکە)ش قۆڵی خۆی هەڵماڵی و دەستیان کرد بە ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن، (پەدەکە)ش وەک کاردانەوە دەستیان کرد بە گرتنی بازرگانە باکورییەکان، دوای ٢ رۆژ بەسەر دەرچونی ئەم بڕیارە (پەدەکە) ٥ بازرگانی (جزرە)یان دەستبەسەر کرد، یەکێک لەوانە (زەکی دەمیر) بوو، دەستیان گرت بەسەر سەروەتەکەیشیدا. لەناوچەکە (پەدەکە) بڵاوکراوەیەکی بڵاوکردەوە داوایان لە لایەنگرانی خۆیانیان دەکرد لەکوێ لایەنگر و کادیرانی (پەکەکە) تان بینی بیانگرن، خاڵە پشکنینەکانی هاتن و چونی

---

[٦٩] ١٨ای تەموز ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

شارۆچکەی زاخۆیان چڕ کردەوە، بەمشێوەیە لەیەککاتدا (پەدەکە) و (پەکەکە) لە دژی یەکتر بڵاوکراوەیان بڵاوکردەوە و ئاڵۆزی و گرژی نێوانیان زیادی کرد، دەتوانرێت بوترێت شەڕی ساردی نێوانیان کۆتایی پێهات و بوار بۆ شەڕی مەیدانی رەخسێنرا، بارودۆخەکە وەک بورکان تەقییەوە و هەردوولا دەستیان لەسەر پەلەپیتکەبوو.

دەروازەی گومرکی (ئیبراهیم خەلیل) بەلای کەمەوە رۆژانە (٥٠٠) لۆری بارهەڵگر دەهاتن و دەچوون، لەگەڵ دەستپێکردنی ئەم ئابڵوقەیەی (پەکەکە) هاتوچووە سڤیلییەکان راگیران، لەسەر ئەم ئابڵوقەیە بە سەدان لۆری لە بەشی باکوری کوردستان بە خۆیان و بارەکانیانەوە لە سلۆپی، جزرە، ئیدیر و نوسەیبین کەوتنە چاوەڕوانییەوە، لە رۆژی ٨و٩ی تەموز تەنها ٧بۆ٨ لۆرییەک لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) پەڕینەوە.

بەرپرسیارانی گومرکی دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) بەناوی حکومەتەوە لەهەر لۆرییەک (١٠٠٠) هەزار دیناریان وەردەگرت و ئەو بەنزینەیشی شۆفێری لۆرییەکان دەیانکڕی دەبووە سەرچاوەی داراییەکی باش بۆ حکومەتی باشور، لەیەکەم رۆژی دەستپێکردنی ئابڵوقەکە شتومەک و جۆری ئازوقەکان نرخەکانیان بەرز بووەوە[٧٠].

پێش ئەوەی شەڕی لایەنەکان بەشێوەیەکی مەیدانی رووبدات، لایەنەکان لە هاتنەئاراوەی ئەگەری هەموو شتێکدا بێباک بوون و هەروەها ئەوەی لەدەستیان بهاتایە دەیانکرد بۆئەوەی لە ئەگەری هاتنەئاراوەی ئەم شەڕە خۆیان بە حەق بزانن، لەمبارەیەوە لە ٤ی ئاب، نوێنەری (یەنەکە) لە ئەنقەرە (سەرچڵ قەزاز) بۆ رۆژنامە تورکییەکان و (بی بی سی) روونکردنەوەیدا و دەیوت (**ئابڵوقەی پەکەکە لە ئابڵوقەی سەدام و نەتەوە یەککرتووەکان کاریگەرتر بووە، خەڵکی باشور روبەڕوی برسێتی بونەتەوە، ئەمکارەی پەکەکە خزمەت بە سەدام دەکات**[٧١]).

نوێنەرایەتی (ئەرنەکە) واتا (ئانییە رزگارییە نەتەوەیی کوردستان) کەباڵی سیاسی پەکەکە یە، ئۆفیسی رۆژهەڵاتی ناوینیان، لە ٦ی ئاب لەبارەی قسەکانی (سەرچڵ قەزاز)ەوە رونکردنەوەیدا و بە توندی رەخنەی ئەم قسانەیانکرد، لەم رونکردنەوەیەدا (ئەرنەکە) باسی لە پەیوەندییەکانی نێوان (یەنەکە و میت) دەکرد و هۆکاری بڕیاری ئابڵوقەشی بەمشێوەیە هێنابووە زمان (**کۆمەڵە کەسان و لایەن هەن دەیانەوێت ئەو ئازادییە هەراج کەن کە بە رەنج**

---

[٧٠] ٢١ی تەموز ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە

[٧١] ٥ی ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی)

**و خوێن و ئەمەکی خەڵکی باشور هاتووەتەدی، ئەوان لە باشور چەندین ئۆفیسی میت یان کردووەتەوە، بەرپرسیارانی باشور کەسانی شۆڕشگێڕی پارچەکانی تری کوردستان دەسگیر دەکەن و رادەستی تورکیا و سوریایان دەکەنەوە و دەروازەی ئیبراهیم خەلیلیان کردووە بە دەروازەی دزین بۆخۆیان و داهاتی خەڵکی بە هەدەر دەبەن و دەیدزن، لەهەمانکاتدا رێ لە هەڤاڵانی ئێمە دەگرن تاکو نەتوانن ئازوقە بۆ ناوچەکانی تر بەرن و وەڵات پارێزە دڵسۆزەکان دەکوژن و بڕیاری ئابلوقە هەڵوێستە بەرامبەر ئەوانەی لەگەڵ تورکیا پیلان دادەرێژن پەلاماری ئێمە بدەن، ئەوان هەڵەن ئەگەر وابزانن بە دروستکردنی تۆمەت گوایە ئێمە هاوکاری سەدام دەکەین دەستبەرداری مافەکانمان دەبین، ئەی باشە ئەو رۆژەی پەرلەمانیان پێکهێنا و لە ژووری پەرلەماندا ئاڵای عێراقیان شەکاندەوە هۆکارەکەی ئێمەبووین؟، ئەوان بە خۆیان رەوا دەبینن کۆبونەوە لەگەڵ میت دا بکەن، بەڵام لەبارەی کاری هاوبەش و کاری دۆستانە لەگەڵ ئێمەدا خۆیان دوورە پەرێز دەگرن[٧٢]** .

لەوکاتەدا سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لەگەڵ هاوپەیمانەکانیدا لە وەڵاتی ئەمەریکا بوو، لە مەسعود بارزانیان پرسی (ئایا ئێوە واتا بەرەی کوردستانی و تورکیا دژ بە (پەکەکە) هیچ رێککەوتنێکتان هەیە؟)، لەمبارەیەوە مەسعود بارزانی وتی **(رێککەوتنێکی وا لەئارادا نییە، ئەگەر پەکەکە هێز و توانای هەیە ئەوە ئازادە لە تورکیا هەرچییەک بکات، بەڵام بەرای ئێمە ئەوان خاوەن هێز نین هەربۆیە لەدوای هەموو چالاکییەک هەڵدێن، بەمشێوەیە کێشە بۆ گەلی کورد دروست دەکەن و لەهەمبەر مێژوو بەرپرسیار دەبن، ناکرێت ئامانجەکانیان لە خاکی ئێمە بەدیبهێنن، ئەگەر هەر زۆر مەبەستیانە ئابلۆقە بەسەر ئێمەدا بسەپێنن با شۆفێرەکانی کوردی تورکیا ئازوقە بۆئێمە نەهێنن، بەڵام دەبێت باش بزانن تاوانێکی گەورەی مێژوو دەکەن، هەرگیز میللەتی کورد لەوان خۆش نابێت)** .

سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی بەشێوەیەک قسەی دەکرد لەوەدەچوو خاکی باشوری کوردستان موڵکی ئەوبێت، هەروەها بە ناوی میللەتی کوردەوە دەدوا و دەیوت گوایە لە کوردانی باکور نابورێن، پابەند بوونی کوردی باکور بە ئابلۆقەکەوە، کوردانی باشوری نیگەران و نارەحەت کردبوو، ئەندامی سەرکردایەتی (یەنەکە) ئەحمەد بامەڕنی لەمبارەیەوە دەیوت **(ئەم ئابلۆقەیەی پەکەکە وا لە خەڵکی دەکات بەچاوی رژێمی سەدامەوە لێیان بروانن)**.

---

[٧٢] ٩وە١٥ ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی (یەنی ئولکە)

هەروەها (ئەحمەد بامەڕنی) لەبارەی هەڵوێستی شۆفێرە باکورییەکانەوە دەیوت لەوان حاڵی نابن و بانگەوازی بۆدەکردن لە هەمبەر (پەکەکە) ئەوانیش هەڵوێست نیشان بدەن و بەپێچەوانەوە ئەگەر سوور بن لەسەر هەڵوێستی خۆیان ئەوە من وەک پەرلەمانتارێکی کورد ئەو شۆفێرانە و ئەوکەسانەی هەمان هەڵوێستیان هەیە لەبارەی کوردبونیانەوە نکۆڵیان لێدەکەین[٧٣] .

(ئەحمەد بامەڕنی) چەندین ساڵ لە فەرەنسا نوێنەری (یەنەکە) بوو، دوای راپەڕین گەڕایەوە بۆ کوردستان و دوایش (یەنەکە) کردی بە پەرلەمانتاری دهۆک، لە لێدوانەکەیدا دەیوت (براکانمان لە تورکیا)، ئەم دێڕەی وەک بانگەوازییەک بەکار دەهێنا و ئەم لێدوانەیشی بۆ رۆژنامە تورکەکان دەدا، (ئەحمەد بامەڕنی) پێیوابوو بەم هەڕەشە و بەم بانگەوازییە کوردی باکور دەستبەرداری ئابلۆقە دەبن.

---

[٧٣] ٤ی ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی) .

## (گەورەترین ئۆپەراسیۆنی ئەودیو سنورا)

لە سەرەتای مانگی ئاب، سوپای تورک کەوتنە جوڵەوە و لە باشوری کوردستان دەستیان کرد بە هێرشکردن بۆسەر بنکە و بارەگاکانی (پەکەکە)، بەرپرسیارانی دەوڵەت لەبارەی ئەم ئۆپەراسیۆنەوە دەیانوت (**لە ساڵی ١٩٨٣ وە ئەم ئۆپەراسیۆنە دەبێتە گەورەترین ئۆپەراسیۆنی مێژووی سوپاکەمان**)، لەهەمانکاتیشدا چاوەڕێی گەڕانەوەی هەردوو سەرکردەی کورد (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) بوون.

لەوماوەیەدا (ئەشرەف بتلیسی) کەلە ساڵی (١٩٩٣) لەئاکامی رووداوێکی فڕۆکەدا گیانی لەدەستدا یاخود بەبۆچونی چەند لایەنێک دەیانوت لە ئاکامی کۆمپلۆیەک کوژراوە، ناوبراو لە ١٠ی ئابی ١٩٩٢ چوو بۆ دیاربەکر و دەیویست ئەو پیلانەی لە ئەنقەرە دایانڕشتبوو لە بەهاری ساڵی داهاتوو بیخەنە بواری جێبەجێ کردنەوە، ئومێدی هەرە گەورەیان بە هێزی سەربازی پیادەییانەوە گرێدابوو، بۆ ئەم مەبەستەش کۆتایی مانگی ئاب یان سەرەتای مانگی ئەیلولیان دیاریکردبوو، ژەنڕاڵەکانی تورک لەم کارە پەلەیان بوو، (سلێمان دیمیرال) کە تازە ببوو بە سەرۆکی حکومەتی تورکیا ئەویش هەروەکو سەرکردەکانی پێش خۆی بەڵێنی دەدا (**لەماوەیەکی کەمدا تیرۆریستان بنبڕ و ریشە کێش دەکەین**)، ئەم ریشەکێشییەی ئەم جارە لەچاو ریشەکێشەکانی تری پێشو کەمێک جیاوازتر بوو، ئەمە گرێدراوبوو بە راستگۆیی سەرکردەکانی باشورەوە. خەڵکی ناوچەی (لیجە و قوڵپ)ی سەربە شاری ئامەد کە بەشداری مەراسیمێکی بە خاک سپاردنی تەرمی گەریلایەک ببوون لەلایەن هێزەکانی دەوڵەتی تورکەوە دەستدرێژیان لێکرا و بەمشێوەیە دەوڵەت و حکومەتی تورک لەمەڕ سیاسەتی نوێیان بەرامبەر بە کورد رووی راستەقینەی خۆیان ئاشکراکرد، دەوڵەتی تورک ئەمجارەیان سودیان لەو بەڕێوبەرایەتییە وەردەگرت کە لەلایەن خودی کوردەوە باوڕ پێکراوبوون و بە مکیاج رووە راستەقینەکەی خۆیان شاردبووەوە، ئەمجارەیان دەوڵەتی تورک سوور بوو لەسەر ئەوەی شۆڕشی کورد نەهێڵن و تەفروتونایان بکەن.

بەگوێرەی ئەو سەرچاوانەی لە سوپای تورکەوە نزیک بوون دەوترا ئەم ئۆپەراسیۆنە سەرەتا بە بۆردۆمانی ئاسمانی ناوچەکانی (چوکورجە و ئولودەرە) دەست پێدەکات و پاشان لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل)ەوە زرێپۆش و تانک و تۆپەکانیان رەوانەی باشور دەکەن و دوایش هێزی پیادەیی سوپا دەچێتە باشورەوە، ئامانجیان ئەوەبوو لە رێی ئامێدییەوە هێرش بەرن بۆ ناوچەی (مەتینا) و لە رێی زاخۆشەوە بە پێشەوایەتی و بە هاوکاری پێشمەرگەکانی (پەدەکە) هێرش بکەنە سەر ناوچەکانی (سنات و هەفتانین).

لەکاتی دەستپێکردنی ئۆپەراسیۆنەکە دەرکەوت ئەو بۆچونانە هەموویان راست بوون، ئامانجی سەرەکی دەوڵەتی تورک کە دەیویست بە هاوکاری و بە پاڵپشتی (پەدەکە) بەدیبهێنێت ئەوە بوو دوای ئۆپەراسیۆنەکە لە باشوری کوردستان جێگیر بن، لە سەروبەندی ئەم گۆڕانکاریانەدا (ئەرنەکە)( باڵی سیاسی پەکەکە) بڵاوکراوەیەکی بڵاوکردەوە و لە بڵاوکردنەوەکەدا هاتبوو ئەوان لەمێژەوەیە ئاگەداری ئامادەباشییەکانی ئۆپەراسیۆنەکانن و بانگەوازی ئەوەیان دەکرد گەلی کورد لەهەمبەر ئەم هێرشانە بە هەڵوێست بن و هەروەها دەیانوت ئەم ئۆپەراسیۆنە تەنها جموجۆڵێکی کاتی نییە بەڵکو دەوڵەتی تورک دەیەوێت هەموو باشوری کوردستان داگیربکات و ویرانی بکات[٧٤].

[٧٤] ١٢ای ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم )

## (پارتی بە پارە منیان بە جەندرمەی تورک فرۆشت)

کاتێک سوپای تورک سەرقاڵی ئامادەباشییەکانیان بوون بۆ هێرشکردنە سەر باشوری کوردستان، ئەو دەمە گەریلایەکی نەخۆشی (پەکەکە) لە نەخۆشخانەی ئازادی لە دهۆک تیماردەکرا بەناوی (سەلمان ئالاگوز) لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە) رفێنرا و بە پارە رادەستی بارەگایەکی جەندرمەیان کرد، دوای ئەم فرۆشتن و رادەستکردنە گەریلا فرۆشراوەکە لەلایەن جەندرمەکانەوە بۆ لێکۆڵینەوە و زیندانی کردنی رەوانەی دیاربەکر کرا

(سەلمان ئالاگوز) دەیوت لە مانگی کانونی دووەمی ساڵی (١٩٩٢) لە ئەوروپاوە چووە بۆ ئاکادیمیای (مەعسوم کورکماز) لە لوبنان و لەوێ خولی پەروەردەی تەواوکردووە، لەبارەی فرۆشتنەکەی لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە سەلمان دەیوت **(دوای خولی پەروەردە لە لوبنانەوە چووم بۆ ناوچەی هەفتانین، لەوێ نەخۆشکەوتم و پاشان بردمیان بۆ نەخۆشخانەی دهۆک، لە نەخۆشخانە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) هاتن و دەستوچاومیان بەست و پاشان منیان برد و ٣ رۆژ و ٣ شەو بەوشێوەیە هێشتیانمەوە، لە ١٧ی ئاب منیان رادەستی کارمەندانی دەوڵەتی تورک کرد، لەکاتی ئەم ئالوگۆڕەدا سەودا و مامەماڵەکردن دەستی پێکرد)**[٧٥].

لەراستیدا پێشوتریش لەم جۆرە رووداوانە هاتبوونە ئاراوە، ئەو گەریلایانەی بەهۆی نەخۆشی یان برینداری یاخود بەهەر هۆکارێکی تربوایە کە دەکەوتنە ژێر دەستی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) وە زۆرجار بە پارە بە بارەگا سەربازییەکانی تورک دەفرۆشران،

---

[٧٥] ساڵی ١٩٩٢ نۆسیەی (سەلمان ئەلەگون) لە دادگای دیاربەکر.

نەدەكرا بوترێت ئەمە سیاسەتی فەرمی (پەدەکە)یە، بەڵام ئەوەی سەمەرەبوو ئەوەبوو سەرکردایەتی (پەدەکە)ش بۆرێگرتن لەم جۆرە ڕووداوانە هیچ هەوڵێکیان نەدەدا، (پەدەکە) هاوشانی شەڕی (براکوژی) شەڕی (برا فرۆشتن)یشی زیاد کردبوو، ئەمەیە کە دەڵێن (مێژوو دووبارە دەبێتەوە)، ٢ ساڵ پێشتر بەسەر ئەم ڕووداوەدا فەرماندەیەکی (پەدەکە) بەناوی (محەمەد بەیتەلشەبابی) لەلایەن ئەفسەرێکی عێراقییەوە بە (١٠٠) هەزار دیناری عێراقی فرۆشرابوو بە حکومەتی عێراق، دەتوانرێت بوترێت ئەوەی هەلی بۆبڕەخسایە ئەم کڕین و فرۆشتنەی دەکرد.

## ئایا ئابڵوقە لە زەرەری کێدایە؟!

دوای تێپەڕبوونی مانگێک بەسەر ئابڵوقەی (پەکەکە) لە نێوان لایەنە کوردییەکان چاوپێکەوتنی جۆراوجۆر هاتنەئاراوە، هەتا ماوەی ئابڵوقەکە درێژ ببوایەتەوە هاتنە ئاراوەی مەترسی زیادی دەکرد، لەبەرامبەر بەمەشدا حکومەتی باشور بەرامبەر بە (پەکەکە) ئابڵوقەی بەکار دەهێنا، گەریلایەکی زۆری (پەکەکە) بە درێژایی هێڵەکانی نێوان زاخۆ و ئامێدییە بڵاوەیان کردبوو لە سەنگەریشدابوون و بەهۆی ئابڵوقەوە نەیاندەتوانی هەموو پێداویستییەکانیان بەدەست بخەن، لەبارەی ئەم ئابڵوقەیەوە نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) دەیوت **(کۆنترۆڵی ئەو هەموو ڕێگایانەمان کرد کە دەچن بۆ ئەو شوێنانەی گەریلای (پەکەکە)ی لێیە، پێشوتر داوامان لێکردبوون بارەگا و کەمپەکانیان چۆڵ بکەن، لەبەرئەوەی گوێیان لێنەگرتین ئێمەش ڕێگاکانمان لێگرتوون**[76]**)**، لەمبارەیەوە (پەکەکە) پێشوتر ئامادەباشی خۆیان کردبوو، ئازوقەیەکی باشیان بۆخۆیان خستبوو، بەهۆی مانەوەیان لە نزیک سنورەکانی نێوان تورکیا و ئێران، ئابڵوقە زۆر کاریگەری لە گەریلاکانی (پەکەکە) نەدەکرد.

بۆ ئەوەی ئابڵوقەی سەر باشور نەمێنێت چەند ڕۆشنبیر و چەپڕەوی باشوری کوردستان و چەند پەرلەمانتارێکی (یەنەکە) لە لوبنان چاویان بە (عەبدوڵڵە ئۆجالان) کەوت، هەردوو پارتی باشور (پەدەکە و یەنەکە) لەڕێی ناراستەوخۆوە داوایان لە (پەکەکە) دەکرد ئابڵوقەکە لابدات، بەڵام پێیان باش بوو ئەم داواکارییە بە فەرمی نەکەن، بەتایبەتی ڕونکردنەوەکانی (سەرچڵ قەزاز و مەسعود بارزانی) تەواوکەر بوون ویژدانی کورد بوروژێنن و وایان لێبکەن داوا لە (پەکەکە) بکەن بۆئەوەی دەستبەرداری سزای ئابڵوقە ببێت، خەڵکی باشور دەیانهێنایە زمان ئەم ئابڵوقەیە زەرەریان پێدەبەخشێت و ئەگەر ئەم کارە بەردەوام بێت (پەکەکە) هیچی

---

[76] ٢٣و٢٩ ئاب ١٩٩٢ ڕۆژنامەی (یەنی ئولکە)

لە سەدام کەمتر نابێت، بەمشێوەیە دەیانویست (پەکەکە) بخزێننە کوونەوە و کاریەگری لێبکەن تاکو هەنگاو بەرەو دوواوە بنێت.

ئەو پروپاگەندانەی دژ بە (پەکەکە) دەکرا لە باشوری کوردستان لە چوارچێوەی هەمان مژاری ئابلۆقەکەوە دەکرا، لە راستیدا تەنها گەل لەم ئابلۆقەیە زەرەرمەند بوو، بێشک سەرانی (یەنەکە و پەدەکە) و دەوروبەر و کەسوکاریان ئەم ئابلوقەیە زیانی پێنەدەگەیاندن، لەو سەردەمەدا تورکیا پێداویستییەکانی (یەنەکە و پەدەکە)یان دابیندەکرد، ئەوان پارەدار بوون و دەیانتوانی هەموو شتێکیان لە تورکیاوە بۆدابینبکرێت، کەسانی سەر بەم دوو بنەماڵەیە خاوەن پارەیەکی زۆر بوون، هەربۆیە لەمبارەیەوە (سەفین دزەیی) دەیوت (**ئەمە بیرکردنەوەیەکی بێ ئەقڵانەیە بیر لەوە بکرێتەوە کەگوایە ئازوقە زیان بە پەدەکە دەگەهێنێت**)، بەم قسەیە (سەفین دزەیی) تەئکیدی دەکردەوە لەم ئابلوقەیە نەک (پەدەکە) تەنها گەل زەرەرمەندە[٧٧].

کاتێک سەرانی (پەدەکە و یەنەکە) ژێراوژێر هەوڵیان دەدا ئابلوقەکەی (پەکەکە) نەمێنێت، لەلایەکی تریشەوە دەیانویست درێژە بخاهێنێت ، ئەمەشیان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکار دەهێنا کە بە خەڵک بڵێن (پەکەکە) ئەوەندەی سەدام زاڵمە و عەزیەتی گەلەکەمان دەدات، بەمشێوەیە هەوڵیاندەدا لە نێوان (پەکەکە) و خەڵکیدا تووی دوژمنایەتی و قین و نەفرەت بچێنن.

ئاڵۆزی و گرژی نێوان خودی (پەدەکە و یەنەکە) ببووە هۆکار لە دژی یەکتر ئابلوقە بەکار بهێنن، هەرچەندە بە رواڵەت وادەبینران بەیەکەوە کار دەکەن، بەلام بەتەواوەتی دژ بەیەکتری کاریان دەکرد و لە نێوانیاندا دوبەرەکی هەبوو، لەو شوێنانەی لایەنگرانی (یەنەکە)ی لێزۆربوو کەلە ژێر دەسەلاتی (پەدەکە) دابوو (یەنەکە) دەیوت هۆکاری ئەم ئابلوقەیە (پەدەکە) یە چونکە (پەدەکە) هاوکاری تورکیا دەکات و لە ئەگەری هاتنەئاراوەی شەڕی (براکوژی) ئەوا (پەدەکە) بەرپرسیارە، درێژ بونەوەی وادەی ئابلوقە بۆ (پەکەکە)ش کێشەیەکی گەورە بوو، درێژ بونەوەی ئابلوقە زیاتر زیانی بە خەڵکی باشور دەگەیاند و هەروەها شۆفێرە باکورییەکانیش زەرەرمەند بوون، چونکە قورسایی ئابلوقەکە بەسەر شانی ئەوانەوە بوو.

---

[٧٧] ٢٣و٢٩ ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی (یەنی ئولکە)

(پەکەکە) دەیویست لەرێی ئەم ئابڵوقەیەوە دوو پەیام بدات، یەکەمیان ئەوەبوو دەیویست بڵێت رێگا شاخاوییەکان و سەرەرای سوپای تورکیش رێگا فەرمییەکانیش لەژێر کۆنترۆڵی ئەماندایە و ئەوکاتەی بیەوێت دەتوانێت رێگاکان دابخات و خەڵکی باکوریش رێز لەو بریارانە دەگرن کە لەلایەن ئەمانەوە دەردەکرێن و خەڵکی پشتوپەنای سیاسەتەکانیانن، هەربۆیە هەر لایەنێک روبەرِوی (پەکەکە) ببێتەوە ئەوا راستەوخۆ گەلی باکوریش دەگرێتەوە. دووەمین ئەوەبوو دەیانویست بڵێن کێ هێرشمان بۆبهێنێت بە توندی روبەرِویان دەبینەوە و باجەکەیشی قورس دەبێت و دەتوانین باشور لە رووی جیهاندا بەتەنیا جێبهێڵین. تەنانەت لەمبارەیەوە ئەو هاوکارییەی حکومەتی ئەڵمانیا کە دەیویست بۆ باشوری بنێرن لەبەر بوونی ئابڵوقە بەرپرسیارانی ئەڵمانیا لە شاری کۆڵن دەچوون سەردانی ئەو رێکخراوە کوردییانەیان دەکرد کەلە (پەکەکە) وە نزیک بوون و پێیانیان دەوتن بە (پەکەکە) بڵێن ئابڵوقە لابەرێت.

سەبارەت بەم مژارە (پەکەکە) لە هەموو رونکردنەوەکانیاندا دەیانوت هەرگیز لەرێگای ئەم بریاری ئابڵوقەیەوە بیریان لەوە نەکردووەتەوە زیان بە خەڵکی باشور بگەهێنن، لەگەڵ ئەوەشدا (پەکەکە) داوای لە خەڵکی باشور دەکرد نابێت بەرامبەر ئەم دەسەڵاتە بێدەنگ بن کە هاوکاری دوژمن و داگیرکەری کوردستان دەکەن و هەروەها دەبێت گەل لەهەمبەر سیاسەتی شەرِەنگێزی بووەستنەوە، دەستبەسەرداگرتنی خەتی (ئیبراهیم خەلیل) و رێگا سنورییەکان و ئەم ئابڵوقەیەش کارتێکی وورياکردنەوە و کارتێکی سووری باش بوو بۆ (پەکەکە).

( ئەرنەکە)ی باڵی سیاسی (پەکەکە) لە ١٤ی ئاب بڵاوکراوەیەکی بڵاوکردەوە و تێیدا دەیوت **(هەتا پەدەکە بەردەوام بێت لە هاوکاریکردنی دەوڵەتی تورک ئابڵوقەش بەردەوام دەبێت، ئەگەر پەدەکە دەستبەرداری رێگری لە هاتوچووەکانی بادینان ببێت و رێگا لە کاروخەباتی وەلاتپارێزان نەگرێت لە باشور و ئەگەر باجی زیاد لە بازرگانەکانی باشور و باکور وەرنەگرێت ئەوا کۆتایی بە ئابڵوقە دەهێنین)** .

ئەم ئابڵوقەیە کاریگەرییەکی زۆری خستبووە سەر شانی شارەکانی وەک (دهۆک، سلێمانی، هەولێر و زاخۆ) و دەوروبەریشی، هەروەها نەبوونی و دەستنەکەوتنی شتومەکی پێویست لە باشور پەیتا.. پەیتا خەڵکی بەرەو برسی بوون دەبرد، نرخی نەوت دووقات بەرز ببووەوە، بۆ رێگری کردن لە هاتنەئاراوەی برسێتی سەرۆکی حکومەت (فوئاد مەعسوم) بە نهێنی

سەردانی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردبوو، (فوئاد مەعسوم) لە سەردان و دیمانەکاندا سەرنجی خستبووە سەر گەورەیی و مەترسی هاتنە ئاراوەی ئەو برسێتییەی کەلە ئاکامی ئابڵوقەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆسەر عێراق و ئابلوقەی (پەکەکە) ش بۆسەر باشور. کاتێک دیدارەکان بەردەوام بوون بۆ هەڵگیرانی ئابڵوقەکان لەسەر پردی (نێردوشی) نێوان (جزرە و سلۆپی) گەریلاکانی (پەکەکە) دوو لۆری بارهەڵگریان سوتاند کە دەیانویست بچن بۆ باشور، هەروەها دوو شۆفێریش لە باشور رفێنران کە ویستبوویان سەرپێچی بڕیاری ئابڵوقەکە بکەن.

## ئابلۆقە لادەبرێت

ئابلۆقەی ئابوری سەر باشور کە (پەکەکە) لە ١٧ی تەموزەوە رایگەیاندبوو لە ١٨ی ئابدا هەڵگیرا، لەم بارەیەوە فەرماندەی فەرماندارێتی (هەفتانین) بڵاوکراوەیەکی بڵاوکردەوە و تێیدا هاتبوو سیاسەتی ئابلۆقەکەمان ئامانجەکانی خۆی پێکا و بینیشمان خەڵکی باشور روبەڕوی برسێتی بونەتەوە هەربۆیە بڕیارماندا ئابلۆقە لابدەین و هەروەها ئەم ئابلوقە وەلامی ئەو هێرش و زوڵمانەی دایەوە کەلە هەمبەر وەلاتپارێزان و گەلەکەمان کراوە، لە بڵاوکراوەکەدا دەوترا (**بڕیاردانی ئەم ئابلۆقەیە لە بەرژەوەندی هیچ بنەماڵە و خانەوادەیەک و کەسایەتییەکدا نەبووە بەڵکو بەتەواوەتی لە بەرژەوەندی نیشتیمان و میللەتەکەمان بووە، ئێمە بە خوێن بەرژەوەندی نیشتیمان و میللەت دەپارێزین، ئەم تابلۆی ئابلۆقەیە برسێتی و نەبونی و ئاستی مردنیشی نیشاندا، ئەم چالاکییەمان دژ بە پەدەکە، بەرەی کوردستانی، تورکیا و ئەمەریکا بووە**[٧٨]).

کاتێک (پەکەکە) ئابلۆقەکەی هەڵگرت کە ماوەی مانگێکی خایاند، دەوڵەتی تورک بەمە ناڕەحەت بوو چونکە بەم بڕیارە ناوبەری پارتە کوردییەکان ئاڵۆزییان نەدەما و بەرامبەر بەیەکتری نەرمییان نیشاندەدا، بەڵام بەرەی کوردستانی رایگەیاند رێگا بەو لۆریانە نادەن کەلە تورکیاوە دەێن، دوای ئەم بڕیارە بەدرێژایی ١٠کم لەم دیو ئەودیوی سنور لۆری بارهەڵگر لە چاوەڕوانیدا بوون، قایمەقامی زاخۆ (مەزبەتە)ی دابوو بە ئیدارەی گومرکی بەشی تورکیا و پێیانی وتبوو (**ئێمە ئەو لۆرییە بارهەڵگرانە قەبوڵ ناکەین کەلە تورکیاوە دێن، ئێمە نە قەبوڵی دەکەین و نە پێویستیشمان بەو شتومەک و خواردنانەیە کە دوای رەزامەندی پەکەکە دەگەنە دەستمان**). بەڵام ئەم هەڵوێستەی قایمەقامی زاخۆ دوور لە راستی بوو.

---

[٧٨] ١٩ی ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم ).

بەرپرسیارانی تورک ئەگەر بەرەی کوردستانیش ریگرییان لە هاتنی لوری نەکردایە ئیدیعای ئەوەیان دەکرد سەغڵەتی گیانی شوفێرەکانن و هەوڵدەدەن ژیانیان بپارێزن و ئەوانیش بۆ ئەنجامدانی ئابڵوقەی خۆیان هۆکاریان پەیدا دەکرد، لەم بارودۆخەدا بەرپرسێکی (یەنەکە) ئاراس شێخ جەنگی تاڵەبانی کە برازای (جەلال تاڵەبانی) بوو سەردانی بنکەی گومرکی (ئیبراهیم خەلیل)ی کرد و لەگەڵ بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک دیداری ئەنجامدا و ئاراس دەیوت (**کارێکمان نەکردووە ببێتە هۆکاری هاتنە ئاراوەی ئابڵوقە، لەلایەن ئێمەوە هیچ کێشەیەک نییە، لایەنی تورکیا وازناهێنێت، ئەوان نیگەرانی ئەوەن ژیانی هاولاتییانیان لە مەترسیدایە، با هاولاتییانیان بێن بۆ ئێرە من کەفیلی پاراستنی ژیانی ئەوان دەکەم**). ئەم گرژی و ئاڵۆزییە تا چەند رۆژێکی خایاند، دوای ئەوەی کەسانی پلە بالای ناو پارتەکان کەوتنە بەینەوە ئینجا رێدرا لورییە بارهەڵگرەکان هاتوچۆ بکەن، ئەوەی راستی بێت دەوڵەتی تورک دەیویست پەیامێک بە دەسەلاتی باشور بدات ئەگەر ئەمانیش بیانەوێت دەتوانن دەرگای (ئیبراهیم خەلیل) دابخەن.

## (هێرشکردنە سەر پارتی ئازادی کوردستان ـ پاک)

لادانی ئابلۆقە سەرەڕای ئەوەی لە گۆڕەپانەکەدا ئارامییەکی خولقاندبوو بەلام بۆ هێوربوونەوەی ڕەوشەکان دیدارەکان لەسەر ئاستی سیاسیدا بەڕێوە نەدەچوو، ئەمەش بووە هۆکار ئیتر جام ئاوی لێبڕێژرێت، زۆرینەی سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی سووربوون لەسەر ئەوەی ئەو پیلانە پەیڕەو بکەن کەلە ئەنقەرەوە داڕێژرابوو.

لە ٢٨ی ئاب دەوڵەتی تورک لەهەمبەر گەل کوشتاری ئەنجامدا و ئەمەش نارەزایی لێکەوتەوە و بۆ ئەم مەبەستەش لایەنگرانی (پاک) پارتی ئازادی کوردستان بۆئەوەی بەرامبەر بە دەوڵەتی تورک نارەزایی نیشان بدەن لە هەولێر گردبونەوەیان ئەنجامدا، بەلام پێشمەرگە ئەمەی قەبوڵ نەکرد و لەهەمبەر خۆپیشاندەران توندوتیژییان نواند و لە ئاکامدا ٣ خۆپیشاندەر کوژران کە دوانیان ژن بوون، ئەمە پارچەیەک بوو لە پیلانەکان، شارۆچکەی شرناخ لە زاخۆوە ٦٠کم دوورە، لە ١٨ی مانگ هەتا ٢٠ی ئاب شرناخ و گوندەکانی چواردەوری بە فڕۆکە و تۆپ بۆردۆمان کران، لە ئاکامی ئەم بۆردۆمانانەدا بە دەیان سڤیل کوژران و زەرەرێکی زۆر گەیەندرا بە ماڵ و حاڵی خەڵکی، دوای ئەم بۆردۆمانە چڕە خەڵکی گوندەکان و دەوروبەری کۆچیان کرد بۆ شارەکانی تر. گەلی کورد لە باکور بەرامبەر بەم کوشتار و بۆردۆمان و ماڵ وێرانکارییەی دەوڵەتی تورک٣ رۆژ (ماتەمین)یان راگەیاند و خەڵکی لە هەموو شار و شارۆچکەکان رژانەسەر شەقام و دوکانەکانیان داخست [79].

پارتی ئازادی کوردستان (پاک) بۆئەوەی هێرشەکانی دەوڵەتی تورک پرۆتێستۆ بکات لە هەولێر خۆپیشاندانێکیان سازدا کە منداڵ و ژنیش بەشدارییان تێداکرد، لە نیوەڕۆی رۆژی ٢٨ی ئاب لایەنگرانی (پاک) بۆ پرۆتێستۆکردنی دەوڵەتی تورک کە ژمارەیان (٥٠٠) کەسێک دەبوون لەناو شارەوە هەتا بەردەمی باڵەخانەی پەرلەمان کەوتنە ڕێ، خەڵکەکە دروشمیان

---

[79] ٢٠ی ئاب ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم ).

دژی داگیرکاری و خواستی سەربەخۆیی و ئازادییان دەوتەوە، هەتا گەیشتنە نزیک باڵەخانەی پەرلەمان ژمارەیان بوو بە (٥٠٠٠) هەزار کەسێک، پێشمەرگەش ڕێگری لێکردن و دوای ئەوەی گرژی هاتە ئاراوە و پێشمەرگەکان تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد، لەئاکامدا ٣ کەس کوژران.

یەکێک لە کوژراوەکان ژن بوو کە خەڵکی باکور بوو بەناوی (فلیز تورگوت)، لەم خۆپیشانەدا کەسانی وەک (عەزیز ئاکرەیی) کە وەزیرێکی کۆنی حکومەتی عێراق بوو، (ڕەئوف کامیل) و چەند ڕۆشنبیرێکی تری هەولێری بەشدارییان تێدا کرد، لەهەمان خۆپیشاندانەدا بەهۆی تەقەوە چەند کەسێکی تریش بریندارکران و کەسانێکی زۆری تریشیان دەست بەسەر کران، بەگوێرەی بەرەی کوردستانی ئەم خۆپیشاندانە مۆڵەتیان نەبووە و بەگونجاویشیان نەبینیوە کە سلۆگان دژی تورکیا بڵێنەوە، دەسەڵاتی باشور حەزیان لە چارەی (پاک) نەبوو هەربۆیە نەیاندەویست گەشە بکات و بە مەترسییان دەبینی، هەتا ڕەوشی باشور خراپ ببوایە و نارەزایی گەلیش لەهەمبەر پارتە کلاسیکەکان زیادیان بکردایە خەڵکی لە (پاک) زیاتر نزیک دەبونەوە، پارتەکانی باشور درکیان بەمەکردبوو هەربۆیە دەیانویست ڕێگری لەم پێشهاتە بگرن.

بەگوێرەی پارتەکانی باشور ڕێنەگرتن لە پێشکەوتنەکانی (پاک) لەوانەبوو ببوایە بە پارتێکی سەرنج ڕاکێشەر و بە هێز و ببوایە بە شەریکی دەسەلاتیش، هەربۆیە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆی حکومەتی باشورەوە بە پارتێکی بێ مۆڵەت هەژمار کرا و دەست کرا بە قەدەغەکردنی کاری چالاکی کادێر و چاوترساندنی لایەنگرانیان، بەلام (پەکەکە) پێچەوانەی ئەوانی دەکرد و (پاک)ی دەخستە ڕیزی پێشەوە و دەیویست لە ژێر سێبەریاندا لە باشور ئازادییانە تر بجوڵێتەوە.

دوای لاچونی ئابڵوقە و ئارام بوونەوەی ڕەوشەکان و باش بوونی کەمێکی پەیوەندییەکانی (پەکەکە) لەگەڵ دەسەلاتی باشور بەلام بەهۆی هێرشەکانی بەرەی کوردستانی بۆسەر (پاک) جارێکی تر پەیوەندییەکان گرژییان تێکەوتەوە و ئەگەری هاتنە ئاراوەی شەڕ زیادی کردوو فتیلی شەڕی باشور جارێکی تر گڕی گرتەوە. دوای تەقەکردن لە خۆپێشاندەرانی هەولێر ئەمجارەیان لە نزیک شاری سلێمانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) ٣ ئەندامی سەرکردایەتی (پاک) یان دەستگیر کرد و دوانیانیان گوولە بارانکرد کە هەردوکیان ژن بوون بە ناوی (کرمانج و

نەجیر)، یەکێکی تریان بەدیلی گرت و رەوانەی زیندانیان کرد کە ناوی (ئارام) بوو خەڵکی هەولێریش بوو، ئارام خاوەن ٩ برا و خوشک بوو بەهۆی باوەڕ نەبوونیان بە دەسەڵاتی باشور بڕیاریاندا بوو هەموویان ببن بە گەریلا، یەکێک لە ئەندامی سەرکردایەتی (پاک) بەناوی (عەزیز فەیسەڵ بانی) ئەویشیان دەستبەسەر کرد، بەڵام توانرا بە هەوڵی چەند کەسێکی دەستڕۆوە لەماوەیەکی کەمدا (عەزیز) ئازاد بکرێت، عەزیز سەربە عەشیرەتی مزووری بوو، جارێکی تر دوای هەڵگیرساندنی شەڕی باشور دەستگیر کرایەوە، باوکی عەزیز پێشمەرگەی سەردەمی (مەلا مستەفا) بووە و پێشمەرگەیەکی ئازای سەربە (پەدەکە) بوو، بە (عەزیز)یان دەوت درێژ، ئەویش لە ساڵی (١٩٨٣) وە بووە بە پێشمەرگەی (پەدەکە) و هەتا ساڵی (١٩٩٠) لەناو (پەدەکە) ماوەتەوە، بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵ (پەکەکە) ئاشنایی دروست دەکات واز لە (پەدەکە) دەهێنێت و دەچێتە ناو ریزەکانی (پاک)وە، دوای ئەوەی جارێکی تر دەیگرنەوە ئەمجارەیان لە سڵاحەدین دەیخەنە زیندانەوە کە پێی دەوترا زیندانە تایبەتییەکەی (مەسعود بارزانی)، (مەسعود بارزانی) داوای لێدەکات واز لە (پاک) بهێنێت، بەرامبەر بەمە پلە و پایەی بەرزیان بۆ پێشنیار کردبوو، دەسەڵاتی باشور بەتایبەتی (پەدەکە) هەتا بیانتوانیایە پەیوەندی ئەو کەسانەیان دەپچڕی کە لەگەڵ (پەکەکە) دەیانبەست، لەگەڵ ئەم سیاسەتەدا بێگومان کوشتنیشیان پەیرەو دەکرد، کوشتنی (عەلی شەعبان، سادق عومەر، کرمانج و نەجی) و کەسانی تر، ئەم کوشتارانە بەو ئامانجانە دەکران رێگری بکەن لە بەشداربوونی خەڵکی بۆناو (پەکەکە).هەرلە سەرەتای ساڵی (١٩٨٨) وە هەوڵدرابوو (پاک) دروست بکرێت، بەڵام نەگونجا و لە ئاکامدا لە ساڵی ١٩٩١ (پاک) دامەزرێنرا و بە فەرمی بونی خۆی راگەیاند، هەرلە دژی ئەم پارتە ئەمجارەیان لە ٨ی تەموز لە (تەقتەق) هێرشیان بۆبردن.

سەرکرادیەتی (پاک) لە دژی رژێمی سەدام و لە هەمبەر ناعەدالەتی بەرەی کوردستانی خۆپێشاندانێکیان سازدا، بە بیانوی ئەوەی ئەم خۆپێشاندانە مۆڵەتی نییە دوای ئەوەی لەلایەن پێشمەرگەوە رێگرییان لێکرا پاشان تەقەیان لێکردن و لە ئاکامدا سێ کەس بریندار کران و کەسانێکی زۆریشیان دەستگیرکرد، لە میانەی ئەم هێرشانەی سەر (پاک) ماوەیەک دوای ئەم رووداوە لە (دیانە) بۆسەیەک بۆ گەریلاکانی (پاک) دادەنێن و دوای ئەوەی تەقەیان لێدەکەن دوو گەریلا (پاک) دەکوژرێت و شەڕ دێتەئاراوە و دوو پێشمەرگەی (یەنەکە)ش

دەکوژرێن، بەرەی کوردستانی رایانگەیاند ئەم رووداوە لە ئاکامی حاڵی نەبوون و هەڵەیەک هاتووەتە ئاراوە و بەمشێوەیە مەسەلەکەیان پەردەپۆش کرد. لە زستانی هەمان ساڵدا جارێکی تر پێشمەرگە بۆسەیان بۆ دەستەیەک لە گەریلاکانی (پاک) دانا و دەستیان لێوەشاندن و لە ئەنجامدا سێ گەریلای (پاک) کوژران، سەرۆکی (پاک) کەسێکی رۆشنبیری خەڵکی سلێمانی بوو بەناوی (دکتۆر سیروان)، گەریلاکانی (پاک) لەناو (پەکەکە) مەشقی سەربازیان دەبینی و زیاتر لەگەڵ ئەواندا دەمانەوە، رێکخستنەکانی (پاک) زیاتر لە سلێمانی و هەولێر و دەوروبەری بەهێز بوون، هەروەها لە زاخۆ و ئامیدییە لایەنگرێکی زۆریان هەبوو، هەروەها کەسانی باکوریشیان تێدا بوو.

## (پەدەكە) كارتی ئێران دژ بە (پەكەكە) بەكار دەهێنێت

دوای ئەوەی لە شەوی ٢٨ی ئاب گەریلاكانی (پەكەكە) لە نزیک گوندی (ئەلان)ی سەربە شەمزینان بۆسەر بارەگایەكی سەربازی سوپای تورک هێرشیان ئەنجامدا، لەسەر ئەم مەسەلەیە سوپای تورک سنوری ئێرانیان بەزاند و كەوتنە جوڵەوە، ئەمەش بووە هۆكارێكی جدی كە ئاڵۆزی لە نێوان توركیا و ئێران بێتەئاراوە. سەبارەت بە دوا گۆڕانكارییەكان و زیاد بوونی چالاكییەكانی گەریلاكانی (پەكەكە) لەسەر سنور وەزارەتی دەرەوەی توركیا هۆشداریدا بە حكومەتی ئێران، كۆپتەرێكی سوپای تورک كە بۆ هاوكاریكردنی بارەگای (ئەلان) چووبوو موشەكی نابوو بە بارەگا و گوندێكی ئێرانەوە، راستەوخۆ بۆ وەڵامدانەوە كۆپتەرێكی ئێران هەڵسابوو بە ناوچەكەدا جەولەی كردبوو، بەمشیوەیە كۆپتەرە توركییەكە لە ناوچەكە كشابووەوە، لەهێرشەكەی گەریلاكانی (پەكەكە) بۆسەر بارەگای ( ئەلان) نزیكەی (١٠٠) جەندرمە كوژرابوون، ئەم چالاكییە ئەنقەرەی تەنگەتاو كرد و بەتەواوەتی غەزەبیان لێدەباری، بۆئەم مەبەستەش لەبەر ئەوەی گەریلاكان بەگوێرەی ئەوان گوایە لە ئێرانەوە دزەیان كردووە دەوڵەتی تورک دەیانویست دەرسێک بە تەهران بدەن.

سەرچاوەكانی (پەكەكە) ئەو ئیدیعایەیان بەدرۆ دەخستەوە كە دەیانوت گوایە هێزەكانیان لە ئێرانەوە دزەیان كردووەتە ناو توركیا، لەهەمانكاتدا لەناو خاكی توركیادا بەردەوام گەریلاكانی (پەكەكە) لەهەمبەر بارەگا سەربازییەكانی تورک چالاكیان ئەنجام دەدا، بەهۆی ئەم رووداوەوە فڕۆكە جەنگییەكانی تورک هەتا ماوەی مانگێكیش بەردەوام بەبیانوی دۆزینەوەی بارەگا و شوێنی گەریلا سنوری ئاسمانی ئێرانیان دەبەزاند. هاتنە ئاراوەی یەكێک لە گرژییە هەرە گەورەكانی نێوان ئیران و توركیا ئەوەبوو جارێكیان فڕۆكەیەكی جەنگی تورک دەچێتە ناو ئاسمانی ئێرانەوە و فڕۆكە جەنگییەكانی ئێرانیش شوێنی دەكەون و ناچاری دەكەن لە شاری (تەبریز)ی ئێران بنشێتەوە، بەڵام هەردوو دەوڵەت ئەم جۆرە رووداوانانەیان لە نێوان خۆیان بە نهێنی دەهێشتەوە، باڵویزی ئێران لە توركیا (جەلالەدین

مەمینی) سەبارەت بەم بەزینی سنوری ئاسمانەیان لەلایەن فرۆکەکانی تورکیاوە هیچی نەدەوت و لە رونکردنەوەیەکیدا وتی (**پێشمەرگەکانی پەدەکەی ئێران جارناجارێک لە سنوری تورکیاوە هاتوونەتە ئێرانەوەوە هێرشیان کردووەتە سەر بارەگاکانمان**)، لەم رەوشەدا بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک بە ئاشکرا دەیانوت دەوڵەتی ئێران هاوکاری (پەکەکە) دەکات هەربۆیە خۆیشیان بە شێوەیەکی ئاشکرا هاوکاری (پەدەکە)ی ئێرانیان دەکرد.

دەوڵەتی تورک لەهەمبەر هاوکارییەکانی دەوڵەتی ئێران بۆ (پەکەکە) کە بەڵگەشیان نەبوو کارتی سووری هاوکاریکردنی (پەدەکە)ی ئێرانیان نیشانی رژێمی تەهران دەدا، دەوڵەتی تورک دەیانویست ترسی وروژانی کوردی ئێران بخەنە دڵی تەهرانەوە، دەوڵەتی ئێرانیش ئەنقەرەیان بەوە تۆمەتبار دەکرد هاوکاری (موجاهدین خەڵک و پەدەکە)ی ئێران دەکەن، هەربۆیە ئێران زۆرجار چاوپۆشییان لە هاتوچۆی گەریلاکانی (پەکەکە) دەکرد لە سنورەکان.

پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ی ئێران لە پێدەشتی (مێندینی) سەر بە شارۆچکەی (باشکەلە)ی سەر بە شاری (وان) جێگیر ببوون هەروەها لەو کاتەی هەموو ئەم مەسەلانە هاتبوونە ئاراوە پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ی ئێران هێرشەکانی خۆیان بوسەر ئێران چڕکردبووەوە، ژمارەی پێشمەرگەکانی ئەوکاتەی (پەدەکە)ی ئێران لەو ناوچەیەدا دەگەیشتە ٣٠٠ بۆ ٤٠٠ پێشمەرگەیەک و پێداویستییەکانیشیان لەلایەن بارەگای فەرماندارێتی جەندرمەی (چاڵدران)وە دابیندەکرا، بۆ رێخۆشکردن و بۆ ئاسانکردنی هێرشەکانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ی ئێران روو لە ئێران هاتوچووەکانی ئەو ناوچەیە لە رووی سیڤیلەوە لەلایەن بارەگا سەربازییەکانی (هێشکە و دێریشک)وە قەدەغە کرابوو، پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ی ئێران لە مانگی حوزەیرانەوە هەتا تەموز ٥جار هێرشیان کردە سەر بارەگا سەربازییەکانی ئێران کە نزیکی سنوری ئێران و تورکیا بوون، لە مانگی تەموزدا چڕبوونی هێرشەکانی (موجاهدین خەڵک و پەدەکە)ی ئێران روو لە ئێران دوابەدوای کۆبونەوە سێ قۆڵییەکەی ئەمەریکا و ئەنقەرە و بەرەی کوردستانی بوو کەلە (دیانە) بەسترا، دەتوانین بڵێین دوای ئەم کۆبونەوەیە هێرشەکان بۆسەر ئێران زیادیان کرد، لەئاکامی ئەم هێرشانە بۆسەر بارەگا سەربازییەکان ئێران نزیکەی (١٠٠) پاسدار کوژران، ئێران بۆ پەرچدانەوەی ئەم هێرشانە لە ناوچەی (گەورە)ی باکور و لە ناوچەی (حاجی ئومران)ی باشوری کوردستان بۆردۆمانی بارەگاکانی (پەدەکە)ی ئێران و (موجاهدین خەڵک) یان دەکرد، تەلەفزیۆنەکانی ئێران وەکو

سەرکەوتنی سوپاکەیان هێرشە ئاسمانییەکانی (حاجی ئومران)ی نیشاندەدا، رۆژنامەکانی ئێرانیش دژ بە تورکیا کەمپینێکیان دەست پێکرد، رۆژنامەکان سنور بەزاندنەکانی فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیا بۆ ناو ئاسمانی ئێران وەک هەڵویستێکی دوژمنکارانە ناوزەند دەکرد، رۆژنامەی (ئەبرار) داوای لە ئێران دەکرد پەیوەندییە بازرگانییەکان لەگەڵ تورکیا رابگرن و پەیوەندی دیبلۆماسیشیان لەگەڵ تورکیا کەم بکرێتەوە، رۆژنامەی (سەلام)ی ئێرانیش شەرمەزاری ئەم کارانەی تورکیا دەکرد، هەروەها رۆژنامەی (جمهوری ئێران)یش ئەم کارانەی تورکیایان شەرمەزار کرد هەروەها تورکیای بە هاوکاری (موجاهدین خاڵک و پەدەکە) ی ئێران تۆمەتبار دەکرد، هەمان رۆژنامە ئیدانەی کارەکانی تورکیای دەکرد و دەیانوت ئەم کارانەی تورکیا گرژی دەخاتە نێوان پەیوەندییەکانی نێوانیان و پەیوەندییەکانیان گرژ تر دەکات و ئەنقەرە بە نیازن (مەجاهدین خەڵک) بە فەرمی لە وەڵاتەکەیان بناسێنن و هەروەها ئەمەریکایان بەوە تۆمەتبار دەکرد بە نیازن تۆوی نەفرەت و دووبەرەکی و دوژمنایەتی لە نێوان تورکیا و ئێراندا بچێنن.

لەهەمانکاتدا رۆژنامەکانی تورکیش دژ بە ئێران کەمپینێکیان دەست پێکرد، نوسەرانی تورک ئێرانیان بەوە تۆمەتبار دەکرد گوایە هاوکاری (پەکەکە) و پارتە ئیسلامییەکانی ناو تورکیا دەکەن و دەشیان وت هەرچالاکییەکی تێکدەری و تیرۆریستی ئیسلامی لە جیهاندا روودەدەن بە هاوکاری ئێران دێنە ئاراوە. لە ٥ی ئەیلول وەزیری دەرەوەی ئێران لەرێی ئاژانسی فەرمی (ئێران)وە روونکردنەوەیەکیدا و لەبارەی تۆمەتەکانی تورکیا گوایە وەڵاتەکەیان هاوکاری (پەکەکە) دەکەن وتی (**هەموو ئەمانە درۆن و دوورن لە راستییەوە**) .

ئەوکاتەی (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) لەگەڵ تورکیا لەبارەی هەموو شتێکەوە تەبابوون و هاتنە ئاراوەی کێشەی سنور لە نێوان ئێران و تورکیا وایلە (عیسمەت سیزگین) ی وەزیری ناوخۆی تورکیا کرد لە مانگی ئەیلول بچێت بۆ تەهران، سەرەڕای ئەو هەموو کێشەی نێوان تورکیا و ئێران بەڵام (عیسمەت سیزگین) لەبارەی هێرشی سوپاکەیان دژ بە (پەکەکە) لە باشور دەیانویست بەرەی ئێران بەلای خۆیاندا رابکێشن.

## (یەنەکە و پەدەکە) تۆمەتباری (پەکەکە) دەکەن بە پەلاماردەر

لەدوای کوشتنی ئەندام و سەرکردەکانی (پارتی ئازادی کوردستان.. پاک) لە باشور لە نێوان لایەنەکان گرژی و ئاڵۆزییەکان پەرەیان سەند، لە ١٢ ی ئەیلولی (١٩٩٢) نوێنەرانی (یەنەکە و پەدەکە) لە تورکیا لەو روونکردنەوەی کردیان مەسەلەکان زیاتر روونبوونەوە. نوێنەری (یەنەکە) و (پەدەکە) سەرچڵ قەزاز و سەفین دزەیی باسی ئەوەیان دەکرد گەریلاکانی (پەکەکە) پەلاماری هێزی پێشمەرگەی هەردووکیانیان داوە، هەروەها دەیانوت گوایە گەریلا لە لوبنان پێشمەرگەیەکی (یەنەکە)یان کوشتووە و یەکێکی تریان بریندار کردووە، هەروەها گەریلا منداڵی ناوچەکانیان رفاندووە و لەهەمان کاتوساتی هاتنە ئاراوەی ئەم رووداوانەدا ٣ پێشمەرگەی سەر بە (پەدەکە) بێسەروشوێن کراون، هەروەها داوای ئەوەیان لە (پەکەکە) دەکرد سنوری عێراق دژ بە تورکیا بەکار نەهێنن، بۆ ئەم مەبەستەش هەرەشەیان دەکرد و دەیانوت (**باکەس بە هەڵە تێنەگات تاکو ئەمڕۆ بە توندی وەڵامی پەکەکەمان نەداوەتەوە لە بێ توانایماندا نەبووە، هەتاکو ئێستا سەرکردایەتیمان بڕیارێکی وایاندەرنەکردووە بەشێوەیەکی سەخت روبەڕویان ببینەوە**)[٨٠].

نوێنەری (ئەرنەکە) باڵی سیاسی پەکەکە لە ئەڵمانیا قسەکانی ئەم دوو نوێنەرەی (یەنەکە و پەدەکە)ی بەدرۆ دەخستەوە، نوێنەری (ئەرنەکە) دەیوت (**ئەوان باش دەزانن ناتوانن بەبێ هۆکار هێرشمان بۆبهێنن، هەربۆیە پەنا دەبەنە بەر سیناریۆ دروستکردن، زوو.. زوو دەیهێننە زمان گوایە ئێمە لەگەڵ سەدام رێککەوتوین و هاوکاریمان دەکەن، ئەیانەوێت ئەو قین و نەفرەتەی گەلی کورد هەیەتی بەرامبەر بە سەدام بەرامبەر بە ئێمەش هەیانبێت**) .

نوێنەرەکەی (ئەرنەکە) لەبارەی تۆمەتەکانی نوێنەرەکانی (یەنەکە و پەدەکە)وە دەیوت بەپێچەوانەوە بەڵکو ئەوان هێرشیان بۆهێناوین، دەیانوت هەر ئەوانن هێرشیان بردووتەوە

---

[٨٠] ١٣ای ئەیلول ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ).

سەر (پاک) و دەیانکوژن کە نوێنەرایەتی گەلیش دەکەن، بەڵی نوێنەری (ئەرنەکە) دەیویست بڵێت بەرەی کوردستانی لەرێی ئەم پروپاگەندە بێبنەمایانەوە زەمینە بۆ هێرشکردنمان خۆشبکەن.

بۆ تەواوکردنی ئامادەباشییەکان سوپای تورک لەرێی شەمەندەنەفەرەوە سەربازیان بۆ ناوچەکە دەگوازتەوە، هەموو کارمەند و ڤاگۆن و ئامرازەکانی گواستنەوە لە وەزارەتی گەیاندنەوە بۆ ئەم مەبەستە تەرخانکرابوو بۆ کارئاسانی کردن بۆ سوپا، لەهەمانکاتدا چەکی قورس و تۆپ و زرێپۆش و دەبابە و ماشێنە سەربازییەکانی تری سەربازی بەردەوام بەرەو باشوری کوردستان بەلکێش دەکران.

## جموجۆڵی مانگی ئەیلول

لە بەیانییەکی رۆژی مانگی ئەیلول جارێکی تر سوپای تورک سنوریان بەزاند و خۆیان گەیاندە ناوچەی (دەشتان)ی نزیک ئامێدییە، لە سنوری (چوکورجە)وە سوپای تورک ١٠کم چوونە ژوورەوە، پێش ئەوەی ئۆپەراسیۆنی پیادەییان دەست پێبکات ناوچەکەیان بەچڕی بۆردۆمان کرد، ئەم ئۆپەراسیۆنە لەلایەن ٣ فەیلەق و تیمی تایبەتی کۆماندۆی شاخی دەستی پێدەکرا کەلە ناوچەکانی (وان و هەککاری) یەوە رەوانە کرابوون.
کاتێک شەڕ و پێکدادان لە نێوان گەریلاکانی (پەکەکە) و سوپای تورک سەختتر دەبووەوە، هەردوو سەرکردەی کورد (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) لە مانگی ئاب چوون بۆ ئەنقەرە و چاویان کەوت بە سەرۆک وەزیران (سلێمان دیمیرال) و سەرۆک کۆمار (تورگوت ئۆزال). شایەنی باسە جموجۆڵە سەربازییەکانی سوپای تورک کەلە مانگی ئەیلول دەستیان پێکرد راستەوخۆ دوابەدوای ئەم دیدارانە هاتنە ئاراوە، لە ٢٩و٣٠ ئابدا چیای (جودی) زۆر بە خەستی بۆردۆمانکرا، لە مانگی ئاب بەدواوە بەلێشکردنی هێزی سەربازی و زرێپۆش و تۆپ بۆ (جزرە، خابور و سلۆپی) بەردەوام بوو، ژمارەیەکی زۆری سەرباز و ماشێنی سەربازی لە نزیک باڵەخانەی گومرکی سلۆپی جێگیرکران، هەروەها ئەو کۆماندۆ شاخاوییانەی لە شارەکانی (قەیسەری و بۆلۆ)وە هێنابوویان لەگەڵ زرێپۆش و ماشینە بارهەڵگر و مودەرەعەکانیان لە نزیک (ئیبراهیم خەلیل) جێگیریانکردن. چڕبونەوەی هێرشی گەریلاکانی (پەکەکە) بۆسەر بنکە و بارەگاکانی سوپای تورک گڕی لە بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک بەردابوو، ئەوانیش دەیانویست نەک تەنها (پەکەکە) بەڵکو داخی دڵی خۆیان بە دەسەڵاتدارانی باشوریش برێژن، لەهەمانکاتدا لەبارەی گواستنەوەی گاز و نەوت و بەنزینەوە بڕیاری کەمکردنەوەیان درا و بەمشێوەیە شۆفێرەکان تەنها بۆیان هەبوو (١٠٠٠) لیتر بەرن بۆ تورکیا، ئەمە سیاسەتێکی دەوڵەتی تورک بوو لەهەمبەر باشور چونکە کەمکردنەوەی بازرگانی ئیبراهیم خەلیل دەبووە کەمبونەوەی داهاتی سەرکردەکانی باشور، هەربۆیە دەیانویست فشار بۆ سەرکردەکانی باشور بهێنن و بە زووترین کات بکەونە خۆیان، سەرکردایەتی باشوریش بڕیاری خۆیاندا و هێزی پێشمەرگەی خۆیان رەوانەی خاڵە سنورییەکان کرد.

## هێرشی گەریلا بۆسەر بارەگا

هەفتەیەک پێش ئەوەی شەڕ دەست پێبکات، گەریلاکانی (پەکەکە) لە مێژووی خۆیاندا گەورەترین چالاکییان ئەنجامدا، لە شەوی ٢٨ی ئەیلول لە (شەمزینان، سامانلی و یەشیلئۆڤە) هێرشیان کردە سەر بنکە و بارەگا سەربازییەکانی سوپای تورک، لەم هێرشەدا بە گشتی ٧٠٠ گەریلا بەشداری تێداکرد و هەدەفی سەرەکییان بارەگای (رۆبارۆک) بوو کە نزیکەی (٥٠٠) سەربازی تێدابوو. ئەم هێرشە لە نیوەی شەو دەستی پێکرد و هەتا نیوەڕۆی رۆژی دوایی خایاند، ئەم پەلامارییە دەنگی دایەوە و لەهەمانکاتدا گەریلاکان توانیان گەورەترین زیان بە دەوڵەتی تورک بگەهێنن، لە هێرشەکانی سەر بارەگاکانی (سامانلی و یەشیلئۆڤا) نزیکەی (٥٠) گەریلا شەهید بوون و(٢٠٠) سەربازیش کوژران. دوابەدوای ئەم هێرشە فرۆکە جەنگییەکانی تورک ناوچەکەیان بە چڕی بۆردۆمان کرد و لە ئاکامدا چەند گوندنشینێک کوژران، هەندێک لەو گروپانەی بەشداری ئەم هێرشەیان کردبوو لە باشورەوە هاتبوون هەربۆیە دوای ئەنجامدانی چالاکییەکە گەڕانەوە بۆ باشور و ئەوانی تریش لە باکور مانەوە [81].

دوای ئەم هێرشە سوپا سالاری تورک (دۆغان گورێش) راچەڵەکا و رایگەیاند لێرە بەدواوە کۆنسەپتی نوێ بەکاردەهێنن، بەڵام سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم کۆنسەپتە نوێیەوە هیچی نەدرکاند، سەرۆک وەزیران (سلێمان دیمیرال) دوای ئەم چالاکییە وتی (**کێشەی کورد کێشەیەکی سیاسی نییە**[82])، خوا دەیزانی سلێمان دیمیرال چەندجار ئەم قسەیەی دووبارە کردبووەوە.

---

[81] ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[82] ٢ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی).

لەهەمان رۆژاندا بەتایبەتی لە ناوچە سنورییەکان شەڕوپێکداداان زیادیان کردبوو، دوای ئەم چالاکییەی گەریلا بە دوو رۆژ، ئەمجارەیان گەریلا لە (شرناخ) هێرشیان کردەسەر بارەگای سەربازی (قەرەگێچیت ).

دوای ئەم چالاکییانە جارێکی تر (یەنەکە و پەدەکە) هۆشداریاندا بە (پەکەکە) و داوایان لە (پەکەکە) دەکرد جارێکی تر لەناو خاکی باشور چالاکی ئەنجام نەدەن، لە ١٩٩٢/١٠/٤ رۆژنامەی (حورییەتی) تورکی لەسەر زاری بەرپرسێکی دەوڵەتەوە بڵاویکردەوە ئەنقەرە ئاگەداری ئەم هۆشیارکردنەوەی (یەنەکە و پەدەکە)ن، **بەمشێوەیە هەنگاو بە هەنگاو هاتنەئاراوەی شەڕ نزیک بوومەوە.**

## ئۆجالان (خۆتان ئامادەکەن بۆ شەڕ)

عەبدوڵە ئۆجالانی سەرۆکی گشتی پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) لە ١٩٩٢/١٠/٢ لەرێگای راکاڵەوە رێنمایی هێزەکەیانی دەکرد لە باشور و پێیوتن :

**( وەک دەزانن مەسەلەی هێرشی بەرەی کوردستانی یان پەدەکە لەئارادایە، پێویستە لەهەمبەر ئەم هێرشانە هەموو ئامادەباشییەکی خۆتان بکەن، لەچوارچێوەی پیلانەکانی زاخۆ کارەکانتان رێکبخەن کە پێشوتر دارێژرابوو، لەحاڵەتی هێرش بۆهێنانمان ناکرێت شەڕی سەنگەر و مەیدانی پەیرەو بکرێت، بەوپەڕی توانا و گوڕوتینتانەوە بەشێوەیەکی پارتیزانی گەریلایی ئەم شەڕە پێشبخەن، هەوڵبدەن گرووپی بە ئەزمون و بە تواناتان لەریزەکانی پێشەوە بێت، پیلانەکانی سەر باشور و هێرشەکانتان بەتەواوەتی لە رووی بەرەی خیانەت ئەنجام بدەن و لەسەر بناغەی خواستی سەربەخۆیی گۆڕەپانی شەڕ جۆشبدەن، لەکاتی جێبەجێکردنی هەموو ئەمانە دەبێت خوولی پەروەردەی خۆتان لەبیر نەکەن و بە پیلان و بە سەرنج و بە شێوەیەکی ووردبینانە کارەکانتان ئەنجام بدەن، دەبێت ئامادەباشی گەریلا بەگشتی لەئاستی جموجۆڵی پارتیزانی بێت، ئەوان دەیانەوێت بەردەوام هێزەکانمان لە شوێنێک کۆبکەنەوە و نارەحەتیان بکەن، لەحاڵەتی پێویستدا نابێت کێشە بێتەئاراوە لەسەر بۆچونی ئەوەی ئایا ناوچەکانی ژێر دەستمان چۆڵ بکەین یاننا، ئەگەر پێویست بکات لە زاخۆ وە تاکو ناوەوە بە پانتایی ئەو جوگرافییە خۆتان جێگیربکەن، دەتوانن ئەم شەڕە بکەنە شەڕی ناخۆ، ماڵ و حاڵ و شوێنەکانیان بەتەواوی دەزانرێت، ئێمە ئەو توانایەمان هەیە هێرش بەرین و تێکیان بشکێنین، دەتوانن رێگاکان بگرن، ئەگەر پێویست بکات دەتوانین جارێکی تر بڕیاری بەکارهێنانی ئابڵوقە بدەین، پێشوتر لەبارەی ئەم مەسەلانەوە رێنماییتان پێگەیشتبوو، ئەوەی گرنگە ئەوەیە ئەم رێنماییانە بەشێوەیەکی دروست بخرێنە بواری جێبەجێکردن و پراکتیکەوە)** [83].

---

[83] تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٩٢ رێنمایی و ئاخافتنەکانی ئاکادیمیای مەعسوم کورکماز .

دوای ئەم ڕێنماییانەی (عەبدوڵە ئۆجالان) بەچەند کاتژمێرێک لە خواکورک پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی لەگەڵ پیاوەکانی خێڵی برادۆست هێرشیان کردەسەر بارەگای سەرەکی (پەکەکە) .

**(پەکەکە) زۆر دڵنیابوو لەوەی کە هەر پەلاماریان دەدەن.**

## شەڕی باشووری کوردستان دەست پێدەکات

ڕوونکردنەوەکان و تەکتیک و تاوەنبارییە بەرامبەرییەکان هیچ کامیان گڕی ئاگری فتیلی شەڕەکەیان خامۆش نەدەکردەوە، دەبوایە شەڕەکە بهاتایەتە ئاراوە و نەدەتوانراش فەرامۆشیش بکرێت، لایەنەکانیش بەگوێرەی ڕەوشەکە لە سەنگەردابوون و دوا ئامادەباشی خۆیان کردبوو، ئەم شەڕە شەڕی دوو بەرە بوو، بەرەیەکیان پێکهاتبوو لە (دەوڵەتی تورک، یەنەکە و پەدەکە) کە شەریک بوون و بەرەکەی تریش تەنها (پەکەکە) بوو.

لە مێژووی کوردستاندا خوێناویترین شەڕی ناوخۆی کورد دەستی پێدەکرد، لە ٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٢) لە (هەیاتی)ی نزیک لە خواکورک دوای بۆردۆمانێکی چڕوپڕی هاوان و فڕۆکەی جەنگی سوپای تورک، (٣٠٠٠) هەزار پێشمەرگە هێرشیان کردەسەر سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە). لە ڕۆژی یەکەمدا گەریلاکان بە بڕوابوون بە خۆیان و بە هێز و توانای خۆیان و بە فیداییەکی بێوێنانە و بە ئیرادەیەکی مەزنەوە توانیان بەرپەرچی هێرشەکان بدەنەوە و دەستیان لێبوەشێنن و زیان بە هێزەکانی پێشمەرگە بگەهێنن. پێشمەرگەکان بریندارەکانی خۆیان دەگوازتەوە بۆ نەخۆشخانەکانی شەقڵاوە، هەولێر و سلێمانی، زۆربەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە (خواکورک) کچ بوون و هەروەها ژمارەیەکی زۆری بریندارێشیان لەوێبوون کە بەکۆی گشتی ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی (٦٠٠) گەریلایەک. گەریلاکان شوێنە ستراتیژییەکانیان گرتبوو، گەریلاکان بە گرووپی ٥ هەتا ١٠ کەسییەوە سەنگەریان گرتبوو، لەسەر زۆربەی گردەکان دۆشکە و چەکی قورسیشیان دابەستبوو، هەروەها ڕێگاکانیشیان لوغم ڕێژکردبوو، هەتا شەڕ درێژەی بخاندایە نەبوونی خواردن، ئاو، تەقەمەنی دەبوو بە کێشەیەکی گرنگ.

گەریلاکان سوودێکی باشیان لەو شوێنانە وەردەگرت کە دەستیان بەسەریدا دەگرت، جگە لە خۆراگری و بەرخودان و مردن ڕێگاچارەیەکی تریان نەبوو، ئەوان دەیانزانی درێژبوونەوەی مەودای شەڕەکە دەبووە هۆی ڕووخانی وورەی پێشمەرگە، لەهەمانکاتدا گەورەترین چەکی دەستی گەریلاکان کە زۆربەشیان کچ بوو تەنها وورە بوو، گردێک هەر بە ١٠ گەریلایەک یان گردێکی پانوپۆڕ لەوانەبوو بە ٥٠ گەریلایەک چواردەوری بگیردرایە و بیانپارستایە بەڵام پێشمەرگە بە هێزێکی زیاد لە ١٠٠ کەسییەوە و بە چەکی گران و جۆراوجۆر هێرشیان بۆدەبرد، دوای ئەوەی بەرپەچیان دەدرایەوە و زیانیان پێدەگەیشت پێشمەرگەکان ناچاردەمان بکشێننەوە. فڕۆکە جەنگییەکانی تورک لە ڕێی بۆردۆمانکردنەوە هاوکاری پێشمەرگەکانی دەکرد، گەورەترین چەکی ئەم شەڕە (حەق) بوو لەهەمبەر (ناحەقی)، پێشمەرگەی داماو سەرەڕای ئەو ئەزمون و توانا و چەکانەیشی هەشیانبوو کەچی ئەنجامی پێویستییان بەدەست نەدەخست.

بەرەی شەڕی گەریلا لە (خواکورک) لەلایەن فەرهاد واتا (عوسمان ئۆجالان)ەوە فەرماندارێتی دەکرا و بەرەی پێشمەرگەش لەلایەن (مستەفا چاوڕەش)ی فەرماندەی (یەنەکە)وە فەرماندارێتی دەکرا، هەروەها کەریم خانی برادۆست و فەرماندە تورکەکانیش بەسەر هێزەکانی خۆیانەوەبوون.

دوای ئەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ ناوچەی (خواکورک) بەلکێشکران و شەڕ هاتەئاراوە سەرەتا بەرەی کوردستانی دەیانویست ئەم پێشهات و ئەم ڕووداوانە لە خەڵکی بشارنەوە، نوێنەرانی (پەدەکە و یەنەکە) لە ئەنقەرە لەگەڵ ڕۆژنامەوانەکاندا چاوپێکەوتنیان نەدەکرد، ڕێگاشیان نەدەدا ڕۆژنامەوانەکان بچنە ئۆفیسەکانیانەوە، لەبارەی یەکەم ڕۆژانی دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەکانەوە فەرماندەی گەریلاکانی هەرێمی (سەرحەد) لە ڕۆژنامەی (سەرخوەبون) تیشکی خستەسەر ڕووداوەکان و دەیوت (**ئێمە لەسەر شێوازی شەڕی پارتیزانی سەنگەرمان گرتووە، هێزی پێشمەرگە بە تۆپ و هاوان و دۆشکە و چەکی ئۆتۆماتیک هێرشمان بۆدەهێنن و ئێمەش لەئاستیاندا خۆمان دەپارێزین و بەرپەرچی هێرشەکانیان دەدەینەوە و هەروەها لە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕەکەدا زیانمان نەبووە**)[٨٤].

---

[٨٤] ٣ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی (نوزگور گوندەم ).

کاتێک بۆ دەستپێکردنی شەڕی باشور دوا بڕیار درا و دوا ئامادەباشی کرا، شەڕەکە لە چوارچێوەی ئەو پیلانەی لە نێوان ئەفسەرە پلە بەرزەکانی سوپای تورک و بەرپرسیارانی بەرەی کوردستانی داڕێژرابوو روویدەدا، زۆرێک لە فەرماندە پلە بەرزەکانی (میت) و سوپای تورک بە جلوبەرگی کوردی و بە جلوبەرگی پێشمەرگەوە لە باشوری کوردستاندا بوون و چاودێری گۆڕانکارییەکانیان دەکرد.

## دوای یەکەمین پێکدادان بۆ ڕێککەوتن دیدار لەنجامدرا

شەڕوپێکدادانەکان لە ٢ی تشرینی یەکەم دەستی پێکرد، جارناجارێک دەنگی تەقە کپ دەبوو، ئەم کپییەش ماوەی دوو ڕۆژی خایاند، لەگەڵ کەمبونەوەی شاڵاوی پەلامارییەکانی پێشمەرگە و پەرچدانەوەی پەلامارییەکان لەلایەن گەریلاوە، بە ئامانجی دیدار بەرەی کوردستانی بۆئەوەی چاویان بە فەرماندەکانی (پەکەکە) بکەوێت وەفدێکیان نارد بۆ (خواکورک)، ئەم وەفدە پێکهاتبوون لە پەرلەمانتارێک و چەند فەرماندەیەکی پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی.

ئەم وەفدە بەناوی حکومەتی کوردستانەوە قسەیان لەگەڵ فەرماندەکانی (پەکەکە) دەکرد، داوایان لە (پەکەکە) دەکرد لە هەرێمەکە پاشەکشی بە گەریلاکانیان بکەن، فەرماندەکانی (پەکەکە)ش دەیانوت بەنیاز نین هیچ سەنگەرێک چۆڵبکەن کە بە ڕەنجی خۆیان بەدەستیان خستووە.

یەکەمین ڕوونکردنەوە لەبارەی هێرشەکانەوە لەلایەن جێگری (جەلال تاڵەبانی)یەوە کرا کە (نەوشیروان مستەفا) بوو، نەوشیروان دەیوت (**بەهۆی چالاکییەکانی گەریلاکانی پەکەکە وە لەسەر سنور سوپای تورک بۆردۆمانی گوندەکانمان دەکەن و بەم چالاکییانە زۆر نیگەران و نارەحەتین**)، (نەوشیروان مستەفا) ئەم شەڕەی بە مەسەلەی (ویژدان)ەوە گرێدەدا و دەیوت (**حکومەتی هەرێم بەرپرسی هەموو سنورەکانە، هەموو جیهان سەبارەت بە بوونی کەمپەکانی پەکەکە وە زۆرمان لێدەکەن دەریان بکەین، لە کوردستانی تورکیا پەکەکە لەبارەی تەکتیک و ستراتیژییەتی خۆیانەوە سەربەستن نەک لێرە، ئێمە لەگەڵ ئەوەدا نین پەکەکە بۆ ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیان خاکی کوردستانی عێراق بەکار بهێنن، دەمانەوێت لە ڕێی تەبایی و دۆستایەتی و باوەڕییەوە کێشەکانی نێوانمان چارەسەر بکەین، ئێمە بیر لە بەرژەوەندی باڵا و گشتی میللەتی کورد دەکەینەوە، لەبارەی ئایا پەکەکە بڕیاری ئەوەیانداوە هەرێمەکەمان چۆڵ بکەن یاننا خاوەن هیچ زانیارییەک نین هەربۆیە وەفدمان بۆلایان**

ناردووه)، قسەکانی نەوشیروان مستەفا بۆنی ئەوەیان لێدەهات ئەگەر پەکەکە لەسەر خواستی خۆیان هەرێمەکە چۆڵ نەکەن ئەوە ناچاردەبن هێرشیان بۆبهێنن، هەروەها ئەوەشی لەیاد نەکردبوو کە بڵێت نەهاتنە ئاراوەی شەڕ لە بەرژەوەندی هەردوولا ماندایە .[85]

لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە فەرماندەی پێشمەرگەکانی (یەنەکە) مستەفا چاوڕەش دەیوت **(ئێمە دژی ئەو چالاکییانەین کە پەکەکە لەناو خاکی ئێمەدا ئەنجامیان دەدەن، وەکو پەرلەمانی هەرێمی کوردستان بڕیارمانداوە رێگا بە هەموو کاروباری سیاسییان بدەین، بابێن ئۆفیس بکەنەوە و رۆژنامە دەربهێنن و رادیۆ و تەلەفزیۆنیش بکەنەوە، ئێمە ئامادەین بۆئەم جۆرە کارانەیان هاوکاریشیان بکەین، هەموو هاوکاری جیهان لە دەروازەی تورکیاوە بەدەستمان دەگات، پەکەکە دەمانخاتە حاڵەتێکی زۆر ناخۆشەوە، وەفدێکمان ناردووە بۆلایان کە پێیان بڵێن ئێمە براین و رێزیان لێدەگرین، بەلام دەبێت دەستبەرداری چالاکییەکانی سەر سنور بن، پێیانمان وت هەرێمەکەمان چۆڵ بکەن، نامانەوێت لووتی کەس خوێنی لێبێت، ئەگەر گوێ لە قسەکانمان نەگرن ناچارین هێز بەکار بهێنین و پەلاماریان بدەین و لێرە دەریان بکەین، ئەمە بڕیاری حکومەت و پەرلەمانیشە، لەم حاڵەتە ئایا کوردەکانی تورکیا لێمان تورە دەبن یاننا ئەوە کەیفی خۆیانە، بڕیاری دەرکردنی پەکەکە لە هەرێمەکەمان لەبەرخاتری تورکیا نییە بەڵکو لەبەر خاتری خۆمانە)** .

رۆژانی ٣و٤ی هەمان مانگ بەهۆی دیدارەکانەوە هەرێمەکە ئارام بوو، بەلام ئەم هێمنییە بۆ هەردولا تەنها تاکتیکی کاتی بوو، دەبوایە شەڕ بهاتایەتە ئاراوە، کاتێک لە (خواکورک) رەوشەکە بەمشێوەیە بوو (پەدەکە) لە بادینان سەرقاڵی ئامادەباشییەکانی شەڕ بوو.

---

[85] ٤ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم ).

## سەنگەرەکان و تەکتیکەکان

لە ٤ی مانگی تشرینی یەکەم شەڕوپێکدادانەکان دژوار بوونەوە، هێزی پێشمەرگە بە هاوان و موشەک و تۆپ هێرشی سەنگەرەکانی گەریلایان دەکرد، فەرماندەکانی گەریلا بە تایبەتی لە شەڕەکانی بادینان سەرەڕای ڕێنماییەکانی (عەبدوللە ئۆجالان) کەچی شەڕی (پاراستنی سەنگەر و شوێنیان) دەکرد، فەرماندەکانی گەریلا دەیانویست بەهەرشێوەیەک بێت سەنگەرەکانیان بپارێزن ئەمەش پێچەوانەی ڕێنماییەکانی سەرۆکەکەیان بوو، لەوانەشبوو بەهۆی ناچارییانەوە بوبێت ئەم شێوازی پاراستنەیان دەکرد، ئەم شێوازی شەڕە و ئەم تەکتیکە بۆ زۆرینەی گەریلاکانی (پەکەکە) تازە و تاڕادەیەک پێی نامۆ بوون، زیاتر گەریلا شێوازی شەڕی (لێدە و بگەڕێوە)یان بەکار دەهێنا، یاخود هێرشی ناوەختیان ئەنجام دەدا.

گەریلاکان لەسەر گردە ستراتیژییەکاندا دۆشکە و بیکەیسییان دابەستبوو هەربۆیە هێرشەکانی پێشمەرگە بێکاریگەر دەمانەوە، ئەگەر بەرەیەکی جەنگ پشتی قایمبێت ئەوا پاراستنیشی زەحمەت نییە، بەڵام بەهۆی دەستپێکردنی هێرشی سوپای تورک و بۆردۆمانەکانیان کە هەرچوار لای سەنگەر و شوێنەکانی گەریلاکانی دەگرتەوە دەبووە هۆکار گەریلاکان نارەحەتییان بۆ دروست ببێت، سەرەڕای ئەمەش فەرماندەکانی گەریلا سووربوون لەسەر ئەوەی بەرگری لە شوێنەکانیان بکەن، دەبوایە بە شێوەیەکی تەکتیکیش بوبێت شوێنەکانیان جێبهێڵایە بەڵام بەمشێوەیە کەوتبوونە ناو دەریای هەڵەی تەکتیکییەوە، سەرەڕای ئەوەی ئەم شێوازە شێوازی شەڕی گەریلا نەبوو کە پێشی ڕانەهاتبوون و سەرکردایەتی و سەرۆکەکەشیان ئەمەی نەدەویست کەچی فەرماندەکانی هەرێمەکان ئەو تەکتیکە هەڵەیەیان بەکار دەهێنا، ئەم شێوازی شەڕە لەگەڵ قانونی شەڕی گەریلا نەدەگونجا.

پێش دەستپێکردنی شەڕەکە لەلایەن فەرماندەی گەریلاکانەوە بۆچونی ئەوە هەبوو بوونی چەند چادرێکی کەپمەکانی گەریلا بۆ دەسەڵاتی باشور و بۆ سوپای تورک کێشەیەکی ئەوتۆ دروست ناکات و نابنە هەدەفێکی سەرەکی، لەلایەکی تریشەوە فەرمانداریێتی پێشمەرگە و سوپای تورکیش پێیان وابوو گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەر رێنماییەکانی (عەبدوللە ئۆجالان) کە پێیانی وتبوو (شەڕی سەنگەری مەکەن و بە شێوەی گرووپی بچوک جەولە بکەن و بە پانتایی جوگرافییەکان جوڵە بکەن) فەرماندەکان شەڕی سەنگەر ناکەن، کەچی فەرماندەکانی ئەو هەرێمە شەڕی سەنگەرییان دەکرد، گرووپەکانی گەریلا تاڕادەیەک بەگوێرەی کاردانەوە و هەڵوێستی پێشمەرگە و سوپای تورک سەنگەریان دەگرت، هێزی پێشمەرگە و سوپای تورکیش روویان لە سەنگەر و بارەگاکانی گەریلا کردبوو، لە شوێنە دیاریکراوەکاندا بڵاوەیان بە هێزەکان دەکرد و گەریلاش بە گوێرەی ئەوان دەجوڵانەوە، کە رەوشەکە بەمشێوەیە پەرەی سەند شەڕی مەیدانی دەستی پێکرد و گەریلاش گردە ستراتیژییەکانیان دەگرت، لەسەر گردەکان دژ بە کۆپتەر و بۆردۆمانی فڕۆکە دەبونەوە و هەروەها بە تفەنگیش بەرگرییان لە دەوروبەری خۆیان دەکرد، بەمشێوەیە بە شێوەیەکی گشتی گەریلا بێ جوڵە دەمانەوە. دەستەی گروپی بچوکی گەریلا بە ناوچەکاندا بڵاوەیان کردبوو، ئەمەش ببووە هۆکار رێگری لە بڵاوبونەوەی هێزی پێشمەرگە و سوپای تورک بکەن، ئەم گرووپە گەڕۆکانە دەیانتوانی زیان لە هێزی پێشمەرگە بدەن بەڵام سەرەڕای ئەمەش فەرماندەکانیان سوور بوون لەسەر ئەوەی شەڕی سەنگەر بکەن، سەرەڕای هەموو شتێک گەورەترین چەکی دەستی گەریلا بێشک وورەیان بوو، هەموو جیهان چاوی لێیان بڕی بوو، دێڕێکی زۆری لاپەڕی مێژووی چارەنوسیان لەم شەڕە دەنوسرایەوە، لەهەمبەر ئەم هەموو هێرش و زۆربۆهێنانە تەنها وورەیان رێگر بوو لەهەمبەر تەسلیم بونیان، لەهەمبەر ئەمەشدا ئاستی بەرز بوونەوە و دابەزینی وورەی پێشمەرگە ببووە هۆکار سەربکەون و زیانیان بەرکەوێت، ئەم شێوازی شەڕی مەیدانی و سەنگەرییەی گەریلا شێوازێکی نوێ بوو، چەندین ساڵ بوو گەریلا لەسەر شێوازی پارتیزانی شەڕیان دەکرد، بەڵام ئێستا لەسەر شێوازیک شەڕیان دەکرد کە پێی نامۆ بوون، لەبەرەی پێشمەرگەدا فەرماندەکانی تورک سەرکردایەتییان دەکرد و ئەوانیان رێکدەخست و رێنماییان دەکردن و فەرمانیان دەدانێ، سەرەڕای ئەمەش سەرکەوتنیان بەدەست نەدەخست.

لەناو هێزی پێشمەرگە دوو روانگە هەبوو لەئاستی گەریلا ئەویش رێز و ترس بوون، بەرگرییەکانی گەریلا و گیانفیدابیان و خۆراگرییان و ئیرادەیان کە زۆربەشیان کچ بوون ئەمە لەناو پێشمەرگەدا بە ڕێزەوە لێیدەڕوانرا، ماوەیەکی دوور و درێژە پێشمەرگە و گەریلا ئاشنای یەکترن. کاتێک گەریلایەک شەهید دەبوو هەندێک لە فەرماندەکانی پێشمەرگە بە دوژمن ناوزەندیان دەکرد، ئەمەش بەگشتی لەلایەن پێشمەرگەوە مایەی قەبوڵکردن نەبوو، بوونی ئەفسەرە تورکەکان لەناو هێزی پێشمەرگەدا نەک وورە بەخشین بەڵکو ببووە مایەی روخانی وورە، گرنگترین بەشی ئەم شەڕە ویژدان و وورە بوو، پێشمەرگەی داماو لەسەر بڕیاری سەرکردایەتی خۆیان هێنرابوون بۆ ئەم شەڕە و ئەمەشیان لەسەر خواستی خۆیان نەدەکرد بەڵکو بەناچاری پێوەی گلابوون، سەرکردایەتیان شەڕی یەکتری کوشتنیان پێدەکردن کە پێی دەڵێن شەڕی ( **براکوژی**) .

## له (هەفتانین) شەڕوپێکدادانی خوێناوی

لەگەڵ دەستپێکردنی هێرشی پێشمەرگە بۆ سەر (خواکورک)، پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ش لە (هەفتانین) هێرشیان کردەسەر بنکە و سەنگەرەکانی گەریلاکانی (پەکەکە)، لە ٢و٣ی مانگی تشرینی یەکەم لەو شەڕو پێکدادانەی لە نێوان پێشمەرگەکانی (پەدەکە) و گەریلاکانی (پەکەکە) لە بادینان هاتنەئاراوە بەگشتی (٥٠) پێشمەرگە و گەریلا ژیانیان لەدەستدا، هەروەها لە ٤ی هەمان مانگدا لەو پێکدادانەی لە دەوروبەری (زاخۆ) هاتنە ئاراوە ٣ گەریلا و ٦ پێشمەرگەی (پەدەکە) گیانیان لەدەستدا، دوای ئەم رووداوە بە چەند رۆژێک لە باکوری (شەرانیش و باتوفە) هێرشیان کردە سەر گەریلا و لە ئاکامدا (٢٥) پێشمەرگە کوژران و (٦٠) یشیان بریندار بوون، (پەدەکە) لەم هێرشانەدا هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەدەکەوت و دەتوانرێت بوترێت ئایا پێشمەرگە لەبەرامبەر گەریلا خۆیان پێڕانەدەگیرا یان نەیاندەویست شەڕ بکەن هەربۆیە (پەدەکە) ناچارمان لە (هەولێر و سلێمانی)یەوە نزیکەی (٥٠٠٠) هەزار پێشمەرگەی تر رەوانەی هەفتانین بکەن. بۆ گەیشتنی پێشمەرگە تازەکان بۆ هەرێمەکە ناوبەریاندا بە هێرشەکان، نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) لەبارەی گۆڕانکارییەکان و شەڕەکانەوە دەیوت (**هەواڵی هاتنەئاراوەی شەڕ راستە، دوو رۆژ لەمەوبەر لە نزیک زاخۆ شەڕ لە نێوان پێشمەرگەکانمان و گەریلاکانی پەکەکە روویداوە، یەک پێشمەرگەمان کوژراوە و یەکێکی تریشمان بریندارە، هێزی پێشمەرگەمان لە ناوچە سنورییەکان دژ بە پەکەکە دەستیان کردووە بە جموجۆڵ، لەو ناوچەیەدا ١١ کەسی سەر بە پەکەکە دەستبەسەر کراون، داوایان لێدەکەینەوە کەمپەکانی هەفتانین و خواکورک چۆڵبکەن، ٦ مانگ لەمەوپێش نوێنەرمان بۆلایان نارد، بەلام سەرکردایەتییان وەلامی پەیامەکانمانیان نەدایەوە، ئەوەی راستی بێت ناوچەکە زۆر ئالۆز بووە و نازانین ئایا شەڕی**

**کورد بە کورد کوشتن دێتە ئاراوە یاننا)**[٨٦]، نوێنەری (یەنەکە)ش سەرچڵ قەزاز لە ئەنقەرە دەیوت (**٧ گەریلای پەکەکە کوژراون هەروەها جوڵەمان بە ٥٠٠٠ هەزار پێشمەرگە کردووە بۆ ناوچەکە، سوورین لەسەر ئەوەی پەکەکە لە هەرێمەکە دەربکەین)** [٨٧]، لەکاتی گرژی و هاتنە ئاراوەی شەڕ لە زاخۆ و دهۆک دەستکرا بە گرتنی کوردانی باکور و لایەنگرانی (پەکەکە)، ئەوکاتەی شەڕەکان چڕبوونەوە جارناجارێک هاتن و دەرچوون لە شارۆچکەی زاخۆ قەدەغە دەکرا، (پەکەکە)ش هۆشداری دەدا بە (پەدەکە) و دەیانوت ئەگەر ڕەشبگیری لە ڕووی سڤیل بەردەوامی پێبدرێت ئەوا بڕیاری ئابڵوقەیەکی بەرفراوان دەدەین.

---

[٨٦] ٦ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[٨٧] ٥ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ (ئاژانسی ئاناتۆڵو).

## لە چاوپێکەوتنەکان ئەنجام وەرناگیردرێت

دیدارەکانی نێوان نوێنەرانی (پەکەکە و یەنەکە) لە (خواکورک) ماوەی ٣ ڕۆژی خایاند بەڵام ئەنجامێکی ئەوتۆی لێ سەوز نەبوو، لایەنەکان دواخوازییە کۆنەکانیان هێنابووە زمان و وەڵامە کۆنەکانیشیان وەرگرتبووەوە، بەمشێوەیە هیچ ئەنجامێک بەدەست نەکەوت. ئەوانەی بەناوی (یەنەکە)وە بەشداربوون پێکهاتبوون لە (مەحمود پێنجوێنی، مام ڕۆستەم، شێخ تاریق و حەمە غەریب) بەناوی حکومەتی هەرێم و مام جەلاوە داوایان کردبوو (پەکەکە) هەرێمەکە چۆڵبکات، لەهەمبەر ئەم داخوازییە فەرماندەکانی (پەکەکە) وتوبویان باشوری کوردستان پارچەیەکە لە خاکی کوردستان و وەکو کوردێک بە مافی ڕەوای خۆیان دەبینن لێرە بمێننەوە و پێیان وتبوون هەرێمەکە چۆڵ ناکەن. ئەوکاتەی ئەم دیدارانە درێژەیان هەبوو (پەدەکە) بۆئەوەی گرژی دروست بکات خوروقاتی دروست دەکرد. لە یەکەم ڕۆژی دیدارەکان (عوسمان ئۆجالان) ئەوکاتەی دەیەوێت بچێت بۆ شوێنێک، لەڕێی (سیدەکان) پێشمەرگەکانی (پەدەکە) تەقەی لێدەکەن، دوای ئەم ڕووداوە (عوسمان ئۆجالان) دەگەڕێتەوە شوێنی خۆی و بۆ بەدەست خستنی کات سوور دەبێت لەسەر بەردەوام بوونی دیدارەکان. بەردەوامی دیدارەکان و بەردەوامی دروستکردنی گێرەشێوێنییەکان لەلایەن (پەدەکە)وە کارێکی وایکرد (نەوشیروان مستەفا) بێتە بەینەوە، (نەوشیروان مستەفا) دەیوت لایەنگری هاتنە ئاراوەی شەڕ نین و داوایدەکرد چاوی بە فەرماندەکانی (پەکەکە) بکەوێت. کاتی خۆی (نەوشیروان مستەفا) ڕابەرایەتی ئەو شەڕەی کردبوو کە لە ساڵی (١٩٨٣) ئەندامی سەرکردایەتی (پەکەکە) (محەمەد قەرەسونگور)ی تێدا شەهید بوو، ئەو سەردەمە ژمارەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەرێمەکەدا دەگەیشتە ٣٠ بۆ ٤٠ گەریلایەک، هەرگیز (نەوشیروان مستەفا) خەیاڵی بۆئەوە نەدەچوو ژمارەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە باشور ببن بە هەزارەها و ڕۆژێک ڕووبەڕوویان قیتببنەوە !.

کاتێک دیدارەکانی نێوان (پەکەکە و یەنەکە) بەردەوام بوو، فڕۆکە جەنگییەکانی تورک بە سەختی (خواکورک)یان بۆردۆمان دەکرد، هیچ ئەنجامێک لە دیدارەکان نەهاتەدی و شەڕ

دەستی پێکردەوە و ئەم شەڕوپێکدادانەش لە ناوچەی (سۆران) تادەهات دەبووە هۆکاری ناڕەحەت بوونی خەڵکی و تا دەهاتیش دەنگی نەخوازیارانی شەڕ زیادیان دەکرد.

## دەسەڵاتدارانی باشور هێرشیان کردە سەر (پەکەکە) و لەسەر بنەمای یاسای نێودەوڵەتی حکومەتیان ڕاگەیاند

٣ ڕۆژ دوای هێرشەکانی بەرەی کوردستانی بۆسەر گەریلاکانی (پەکەکە) لە (خواکورک)، پەرلەمانی باشوری کوردستان لە ٢٨ی مین دانشتنیدا لە ٤ی تشرینی یەکەم ڕایانگەیاند بارودۆخ لەبارە و فیدراسیۆنیان ڕاگەیاند .

گەلی کوردیش هەروەکو هەموو نەتەوەکانی ژێر حکومڕانی ئیمبراتۆرییەتی عوسمانی لە کۆتایی شەڕی جیهانی یەکەم ئاواتەخوازی ئەوەبوون ئازاد ببن و بتوانن دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆخۆیان پێکبهێنن، بەڵام زلهێزە براوەکانی جەنگەکە لەبەرئەوەی کلیلی چارەسەرییەکانیان بەدەستەوە بوو لەپێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیان سەربەخۆییان بە گەلی کورد ڕەوا نەبینی، گەلی کوردی ستەملێکراو لەپێناو ئازادی خۆی تێکۆشاوە و لەپێناو ڕزگاری خۆیشیان ئەو سەرهەڵدانانەی بەرپایان کردبوو کە ئاکامەکەیشی دەبووە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی و کوردستانی گەورەشی دەگرتەوە، لە بەندی٤ی مادەی ٦٢و٦٤ی بەیاننامەی (سیڤەر) ئاوات و خواستی گەلی کوردی بەرجەستە کرد، لێ مەخابن کەچی لە ١٩٢٠/٨/١٠ کوردستانیان لە نێوان ٤ وەڵاتدا دابەشکرد.

ئەو ئومێدەی کورد هەیبوو لە ٣ی تەموزی ساڵی ١٩٢٣ لە ڕێککەوتنی (لۆزان)دا بەتەواوی لەناوچوو، ویلایەتی موسڵ لەسەر خواست و ڕەزامەندی کۆمیتەی کۆمکاری میللەتان کە دروستیان کردبوو لە ١٩٢٥/١٢/١٦ دا لە ٢٧مین دانیشتنیاندا بە عێراقەوە گرێدرا، لەو ڕاپۆرتەی کە لە بەیاننامەی (سیڤەر)دا هاتووە نوسراوە لەبەر زۆری ڕێژەی سەرژمێری کوردستان کورد دەتوانێت دەوڵەتێکی سەربەخۆ دابمەزرێنێت چونکە ڕێژەی دانیشتوانی کورد لە هەرێمەکەدا لە ٨ بەشدا ٥ی دەگرێتەوە. لەو سەردەمە کۆمکاری میللەتان لە ئاستی کورد دەستی هاوکاری خۆی کێشایەوە، کورد تەنها داوای یەکسانی ئیداری و داد و ئازادی زمانی دەکرد، بەمشێوەیە خەڵکی باشوری کوردستان لەلایەن ئینگلیزەوە کە حوکومڕانی شێخ مەحمودی بەرزنجیشیان دەناسی جارێکییان لە ساڵی ١٩١٩ و جاری دووەم لە ساڵی

١٩٢٢ شۆڕشیان خامۆش کرد و داخوازییەکانیشیان فەرامۆش کرا، بەشی باشوری کوردستان بەبێ ئیرادەی سەربەخۆی گەلەکەی و بەزۆرەملێی خاکەکەیشی لکێنرا بە دەوڵەتی عێراقەوە، حکومەتی ئینگلیز ئەوکاتەی حکومەتی عێراقی بە فەرمیش ناسی پێشوتریش هەر لەژێر دەسەڵاتی خۆیدابوو، بۆئەوەی دڵی کورد رازیبکات ئینگلیز و دەوڵەتی عێراق پەیمانێکیان بڵاوکردەوە کەلە ناو سنوری دەوڵەتی عێراقدا ئەگەر پێویست بکات کورد دەتوانێت حکومەت دابمەزرێنێت، کوردیش لەبارەی مەسەلەی ئابوری و سیاسییەوە لیژنەیەکیان پێکهێنا دانوساندن لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و ئینگلیز بکەن و داخوازییەکانیان بەرقەرار بکەن بەڵام ئەم پەیمان و نیاز و خواستەیان تەنها لەسەر کاغز مایەوە، لە ساڵی ١٩٣٢ عێراق وەک ئەندام لەناو کۆمکاری میللەتان قەبوڵکرا، بەمشێوەیە دەبێت عێراق قەبوڵی هەموو مەرجەکانی کۆمکاری میللەتان بکات، حکومەتی عێراق لە ١٩٣٢/٥/٣٠ رایگەیاند رێز لە بەڵگەکانی کۆمکاری میللەتان دەگرێت، بەمشێوەیە عێراق رێز لە مافی کولتوری و ئیداری کەمە نەتەوەکان دەگرێت و لە کەرکوک و سلێمانی و هەولێر هەمان ماف بە کورد دەناسێت. ئەو مافانەی لەسەرەوە باسکراوە تاکو ئیستاش لە چوارچێوەی قانونی نێودەوڵەتی بە فەرمی دەناسرێت، دوای هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوی کۆمکاری میللەتان ئەم دەسەڵات و پاراستنی مافانە لە بەرواری ١٨ی نیسانی ١٩٤٥ بە گوێرەی مادەی ١٦ کەوتە ژێر دەسەڵاتی نەتەوە یەککرتووەکانەوە واتا (یوئێن)، بەگوێرەی ئەم بەڵگەیە هەروەکو چۆن عێراق ناتوانێت بە شێوەیەکی سەربەخۆیانە ئەو بڕیارانە بگۆڕێت کە پێشوتر باسکراون هەروەها ناشتوانێت ئەو کەس و لایەنانە بە پۆزسیۆن دابنێت کە داوای ئەو مافانە دەکات، تەنها مافی بڕیاری زۆرینەی کۆمکاری ناوبراو و هەڵسەنگانی دیوانی دادی نیونەتەوەییە کە دەتوانن ئەو مادە و بڕیارانە دووبارە هەڵسەنگێننەوە، بەمشێوەیە ریزگرتن لە سەروەری و یەکپارچەیی عێراق و سەربەخۆییان بەسترابوو بە رێزگرتنی ئەو بەڵگە و مادانەی کە ناویان هاتبوو، بەڵام حکومەتی عێراق بەشێوەیەکی ئاشکرا پەیمانەکانی پێشێل کرد، لەلایەن کۆنسەی ئاسایشی (یوئێن) لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ بە بڕیاری ٦٨٨ و کۆمیتەی (مافی مرۆڤ)ی (کۆنسەی ئابوری و رامیاری) گرێدراو بە (یوئێن) لە بەرواری ١٩٩٢/٣/٥ وە بە بڕیاری ٧١ی ساڵی ١٩٩٢ هەموو پێشێلکارییەکانی دەوڵەتی عێراقیان دەست نیشانکرد، مێژووی کورد لە عێراقدا پڕە لە مەینەتی و شۆڕش، حکومەتی عەبدولکەریم قاسم وازی لە پەیمانەکان هێنا و ئەو دەستورە

مۆقەتەی لە شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ دا پێکیان هێنا، مادەی ٣ دەستور کە باس لە یەکسانی کورد و عەرەب دەکات دوای ماوەیەک ئەم مادەیە لە قانون دەرکرا، کورد بە رابەرایەتی (مەلا مستەفا) لە ١١ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ جارێکی تر دەستیان دایەوە چەک، ئەم شۆڕشە نەتەوەییە خواستی مەشروعی گەلی کوردی پێش خستبوو، بە رێککەوتنی ١٩٧٠/٣/١١ مافی ئۆتۆنۆمی درا بە گەلی کورد وە ئەمە بەشێوەیەکی کاتی خرایەناو دەستورەوە، بەڵام حکومەت لەگەڵ ئەم رێککەوتنەش نەگونجا، لە ئەنجامی فرۆشتنی بەشێکی زۆرکەمی ئاوی عێراق لەلایەن سەدام حوسێنەوە بە وەڵاتی ئێران لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ کپکردنەوەی شۆڕشی کورد لە دوای واژۆکردنی رێککەوتنی جەزائیر شۆڕشی کورد بە شێوەیەکی کاتی هەرەسی هێناو پاشان جارێکی تر بەردەوامییان دابە خەباتی خۆیان و گەلی کورد بۆ جیهانی سەلماند هەرگیز دەست لەمافی رەوای خۆی هەڵناگرێت.

لە قانونی (یوئێن) روونکراوەتەوە مرۆڤ لە مافی بنەڕەتی گەورە و بچوکی خۆی نابێت بێبەش بکرێت، بەبێ هیچ جیاوازییەک هەموو میللەتێک خاوەن مافی خۆیەتی، لەلایەکی تریشەوە لە بەشێکی ژمارە ١ لە خاڵی ٦ دا باس لەوە دەکات رێز لە پەیوەندییە یەکسان و بنگەییەکانی نێوان نەتەوەکان و یەکسانی خەڵک دەگیردرێت هەروەها هەموو گەلێک خاوەن ئەو مافەیە کە دەتوانێت مافی بوونی خۆی بسەلمێنێت، لە ساڵی ١٩٦٦ بڕیارێک درابوو دەڵێت هەموو گەلێک چارەنوسی خۆی دیاری دەکات و خاوەن مافی سەربەخۆی سیاسی خۆیەتی، ئەم بڕیارە لەلایەن لیژنەی گشتی (یوئێن) و هەروەها لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٧١ یش لەلایەن عێراقەوە قەبوڵکرا.

لە ساڵی ١٩٢١ لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە تاکو ئێستا ئەو هەڵوێستانەی حکومەتە جۆربەجۆرەکان بەرامبەر بە کورد نیشانیان داوە پێکدێت لە زۆرلێکردن و سەرکوتکردن و داپڵۆسین، هەروەها لە بچوکترین مافی مرۆڤایەتی کە کلتور و ئابورییە بێبەشیان کردوون، حکومەتەکانی عێراق تەنها وەک مرۆڤ زوڵم و زۆرییان لە کورد نەکردووە بەڵکو ئاژەڵ و کشتوکاڵیان لەناوداوە و ژینگەی وڵاتەکەشیان وێران کردووە، حکومەتی عێراق بە شێوەیەک کەلە مێژووی مرۆڤایەتیدا نەبینراوە بەرامبەر بە کورد هەموو شێوە دڕندەییەکیان بەکار هێناوە.

١/ ڕەوشی زیاد لە ٨ هەزار بارزانی کەلە ساڵی ١٩٨٣ دەستگیر کراون و تاکو ئێستاش هیچ ئاسەوارێکیان نییە.
٢/ لە نێوان ساڵی١٩٧٠ تاکو ١٩٨٨، ٣٠٠ هەزار کوردی فەیلی لە عێراق دەرکران و ٧٥٠٠ کەسیان دەستبەسەر کران و لەناو دران.
٣/ لە ساڵی ١٩٨٨، ٥٠٠٠ هەزار گەنج و منداڵ و پەککەوتە لە شاری هەڵەبجە بە چەکی کیمیایی شەهید کران و لە بالیسان و ناوچەکانی تری کوردستان کۆمەڵکوژی تریان ئەنجامدا.
٤/ ئۆپەراسیۆنی ئەنفال بەشێوەیەکی دڕندانە و بێ بەزەییانە وبەبێ هیچ هۆکارێک کوردیان کۆمەڵکوژ کردوو لە ئاکامدا ١٨٢٠٠٠ هەزار کوردیان زیندەبەچاڵ کرد.
٥/ ڕوخانی زیاد لە ٤٠٠٠ هەزار گوند (ئەم گوندانە پێکهاتبوون لە ٪٩٠ ی گوندی باشوری کوردستان) هەوڵی لەناودانی کەمە نەتەوەییەکانی تری عێراق وەک ئاشوری و تورکمان.
دەوڵەتی عێراق بەدەر لە توانا و هێز و ووزە بەرامبەر بە کورد پەلامارییان ئەنجامدا کە مخابن بەگوێرەی قانونی نێو دەوڵەتی بوایە دەبوایە لایەنێک بهاتایەتە جواب بەڵام کەس نقی لێوەنەهات، دەرەنجام لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ ڕەوی مەزن ڕوویدا و لە تەلەفزیۆنەکانی جیهان شوێنێکی فراوانی گرتەوە و ئیتر نەیانتوانی ئەو ڕاستییانە لە گەلانی جیهان بشارنەوە کە کورد زوڵمی لێدەکرێت، بەمشێوەیە لە دوای ڕێککەوتنی سیڤەرەوە دونیا یەکەمجارە دووەمین ووشەی عەدالەتی هێنایە زمان و کۆنسەی ئاسایش بڕیاری ژمارە ٦٨٨ یان هێنایە ناو باسانەوە، بەگوێرەی ئەم بڕیارە ڕێگا لە زوڵموزۆری سەر کوردان دەگیردرێت و لە کوردستانی عێراق هەرێمی پاراستنی ئاسایش پێکدەهێنرێت، میللەتی کورد سەرەڕای هەموو زوڵموزۆری وماڵوێرانی و سەرکوتکردن و مەترسی لەناودانیشیان بەڵام هەمیشە هەوڵیانداوە بۆ ئاشتی، بۆ نمونە لە نێوان شۆڕشی کورد و حکومەتەکان لە ٢٩ حوزەیرانی ١٩٦٦ و هەروەها لە ساڵی ١٩٨٤ دیدار هاتنەئاراوە، کەچی سەرەڕای ئەم نییەت باشییەش ڕوبەڕوی تۆپ و تەیارە و خیانەت بوونەوە.
بەنەگونجاندنی دەوڵەتی عێراق بە هیچ ڕێگا چارەیی و ڕێککەوتنێک هەروەها ئەنجام وەرنەگرتن لە دیدارەکانی ساڵی ١٩٩١ و کشانەوەی دامودەزگاکانی دەوڵەت لە باشوری کوردستان و بەکارهێنانی ئابڵوقە بەسەریاندا هەموو ئەمانە بوون بە هۆکار تاکو بەرەی کوردستانی بەرەو هەڵبژاردن هەنگاو بنێت، گەلی باشور لەو کەشوهەوا ئازادەی بەدەستیان

هێنابوو لە بەرواری ١٩ی ئاداری ساڵی ١٩٩٢ لە خاکی ئازادی باشوری کوردستان پەرلەمانتارانی خۆیان هەڵبژارد و لە رۆژی ٥ی تەموزی ساڵی ١٩٩٢ هەرێمی کوردستان یەکەم حکومەتی خۆیان بەدەنگدانێکی گشتی پێکهێنا، لە قانونی پەرلەمانی کوردستانی عێراق بە پشتبەستن بە مادەی ١٠ی ساڵی ١٩٩١ خاڵی ٥٨ ئەرکی ئەنجومەنی وەزیران چارەسەرکردنی کێشەی بوژانەوەی خەڵکی کوردستانی عێراق لە ئەستۆ دەگرێت هەروەها یەکرێزی نەتەوەیی عێراق و پاراستنی مێژوویی برایەتی نێوان کورد و عەرەب بە بنەما دەگرن و گونجاندن بەو بڕیارانەی کەلە کۆبونەوەی پارتەکانی عێراقی کەلە ڤییەننا و کوردستانی عێراق بەسترابوون، پەیوەست دەبن بەو بڕیارانەی کە پاراستنی بەرژەوەندییەکانی هاوبەشی گەلی کورد و عەرەب لەخۆدەگرێت هەروەها کورد مافی نەتەوەیی خۆی دیاری دەکات و رێز لە مافی نەتەوەیی و کولتوری و ئیداری ئاشوری و تورکمان دەگرێت و ئەم بڕیارەش لە دەستوردا جێگیردەکرێت، بەمشێوەیە ئەنجومەنی نەتەوەیی کوردستان بڕیارێکی نوێی دەردەکرد، هێنایانە زمان پابەند دەبن بەو بڕیارانەی کە مافی تاک بەرجەستە دەکات کەلەلایەن رێکخراوە نێونەتەوەییەوە دەرکراون، لەم رەوشە مێژوویەدا ئەم هەڵبژاردنە ئازادی و ماف و یەکسانی تاک بەرجەستە دەکات، باوەڕبوون بە سیستەمی پەرلەمانی دیموکرات و فرە حزبایەتی، کەلەلایەن رێکخراوە نێونەتەوەییەکانەوە داڕێژراوە هەروەها بڕیار لەسەر فیدرالی یەکگرتوو درا لەسەر بناغەی رێزگرتن لەمافی مرۆڤ [88].

ئەوکاتەی ئەم بڕیارە راگەهێنرا هەموو ئامادەبوان هەستانە سەرپێ و کەوتنە چەپڵە لێدان و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، ئەم بڕیارە لە (واشنتۆن)ەوە بە هەموو جیهان راگەهێنرا، راگەیاندنی ئەم بڕیارەی پەرلەمانی باشور لە واشنتۆنەوە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی ئەوکاتە سەرکردەکانی باشور لە واشنتۆن بوون، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند ئەم بڕیارە لەلایەن ئەمەریکاوە بە گرنگ هەژمارکراوە، سەبارەت بە ترازووی گۆڕانکاریەکانی رۆژهەڵاتی ناوینەوە ئەم بڕیاری فیدراسیۆنە بە گۆڕانکارییەکی گرنگ دەژمێردرا، ئەوەی راستی بێت (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) ئەو سەردەمە پێیان باشبوو ئەم راگەیاندنە لەئاستی خوارووی خۆیانەوە بکرێت، نوێنەری (یەنەکە) لە ئەمەریکا (بەرهەم ساڵح) دەیوت

---

[88] ١و١٥ تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( میدیا گونەشی )

**(سەرکردەکانمان ئاواتخوازی مافی چارەی خۆنوسین بوون بەڵام ئەمڕۆ راگەیاندنی بڕیاری فیدراسیۆن بەراستی زۆر گرنگە، هەروەها ئەم حکومەت و فیدراسیۆنە جگە لە هەولێر و سلێمانی کەرکوکیش دەگرێتەوە، سیستەمی فیدرالی هەموو کارەکان دەخاتە ژێر کۆنترۆلی خۆیەوە و بەگوێرەی دەستوری خۆی حکومەت بەڕێوە دەبات و هیواداریین هەرێمەکانی تری عێراقیش سیستەمی فیدراسیۆن بۆخۆیان بکەن بە بنەما و وەک ئەمەریکا سیستەمی فیدراسیۆن بکەنە سیستەمی دەوڵەتی عێراق)**، بەگویرەی بۆچونەکانی بەرهەم سالح ئەم سیستەمە تەنها لە عێراقێکی ئازادی دوای نەمانی سەدام بەدیدێت و هەروەها بەرهەم سالح باسی لەوە دەکرد ئەم فیدراسیۆنە مافی سیاسی و کولتوری تورکمان و ئاشورییەکانیش دەستەبەر دەکات[٨٩].

هەردوو سەرکردەکانی باشور (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) لە ئەمەریکاوە پەیامی پیرۆزباییان نارد بۆ پەرلەمانی باشور و دەیانوت (**بەمشێوەیە ئامانجی سەرەکی و هاوبەشی گەلی کورد هاتەدی)**، پەیامەکەی هەردوو سەرکردەکەی باشور بەمشێوەیە بوو (**راگەیاندنی فیدراسیۆن لە گەلی کورد پیرۆز بێت و بە خێر و بەخۆشی بێت، ئەم بڕیارە مێژووییە لەجێی خۆیەتی، ئەم بڕیارە ئومێد و ئاواتی هەموو گەلی کوردە، هەروەها ئەم دەستکەوتە لە سایەی خوێنی شەهیدان و لەسایەی یەکریزی و تەبایی و لە دۆخێکی ناهەمواردا دراوە، بەناوی سەرکردایەتی یەنەکە و پەدەکە وە بەهەموو توانامانەوە کاردەکەین بۆ ئیدامە پێدانی بە ژیانکردنی ئەم فیدراسیۆنە و هەروەها دەمانەویت ئەم رۆژە پیرۆز و مێژووی و مەزنە بکەین بە جەژن)**[٩٠].

چوارگۆشەکانی موقاعەتەکان پەیتا.. پەیتا رەش دەکرانەوە، ئەو وەلاتانەی بەرژەوەندییان هەبوو لە هەرێمەکە بەسەر هەمووشیانەوە تورکیا لەهەمبەر ئەم بێدەنگی و نارەزایی نیشاندانەیان بۆ ئەم حکومەتە داوای کەلەسەری (پەکەکە)یان دەکرد، یاخود (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) پێیان وابوو ئەگەر هێرش بکەنە سەر (پەکەکە) ئەوە بەرامبەر بە راگەیاندنی فیدراسیۆن کەس روبەڕویان نابێتەوە، (ئەحمەد سەعدی پیرە) کە جێگیری سەرۆک وەزیران بوو دەیوت (**لەبارەی راگەیاندنی فیدراسیۆن ژمارەیەکی زۆری**

---

[٨٩] ٦ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی)

[٩٠] ٦ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ).

**پەرلەمانتارانمان بێ ئاگابوون)**، بەمشێوەیە ئەحمەد سەعدی پیرە ناكۆكی نێوان بڕیاری هێرشی سەر (پەكەكە) و ڕاگەیاندنی فیدراسیۆنەكەی دەخستە ڕوو. بەهۆی ئەم ڕاگەیاندنی فیدراسیۆنەوە پەرلەمان ئەو ڕۆژەی كرد بە جەژن، تەلەفزیۆنەكان بەردەوام پیرۆزباییان ڕادەگەیاند و باسیان لە مێژووی خەباتی كوردیان دەكرد، بڕیاربوو لە ۲۳ی مانگی تشرینی دووەمدا لە باشور كۆنفرانسێك ببەسترێت و ئامانج ئەوەبوو تاوتوێی بڕیاری فیدراسیۆن بكەن و لەبارەی ئەو حكومەتەی لەدوای نەمانی سەدام پێكدەهێنرێت ئایا دەبێت پەیوەندییان لەگەڵیاندا چۆن بێت، لەمبارەیەوە جارێكی تر ئەحمەد سەعدی پیرە دەیوت **(دەبێت هەموو جیهان ئەم بڕیارەمان قەبوڵ بكات، ئەمە خەڵات نییە كە بە ئێمە بەخشرابێت، ئێمە ئەمەمان بە خەبات بەدەست خستووە)**، سەبارەت بە هەڵوێستی توركیا ئەحمەد سەعدی پیرە دەیوت **(توركیا پێی وتوین ئەگەر ڕێز لە سەروەری خاكی عێراق بگیردرێت و پارچە بوون نەیەتە ئاراوە و عێراق دابەشنەكرێت ئەوا ئێوە سەبارەت بە شێوازی فۆرمێكی سیاسی چیتان دەوێت ئازادن)** ،ئەحمەد سەعدی پیرە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ دانی بەوەدا هێنا كە بەشێكی زۆری پەرلەمانتاران ئاگەداری ڕاگەیاندنی فیدراسیۆن نەبوونە، ئەوەشی ئاشكرا دەكرد ئەم بڕیاری فیدراسیۆنە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ دوای ڕەزامەندی توركیا دراوە، هەروەها ئاواتی ئەوەشی دەخواست ئەم مۆدێلە ببێتە مۆدێلی سیستەمی هەموو پارچەكانی تر، هەروەها دەیوت **(پەیوەندیمان لەگەڵ توركیا و وەڵاتانی تر پەیوەندییەكی باش دەبێت و مافی كەمە نەتەوەكانی ژێر دەسەڵاتیشمان دەپارێزین)**.

لەگەڵ بەردەوام بوونی شەڕدا دەنگی ناڕازیش زیادیان كرد، نوسەر (حەمە سەعید حەسەن) نوسەری گۆڤاری (خەرمانە) كە لە سوید دەردەچوو سەرزەنشتی حكومەتی باشوری دەكرد كە پەلاماری (پەكەكە)یان داوە و دەیوت **(حكومەتێك كە ناتوانێت چارەیەك بۆ عەرەبانە و فرۆشیارەكانی ناو شاری هەولێر بدۆزێتەوە كەچی بەرامبەر بە دەركردنی بڕیاری شەڕكردنی دژ بە پەكەكە هیچ نارەحەتییەكی نەچێژا)** .

## له پێکدادانه‌کاندا پێشمه‌رگه‌ی عه‌شیره‌ته‌کان

له ٢و ٣ مانگی تشرینی یه‌که‌م له (خواکورک و هه‌فتانین) هێرشه‌کان به‌رده‌وام بوون، دوای ئه‌وه‌ی ٤ی هه‌مان مانگ حکومه‌تی هه‌رێمی باشوری راگه‌هێنرا هێرشه‌کانیش زیاتر چڕکرانه‌وه، له‌هه‌مان کاتیشدا پێشمه‌رگه‌کانی (په‌ده‌که) له ده‌وروبه‌ری (زاخۆ و باتوفه) هێرشیان کرده‌سه‌ر گه‌ریلاکانی (په‌که‌که)، هه‌روه‌ها له ٥ی هه‌مان مانگیشدا پێشمه‌رگه‌کانی (یه‌نه‌که) له (لۆلان) هێرشێکی تازه‌یان کرده‌سه‌ر که‌مپه‌کانی (په‌که‌که)، سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی پێشمه‌رگه‌کانی (یه‌نه‌که) له‌م هێرشانه‌دا چه‌کی قورسیشیان به‌کار هێنابوو به‌لام له‌لایه‌ن گه‌ریلاکانی (په‌که‌که)وه زیانیان پێگه‌یشت. ئه‌وه‌ی مایه‌ی سه‌رنج بوو (یه‌نه‌که) ئه‌م هێرشانه‌ی به پێشمه‌رگه دێرینه‌کانی خۆی ئه‌نجام دابوو، پێشمه‌رگه‌کان برینداره‌کانی خۆیانیان ده‌گوازته‌وه بۆ نه‌خۆشخانه‌کانی (هه‌ولێر، سلاحه‌دین و شه‌قلاوه)، به‌لام له‌به‌رئه‌وه‌ی رۆژنامه‌وانه‌کان نه‌یانده‌توانی بچنه به‌ره‌ی شه‌ڕه‌که‌وه و خۆیان بگه‌هێننه لای گه‌ریلاکان هه‌ربۆیه له‌باره‌ی زیانی گه‌ریلاوه زانیاری به‌ده‌ست نه‌ده‌خرا.

له‌کاتی ده‌ستپێکردنی شه‌ره‌کاندا له‌ناو ریزه‌کانی پێشمه‌رگه‌ی (یه‌نه‌که و په‌ده‌که) گرژی هاتبووه ئاراوه، ده‌نگۆی ئه‌وه هاتبووه ئاراوه پێشمه‌رگه‌یه‌کی زۆر خوازیاری به‌شداریکردنی ئه‌م شه‌ڕه نین و تیاشیاندا هه‌یه چونه‌ته ناو ریزه‌کانی گه‌ریلاوه، له ٥ی مانگی تشرینی یه‌که‌م له نزیک (خواکورک) فه‌رمانده‌یه‌کی (په‌ده‌که) به‌ناوی (موقه‌ده‌م عه‌زیز) به‌خۆی ١٠ پێشمه‌رگه‌یه‌وه چوونه ناو ریزه‌کانی گه‌ریلاوه، هه‌روه‌ها له (هه‌فتانین)یش ده‌سته‌یه‌ک پێشمه‌رگه‌ی (په‌ده‌که) به فه‌رمانداریێتی (محه‌مه‌د سمۆ) رایانگه‌یاند که نایانه‌وێت شه‌ڕی (په‌که‌که) بکه‌ن، هه‌ربۆیه سه‌رکردایه‌تی (یه‌نه‌که و په‌ده‌که) بۆ ئه‌م شه‌ڕه زیاتر ئه‌و

پێشمەرگانەیان دەنارد کە خەڵکی گوند و شارۆچکە و سەربە عەشیرەتەکان بوون، زۆربەی ئەم پێشمەرگانەش خزمی یەکتر بوون، هەربۆیە لەکاتی شەڕکردندا بەهۆی خزمایەتییەوە یەکترییان باش دەپاراست و لەکاتی هاتنەئاراوەی کوژراویشیاندا هەوڵیاندەدا تۆڵەی ئەم خوێن ڕشتنە بکەنەوە هەربۆیە لەهەمبەر گەریلادا شەڕێکی باشیان دەکرد. هۆکارێکی تری گرنگی ناردنی ئەم جۆرە پێشمەرگانە بۆ بەرەی شەڕ نەفامی و نەخوێندەوارییان بوو، خەڵکی شار بە بەراورد بە خەڵکی لادێ و کەسانی نەفام خوێندوارتربوون هەربۆیە لە بەرەی شەڕەکاندا پرسیارێکی زۆریان ڕوبەڕوی فەرماندە و بەرپرسیارەکان دەکردەوە، فەرماندە و بەرپرسیارەکانیش نەیاندەتوانی بە ئاسانی قەناعەتیان پێبکەن هەربۆیە ئەوجۆرە پێشمەرگانە باوەڕیان بە بیانووەکانیان نەدەکرد، سوودێکی تری بەشدارییپێکردنی پێشمەرگەی نەخوێندەوار و عەشیرەتەکان ئەوەبوو هەواڵ و دەرەنجامی شەڕەکانیان لەناو خەڵکیدا بەباشی بڵاونەدەکردەوە، ئەمەش خواستی هەرە گەورەی دەسەڵاتی باشور بوو.
لەگەڵ چڕبونەوەی شەڕوپێکدادانەکان لە شار و شارۆچکەکانیش دەستکرا بە پەلاماردانی لایەنگرانی (پەکەکە)، لە ٥ی تشرینی یەکەم پێشمەرگەکانی (بەرەی کوردستانی) هێرشیان کردەسەر لایەنگرانی (پاک) و لە ئەنجامدا ٤ کەسیان کوشت و خەڵکێکی زۆری تریان دەستبەسەر کرد.
ئەو کاتەی شەڕوپێکدادانەکان درێژەیان خایاند لە شارەکانی وەک (هەولێر، سلێمانی و دهۆک) بۆپاراستنی زیاتر بارەگا حزبییەکان خرانە ژێر چاودێرییەکی باشترەوە و پێشمەرگەیەکی زۆر دەیانپاراستن، ئەوان ترسی ئەوەیان هەبوو (پەکەکە) لە هەرێمەکە لایەنگرێکی زۆری بۆخۆی بەدەست خستووە، (یەنەکە و پەدەکە) ترسی ئەوەیان هەبوو کە لایەنگرانی (پەکەکە) خۆپیشاندان بکەن و ڕەوشەکە بشلەژێت هەربۆیە بۆ پاراستنی ڕەوشەکە ئەوەی لەدەستیان بهاتایە دەیانکرد. لەکاتی شەڕوپێکدادانەکاندا (پەدەکە) لەهەمبەر ئەو باکورییانەی کە ناسنامەی (جزرە و نوسەیبین و شرناخ و سلۆپی)یان هەبوو لە باشور بوون ڕەشبگیرییان دەستپێکرد، بەگوێرەی زانیارییەکان نزیکەی (١٠٠) کەسێکیان دەستگیر کرد، دوای لێکۆڵینەوە هەندێکیان بە کەفالەت و هەندێکیشیان لەهەمبەر (٢٥٠٠) دینار ئازاد کران، لەهەمانکاتیشدا چوون و هاتن بۆ شاری (زاخۆ) قەدەغە کرا، ئەو لۆرییە بارهەڵگرانەیشی دەهاتنە باشورەوە بەبێ ئەوەی بهێڵن بەناو (زاخۆ)دا تێپەڕێت لەڕێی

(موسڵ)ەوە بەڕێیان دەکردن، هەروەها لەهەمانکاتیشدا لە پەرلەمان کۆبونەوەکان بەردەوام بوون بەڵام لەبارەی شەڕەکەوە هیچ لێدوانێکیان نەدەدا، لە هەمان کاتوساتدا سەرۆکی (یەنەکە) (جەلال تاڵەبانی) گەڕایەوە باشور و کۆبونەوەی بە سەرکردایەتی رێکخراوەکەی خۆی کرد.

## بە منداڵان تەرمی گەریلا بەردباران دەکەن

شەوی ٥ی تشرینی یەکەم لە شاری (زاخۆ) لە ئەنجامی پەلامارییەکدا بۆسەر ماڵێک دوو گەریلای (پەکەکە) بە دیل گیران و پاشان گوولەبارانیان کردن، تەرمەکانیشیان لە قەراغی شار فڕێدا و دوایش منداڵانیان هاندا تەرمەکان بەردباران بکەن و ئەوانیش بەردبارانیان کردن، ئەمە نیشانەی قین و نەفرەتێکی زۆر مەزن و گەورەبوو کە سەرکردایەتی (پەدەکە) بەرامبەر بە کوردی باکور نواندی کە بەدرێژایی تەمەنی خۆی بەرامبەر بە ڕژێمی عێراق نیشانی نەدابوو. یەکێک لە گەریلا کوژراوەکان ناوی (یڵماز) بوو خەڵکی شارۆچکەی (جزرە) بوو، لە تۆڵەی ئەم کارەش گەریلاکانی (پەکەکە) لەناو شارۆچکەی (زاخۆ) فەرماندەیەکی (پەدەکە)یان کوشت. شەڕوپێکدادانەکان تادەهات پەرەیان دەسەند و فراوان دەبووەوە، ڕێگاوبانەکانی (قەسرۆک، مێرگەسۆر، هەفتانین، باتوفە و کانی ماسی) کە بەرەو سنورەکان دەچوون لەلایەن گەریلاکانی (پەکەکە) گیردران، فەرماندەیەکی (پەدەکە) بە ناوی (شڤان سندی) کەلە ٦ی تشرینی یەکەم فەرماندارێتی هێرشەکانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ی کردبوو کەوتە بۆسەی گەریلاکانەوە و ٧ پێشمەرگەی کوژرا، هەروەها لە نزیک (باتوفە) گروپێکی تری پێشمەرگەی (پەدەکە) دەکەونە ناو چەمبەری گەریلاکانەوە و لە ئاکامدا چەند پێشمەرگەیەکیان بەدیل گرتبوو، ڕاگەیاندنەکانی پارتەکانی دەسەڵات بەردەوام بانگەوازی پێویستی خوێنیان دەکرد و لە هەمانکاتیشدا نەیاندەهێشت خەڵکی سڤیل بچنە نەخۆشخانەکانەوە و دەیانویست ڕاستییەکان لە خەڵکی بشارنەوە.

## لەفسەرە تورکەکانی ناو ریزەکانی پێشمەرگە

پەیامنێری ئاژانسی (ئەی ئێف پی) کە چاودێری گۆڕەپانی شەڕەکانی باشوری کوردستانی دەکرد ئەوکاتەی سەرانی دەسەلاتی باشور نکۆڵی ئەوەیان دەکرد ئەفسەری تورک بەشدارییان لە شەڕەکان کردبێت بەلام ئاژانسی ناوبراو لە ٧ی تشرینی یەکەم هەواڵێکی بلاوکردەوە لە شەڕەکانی (برادۆست) بەلای کەمەوە ٢ ئەفسەری تورک بەشدارییان کردووە و ئۆپەراسیۆنەکانیان بەڕێوە بردووە، لەهەمانکاتدا سەرچاوەکانی (پەکەکە) دەیانوت لە (بادینان) ٢ ئەفسەری تورک بەشداری شەڕەکانیان کردووە و ٢ ئەفسەری تریشیان بریندار بووە، ئەم دوو هەواڵەش لەماوەیەکی زۆرکەمدا بە هەموولایەکدا بلاوبووەوە.
سوپا سالاری تورک (دۆغان گورێش) لە دیمانەیەکیدا ئەم ئیدیعایانەی پشتراست دەکردەوە، لە لێدوانێکی (دۆغان گورێش) بۆ ئاژانسی (رۆیتێرس) کەلە ٧ی تشرینی یەکەم کردبووی دەیوت (**ئەگەر هێزە کوردییەکانی باکوری عێراق دژ بە پەکەکە داوای هاوکاریمان لێبکەن بۆچی هاوکارییان نەکەین، لەکۆتایی ساڵدا فڕۆکەکانمان شوێنی پەکەکە دەدۆزنەوە و لێیان دەدەن**)، هەروەها وەزیری بەرگری تورکیا (نەوزاد ئەیاز) دەیوت (**هەموو پشتیوانییەکی ئەو پێشمەرگانە دەکەین کە دژ بە پەکەکە دەجەنگن**) [91]، لەهەمانکاتدا ئەندامی سەرکردایەتی (یەنەکە) (فوئاد مەعسوم) ئەم ئیدیعایانەی دەسەلماند و دەیوت (**من نازانم ئایا لە هەرێمەکەماندا ئەفسەری سوپای تورک هەیە یاننا، بەلام ئەگەر دەوڵەتی تورک بیانەوێت چاودێری شەڕەکان بکەن لەحاڵەتی ناردنی ئەفسەرەکانیان بۆ هەرێمەکە هیچ ئیعتیرازێکمان نابێت**)[92] ، هەروەها سەرۆکی گشتی (پەکەکە) ش (عەبدوللە ئۆجالان) دەیوت (**ئەفسەرە**

[91] ٩ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[92] ٨ی هەمان سەرچاوە

**تورکەکان نەک تەنها چاودێری شەڕوپێکدادانەکان ئەکەن بەڵکو ئۆپەراسیۆنی پێشمەرگەکانیش دەبەنبەڕێوە)** [٩٣]، دەسەڵاتی باشور ئەم ڕاستییانانەیان لە خەڵکی دەشاردەوە و گوێی خۆیان لەئاستی ئەم ئیدیعایانەدا گرتبوو، بەڵام دوای کۆتایی شەڕوپێکدادانەکان خەڵکی بۆیان دەرکەوت ئەفسەری تورک شەڕەکانیان بردووە بەڕێوە بەڵام مەخابن کوژراوی هەردوو بەرەی شەڕەکە کورد بوون بەڵام بەرەیەکیان لەلایەن ئەفسەری تورکەوە فەرمانداریتی کرابوو.

---

[٩٣] ١٠ای هەمان سەرچاوە .

## هێرشی (پەکەکە)

لە رۆژانی ٥و٦ی مانگی تشرینی یەکەم، دوای ئەوەی هێرشەکانی پێشمەرگە بۆسەر گەریلاکانی (پەکەکە) لە (خواکورک، زاپ، شەبەرگێ و هەفتانین) چڕبوونەوە گەریلاکانیش لە (باتوفە) هێرشێکیان کردەسەر بارەگایەکی (پەدەکە)، لە ئاکامی ئەم هێرشەدا ٣٠ پێشمەرگەی (پەدەکە) کوژران. لەدوای ئەم هێرشە راگەیاندنەکانی باشور بەردەوام بانگەوازییان بۆ خەڵکی دەکرد خوێن ببەخشن و نەخۆشخانەکانیان لەهەمبەر خزمەتگوزاری سڤیلدا داخست، لەدوای ئەم هێرشە (پەدەکە) لەسەر رێگاوبانەکان بنکەیەکی زۆری پێشمەرگەی خۆیان چۆڵکرد، دوای ئەم هێرشە کە گەریلاکان سەرکەوتنیان بەدەست خستبوو پەرەیان بە هێرشەکانیاندا، لەهەمبەر دەرەنجامی هێرشەکەی (باتوفە) فەرماندە و بەرپرسیارانی (پەدەکە) دەیانوت گوایە ٤ پێشمەرگە کوژراون و ١٢ تریشیان بریندارە هەروەها دەیانوت لەماوەیەکی کورتدا شەڕوپێکدادانەکان کۆتاییان پێدێت [٩٤]، لەهەمبەر ئەم گۆڕانکارییەدا و لە هەمان رۆژدا پێشمەرگەکانی (یەنەکە) و پێشمەرگەکانی عەشیرەتی (برادۆست) بە هەزارەها پێشمەرگە لە (خواکورک) هێرشیان کردەسەر کەمپەکانی گەریلاکانی (پەکەکە)، هێزەکانی پێشمەرگە و گەریلا کەوتبوونە ئەمبەر و ئەوبەری دۆڵێکەوە، گەریلاکان بەرەکەی خۆیان ناونابوو (زێی ئازادی)، ئەم شوێنەش سێ سوچکەی سنورەکانی ئێران و تورکیا و عێراق بوو، ژمارەی گەریلاکانی ئێرە نزیکەی (٦٠٠) گەریلایەک دەبوون، بەشێک لەم گەریلایانەی ئێرە بەرەو سنورەکانی سلێمانی پاشەکشێیان کرد و خۆیان لە سنوری ئێران جێگیرکرد و بەشەکانی تریشیان هەرلە (خواکورک) هێشتەوە تاکو لە حاڵەتی هەر هێرشێکی پیادەیی سوپای تورک بەرگری لە خۆیان بکەن.

---

[٩٤] ٨ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ).

هاوکات شەڕوپێکدادانەکان بە هەموو سەختی خۆیانەوە بەردەوام بوون، سوپای تورک بە فڕۆکە جەنگییەکانی خۆیان بۆردۆمانی شوێنەکانی گەریلایان دەکرد و دەیانویست کارئاسانی بۆ پێشڕەوی هێزی پێشمەرگە بکەن. لە ٥و٦ی مانگی تشرینی یەکەم فڕۆکە و کۆپتەرەکانی سوپای تورک زۆر بە سەختی ناوچەکانی (هەفتانین، سینات و باتوفە)یان بۆردۆمان کرد، دوکەڵی ئەم بۆردۆمانانە لە ناوچەکانی (ئولودەرە و سلۆپی)یەوە دەبینران. فڕۆکەکان لە شارەکانی وەک (دیاربەکر، موش و مەلاتیا)وە هەڵدەفڕین، لەکاتی ئەم بۆردۆمانانەدا چەند گروپێکی جەندرمەی تورک چوونە باشوری کوردستانەوە، جەندرمەکانی ناوچەکانی (چوکورجە و ئوزوندەرە)ش لە چاوەڕوانی فەرمانی بەزینی سنور بوون و فڕینی فڕۆکەی کەشفی سوپای تورکیش لە هەرێمەکاندا زیادیان کردبوو. بەهۆی هاتنەئاراوەی گرژییەکانی یەکەم هەفتەی شەڕوپێکدادانەکانەوە حکومەتی هەرێم جگە لەکەسانی مۆڵەتپێدراوی وەک کارمەندانی تورک و رۆژنامەوانانی تایبەت قەدەغەی هاتوچۆی سنوریان راگەیاند. هیچ کارمەندێکی حکومی وەڵامی پرسیارەکانیان نەدەدایەوە جگە لە کارمەندانی گومرک نەبێت، ئەوانیش دەیانوت بۆیە سنورداخراوە ترسی ئەوە هەیە کە لەوانەیە شۆفێری لۆرییەکان هەواڵی ناراست و نا دروست بڵاوبکەنەوە، هەرچەندە لەوانەبوو هەواڵ بە نادروست بڵاوبکرایەتەوە بەڵام رۆژنامەوانەکان هەموو شتێکیان بە راست و دروست بڵاودەکردەوە.

## جارێکی تر ئابڵوقەی ئابوری

ئارتەشی رزگاری گەلی کوردستان (ئارگەکە) لە ٦ی تشرینی یەکەم لە ناوچەکانی (سلۆپی و جزرە) بڵاوکراوەیەکیان بڵاوکردەوە، لە بڵاوکراوەکەی ئارگەکەدا (یەنەکە و پەدەکە)یان بە کرێگیراوی دوژمن لە قەڵەم دابوو، لە بڵاوکراوەکەدا نوسرابوو (**جارێکی تر ئابڵوقەی ئابوری رادەگەهێنین و بۆ ئەم مەبەستەش سنورەکانمان داخستەوە و ئەم شەڕەی هەڵگیرساوە لەنێوان بەرەی ئازادی و بەرەی خیانەتدایە، ئەم شەڕە شەڕی لێپرسینەوەی مێژووییە کە پەکەکە رابەرایەتی دەکات، پێویستە روبەڕوی هەموو هێرشە نارەواکانی یەنەکە و پەدەکە ببینەوە کەلەپێناو پارووپەکی چەور لەهەمبەرمان دەستیان پێکردووە)** .

خەڵکی باکوری کوردستان لە چاوەڕوانی بڕیارێکی بەمشێوەیە بوون هەربۆیە شۆفێری لۆرییەکان بە گونجاندن بە بڕیارەکەی (ئارگەکە)وە رێی (ئیبەک)یان چۆڵکرد، پێشوتریش (پەکەکە) لەسەر هاتنەئاراوەی گرژییەکانیان روو لە (پەدەکە) لە مانگی ئاب ئابڵوقەی بەکارهێنابوو کە ماوەی ١ مانگی خایاندبوو.

## کوردستان گۆمی خوێنە

ئەو هەوالانەی رۆژنامەکان لەبارەی شەڕەکانی (دیانە)ی نزیک (خواکورک) لە ٧ی تشرینی یەکەم بڵاویان کردبووەوە بەشێکیان بەمشێوەیە بوون:

**( فەرماندەیەکی یەنەکە سەبارەت بە شەڕەکانی دوێنێ دەیوت ٢٥ پێشمەرگە کوژراون و ٧٠ یش بریندارە. لە شەڕەکانی برادۆست واتا خواکورک بەتایبەتی لە شوێنەکانی وەک دێل، زیراڤە و سەکیوە شەڕەکان چڕبوونەتەوە و شەڕەکانیش شوێنێکی بەرفراوانیان گرتووەتەوە).**

**(گەریلاکانی پەکەکە شوێنە ستراتیژییەکانیان گرتووە، لەسەر گردەکاندا دۆشکە و هاوان و بیکەیسییان دابەستووە، ئەو پێشمەرگانەی هێرش بۆ ئەو شوێنانە دەبەن زیانیان بەردەکەوێت و پاشەکشێ دەکەن، هەتا ئێستا گەریلاکانی پەکەکە لە هیچ سەنگەرێک دەرنەپەڕێنراون و نەکشاونەتەوە).**

**(لایەنەکان هاوەن دەگرنە یەک و شەڕ بەردەوامە، هەربۆیە پێشمەرگە سڵ لە هێرشکردن دەکەنەوە).**

**(فەرماندەیەکی یەنەکە دەڵێت دوو رۆژ لەمەوبەر گەریلایەکی پەکەکە بە دیلی گیراوە و ٩ تەرمی گەریلاشیان دۆزیوەتەوە، سەبارەت بەم گوتنە ئایا راستە یاننا هیچ زانیارییەک بەدەست نەکەوتووە، هەمان فەرماندە دەیوت گەریلاکان بەشێوەیەکی زۆر باش سەنگەریان گرتووە و هێشتا لە شوێنەکانی خۆیان هەڵمانەتەکاندوون، هێرشەکانمان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نییە، ئامار و ئاکام و ئەنجامەکانی هێرش و شەڕەکان دوای چەند رۆژێکی تر رووندەبنەوە، لە ئێرانەوە گەریلایەکی زۆریان هاتوون بە هانای ئەوانەی ئێرەوە هەروەها ئیستیخباراتی دەوڵەتەکانی ئێران و عێراق و سوریا هاریکاری گەریلاکان دەکەن).**

(ئێوارەی ٦ی تشرینی یەکەم هێزی پێشمەرگە لە ناوچەی بێدەڤان سەنگەرێکی گەریلاکانیان گرتووە، بەڵام بۆ سبەی بەیانی گەریلاکان هێرشیان بۆکردووەتەوە و رزگاریان کردووەتەوە، بەچاوی خۆمان بینیمان لە سەر رێگای دیانە بە مینیبوس و ئامبولانس پێشمەرگە بریندارەکانیان گواستووەتەوە، تەنها بۆ نەخۆشخانەی دیانە ١٨ برینداری پێشمەرگەیان هێناوە، یەکێک لەو پێشمەرگانەی برینەکەی سەخت بوو رووداوەکەی بەمشێوەیە دەگێڕایەوە، ئێمە ١٠ پێشمەرگە بووین، لەناوچەی لالکان سەنگەرێکی گەریلامان دەست نیشانکرد، لە شوێنێکی ستراتیژی سەنگەرمان گرت و پاشان هێرشمان بۆکردن، بەڵام لە سەنگەرەکەدا کەسی لێنەبوو، دوای چەند خولەکێک زانیمان چواردەورمان گیراوە، شەڕ لە نێوانمان هاتەئاراوە، دوو برادەرم کوژران، من بریندار بووم، پێشمەرگەکانی تریش هەڵاتن، دوای ئەوەی ماوەی ٢ کاتژمێر رێمکرد گەیشتمەوە لای برادەرەکانم).

(نەخۆشخانەکانی شەقڵاوە، سلاحەدین، هەولێر و کۆیسنجاق پڕن لە پێشمەرگەی بریندار، هەتا ئێستاش لەبەر نەبوونی دەرفەت پێشمەرگەیەکی زۆرتری بریندار لەو گرد و شاخانە ماون، خوێنیان لەو پێشمەرگانە وەرگرت لە بەرەکانی شەڕدان، بڵندگۆی هەموو مزگەوتەکان دەنگی ماتەمینییان لێبەرز دەبێتەوە، بەگشتی خەڵکی زۆر نارەحەتن، پێشمەرگەکانیش ئەقڵیان ئەم شەڕە ناگرێت، پێشمەرگەیەک دەیوت ٣ رۆژە تەقەم نەکردووە و نایشیکەم).

(خەڵکی رانییە بۆ پرۆتێستۆکردنی ئەم شەڕە خۆپیشاندانیان کرد، فەرماندەکانی پێشمەرگە دەڵێن هیواداریین سەرکردەکانمان بە زووترین کات کۆتایی بەم شەڕە بێ مانایە بهێنن).

(پێشمەرگە دەڵێن بەهۆی سەرماوە سوپای تورک قەمسەڵەیان بەسەرماندا دابەشکردووە، کاتێک فەرماندەکانی پێشمەرگە مەسەلەی ئەم قەمسەڵانانەیان بدرۆ دەخستەوە پێشمەرگەکان دەیانوت چەند ئەفسەرێکی تورکیان لەناو ریزەکانی خۆیان بینیوە).

(زۆربەی پێشمەرگەکان فیشەکیان تەواو بووە، لە باڵەخانەیەکی بەرەی کوردستانیدا سنوقە فیشەکی ژەنگاویان هەڵدەپچڕاند).

(فڕۆکە جەنگییەکانی تورک رۆژانە بەردەوام بە ناوچەکاندا دەفڕن، لەبەرئەوەی شوێنی سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان بەباشی نەدەزانی بۆئەوەی هەڵە نەکەن بەشی ناوەوەیان

**بۆردۆمان نەدەکرد، هەروەها دەوترێت فەرماندەیەکی باڵای پەدەکە لە خواکورک کوژراوە)**[95].

کاتێک لەبەرەی خواکورک شەڕوپێکدادانەکان بەو شێوەیە بوو، لە ناوچەکانی (زاپ، شوبەرگە و بەرواری) شەڕوپێکدادانێکی سەخت بەردەوام بوو، بەگوێرەی هەواڵێک لە شەڕەکانەوە گوایە گەریلاکانی (پەکەکە) ڕێگاوبانەکانیان لوغم ڕێژ کردووە و هێزی پێشمەرگەش بە هاوان تۆپبارانی گەریلاکان دەکەن، لە (بەرواری)ش گەریلا هێرشیان کردووەتە سەر گروپێک لە پێشمەرگە، دوو پێشمەرگەی بریندار (پەدەکە) بەناوی (مەجید عومەر حوسێن و ئەحمەد خەلیل ئیبراهیم) کەلە نەخۆشخانەی (زاخۆ)بوون ڕووداوەکانیان بەمشێوەیە دەهێنایە زمان (**هەموو شوێنەکانی بەرەی شەڕەکان وەک دۆزەخیان لێهاتووە، ئێمە لە خوارەوە و ئەوانیش لە سەر گردەکانن بەو شێوەیە شەڕمان دەکرد، گەریلاکان ئاربێجی و هاوانیان بەکار دەهێنا، ئێمەش بە هاوان و تۆپ لەوانمان دەدا، لەسەرەتادا زۆر نارەحەتیمان چێژا بەڵام کاتێک فڕۆکە جەنگییەکانی تورک بۆردۆمانی سەنگەرەکانی گەریلایان کرد توانیمان کەمێک بچینە پێشەوە)** [96].

لە نەخۆشخانەی زاخۆ (٣٣) برینداری لێبوو، بەگوێرەی دکتۆر (شیراد مەحمود) دوای دەست پێکردنی شەڕ ٤ تەرمی گەریلایان بۆ نەخۆشخانەکە هێناوە، ئەندامی سەرکردایەتی (یەنەکە) (حەسەن کوێستانی) دەیوت (**لە شەڕەکانی ناوچەکانی دهۆک جارناجارێک گەریلاکانی پەکەکە بەرخودانی باشیان کردووە، هەوڵی هێزەکانی پێشمەرگە بۆ ئەوە بووە گەریلا لە شەرانیش و باتوفە دوور بخەنەوە**)، بەگوێرەی (حەسەن کوێستانی) ئەو پێشمەرگانەی لە شەڕەکانی ناوچەکانی دهۆک لەهەمبەر گەریلا شەڕیان کردووە ژمارەیان نزیکەی (١٢٠٠٠) هەزار بووە.

لەبارەی گۆڕانکاری و شەڕوپێکدادانەکانەوە نوێنەری ئانییە ڕزگاری نەتەوەیی کوردستان (ئەرنەکە) لە ٨ی مانگی تشرینی یەکەم ڕونکردنەوەیەکیدا بەمشێوەیە بوو (**لە ناوچەکانی هەفتانین هەتا خواکورک شەڕوپێکدادانەکان بەهەموو سەختی خۆیانەوە بەردەوامن، لە ٢ی مانگەوە تاکو ئێستا ٩ گەریلامان شەهید بووە هەروەها ٢٠ گەریلای پاک کە دۆستمانن گوولە**

---

[95] ٩ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[96] ٩ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

**باران کراون، هەتا ئێستاش ٢٠٠ پێشمەرگەی یەنەکە و پەدەکە کوژراون، خەڵکی باشور دژ بەم شەڕە لە سلێمانی و هەولێر نارەزاییان نیشانداوە، هەروەها ١٠٠٠ هەزار پێشمەرگەش بۆ ئەوەی بەشداری لەم شەڕە نەکەن چەکیان داناوە و لە شوێنی شەڕەکانەوە کشاونەتەوە)**

فەرماندەکانی (پەکەکە) بۆئەوەی قسەکانی خۆیان بسەلمێنن داوایان لە رۆژنامەوانەکان دەکرد بچنە بەرەی شەڕەکانەوە و بەچاوی خۆیان رووداوەکان ببینن.

## مەسعود بارزانی ( ئاپۆ کوردی نازانێت!)

لە هەمان ڕۆژاندا لە کەناڵێکی تورکی بەناوی (شۆو تڤ) لە بەرنامەی (٣٢ ڕۆژ) سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی بانگەشەی ئەوەی دەکرد لەماوەی چەند ڕۆژێکدا (پەکەکە) لە سنورەکان دەردەکەن، بەلام قسەیەکی تری کرد زۆر سەرنج ڕاکێشەر بوو، ئەویش ئەوەبوو (مەسعود بارزانی) وتی (**ئاپۆ کوردی نازانێت و کورد نییە** !)، مەسعود بارزانی لەڕێی ئەم قسەیەوە دەیویست بڵێت کوردی دڵسۆز دەبێت وەک خۆی وابێت!، ئەمەش شەڕێکی دەروونی بوو (مەسعود بارزانی) لەگەڵ خۆیدا دەیکرد. لەناو میدیا و سەرکردە ڕەگەز پەرستەکانی تورک ئەمەیان وەک پروپاگەندە دژ بە (ئاپۆ) و (پەکەکە) بەکار هێنا، سەرکردەی پارتی ڕەگەزپەرستی تورک (مەهەپە) کەناوی (ئالپاسلان تورکێش)ە ئەم قسەیەی (مەسعود بارزانی) وەک نمونە دەهێنایەوە، بەلام ئەوەی مایەی سەرنج بوو ئەوەبوو دەزگاکانی دەوڵەت و ڕاگەیاندنەکان و ڕەگەز پەرستەکانیش نەیاندەتوانی ڕاستی ئەم قسەیە بسەلمێنن.
ئەو ڕۆژانە لیژنەیەکی باشور بۆئەوەی ئابلۆقەی سەر باشور نەمێنێت لە (بیقاع) سەردانی (عەبدوللە ئۆجالان) دەکەن، ئۆجەلانیش ماوەی ٢ کاتژمێر لەگەڵ لیژنەکەدا بە کوردی قسەی کردبوو، ئەم دیمانەیەش لەڕێگای کاسێتەوە نێردرا بۆ هەموو سەرکردەکانی باشور، (مەسعود بارزانی) دەیویست ئەوە بڵێت (ئەوەی کوردی نەزانێت کورد نییە)، کەچی ئەو گەریلایانەی بە دیلی گیرابوون خۆ کوردیشیان دەزانی بەلام لەلایەن (مەسعود بارزانی)یەوە ڕادەستی دەوڵەتی تورک دەکرانەوە.
لە ڕۆژی ٨ی تشرینی یەکەم ٥ گەریلا کە یەکێکیان کچ بوو لەگەڵ ٦ سڤیلی تردا لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل)ەوە ڕادەستی دەوڵەتی تورکیان کردنەوە، ئەوکاتەی ئەم گەریلایانە مامەڵەیان پێدەکرا و ڕادەست دەکرانەوە گەریلاکان سلۆگانیان دەوتەوە و جوێنیان بە

پێشمەرگەکانی بارزانی دەدا، ئەم دیمەنەش رۆژنامەوانێک بینی بووی کەلە بەشی ئەودیوی تورکیا بوو کەلە ناو دوکانێک خۆی مەڵاسدابوو، لەکاتی ئەم رادەستکردنەوەدا بۆماوەیەک دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل)یان داخستبوو[٩٧].

**ئەم دیمەنە دڵتەزێن ترین و بە واتاترین دیمەنی شەڕەکە بوو.**

[٩٧] ٩ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (نوزگور گوندەم ) .

## ئەمەریکا پاڵپشتی تورکیا دەکات

شەڕوپێکدادان و بۆردۆمانی ئاسمانی فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیش لە هەرێمەکە بەردەوام بوون، لەهەمانکاتدا وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا رایگەیاند پشتگیری ئەو تەدبیرانە دەکەین کە تورکیا لە دژی (پەکەکە) وەریدەگرن. لەبارەی تورکیا و گۆڕانکاریەکانی هەرێمەکەوە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەیوت (**هەروەکو پێشوتریش هێناومانەتە زمان پەکەکە رێکخراوێکی تیرۆریستییە، هەمیشە ئەم رێکخراوەمان مەحکوم کردووە، سەرکردە کوردەکانی باکوری عێراقیش رایانگەیاندووە رێ نادەن پەکەکە لەسەر سنورەکانیانەوە هێرش بۆ تورکیا بەرن، لەبارەی بەرەنگاربونەوەی تیرۆرەوە ئێمە هەمیشە پاڵپشتی تورکیامان کردووە، هەمیشە لەبارەی بەرەنگاربونەوەی پەکەکە پاڵپشتی تورکیا دەبین**)[٩٨].

بە کورتییەکەی وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەیوت لەم شەڕەدا پاڵپشتی تورکیاین، پاڵپشتی کردنی تورکیا و دەسەلاتی باشور لەلایەن ئەمەریکا تەنها بە قسە نەبوو، ئەو زانیاریانەی (سی ئای ئەی) و فڕۆکە کەشفییەکانی ئەمەریکا لە ئاسمانەوە بەدەستیان دەخست دەیانگەیاندە (میت)ی تورک، سوپای ئەمەریکا لەڕێی هێزەکەیان لە (ئینجیرلیک)ی شاری (ئەدەنە)ی تورکیاوە ئەو زانیاریانەی بەدەستیان دەخست راستەوخۆ دەیاندا بە (میت)ی تورک. ئەو هێزانەی نەیاندەویست لە رۆژهەلاتی ناوین بارودۆخ بگۆردرێت و ئەو هێزانەی چاویان بە بەرایی شەپۆلی سۆسیالیستی بە رێبەرایەتی (پەکەکە) هەڵنەدەهات و یاخود ئەو هێزانەی دەیانویست چارەسەرییەکان بەگوێرەی لۆژیکی خۆیان ئاڵوگۆڕی پێبکرێت هەرهەموویان ترسیان لە هەژمون و لۆژیکی سیاسی (پەکەکە) بوو. هێزە دەرەکییەکان لە شەڕی باشور هاوکاری سیاسی و سەربازی هێزەی دژبەرەی (پەکەکە) یان دەکرد، ئەمەریکا و وەلاتانی ئەوروپا بە گشتی لایەنگری پاراستن و مانەوەی ئاسایشی

---

[٩٨] ٩ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ).

هەرێمەکە بوون، هەموویان لەو شەپۆلە سۆسیالیستە دەترسان کە هەرێمەکەی تەنی بوو، هەروەها دەیانویست بۆ چارەسەری کێشەکان و بەرژەوەندییەکانیان لە هەرێمەکە خۆیان زاڵ بکەن، لە روانگەی ئەوانەوە (پەکەکە) لەهەمبەر خواستەکانیان رێگربوو هەربۆیە دەیانویست نەیهێڵن یاخود هەرهیچ نەبێت بەباشی پشتی بشکێنن.

(پەکەکە) لە ئەوروپا و هەرێمەکە بە گشتی روبەروی هێرشێکی بەربڵاو ببووەوە هەربۆیە ئەم شەڕەی هەمبەری خۆی وەک (شەڕی خاچ) هەڵدەسەنگاند.

## زاخۆ شارێکی مردوو

سەرکردەکانی کورد لە باشور لە ٩ی تشرینی یەکەم قەدەغەی هاتوچۆی ناو شارۆچکەی (زاخۆ) یان راگەیاند، بەڵام بە مەرجی ئەوەی تەنها لەناو (زاخۆ) گەشت بکەن مۆڵەتیاندا بە رۆژنامەوانەکان لەناو شار بگەڕێن. رۆژنامەوانەکان کە هاتنە (زاخۆ)وە وەک (شارێکی مردوو) پێناسەیان دەکرد، هیچ کەسێک لە زاخۆ نەدەهاتە دەرەوە، لەگەڵ کێدا قسەیان کردبێت دەیانوت دژی شەڕی (**براکوژی**)ن، یەکێک لە هەواڵەکان بەمشێوەیە بوو (**لە سیمای خەڵکیدا بێزارییەک دەخوێنرێتەوە، تەنانەت پێشمەرگەش دەڵێن دژ بە شەڕین، ئەوکاتەی بڕیاردرا کە ناتوانین زاخۆ جێبهێڵین دەرفەتمان بۆ رەخسا کەلە ژێر چاودێری پێشمەرگەدا کەمێک بگەڕێین، چوونەناو نەخۆشخانە قەدەغەیە بەڵام زانیمان لەم نەخۆشخانەیە ٣٠ پێشمەرگەی بریندراری لێیە**) .

بەرپرسێکی (پەدەکە) بەناوی (دکتۆر کەمال کەرکوکی) لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە بە رۆژنامەوانەکانی وت (**دەبێت پەکەکە هەرێمەکەمان چۆڵ بکەن، ئەگەر چۆڵیشی ناکەن دەبێت دەستبەرداری چەک بین و دەستبکەن بە کاروباری سیاسی ئەگەرنا بەپێچەوانەوە شەڕەکان بەردەوام دەبن**)، لەهەمانکاتدا کەمال کەرکوکی دەیوت هیچ پێشمەرگەیەک لایەنگری ئەم شەڕە نییە بەڵام لە بارەی پرسیاری ئابڵوقەکەوە لە وەڵامدا دەیوت (**ئێمە دەتوانین ئەو لۆریانە بپارێزین لە تورکیاوە دێن، ئێمە دڵنیاین ئەم ئابڵوقەیە سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت**)، بەڵام لەبارەی دەرەنجامی ئەوەی ئایا ئابڵوقە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت یاننا ئەمە هەر لە یەکەمین ئابڵوقەوە بەرچاو کەوتبوو. رۆژێک پێش ئەم قسانەی (کەمال کەرکوکی) سەرۆکی (پارتی گەل) (سامی عەبدولرەحمان) بۆ دابینکردنی هاوکاری و ئازوقە چوبوو بۆ ئەنقەرە، بەهۆی ئابڵوقەی (پەکەکە)وە لۆرییەکان لە بەرەی باکورەوە زۆربەیان راوەستابوون، لە هەمان رۆژدا لە (جزرە و سلۆپی) ٣ لۆری بارهەڵگر لەلایەن وەلاتپارێزانەوە سوتێنران کە ویستبویان سنور ببەزێنن.

## بۆردۆمانە ئاسمانییەکان بێکاریگەرن

فرۆکە جەنگییەکانی تورک لە شەڕی دژ بە (پەکەکە) هاوکارییەکی باشی هێزی پێشمەرگەیان دەکرد، هەتا دەهات بۆردۆمانەکانیش چڕتر دەبونەوە، فرۆکە جەنگییەکانی تورک لە جۆری (ف٤ و ف١٦) لە (دیاربەکر و باتمان) هەڵدەستان و لەسەر ئاسمانی بادینان رۆژانە ٢٥جار دەخولانەوە. بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک دەیانوت (**ئێمە لە چاوەڕوانیداین بۆ دەستپێکردنی جموجۆڵی پیادەیی لەوانەیە هەرکاتوساتێک دەست پێبکات**)، لەهەمانکاتیشدا رەوانەکردنی زرێپۆش و دەبابە و لۆری بارهەڵگری سەربازی بۆ سنورەکانی (شەمزینان و چوکورجە) بەردەوام بوون، لەهەمان رۆژاندا (١٠٠) زرێپۆش و دەبابە لە (تاتوان)وە گەیشتنە هەرێمی هەککاری.

ئەو ئەفسەرە تورکانەی لە بەرەی شەڕەکەدا لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بوون لەبارەی سەنگەر و شوێنەکانی گەریلاوە زانیاریان دەدا بە سەروی خۆیانەوە، بەڵام فەرماندەکانی (پەکەکە) دەیانوت ئەم بۆردۆمانانە زۆر کاریگەرییان لێناکات، لەمبارەیەوە دەیانوت (**بۆردۆمانەکانی فرۆکە جەنگییەکانی دەوڵەتی تورک کاریگەرییەکی ئەوتۆمان لێناکات، ئەگەر بێ شانسی نەبێت ئەوا زیانێکی ئەوتۆیان لێناکەوێت، ئەوە ماوەی ٢ ساڵە بەردەوام بۆردۆمان دەکرێین هەربۆیە ئێستا خاوەن ئەزمونین و دەزانین چۆن خۆمان بپارێزین**). خەڵکی (زاخۆ) دەیانتوانی بە دووربین تەماشای بۆردۆمانەکانی ناوچەکانی (چوکەرجە، شەمزینان و ئولودەرە) بکەن، بە درێژایی رۆژ و شەو خەڵکی ناوچەکان تەماشای بۆردۆمان و دوکەڵی تەقینەوەی تۆپەکانیان دەکرد. گەورەترین زەرەی بۆردۆمانەکان بۆ گەریلاکان ئەوەبوو لەکاتی بۆردۆمانەکاندا خۆیان دەشاردەوە و هیچیان پێنەدەکرا، تۆپ و موشەکەکان راستەوخۆ شوێنی مەبەست و شوێنە گرنگەکانی گەریلایان نەدەپێکا، سەرچاوەکانیش ئەمەیان پشتڕاست دەکردەوە. ئەم بۆردۆمانانە زیاتر بە ئامانجی شەڕی دەرونیش دەکران و

دەیانویست لە سایەی ئەم بۆردۆمانانە گەریلاکان لە سەنگەرەکانی خۆیان نەمێننەوە و بەرگری نەکەن و ئەوێ چۆڵبکەن. جاری واهەبوو بەهۆی بۆردۆمانی زۆری ژمارەی موشەکەکانەوە مۆڵگەی دۆستەکانی خۆشیان دەپێکا، کە نمونەی ئەم حاڵەتەش هاتبووە ئاراوە. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە یەکەم هەفتەی شەروپێکدادانەکاندا زیانێکی زۆریان لێکەوت، هەربۆیە ناچاربوون نوێنەرەکەی خۆیان لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) بکەنە بەینەوە بۆئەوەی کۆتایی بەو جۆرە رووداوانە بهێنرێت. (سەفین دزەیی) دەیوت **(لە هەندێک شوێندا لەکاتی شەڕوپێکدادانەکاندا نێوان گەریلا و پێشمەرگەکانمان هەر ١٠٠ مەترێک بووە، هەربۆیە نامانەوێت بەهۆی موشەکەکانەوە زیان بە پێشمەرگەکانمان بکەوێت و لەمبارەیەوە حکومەتی تورکیامان ئاگەدارکردووەتەوە)**[٩٩].

[٩٩] ١٠ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ) پەیامنێر ( یەوز ئۆزجان ).

## خەڵک سڵاو لە پەنابەرە باشورییەکان ناکەن!

لەساڵی (١٩٨٨) بەدواوە بەهۆی کارەساتەکانی هەڵەبجە و شاڵاوی ئەنفال و کیمیابارانەکانی رژێمی سەدامەوە ژمارەیەکی زۆری کوردی باشور روویان لە باکوری کوردستان کردبوو، بەڵام بەهۆی ئەم شەڕوپێکدادانانەوە رەوشیان خراپ ببوو. دوای هاتنە ئاراوەی هێرشەکانی روو لە (پەکەکە) خەڵکی شارەکانی (دیاربەکر، موش و مێردین) خۆیان لە باشورییەکان دوور دەگرت، پەنابەرێکی باشوری لە کەمپێکی دیاربەکر بە ناوی (هاوار) لەبارەی ئەم بێخەمی و ساردبوونەوەی خەڵکی لە ئاستیاندا دەیوت (کاریگەری شەڕەکە دیاربەکریشی گرتووەتەوە، خەڵکی سڵاومان لێناکات، لێرە کاری سەر پێی دەکەین و بژێوی ژیانی خۆمان بەدەست دەخەین بەڵام ئێستا هیچمان لێناکڕن، هەموو کەسێک پێیوایە کە ئێمە سەربە یەنەکە یان پەدەکەین، بەڵام خەڵکی هەیە خاوەن فکرەی جیاوازن، هەموو کەسێک وەک یەک نییە، ئێمە لایەنگری شەڕ نین، ئەم شەڕە شەرمەزار دەکەین، دەمانەوێت بە زووترین کات کۆتایی بەم شەڕە بهێنرێت. ئەم شەڕە دەبێتە هۆکاری پارچە بوونی ناو ریزەکانی کورد و دوژمن دەتوانێت لەسایەی ئەم شەڕەدا هەموومان لەناوبەرێت، بانگەوازیم بۆ هەموو گەلی کورد ئەوەیە روبەڕوی ئەم شەڕی برا کوژییە ببنەوە، تا ١٠ ساڵ لەمەوبەر پەدەکە یەکەم پارتی کوردستان بوو، سەرەڕای کەموکوڕی پەکەکە ش بەڵام دەبێت چاوپۆشی لە پەدەکە نەکەین، ئەگەر کەمێک سەبر بگرین و رەوشەکان بەمشێوەیە بڕوات لەوانەیە لە ماوەیەکی کەمدا پەدەکە لەناو بچێت، لە کارەساتی هەڵەبجە و لە کاتی کۆچە مەزنەکەشدا پەکەکە هاوکارییەکی باشی کوردی باشوری کردووە کە هەرگیز ئەمە لەبیر ناکەین) .

## شەڕ خۆی دووبارە دەکاتەوە

لە ٩ی مانگی تشرینی یەکەم سەرچاوەکانی پێشمەرگە باسیان لەوە دەکرد لە (خواکورک، ئامێدییە، کانی ماسی و زاپ) ژمارەیەکی زۆری سەنگەریان لەلایەن گەریلاکانەوە گیراون و نەشیان هێشتوون پێشڕەوی بکەن، لە هەمانکاتدا لە شەڕەکانی (هەفتانین) فەرماندەیەکی (پەدەکە) بەناوی (دەرباز کەلاش کۆتان) کوژراوە، هەروەها گەریلاش تەرمی دەربازیان لە مەیدانی شەڕەکە دوور خستووەتەوە و رادەستی بنەماڵەکەی کراوەتەوە. لەو شەڕانەی لە ١٠ی مانگی تشرینی یەکەم لە (هەفتانین) روویاندا ٤ پێشمەرگە گیانیان لەدەستدابوو هەروەها تەرمەکانیان هێنابووەوە بۆ زاخۆ. ژمارەیەکی زۆری برینداری پێشمەرگەش هێنرابوون بۆ نەخۆشخانەی ئازادی لە دهۆک، هەروەها سەنگەرێک و دۆشکەیەک و کۆمەڵێ چەکی پێشمەرگەش کەوتبوونە دەستی گەریلاکانەوە. لە ١١ی هەمان مانگدا لە (هەفتانین) گەریلا هێرشیان کردەسەر کەمپێکی پێشمەرگەکان، لەم هێرشەدا ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگە کوژران و ٧یشیان بە دیلی گیرابوو. سەرەڕای ئەوەی فڕۆکە جەنگییەکانی تورک بۆردۆمانیشیان کردبوو بەڵام لەناوچەکە شەڕوپێکدادانەکان زیاتر چڕببونەوە. (یەنەکە و پەدەکە) بۆ ئەنجامدانی هێرشی چڕوپڕ سەرقاڵی کۆکردنەوەی هێزی پێشمەرگە بوون، لەهەمانکاتیشدا شەڕ لە (خواکورک) و گواستنەوەی بریندارەکانی پێشمەرگەش بۆ نەخۆشخانەکان بەردەوام بوون، سەرچاوەکانی (یەنەکە) دەیانوت **(لە ئاکامی ١٠ رۆژی شەڕوپێکدادانەکاندا ١٥٠ پێشمەرگەمان شەهید بووە و تاکو ئێستاش شەڕ لە خواکورک و دەوروبەری زاخۆش بەردەوامە)** .

سکرتێری گشتی (یەنەکە) (جەلال تاڵەبانی) سەبارەت بەو هێرشەی دژ بە (پەکەکە) بە هاوبەشی لەگەڵ سوپای تورک دەستیان پێکردبوو، لەبارەیەوە هەمان ئیدیعاکانی دووبارە دەکردەوە کە گوایە لەماوەی ٢ بۆ ٣ رۆژێکدا (پەکەکە) لە هەرێمەکە دەردەکەن، (جەلال تاڵەبانی) دەیوت **(ئەوان دانبە شەرعییەتی پەرلەمانەکەمان نانێن و ئەوە ماوەی ٢ مانگە پێیان**

**دەڵێین هەرێمەکەمان چۆڵبکەن بەڵام دەرناچن، ئەگەر دەرنەچن ئەوا ئاپۆ وەک خائینی نیشتیمانی دەناسرێت)**[100].

لەبەرئەوەی رۆژنامەوانەکان مۆڵەتی گەڕانیان نەبوو لە هەرێمەکە لەبارەی پەیداکردنی هەواڵەوە نارەحەتییان دەچێژا، تەنها پشتیان بە روونکردنەوە فەرمییەکان دەبەست، پەیامنێرەکانی وەک (فاروق باڵکچی و نایل قادرخان رۆژنامەی حورییەتی تورکی)، (عەبدوللە ئەرسۆی.. رۆژنامەی ئوزگور گوندەم)، (وەدات ئینینێر... رۆژنامەی جمهورییەتی تورکی)، کەلە باشور بوون لە ١٠ی مانگی تشرینی یەکەم لە (دهۆک) لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە دەستبەسەرکران، دوای ئازادکردنیشیان بەردەوام لەژێر چاودێریدا بوون[101].

---

[100] ٨ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[101] ١١ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ).

## دیاسپۆرتی کورد لە ئەوروپا لەم شەڕە پرۆتێستۆ دەکەن

لەگەڵ درێژبونەوەی وادەی شەرویێکدادانەکان دەنگی ناڕەزای لە دیاسپۆرتەوە بەرز بووەوە، بۆ وەستانی ئەم شەڕە رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی کوردی وەک پرۆفیسۆر (عیسمەت وانلی، خەتیب دجلە، ئەدهەم غەمگین، پرۆفیسۆر کەریم یڵدز، فەوزی وەزنەدارئۆغلۆ، جەلیلی جەلیل، فەقێ حوسێن سەغنچ و سەرحەد بوجاک) بە هاوبەش نامەیەکیان نارد بۆ (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)، لە نامەکەدا هێرشەکانی سەر (پەکەکە) یان شەرمەزار و سەرکۆنە دەکرد، لە نامەکە دەوترا پێویستە کێشەکان لەرێی دیالۆگەوە چارەسەر بکرێن و بۆ ئەم مەبەستەش ئامادەن ناوبژیوانی بکەن، هەروەها نوسیبویان (**هەرکێیەک دەبێت بابێت ئەوەی شەڕی ناوخۆ و شەڕی براکوژی هەڵگیرسێنێت لەلایەن مێژوو هەروەها لەلایەن گەلیشەوە مەحکوم دەکرێت**)، لەهەمانکاتیشدا سەرۆکی گشتی (هەپ) پارتی رەنجدەرانی گەل (ئەحمەد تورک، نوسەر جێمشین بێندیر، هونەرمەند نیزامەتین ئەریچ و دکتۆر تارق زیائێکینجی) پێشنیاری ئەوەیان دەکرد بە زووترین کات کۆتایی بەم شەڕە بهێنرێت و پێویستە کێشەکان لەرێی دیالۆگەوە چارەسەر بکرێن[١٠٢].

لە وەڵاتی سوید بە سەدان کورد رێپێوانیان دژ بە هێرشەکانی سەر (پەکەکە) ئەنجامدا و لە شاری برێمنی ئەڵمانیا و ڤێننەی پایتەختی ئۆستورالیا کوردان رێپێوانیان کرد و لایەنگرانی (ئەرنەکە) باڵی سیاسی (پەکەکە) خۆپێشاندانیان کرد.

---

[١٠٢] ١١ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ).

## ئۆجالان (شەڕی باشور دەبەینەوە)

سەرۆکی گشتی پەکەکە (عەبدوللە ئۆجالان) لە ١٠ی تشرینی یەکەم رونکردنەوەیەکی کرد کە تێیدا دەیوت (**ئەم هێرشانە دەرەنجامی پیلانێکی داڕێژراوی پێشوەختە، هێزی خیانەتکاران و دوژمنانمان دەیانەوێت پەلاماری شۆڕشەکەمان بدەن، ئامادەباشییەکانی ئەم هێرشانەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانەکانی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٩١، ئێمە مەبەستمانە و لە پێناویدا تێدەکۆشین لە باشوری کوردستان گەلێکی وەلاتپارێزی نیشتیمان پەروەر بەرجەستە بکەین، بۆ ئەم مەبەستەش ئەنجامی باشیشمان بەدەست خستووە، ئەم کارانەمان بێشک بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و ئیمپریالیستەکان و بەسەر هەموویشیانەوە تورکیاش لە هەرێمەکە دەخاتە مەترسییەوە، بۆئەو مەبەستەیە ئەم هێرشە بەربلاوانەمان بۆ دەهێنن کە مەبەستی سەرەکیشیان تەسفییەکردنی سەرۆکایەتییەکەیەتی، ئەوان لەبارەی کورد و هەرێمەکەوە فۆرمیلەیەکیان پێکهێناوە کە دەڵێن بەڵێ بۆ بوونی کێشەی کورد بەڵام نەخێر بۆ بوونی پەکەکە، ئەوان پێیانوایە ئێمە دەستبەرداری بەهاکانمان دەبین، بەمشێوەیە بە ئەقڵی خۆیان پێیان وایە خەڵکی هاندەدەن و دەیانکەن بە گژی پەکەکە دا کە گوایە شۆڕشەکەمان دژ بەو ئازادییەیە لە باشور کە هێشتا پێی نەگرتووە، بەڵام بە درێژبوونەوەی ئەم شەڕە ئەوە دەرکەوت بەهەڵەدا چوونە، پێشوتر ئێمە پێشبینی ئەم هێرشانەمان دەکرد و خۆمانمان بۆ ئامادە کردبوو، وەکو ئەوەی ئەوان چاوەڕێی بوون نە هەلاتین و نە ئەوانیش توانیان بێنە شوێنەکانمانەوە، گەریلاکانمان لەهەمبەر شەڕی سوپای تورک و کۆماندۆکانیان پیشاون،**

**بێشک گەریلاکانمان لەهەمبەر هێزە خیانەتکارەکانی باشور سەرکەوتنی گرنگیان بەدەست خستووە)**[١٠٣].

ئۆجالان تیشکی دەخستە سەر ئەوەی هێزەکانی باشور لەگەڵ راگەیاندنی حکومەتەکەیان و بە سلۆگانی دەوڵەتییەوە دەیانەوێت گەل چەواشە بکەن و بە فریویانبدەن و رەوایی بە هێرشەکانیان بدەن، لەمبارەیەوە ئۆجالان دەیوت **(ئامانجەکان ئاشکران، بە نیازی خۆیان هێزی گەریلا لە باشور دەردەپەڕێنن و ناچاریان دەکەن بچنە سنوری تورکیا و لەوێش سوپای تورک لە چاوەڕوانیان دەبێت و هەموویان لەناو دەبەن، زۆر ئاشکرایە لەناو هێزەکانی خیانەتدا ئەفسەری تورک هەن، ئەوان هەموویان بەیەکەوە ئەم پیلانانەیان داڕشتووە، ئەمەش لەگەڵ وادەی راگەیاندنی حکومەتی باشور دەخرایە بواری جێبەجێکردنەوە، دیوێکی تری ئەم پیلانە گریمانەی ئەوەیە لەوانەیە درێژە بە هێرشەکانیان بدەن، هەربۆیە لە ئێستاوە دەستیان کردووە بە وتنی ئەوەی هەروا بە ئاسانی هێزەکانی پەکەکە لەناوناچن، هەروەکو چۆن لە کۆندا دەوڵەتی تورک بۆ هاوکاریکردنی وەلاتی ئازەربایجان بۆئەوەی شەڕەکەیان ببنەوە ئەفسەریان ناردبوو ئێستاش دەیانەوێت هەمان سیاسەت لە باشور دووبارە بکەنەوە و ئەفسەریان بۆ هاوکاری خیانەتکاران ناردووە، ئێمەش دەڵێین چیدەکەن بابیکەن و چییان لەدەستدێت بابیکەن ئێمە خاوەن ئەزمونێکی درێژخایەنی گیانفیدایانەین، گەلەکەمان و گەریلاکانمان لەپێناو ئازادی ئامادەن هەموو قوربانییەک بدەن، شەڕی باشور دەبەینەوە و دەشتوانم بڵێم هەرلە ئێستاوە بردومانەتەوە)**

---

[١٠٣] ١١ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (نوزگور گوندەم ).

## ئاڵۆزی نێوان جەلال تاڵەبانی و ئێران

لەگەڵ بەردەوام بوونی شەڕوپێکدادانەکاندا لایەنەکان سووربوون لەسەر ئەوەی شەڕی یەکتر بکەن، ئەوکاتەی هێزەکانی باشور شانبەشانی دەوڵەتی تورک هێرشی (پەکەکە) یان دەکرد لەناکاو (جەلال تاڵەبانی) دژبە ئێران پروپاگەندەیەکی کرد کە بووە مایەی ئەوەی وتەبێژی حکومەتی ئێران ناڕەزایی نیشان بدات .

(جەلال تاڵەبانی) بانگەشەی ئەوەی دەکرد پاسداری ئێرانی بۆ هاوکاریکردنی (پەکەکە) لەناو ریزەکانی گەریلادا شەڕیان کردووە، بەڵام باڵیۆزی ئێران لە ئەنقەرە (محەمەد رەزاباقری) لە ١١ی تشرینی یەکەم (جەلال تاڵەبانی) بە درۆزن ناوزەند دەکرد و دەیوت (**ئێمە بەهیچ شێوەیەک هاوکاری پەکەکە ماننەکردووە، ئێمە پێمانوایە ئەو شەڕەی لە هەرێمەکە هاتووەتە ئاراوە شەڕی ناوخۆی گرووپە کوردییەکانە**)، ئەوەی راستی بێت ئامانجی (جەلال تاڵەبانی) ئەوەبوو چونکە خۆیان بۆ هێرشی سەر (پەکەکە) هاوکاری دەوڵەتی تورک بوون دەیویست ئەو تۆمەتەش بداتە پاڵ (پەکەکە) گوایە لە ئێران هاوکاری وەردەگرێت، هەربۆیە دەیویست شەریک بۆ کارەکەی خۆی پەیدا بکات و ئەوەی لەگەڵ تورکیادا کردوویەتی دژ بە (پەکەکە) بەجێی بهێڵێت بۆ ویژدانی رایگشتی. هەر ئەو رۆژە سەبارەت بە ئیدیعای ئەوەی (پەکەکە) هاوکاری لە ئێرانەوە وەردەگرێت بەدرۆ خرایەوە، بۆئەوەی رەوایی بدات بە شەڕی خۆیان بەردەوام (جەلال تاڵەبانی) تۆمەتی هۆکاری دەهێنایە زمان، (جەلال تاڵەبانی) ئەوەشی دەوت خوازیاری ئەوە نین بە چەک (پەکەکە) لە هەرێمەکەیان دەربکەن بەڵکو دەیانوێت رازییان بکەن.

(جەلال تاڵەبانی) دەیوت کوردەکانی ئێران و عێراق و تورکیا گەیشتونەتە ئاستی قەوارەیەکی دیاریکراو هەربۆیە گەیشتونەتە قەناعەتێک کە نابێت دژ بە کوردی پارچەکانی تر لەگەڵ حکومەتەکانی تر پەیوەندی ببەستن، لەبارەی ئومێدەکانییەوە (جەلال تاڵەبانی) دەیوت **(ئێمە لە هەرێمەکە بەگشتی خاوەن هەزارەها پێشمەرگەین، تەنها ئێمە خاوەن ٢٠ هەزار پێشمەرگەی بە ئەزمونین، خاوەن زرێپۆش و چەکی قورسی سەربازین کەلە سوپای عێراقمان گرتووە، ئێمە لەناو گەردەلولداین و هیوادارم رۆژێک بێت دەرگای خێروبێری ئەو جوگرافییەی ئێمەی تێیدا دەژین گەردەلولێک بەروماندا بیکاتەوە)**[١٠٤].

---

[١٠٤] ١٣ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ).

## گومانی گەلەکۆمە لە کەمپی پەنابەران

بێشک شەڕ تەنها لە سەنگەرەکانی خاکی باشوری کوردستاندا بەردەوام نەبوو، سەرەڕای ئەوەی (پەدەکە) بانگەوازی دەکرد بۆ ئاوارەکانی کەمپەکانی باکوری کوردستان بگەڕێنەوە زیدی خۆیان کە نزیکەی ٢ هەزار پەنابەر بوون، دوای ئەوەی کەس گوێی بۆ ئەم داخوازییەی (پەدەکە) نەگرت گومان و شکی ئەوە زیادیان کرد لەهەمبەر دانیشتوانی کەمپەکان گەلەکۆمە ئەنجام دەدرێت. لەم گەلەکۆمەیەدا ئامانجێکی سەرەکی هەبوو، ئەوەبوو لە دەست بۆڵەبۆڵی خەڵکی رزگاریان دەبوو کە هیچیان بۆناکرێت و لەوانەبوو ژمارەی پێشمەرگەکانی خۆشیانی پێ زیاد بکردایە، هەروەها دەوڵەتی تورکیش لە دەردەسەری ئەم پەنابەرانە رزگاریان دەبوو. بەرپرسیارانی کەمپەکان بە پەنابەرەکانیان دەوت (**گەریلای پەکەکە دێن و پەلامارتان دەدەن، هەربۆیە دەبێت لەگەڵ جەندرمەکان پاسەوانی کەمپەکە بکەن**)، بەڵام دانیشتوانی کەمپەکە لەو باوەرەدابوون پۆلیسی تورک لەگەڵ بەرپرسیارانی (پەدەکە) بەیەکەوە گەلەکۆمە دەکەن و لەوانەیە لەهەمبەر دانیشتوانی کەمپەکە هێرش ئەنجام بدەن و پاشان بیخەنە ئەستۆی پەکەکە وە، سەرەڕای ئەمەش داوایان لێدەکردن لە کەمپەکە بەیەکەوە واتا بە قەڵەباڵغی نەمێننەوە، لەگەڵ ئەمەشدا چەند رۆژێک کەسانی نامۆ و بیانی لە چواردەوری کەمپەکە کەوتنە سوڕانەوە. دانیشتوانی کەمپەکە سەبارەت بەم گۆڕانکاریانە دەیانوت (**بەرپرسیارانی کەمپەکە دەڵێن زانیارییان پێگەیشتووە گەریلاکانی پەکەکە پەلاماری کەمپەکە دەدەن، پێشمان دەڵێن دەبێت لەگەڵ پاسەوانەکاندا ئێشک بگرین، ئەمەش بۆ ئەوەیە نارەحەتمان بکەن، ئەوان بە نیازن پەلاماری کەمپەکە بدەن و پاشان بیخەنە ئەستۆی پەکەکە، هەندێک لە دانیشتوانی کەمپەکە لە بازاڕ هێرشیان بۆهێناون دوایش دەرکەوت هێرشبەران کوردن، دەوڵەتی تورک هانی پیاوەکانی خۆیان دەدەن پەلامارمان بدەن، ئەوانەی لێرە دەمێننەوە کەسانی سەربەخۆن**)، دوای ئەوەی دانیشتوانی کەمپەکە زووتر دەستی خۆیان وەشاند و لەم کارە رۆژنامەوانەکانیان ئاگەدارکردەوە، ئیتر ئەم کارە ئەنجام نەدرا.

## مەسعود بارزانی (بژی تورکیا، بە نەفرەت بێت پەکەکە)

دوای تێپەڕبوونی ١٠ ڕۆژ بەسەر شەڕوپێکدادانەکاندا سەرنج ڕاکێشترین ڕووداو قسەیەکی (مەسعود بارزانی) بوو کە لە ٣١ی مانگی تشرینی یەکەم لە کەناڵی (خەبات)ەوە کردی، (مەسعود بارزانی) بانگەوازی لە پێشمەرگەکانی دەکرد و پێیدەوتن (**هەرگیز بیر لەوە نەکەنەوە لەهەمبەر پارتێکی کوردیدا شەڕدەکەن، ئەوان دوژمنن، پێویستە بزانرێت دوژمنی هەرە گەورەی کورد پەکەکە یە، چەندینجار پێیانمان وت ئێرە چۆڵ بکەن بەلام گوێیان بۆنەگرتین، ئەوان بۆئەوەی ئەم کەشوهەوا ئازادییە و ئەم یەکێتییەمان لێتێکبدەن ئەوەی لە دەستیان دێت دەیکەن، تورکیا گەورەترین دۆستمانە، پەکەکە لە ناو خاکی ئێمە لەهەمبەر دۆستەکانمان کاری تیرۆریستی دەکەن. دەبێت بزانن ئێمە ڕێیان نادەین، سەرۆکەکەیان دیکتاتۆرە، پەکەکە دیکتاتۆر و دوژمنە، هەربژی کۆماری تورکیا بە نەفرەت بێت پەکەکە**)[١٠٥]. دوای ئەو هەموو خەباتە کوردایەتییەی کە خۆیان دەیهێننە زمان بەکار هێنانی ئەم دێرانە لەلایەن (مەسعود بارزانی)یەوە پێویست بە شیکاری تر ناکات.

---

[١٠٥] ژمارەی تایبەتی (سەرخوەبون )١٩٩٢، ١٤ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حوریەتی تورکی ).

## له(هەفتانین) خوێناویترین شەڕ و پێکدادان

هێزەکانی پێشمەرگەی (پەدەکە) بە هاوکاری سوپای تورک جارێکی تر هێرشێکی فراوانیان کردەسەر سەنگەری گوایە (خائینان) واتا گەریلاکانی (پەکەکە)، هەروەها گەریلاکانی (پەکەکە)ش لەهەمبەر ئەم هێرشانە روو لە هێزەکانی (پەدەکە) هێرشیان ئەنجامدا. لە ٢ی مانگی تشرینی یەکەم شەڕوپێکدادانی سەخت هاتنە ئاراوە، لە هەمانکاتدا فڕۆکە جەنگییەکانی تورکیش بە چڕی بۆردۆمانیان دەکرد، لە هەمان شەودا گەریلا بە گوێرەی شەڕی پارتیزانی خۆیان هێرشیان کردە سەر سەنگەرەکانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) و لە هەمانکاتیشدا هێرشیان کردەسەر بنکە و بارەگا سەربازییەکانی نزیک سنوری (چوکورجە، ئولودەرە، قەسرۆک، بەرواری، بەلاماتینە و سەرێخانی)، ئەم هێرشانە لە ئاکامی بەرنامەیەکی داڕێژراودا هاتنە ئاراوە کە لەیەککاتدا ئەنجامی بدەن. ئەم هێرشانەی گەریلاکانی (پەکەکە) هەتا رۆژی دوایشی خایاند، لەم چالاکییانەدا ژمارەیەکی زۆری پیشمەرگەی (پەدەکە) کوژران و بریندار بوون، هەروەها دەست گیرا بەسەر ٢ بارە لۆری چەک و تەقەمەنی. ئەم چەک و تەقەمەنییانەی گیرابوون چەکی ئەڵمانی بوون کە بە دیاری درابوون بە (پەدەکە). دوای ئەم چالاکییانە (پەدەکە) پێشمەرگەکانی خۆی لە ناوچەکان کشانەوە، گەریلاکانی (پەکەکە)ش بە درێژایی ٥کم شوێنە ستراتیژییەکانی سنوری زاخویان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. بەگوێرەی سەرچاوەکانی گەریلا هەموو سنورەکان لە ژێر کۆنترۆڵی ئەواندایە، ئەم کۆنترۆڵکردنەی ئەو شوێنانە هەتا ٣ رۆژی خایاند، ئەو ١٢ پێشمەرگەیەی لەو هێرشانەدا برینداربوون و هێنرابوون بۆ زاخۆ لە هەناسەیاندا هەست بە گەرمایی گەریلا دەکرا. ئەو شوێنانەی گەریلاکان سەنگەریان لێدابوو لە شارەکانیشەوە دەبینران، نزیکەی (١٠٠) پێشمەرگە لە ناوچەکانی (باتوفە، مەتین، دەرکار، قەسرۆک و کانیماسی) لەلایەن گەریلاکانی

(پەکەکە)وە چەمبەردرابوون، هەربۆیە نەدەتوانرا لەلایەن هێزەکانی تریانەوە هاوکارییان بۆبچێت. لەو هێرش و پەلامارییانەی هاتنە ئاراوە کە ماوەی ٢ رۆژی خایاند (١١) گەریلا و (٤٠) پێشمەرگە کوژرابوون.

ئەو گرووپە گەریلایانەی هێرشیان بۆ بنکەکانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بردبوو لەژێر فەرماندارێتی (موراد قەرەیڵان)دا بوون، لەهەمانکاتدا گەریلاکان ئەو پیلانەیان دواخستبوو کە بەنیازی بوون لە ١٢ی مانگی تشرینی یەکەم لە (خواکورک) هێرش بۆسەر پێشمەرگە بەرن. فەرماندەیەکی هێزەکانی سەربە (یەنەکە) بەناوی (مستەفا چاوڕەش) ئیدیعای ئەوەیدەکرد (لەماوەیەکی زۆر کورتدا پەکەکە لێرە دەردەکەین)، هەمیشە ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە و لەهەمانکاتیشدا پێشمەرگەکانیان پێشڕەوییان نەدەکرد بەڵکو تەنها لە سەنگەرەکانیانەوە تەقەیان دەکرد.

لەو رۆژانەدا دەزگا راگەیاندنەکانی تورک لەسەرزاری کارمەندانی دەوڵەت بڵاویان کردەوە سەرکردەیەکی باڵای (پەکەکە) بەناوی (عوسمان ئۆجالان) لەلایەن سوپای تورکەوە کوژراوە، فەرماندەکانی (پەکەکە)ش بەلایانەوە گرنگ نەبوو ئەم هەواڵە بە درۆ بخەنەوە، دەیانوت (مادام چاپەمەنییەکانی تورک ئەم هەواڵەیان بڵاوکردووەتەوە کەواتە راستە)، بەڵێ فەرماندەکانی گەریلا بەوشێوەیە قەشمەرییان بەم هەواڵە دەکرد. پەیتا.. پەیتا لەنێوان خەڵکیدا دەنگی ناڕەزایی لە دژی ئەم شەڕە پەرەی دەسەند، خەڵکی دهۆک، سلێمانی وهەولێر ناڕەزاییان نیشاندەدا. هێزەکانی (یەنەکە و پەدەکە) بەردەوام بوون لە دەستگیرکردنی لایەنگران و ئەندامانی (پاک) و بەکۆی گشتی (٦٠) کەسیان دەستگیر کرد. ئاژانسی (Reuters) جگە لەوەی کە باسی دەنگی ناڕەزایی پێشمەرگەکانی ناو شەڕەکانیان دەکرد هەروەها باسی لە دەنگی ناڕەزایی خەڵکیشیان دەکرد، لەهەمانکاتدا هەمان ئاژانس باسی لە قسەیەکی (فوئاد مەعسوم) دەکرد کە وتبوی (**ئامانجی ئێمە نەهێشتنی پەکەکە نییە بەڵکو دەمانەوێت هەرێمەکەمان چۆڵ بکەن**)، هەروەها قسەیەکی (مستەفا چاوڕەش)ی بڵاوکردبووە کە وتبووی (**ئێمە نامانەوێت لەگەڵ پەکەکە شەڕبکەین ئەوان برای ئێمەن**) [١٠٦]. بە گوێرەی هەمان ئاژانس پێشمەرگەیەک بەناوی (عومەر کاوانی) سەبارەت بە شەڕەکان ناڕەزاییەکانی خۆی بەمشێوەیە هێنابووە زمان (**ئەم شەڕە تاوانە، سەرکردەکانمان هەڵە دەکەن، هەروەکو**

---

[١٠٦] ١٥ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ، رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی ).

**چۆن ئێمە لێرە بۆ گەلی خۆمان تێدەکۆشین ئەوانیش لە پارچەکەی خۆیان بۆ ئازادی گەلی خۆیان تێدەکۆشن، ئەگەر ئەم شەڕە درێژ بخاهێنێت ئەوە بە دڵنیاییەوە لەناو خەڵکیدا نارەزایی دێتە ئاراوە) .**

دەوڵەتی ئێران لەرێگای (پەدەکە)وە دەیویست کۆتایی بە شەڕی ناوخۆی پارتە کوردییەکان بهێنێت بەڵام سەرکەوتنیان بەدەست نەخست. فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکیش بەردەوام بۆردۆمانی سنورەکانی سێ سوچکەی ئێران و تورکیا و عێراقیان دەکرد، بەهۆی ئەم بۆردۆمانانەوە دانیشتوانی گوندی (کاڤاکلی) سەر بە (چوکەرجە) گوندەکەی خویان چۆڵکرد، لەهەمانکاتدا خەڵکێکی زۆری گوندەکانی ئەودیوی سنوری باشور گواستبویانەوە بو بەشی باکور.

## دیمەنی شەڕی هەزەلی بۆ پەیامنێرەکان

سەرەتا شەڕی باشور لە بەرەی (خواکورک)ەوە دەستی پێکرد، لە هەفتەی دووەمدا هێواش.. هێواش بەرەوکۆتایی دەچوو، لە ئاکامدا دەنگی تەقەکان کپ بوون، سەبارەت بە کۆتایی شەڕەکان هەواڵە سەرەتاییەکان بەمشێوەیە بوون:

(هێزەکانی پێشمەرگە لە بەرەی خواکورک بەرەو لۆلانی نزیک بە ئێران پاشەکشێ دەکەن، لەهەمانکاتدا لە لۆلان گەورەترین گروپی هێزی گەریلای لێیە. بە گوێرەی وتەکانی فەرماندەکانی سەربە یەنەکە بێت هێزی گەریلا بە کچەکانیشیانەوە دەگەنە ٦٠٠ کەسێک، لەبەرئەوەی پشتیان بە شاخەکانی سنوری ئێرانەوە ناوە پێشمەرگە نەیتوانیوە هێرشیان بۆبەرن. هێزەکانی پێشمەرگەی یەنەکە و پەدەکە دەیانەوێت هێرشی ئەو گەریلایانە بکەن کە لە لۆلانن، بەڵام هێشتا لەبارەی چۆنییەتی هێرشەکەیانەوە نەگەیشتونەتە هیچ ئەنجامێک. هێزی پێشمەرگە ئەو شوێنەی کە دەیانویست بۆ هێرشی سەر گەریلاکان بەکاری بهێنن کە زانیان بۆیان گونجاو نییە بۆ ئەم ئامانجە ناچاردەبن خاکی ئێران و تورکیا بەکار بهێنن. ئەوبەری بەرەی شەڕی خواکورک لەبەرئەوەی چەند رۆژێک بوو تەقەی تێدا نەدەکرا کپ بوو بەڵام بە چوونی رۆژنامەوانەکان بۆ ناوچەکان هێزی پێشمەرگە دیمەنی شەڕێکی هەزەلییان بۆ رۆژنامەوانەکان رێکخست. پێشمەرگەکان هاوانێکیان تەقاند و دەیانویست پەیامنێر و رۆژنامەوانەکان وێنەی بگرن، بەڵام مەخابن بەخت یاوەریان نەبوو چونکە هاوەنەکەیان نەتەقییەوە) .

(یەکێک لە پێشمەرگەکانی ناوچەکە بەناوی محەمەد مستەفا دەیوت برادەرێکی زۆرمان کەلە پێشەوەی بەرەکەن لەبەر سەرما و سۆڵە زۆربەیان نەخۆش کەوتن، هەروەها خۆیشی لەبەرئەوەی نەخۆشکەوتبوو دەکۆکی، محەمەد دەیوت ماوەی ١٥ رۆژە نان و تەماتەیان خواردووە، هەروەها باسی لەوەش دەکرد کە ئازوقەیان نییە. لەسەر گرد و چیاکان بە

سەدان پێشمەرگە چاوەڕوانی خواردنن، دەرکییان پێدەکرێت کە بەتەواوەتی وورەیان رووخاوە. یەکێک لە پێشمەرگەکان قۆڵی خۆی دەبەستێت و داوا دەکات بیبەن بۆ نەخۆشخانە، بەڵام فەرماندەکانی گومانی لێدەکەن و داواکەی رەتدەکەنەوە و پاشانیش گەنگەشە لە نێوانیان دێتە ئاراوە. بە گشتی پێشمەرگەکان ریش و سمێڵیان درێژ ببوو هەروەها جلوبەرگەکانیشیان چڵکن بوو، ئەوەی گرنگ بوو ئەوەبوو کە خوازیاری شەڕکردن نەبوون. لە حاڵەتی تێکەڵ بوندا بۆ ئەوەی پێشمەرگەکان بتوانن خۆیان لە گەریلاکان جیابکەنەوە پەڕۆی سووریان لە قۆڵ و سەر تفەنگەکانیان بەستبوو. چەند رۆژێکە هیچ دەنگی تەقە نابیسترێت، بەڵام لایەنەکان بۆئەوەی بیسەلمێنن کە هێشتا لە سەنگەرەکانیاندان جارناجارێک فیشەکێکیان دەتەقاند. چەکە قورسەکانی پێشمەرگە پێکهاتبووە لە هاوانی ٨٠ و ١٢٠ میللیم، هەروەها لە بەرەکەشدا نزیکەی ٥٠٠ بۆ ٦٠٠ پێشمەرگەیەکی لێیە. پێشمەرگەکان دەستیان بۆ چەند شوێنێک درێژ کرد گوایە ئەو شوێنانەیان لەژێر دەستی گەریلا دەرهێناوە، دوای ئەوەی رۆژنامەوانەکان ویستیان بچن بۆ ئەو شوێنانەی کەلە ژێر دەستی گەریلاکان دەریانهێناون بەڵام پێشمەرگەکان مۆڵەتیان نەدان. یەکێک لە فەرماندەکانی (یەنەکە) بە ناوی (رێبەر سەعید) دەیوت بەردەوام لەگەڵ عوسمان ئۆجالاندا لەناو دیالۆگداین، هەروەها رێبەر دەیوت فەرماندەکانی (پەکەکە) پێیان وتوین هێرشیان بۆ نەبەین و ئێرەش چۆڵناکەن، رێبەر ئەوەشی دەوت دەیانەوێت بەبێ ئەوەی شەڕ لە نێوانیان بێتە ئاراوە هەرێمەکە چۆڵ بکەن. لەوکاتەوەی شەڕوپێکدادانەکان هاتبوونە ئاراوە نزیکەی ٣٥٠ ئەندام و لایەنگرانی (پاک) یان دەستگیر کردووە، بنەماڵەکانیان دەڵێن بەهیچ شێوەیەک ناتوانن بیانبینن و دەشڵێن گیراوەکانیان لەژێر ئەشکەنجەدان)[١٠٧].

دوای ئابڵوقەی ئابوری (پەکەکە) بۆ سەر هێزەکانی باشور لە (زاخۆ) نارەزایی پەرەی سەند، تەنانەت پێشمەرگەکانیش دەنگی ناڕەزاییان لێبەرز بووەوە. سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنیدا وتی (**بژی تورکیا و بەنەفرەت بێت پەکەکە**)، بەڵام گەلی باشور پێیان وابوو ئەمە قسەیەکی هەڵەیە. ئابڵوقە ببووە هۆکار کە دەنگی ناڕەزایی و گلەیی لەهەمبەر ئەم شەڕە بێتە ئاراوە. لەناو شارەکان بۆ بەدەستخستنی خواردەمەنی لەبەردەم دوکان و نانەواکاندا سرە بەستن دەستی پێکردبوو، لەهەمانکاتیشدا نرخی هەموو شتێک

---

[١٠٧] ٥ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم ) . ( ئەحمەد سۆیلو ) .

بەرز ببووەوە. لەگەڵ هەموو ئەم شتانەدا (پەدەکە) لەهەمبەر ئەم ئابلۆقەیەدا ئانتی پڕوپاگەندی لەهەمبەر (پەکەکە) دەستپێکردبوو، لەهەمانکاتیشدا ئۆپەراسیۆنی گرتنی کوردی باکور بەردەوام بوو. پیاوەکانی پاراستن و کادێرەکانی (پەدەکە) لە شارەکاندا بە لیستی ناوی لایەنگر و ئەندامانی (پەکەکە و پاک)وە دەسوڕانەوە، کێیان بگرتایە رادەستی تورکیایان دەکردنەوە یان لە زیندانیان دەکردن. لە دەرەوەی شاری (زاخۆ) ٨٠ و لە شاری دهۆکیش ٢٦٠ گیراو هەبوون .

## دژایەتیکردنی شەڕی ناوخۆ لەلایەن دیاسپۆرتی کوردەوە

ڕەوەندی کورد لە ئەڵمانیا بە هەموو پێکهاتەکانییەوەی و بە ئامادەبونی لایەنگرانی هەموو پارتەکانیشەوە لە شاری (هیدلبێرگ) پەیامێکیان ئارستەی پەرلەمانی هەرێمی کوردستان کرد کە بەم شێوەیە بوو (**پێویستە بە زووترین کات ئەم شەڕی ناوخۆ نەگریسەی کورد کوژییە رابگیردرێت، پێویستیشە رادەستکردنی شۆڕشگێرانی یەکتر بە وەڵاتانی داگیرکەر رابگیردرێت، پێویستە یەنەکە و پەدەکە دەستبەرداری هاوکاریکردنی دەوڵەتی تورک ببن، پێویستە پەکەکە ش ئابلۆقەی ئابوری سەر باشور هەڵبگرێت و لایەنەکان دەستبکەن بە دیالۆگ**) .

هەروەها لایەنە کوردییەکانی وەک (ئەرنەکە، فیدراسیۆنی کورد لە نەرویج، پارتی سەربەخۆی کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران، رابەری شۆڕشگێری، لایەنگرانی یەککگرتن، کۆمەڵەی ئێران و بەرەی کوردستانی عێراق) لە ڕوونکردنەوەیەکی هاوبەشیاندا دەیانوت (**خاکی کوردستانماڵی هەموو کوردێکە، هیچ کەس و لایەنێک مافی ئەوەیان نییە کوردی پارچەیەکی کوردستان لە پارچەیەکی تر دەربکات، شەڕی براکوژی لەلایەن گەلەوە مەحکوم دەکرێت**)، زۆرینەی چین و توێژەکانی کورد بە مامۆستا و کرێکار و نوسەر و قوتابی و موزیسیان و هونەرمەندەوە سەرقاڵی ئامادەی بەیاننامەیەک بوون واژۆی بکەن، کە تیایدا هاتبوو(**هێرشەکانی یەنەکە و پەدەکە بۆ سەر پەکەکە بە هاوکاری سوپای تورک ئەمە دەبێتە لەناودانی شۆڕشی کوردی و هەربۆیە پێویستە بە زووترینکات کۆتایی بەم شەڕە بهێنرێت، داوادەکەین لایەنەکان لەڕێی دیالۆگەوە کێشەکانیان چارەسەر بکەن**)[١٠٨].

---

[١٠٨] ١٥ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

له رۆژی ١٣ی تشرینی یەکەم هەزارەها کورد لە شارەکانی (مانهایم و فریببورک)ی ئەڵمانیا بە ئامانجی شەرمەزاریکردنی هێرشەکانی (یەنەکە و پەدەکە) بۆسەر (پەکەکە) گردبونەوەیەکیان ئەنجامدا، لە باکوری کوردستانیش لە شار و شارۆچکەکانی وەک (مێردین، نوسەیبین، دیاربەکر) و دەوروبەری خەڵکی بۆ ئەوەی پرۆتێستۆی هێرشەکانی (یەنەکە و پەدەکە) و سوپای تورک بکەن بۆسەر (پەکەکە) لە ١٢ی تشرینی یەکەم چالاکی دوکان داخستنیان ئەنجامدا. چەندین ساڵ بوو ڕێکخستنەکانی (پەدەکە) لە (شەمزینان و هەککاری) خەڵکییان بە ڕێکخستن کردبوو، تەنانەت ئەوانیش دژ بە (پەدەکە) لەناو پرۆتێستۆکاندا بوون. شۆفێری لۆرییەکان باریان بارنەدەکرد و قوتابیانیش وەک پرۆتیستۆ نەدەچوون بۆ خوێندنگا، لە (نوسەیبین) چالاکی داخستنی دوکانەکان ماوەی ٢ ڕۆژی خایاند، لە شارۆچکەی (سلۆپی) تەنانەت کارمەندی شارەوانی شانبەشانی قوتابیان بەشدارییان کرد لە چالاکی مانگرتنی کاتی. لەشارۆچکەی (ئێگل)ی سەر بە (ئامەد) بەهۆی چالاکی پرۆتیستۆی شۆفێر و قوتابییەکانەوە ژیانی ناو شار سڕببوو، لە شارۆچکەی (بسمل)ی سەر بە (ئامەد)یش ماوەی چالاکی ٢ ڕۆژی خایاند[١٠٩].

شەڕی نێوان لایەنەکان ماوەی ١٠ ڕۆژ بوو بەردەوام بوو. بەهۆی زۆربوونی ناڕەزاییەکانەوە تەنانەت تورکەکانیش لەهەمبەر ئەم ڕەوشە ناڕەزاییان نیشاندا. کۆمیتەی ئەوروپای (پارتی ئیسلامی کوردستان) ناڕەزایی نیشاندا و لە بڵاوکراوەیەکیاندا دەیانوت **(لەگەڵ ڕاگەیاندنی حکومەتی کورد لە باشوری کوردستان کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان زۆر بەختەوەر بوون، قەدەری ئەم دەستکەوتەیش لە لێواری ئەو شەڕەدا ماوەتەوە کە لەنێوان لایەنە کوردییەکاندا هاتووەتە ئاراوە، کەمبونەوەی دژایەتیکردنی تورکیا لەهەمبەر ئەم حکومەتە نیشانەی ئەوەیە کە تورکیا خوازیاری زیادبون و چڕبونەوەی شەڕی براکوژی نێوان کوردانە و دەیانەوێت خوێنی زیاتر بڕێژرێت)** .

ڕێکخراوی (کاوە)ش لە بانگەوازییەکیدا دەیانوت (**هیواداریـن دەنگی تەقەی شەڕی براکوژی کپ بکرێنەوە و زەمینە خۆشبکرێت بۆ دیالۆگ و لەیەک حاڵی بوون و کۆتایی بهێنرێت بە ڕژانی خوێنی برا کوژی و مەحکومی هێرشەکانی بەرەی کوردستانی دەکەین بۆسەر پەکەکە**

---

[١٠٩] ١٥ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

**و دژی هەموو بیانو و هۆکارەکانی بەرەی کوردستانین کە هێرشی سەر پەکەکە ی پێدەکەن و مایەی قەبولیش نییە بە زەبری چەک پەکەکە لە باشور دەربکرێت) .**

چەپی شۆڕشگێرانی تورکیش لەمبارەیەوە رونکردنەوەیەکیاندا و دەیانوت **(بارزانی و تاڵەبانی لەپێناو راگەیاندنی حکومەتی کوردستان ئامادەن ببن بە مەقاشی دەستی ئەمەریکا تاکو دەسەلاتی خۆیان بە مەشروعییەت بکەن و لەبارەی دەرکردنی پەکەکە ش لە هەرێمەکە دەیانەوێت دڵی ئەمەریکا و تورکیای پێ خۆش بکەن و بۆ ئەم مەبەستەشیان ئامادەن هەزارەها پێشمەرگە بکەن بە قوربانی و ئەم جۆرە بیرکردنەوە تەسکە دەبێتە هۆکاری براکوژی و تەنها بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و تورکیای پێدەپارێزرێت، ئەمە شەرێکە کەلە ئاکامی نەفامییەوە سەرچاوەی گرتووە)**[110] .

---

[110] هەمان سەرچاوە .

## کۆبونەوە لە هەولێر بۆ بە مەشروعییەتکردنی پەلەمارییەکان

کاتێک شەڕو وپێکدادانەکان لە دووەمین هەفتە نزیک دەبووەوە، (یەنەکە و پەدەکە) بە پاڵپشتی پارتە کوردییەکانی کورد و بە هاوکاری سوپای تورک کە هێرشی سەر (پەکەکە) یان دەست پێکردبوو بۆئەوەی هۆکار و بیانووەکانی خۆیان بهێننە زمان و شیکاری مەسەلەکان بکەن درکیان کرد بۆ ئەم مەبەستە پێویستییان بە کۆبونەوەیەکی بەرفراوانە. ناڕەزایی شەقامی کوردی تادەهات لە زیادبوندا بوو، هەربۆیە بە پێویستیان دەزانی ناڕەزاییەکان کەمبکەنەوە و بەرەی خۆشیان فراوانتر بکەن، هەربۆیە درکیان بەوە کردبوو پێویستییان بە هاوپەیمانی زیاترە. لە ئاکامدا لە ١٩٩٢/١٠/١٢ بە پێشڕەوی (یەنەکە و پەدەکە) لە هەولێر کۆبونەوەیەکی فراوانیان ئەنجامدا. جگە لە (مەسعود بارزانی) و (جەلال تاڵەبانی) و سەرۆکی پەرلەمان (جەوهەر نامیق) و سەرۆک وەزیران (فوئاد مەعسوم) و هەموو وەزیر و پەرلەمانتاران، نوێنەری پارتەکانی وەک پارتی یەکگرتوو (مولازم شوان)، وەک شیوعی (عەزیز محەمەد)، وەک زەحمەتکێشان (قادر عەزیز)، نوێنەرانی ئاشوری و دیموکراتی ئێران (حەسەن شەریفی)، نوێنەری (یەکێتی گەلی شۆڕشگێڕانی کوردستان) و لە باکوری کوردستانیش (یەکبون، کاوە، کوک، هەڤگرتن، پەدەکەی تورکیا و ڤەژین) بەشداری کۆبونەوەکە ببوون. کۆکردنەوەی نوێنەرانی ئەم پارت و رێکخراوانە لەلایەن (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)یەوە دەیانویست ئەوە نیشان بدەن حیسابی پیاو ماقوڵانیان بۆ ئەو نوێنەرانە کردووە، دەیانویست لەرێی ئەم کۆبونەوەیەدا هۆکاری هێرشی سەر (پەکەکە) بۆڕای کوردی بهێننە زمان و خۆیان لە زیانەکان بێبەری بکەن، بەڵام مەخابن پیلان و بەرنامەسازی ئەم هێرشانەی سەر (پەکەکە) پێشوتر لە ئەنقەرە لەگەڵ سوپای تورک دارێژرابوو، هەربۆیە (یەنەکە و پەدەکە) ئێستا دەیانویست ئەم رێکخراو و پارتە کوردییانە بکەن بە شەریکی خۆیان. مامە و کاکە دەیانویست لەرێی ئەم سەرکردە و نوێنەرانی حزب و رێکخراوانەوە لەهەمبەر ناڕەزاییەکانی شەقامی کوردی هێرشەکانی سەر (پەکەکە) بە

مەشروعییەت بکەن و دەشیانویست بۆ جیهانی بسەلمێنن بەرەی فراوانی پارتە کوردییەکان لەلایەک و (پەکەکە)ش بە تەنها لەلایەکە. نوێنەری پارت و رێکخراوەکان هەریەکەیان خاوەن مشتێک لایەنگر بوون، ئەو تابلۆیەی لەلایەن (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)یەوە کێشرابوو پێیان وابوو بە جدی وەردەگیردرێت. ئەوانیش بە فیتی (یەنەکە و پەدەکە) بە ئارەزووی خۆیان کەوتبونە سەروگوێلاکی (پەکەکە). ئەوەی راستی بێت دەبوایە ئەم جۆرە گردبونەوەی حزبانە نەک بۆ شەڕی (پەکەکە) بەڵکو دەبوایە بۆ پێکهێنانی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان ئەنجام بدرایە. نوێنەرانی ئەو پارت و رێکخراوانە ناچار ببوون رەخنەی (پەکەکە) بکەن و خۆیان بە پاڵپشتی (یەنەکە و پەدەکە) نیشان بدەن. ئەوان بە گشتی لە ژێر رەحمی ئەو دوو زلهێزەی (یەنەکە و پەدەکە)دا دەژیان و هەناسەیان دەدا کە ئێستا پەلاماری (پەکەکە)یان دەدا، هەمووشیان بە بودجەی ئەو دوو حزبە دەژیان. ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو قەرزی منەتی خۆیان بە (یەنەکە و پەدەکە) بدەنەوە. دەرکردنی (پەکەکە) بۆ ئەم پارت و رێکخراوانە کێشەیەکی ئەوتۆ نەبوو، هەروەها لاوازکردنی ئەوان لەلایەن (یەنەکە و پەدەکە)شەوە کێشەیەکی ئەوتۆ نەبوو. (یەنەکە و پەدەکە) باشیان دەزانی ئەم پارتانە خاوەن هێزێکی ئەوتۆ نین دەست بنێن بە روویانەوە.

کۆبونەوەکە بە قسەی سەرۆکی پەرلەمان (جەوهەر نامیق) دەستی پێکرد کە دەیوت (**بۆئەوەی شەڕی پەکەکە نەکەین ئەوەی لە دەستمان هات کردوومانە چەندینجار بانگەوازیمان بۆکردن و مەخابن هیچ وەڵامێکمان بەدەست نەکەوتووە**). بەگوێرەی (جەوهەر نامیق) سەرەڕای ئەوەی نەخوازیاریشن بەڵام ناچارن لەرێی شەر و پەلاماردانەوە (پەکەکە) لە هەرێمەکەیاندا دەربکەن.

سەرۆک وەزیران (فوئاد مەعسوم)یش دەیوت (**پەکەکە دەستی گرتووە بەسەر ٣٥٠ گوندی سەر سنور، ئێرەش بۆ هێرشکردنە سەر تورکیا بەکار دەهێنن، بەهۆی هێرشەکانیانەوە تورکیاش گوندەکانمان بۆردۆمان دەکەن، ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیمان شەهید بوونە**). هەروەها (فوئاد موعسوم) ئیدیعای ئەوەی دەکرد لەگەڵ (پەکەکە)دا کێشەی ئایدۆلۆژییان نییە بەڵام گوایە پەکەکە لە هەرێمەکەدا بووە بە ئامرازی کارە تیرۆرییەکانی سەدام، فوئاد مەعسوم زیاتر باسی مەسەلەکانی دەکرد و ئەوەشی لەبیر نەدەکرد بڵێت ئەوان لایەنگری شەڕ نین.

(مەسعود بارزانی) دووەمین کەسی قسەکەر بوو لە کۆبونەوەکە، بارزانی زیاتر مەسەلەی ویژدانی دەهێنایە زمان و دەیویست سەرەنجی ئامادەبوان بەلای خۆیدا رابکێشێت و دەیوت **(دوای کودەتای سەربازی سوپای تورک لە ١٢ی ئەیلول کوردێکی زۆری کوردستانی تورکیا روویان لە عێراق کرد، یەکێک لەوانەش پەکەکە بوو کە هاوکارییەکی زۆرمان کردن. لە ساڵی ١٩٨٣ پەکەکە لە باشوری کوردستان ئەندامانی حزبی شیوعی و کوک یان کوشت، بۆئەوەی دەستبەرداری ئەم کارانانەیان بین چەندینجار ووشیارمان کردونەتەوە، بەڵام مەخابن هیچ سودێکی نەبوو)**. (مەسعود بارزانی) ئیدیعای ئەوەی دەکرد تاکو ساڵی (١٩٨٦) هاوکاری (پەکەکە) یان کردووە و لەبارەیووردەکارییەکانەوە دەیوت **(لە هەمان ساڵاندا زانیاریمان کەوتە بەردەست پەکەکە لەناو خەڵکیدا ئێمە و یەنەکە تۆمەتبار دەکەن بە سیخوڕ و خائین و کۆنەپەرست هەربۆیە دەستبەرداری هاوکارییان بوین و داوامان لێکردن کوردستانی عێراق جێبهێڵن، لەم دواییەشدا هێرشێکی زۆری نارەوایان کردووتەوە سەر من و مام جەلال، هەروەها بەڵگەمان بەردەست کەوتووە پەکەکە لە ساڵی ١٩٨٨ پەیوەندییان لەگەڵ ئیستیخباراتی عێراقدا بەستووە، پەیوەندییەکانی پەکەکە لەگەڵ وەڵاتە دراوسێکاندا پەیوەندییەکی ستراتیژی نییە)**. لەوەدەچوو (مەسعود بارزانی) بیەوێت بڵێت پەیوەندی خۆیان لەگەڵ وەڵاتانی دراوسێ کەسایەتی نییە بەڵکو ستراتیژییە، هەروەها (مەسعود بارزانی) دەیوت **(هەڵوێستی دوژمنانەی پەکەکە لەهەمبەر هێزە کوردییەکانی عێراق بەتایبەتی لە دوای ساڵی ١٩٩١ زیادیان کردووە و لەژێر ناوی پارتی ئازادی کوردستان جێ بۆ سیخوڕی عێراقی خۆشدەکەن لە هەرێمەکە جێگیر بین)**، بەگوێرەی (مەسعود بارزانی) گوایە حکومەتی سەدام حوسێن پارە و هاوکاری بۆ پەکەکە و (پاک) رەوانە دەکات.

(مەسعود بارزانی) دەیوت **(پێشنیارمان کرد بۆ پەکەکە سنور چۆڵ بکەن و بچنەوە ناو تورکیا، بۆئەم مەبەستەش هەموو رێیەکمان تاقیکردووە، بەڵام پەکەکە سوورن لەسەر هاتنەئاراوەی شەڕ)**. مەسعود بارزانی ئیدیعای ئەوەی دەکرد لایەنگری شەڕ نین بەڵام بە زۆرە ملێی پێوەی لکاون. لەدوای قسەکانیشیدا هاتە سەر مەرامی راستەقینەی خۆی و تکایەکی بچوکی لە ئامادەبوان هەبوو کەلەم شەڕەدا هاوکارییان بکەن !.

لەدوای (مەسعود بارزانی) سکرتێری گشتی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی هاتە بەردەم مایک، تاڵەبانی سەرنجی دەخستە سەر پارچەبوونی ریزەکانی کورد و لەمبارەیەوە دەیوت

**(پێویستە هێزە کوردییەکان بەشێوەیەک مامەڵەی گشتی خۆیان بکەن زیان بە لایەنی تر نەگەهێنن).** جەلال تاڵەبانی بە دەربڕینی هەڵویستی (پەکەکە) لەهەمبەر لایەنە کوردییەکانەوە دەستی بە قسە کردنکرد و ئیدیعای ئەوەی دەکرد (پەکەکە) بە (یەکێتی)شەوە هەموو پارتە کوردییەکان گوایە سیخوڕی بۆ ئیمپریالیزم و (میت)ی تورک دەکەن و عەشایرن و (پەکەکە) بڕیاری کوشتنی گەلێک لە سەرکردە و کادێری رێکخرا و پارتە کوردییەکانی دەرکردووە و لەم بارەیەوە (جەلال تاڵەبانی) دەیوت **(ساڵانێکی دووروودرێژ پەیوەندیمان لەگەڵ ئێران و سوریادا هەبووە، بەڵام وەک پەکەکە لە ئاستی ئیستیخبارات نەبووە، پەیوەندییەکانی ئێمە شەفاف بووە و زیانی بە کورد نەگەیاندووە. هەتا ماوەیەکی نزیکیش پەیوەندیمان لەگەڵ پەکەکە دا هەبووە و بە شێوەیەکی باشیش هاوکاری پارە و چەکیشمان کردوون، بۆ پەیوەندی بەستینیش لەگەڵ وەلاتانی وەک لیبیا و سوریا و وەلاتانی تریش دەستی هاوکاریمان بۆ درێژ کردوون. لە ساڵی ١٩٨٦ پەکەکە هەوڵیاندا پەیوەندیمان لەگەڵ ببەستن و ئەمەش بە پرۆتۆکۆڵێکی نێوانمان کۆتایی پێهات، هەروەها لە کۆنگرەی مانگی شوباتی ١٩٩٢ دا رێگاماندا لە کۆنگرەی یەکێتیماندا نوێنەریان قسە بکات، کەچی نوێنەرەکەیان لە کۆنگرەکەماندا تۆمەتێکی زۆری خستە پاڵمان و بەزۆر شت تاوانباریان کردین)،** جەلال تاڵەبانی ئیدیعای ئەوەی دەکرد پەیوەندییەکانی پەکەکە لەگەڵ ئێران و سوریا بە مەترسیدار دەبینرێت، تاڵەبانی دەیوت **(مادام پەکەکە و سەدام، مادام پەکەکە و ئێران پەیوەندییان هەیە دەمانزانی ئەم شەڕە هەردەبێت بێتە ئاراوە)،** بەمشێوەیە (جەلال تالەبانی) هەڵگیرساندنی شەڕی باشوری دەخستە ئەستۆی (پەکەکە) وە !.

دوای تەواوبونی قسەکانی (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) نوبە هاتە سەر نوێنەری پارت و رێکخراوەکانی تر. نوێنەری (یەکبوون) دەیوت **(ئێمە ئامادەین هاوکاری هەموو بڕیارێکی حکومەتی هەرێمی کوردستان بکەین، هاتنە ئاراوەی ئەم شەڕە لە نێوان پەکەکە و بەرەی کوردستانیدا برینێکی گەورەی لە دڵی کورداندا دروست کرد، ئێمە لایەنگری ئەم شەڕە نین و پێویستە کێشەکان لەرێی دیالۆگەوە چارەسەر بکرێن، ئێمە ئامادەین بۆ رێگری لە شەڕ و کۆتایی پێهێنانی ناوبژی بکەین و پێویستە کۆمیتەیەک پێکبهێنرێت کە زۆر لە پەکەکە بکات رێگای دیالۆگ بگرێتەبەر).**

نوێنەری (کوک) هەروەکو نوێنەری (یەکبوون) داوای پێکهێنانی کۆمیتەی دەکرد، نوێنەری (کاوە)ش پێشنیاری بەستنی کۆنگرەی نەتەوەیی کوردی دەکرد و پشتیوانی خۆشیانی بۆ دەسەڵاتی باشور دەهێنایە زمان. نوێنەری (کاوە) رەخنەی (پەکەکە)ی دەکرد و دەیوت **(پێویستە لە باکوری کوردستان لە شوێنی پەکەکە بەدیلێکی تر پێکبهێنرێت)**. سەیروسەمەرە ئەوەبوو نوێنەری (کاوە) سەبارەت بە دۆزینەوەی بەدیلی (پەکەکە) هیچ پێشنیارێکی نەبوو.
ئەم کۆبونەوەیە کاتژمێر (١١) دەستی پێکرد و دانیشتنی یەکەمیان تاکو دوای نیوەڕۆی خایاند و ووتە بێژی کۆبونەوەکە نوێنەری (حزبی شیوعی) بوو. (عەزیز محەمەد) دەیوت **(رەوشی کوردستانی عێراق هێشتا سەقامگیر و روون وئاشکرا نەبووەتەوە، هەربۆیە پێویستە هەمووومان پەنا بۆ راگۆڕینەوە بەرین)** هەروەها (عەزیز محەمەد) (پەکەکە)ی رەخنە دەکرد و ئەوەشی دەوت هەڵوێستی (پەکەکە) لە بەرژەوەندی گەلی کورددا نییە، عەزیز محەمەد پێشنیاری ئەوەیدەکرد بۆ دانوساندن لەگەڵ (پەکەکە) کۆمیتەیەک دروست بکرێت بۆ ئەوەی چارە بۆ کێشەکان بدۆزرێتەوە، هاروەها دەیوت **(دوای کۆبونەوەکە پێویستە لێدوانێکی وابدرێت کە نەبێتە مایەی قوڵبونەوەی کێشەکان)**.
لە دانیشتنی دووەمی کۆبونەوەکەدا نوێنەری (پەدەکە)ی ئێران (حەسەن شەریفی) پشتگیری ئەو پێشنیارەی دەکرد کۆمیتەیەک دروستبکرێت تاکو دانوساندن لەگەڵ (پەکەکە) بکات. نوێنەری (هەڤگرتن و پەدەکە)ی تورکیا دەیانوت **(ئێمە بەشەڕی نێوان پەکەکە و بەرەی کوردستانی نیگەرانین، ئەو هەڵویستەی پەکەکە لەهەمبەر بەرەی کوردستانی نیشانی دەدات ناحەقانەیە، پەکەکە پێویایە هەموو لایەنەکانی کوردستان خائینن)**.
ئەو خواردنە چەورەی کە لەسەر شەرەفی میوانەکان دروستکرابوو خورا. لیژنەیەک لە (حزبی شیوعی، یەککگرتن، کاوە، یەکبون، کۆمەڵە و پەدەکە ئێران) پێکهێنرا تاکو لەبارەی دەرەنجامی کۆبونەوەکە راپۆرت بنوسن، لەهەمان کات و ساتدا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە (خواکورک) پەلاماری هێزەکانی گەریلای (پەکەکە)یان دەدا.
مامە و کاکە لەم کۆبونەوەیەدا ئەوەیان بەدەست خست بەرەیەکی هاوبەش دژ بە پەکەکە پێکبهێنن، بەمشێوەیەش لەسایەی دەرەنجامی ئەم کۆبونەوەیەدا رێگرییان لە نارەزاییەکان دەکرد و دەشیان ویست ئەو شەڕی **(برا کوژی)**یەی بە هاوکاری سوپای تورک دەستیان پێکردووە لەرێی ئەم کۆبونەوەیەدا بە مەشروعییەتی بکەن.

## جموجۆڵی سەندویچ بۆ رزگارکردنی (پەدەکە)

دەوڵەتی تورک لەو دیوی پەردەی شەڕەکەوە بوو، بەگویرەی پیلانەکەیان ئەگەر هێزەکانی (پەدەکە و یەنەکە) نەیانتوانی هیزی گەریلا لە هەریمەکە هەڵتەکێنن ئەوا سوپای تورک موداخەلەی راستەوخۆیان دەکرد. ناوی نهێنی ئەم ئۆپەراسیونەشیان ناونابوو (ساندەویچ)، بۆ دەستپێکردنی ئەم ئۆپەراسیۆنەش چاودێری کاردانەوەکانیان دەکرد، ئەگەر ببینرێت گوشار بۆسەر (پەدەکە و یەنەکە) زیادیان بکردایە ئەوە جموجوڵی سەربازی سوپای تورک دوادەخرا و لەهەمانکاتیشدا دەوڵەتی تورک سووربوو لەسەر درێژەکێشانی شەڕوپێکدادانەکان.

بەڵام وەکو ئەوەی ئەوان خوازیاری بوون چاوەڕوانییەکان و داخوازییەکان نەهاتنەدی، (پەکەکە) وەکو گوێز رەق بوو، بە ئاسانی نەدەشکا، بەتایبەتی لە ناوچەی (هەفتانین) هێرشی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بێ ئەنجام بوون. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) پێشتر هێرشیان دەکرد بەڵام ئێستا مەترسی لەدەستدانی سەنگەرەکانیان هەبوو. بەدەم درێژبوونەوەی شەڕوپێکدادانەکان لەناو خەڵکی قسەی ئەوە بڵاوببووەوە لەوانەیە گەریلاکانی (پەکەکە) بێنە ناو (زاخۆ)وە، لەناو ریزەکانی پێشمەرگەدا وورەی شەڕکردن نەمابوو، هەتا شەڕوپێکدادان درێژەی بخایاندایە (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) کاری هاوبەشیان لەگەڵ دەوڵەتی تورک بە ئاشکراتر دەکرد و ئەمەش ببووە مایەی دۆڕاندنی رەوشی سیاسی شەڕەکە. ئاستی وورە بەرزی دەرونی شەڕەکە بەلای گەریلاکانی (پەکەکە) داشکابووەوە، رەوشی شەڕەکە بەشێوەیەک گۆڕدرا کە ئیتر موداخەلەکردنی سوپای تورک لە کاتوساتدا بێت، بەڵام موداخەلەکردنی سوپای تورک لەم ساتەوەختەدا نەک بۆ لەناودانی گەریلاکانی (پەکەکە) بەڵکو زیاتر بۆ رزگارکردنی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بوو. لە شەڕەکانی ١٢و١٣ی تشرینی یەکەم پێشمەرگەکانی (پەدەکە) سەنگەرێکی زۆریان لەدەست دابوو، گەریلاکانی (پەکەکە) لە سەنگەرەکانی خۆیانەوە دەیانتوانی شارۆچکەی (زاخۆ) ببینن، ئیتر دەبوایە سوپای تورک بە

شێوەیەکی ڕاستەوخۆ موداخەلەی بکردایە و (پەدەکە) لەو ڕەوشە ڕزگار بکات کە تێی کەوتبوو.

هێزی سوپای تورک لە ئێوارەی ١٤ی تشرینی یەکەم لە (ئشکفێرەن)ی سەربە (ئولودەرە) و (تاشدەلەن) بە درێژایی گوندەکانی (کایەدیبی) چوونە ناوچەی (سنات)ی باشوری کوردستانەوە. لە بەیانی ڕۆژی ١٥ی هەمان مانگدا ژمارەیەکی زۆری جەندرمە بۆ ناوچەکە گوێزرانەوە، جاشەکانی عەشیرەتی (بابات و گوویی) بەشدارییان لە جموجوڵەکانی سەر بە (هەفتانین) کرد. ئەو تۆپخانەیەی لە (ئولودەرە)ی سەر بە (هەککاری) جێگیر کرابوون گوازرانەوە بۆ ناوچەکە، ئەم ئۆپەراسیۆنە لەلایەن عەمیدی جەندرمە (مەتە سەیار) کە بارەگاکەی لە (شرناخ) بوو دەبرا بەڕێوە. سەرەتا (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) ویستییان ئەم ئۆپەراسیۆنە زۆر بە نهێنی و بێ دەنگانە ئەنجام بدرێت، هەربۆیە لە ئاستی ئەم جموجۆلە سەربازییە خۆیان لە گێلی دەدا. نوێنەری (پەدەکە) لە دیاربەکر قینی خۆی دانەدەمرکاندەوە و دەیوت (**شتێوانییە مەحاڵە هێزی سوپای تورک بێنە ژوورەوە، ئەگەر بێنە ژوورەوە ئەوا بەرەنگارییان دەبینەوە**)، ئەم قسانە کە دەکرا تەنانەت خاوەنەکەیشی باوەڕی پێنەبوو[111].

نوێنەری (یەکگرتن) لە ئەنقەرە دکتۆر (خەیروللە ئەحمەد ساڵح) دەیوت (**٥ کم سنور گرنگ نییە**)، سەبارەت بە جموجۆڵی سوپای تورک بە شەرمێکەوە دەیوت (**بەڵێ ڕاستە**) [112]. لە دوای ڕاگەیاندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان یەکەمجار بوو سوپای تورک بە پیادە بچێتە باشوری کوردستانەوە. گوایە هەرێمەکە مافی حقوقی نێو دەوڵەتی خۆی هەبوو.

سەرکردەیەکی سوپای تورک دەیوت فڕۆکە جەنگییەکانیان لە قوڵایی ٣٠ کم ناو خاکی باکوری عێراقیان بۆردۆمان کردووە، گوایە بۆردۆمانەکانیان لە ئاکامی دەستنیشانکردنی شوێنەکانی گەریلا لە (هەفتانین) کە ویستویانە بەرەو سنور بچن **هاتوونەتە** ئاراوە، بەرپرسیارانی سوپای تورک نەیاندەویست بەرامبەر بە گەریلاکانی (پەکەکە) دانبە شکستییەکانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە و یەنەکە) بهێنن.

---

[111] ١٨ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠)

[112] هەمان سەرچاوە.

ئەو سەردەمە لە تورکیا (حیکمەت چەتین) کە کەسێکی کورد بوو ببوو بە سەرۆک وەزیران و وەزیری دەرەوەیان دەیوت (**بۆئەوەی گەریلاکانی پەکەکە لە سەر سنورەکان خۆیان نەشارنەوە و هاتوچۆ نەکەن ریۆشوێنی پێویستمان گرتووەتەبەر**) و هەروەها جموجۆڵی پیادەیشی بەدرۆ دەخستەوە. سەرۆک وەزیرانی تورکیا (حیکمەت چەتین) لە ١٥ی مانگی تشرینی یەکەم کە وەڵامی پرسیارەکانی نەدەدایەوە دەیوت (**وەک سەرەتا بۆ ئەوەی تیرۆریستان لەسەر سنورەکانمان هاتوچۆ نەکەن کاری پێویستمان ئەنجامداوە، ئەوێ ناوچەیەکی شاخاوییە، هەربۆیە لە شوێنی جیاواز لە چاو شوێنەکانی تر ٣ بۆ ٥ کم ئیحتیاتی پاراستنی زیاترمان رچاوکردووە**) .

## ( پێشمەرگە مەجبورن پەکەکە دووربخەنەوە )

سوپاسالاری سوپای تورک (دۆغان گورێش) روونکردنەوەیەکی بۆ (فاتیح چەکیرگە)ی پەیامنێری رۆژنامەی (حورییەتی) تورکیدا و دەیوت (**پێشمەرگە مەجبورن پەکەکە دووربخەنەوە**) هەروەها سەبارەت بە شەڕەکان، دۆغان گورێش دەیوت (**تیرۆریستانی پەکەکە ناوچەکانیان لوغم رێژکردووە، لەبەرئەوەیە پێشمەرگە نەیانتوانیوە پێشرەوی بکەن و نەیانتوانی سەنگەرەکانی پەکەکە بگرن**)، بەڵام لەبارەی دەستپێکردنی جموجۆڵە سەربازییەکەیانەوە دۆغان گورێش هیچی نەدەوت.

وەزیری بەرگری تورکیا (نەوزاد ئەیاز) دەیوت (**وەکو دەزانرێت لە نێوان پێشمەرگە و گەریلاکانی پەکەکە کێشمەکێش لەئارادایە، گەریلاکانی پەکەکە لە پێشمەرگەکان دوور کەوتونەتەوە، گەریلا هاتوون بۆسەر سنوری ئێمە و کەوتونەتە سەنگەر دروستکردن، هەربۆیە کاردەکەین تاکو دووریان بکەینەوە، مەسەلە ئەوە نییە کە ئێمە هاوکاری لایەنێک دەکەین یاننا، سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەم جموجۆڵە چەنێک دەخاھێنێت ناتوانم هیچ بڵێم، بەڵام بۆ ئەنجامی ئەم کارە پێویست بە چەنێک کات بکات ئەوەندە دەخاھێنێت**)[112].

(پەکەکە) نەک تەنها لە باشور بەڵکو لە ئاستی نێو دەوڵەتیشدا گەمارۆ درابوو، لایەنەکان لە یەکەم رۆژانی دەستپێکردنی جموجۆڵی (ساندەویچ)دا نەیاندەویست هێز و توانای خۆیان بدرکێنن. سەرەڕای هەموو ئەو گوشارانەش (پەکەکە) خۆی بەدەستەوە نەدەدا. هێزەکانی باشور بەتایبەتی (پەدەکە و یەنەکە) بۆئەوەی بۆ گەل ئاشکرانەبێت هاوپەیمانی هێزی دەرەکین و (پەکەکە) نەخەنە ناو ریزی هێزێکی شۆڕشگێڕەوە کە ئەمان هێرشیان بۆدەهێنن و (پەکەکە) لەسەر حەق دەرنەکەوێت ئەوەی لەدەستیان بهاتایە دەیانکرد و راستییەکانیان لە خەڵکی دەشاردەوە و بەتایبەتیش نەیاندەویست دەست تێکەڵییەکەیان لەگەڵ دەوڵەتی تورک ئاشکرا ببێت.

لە ١٣ی تشرینی یەکەم ئەنقەرە میوانێکی هەبوو ئەویش سەرۆکی پەرلەمانی عێراق (مەهدی ساڵح) بوو کە لەلایەن سەرۆکی پەرلەمانی تورکیاوە (حوسامەتین جیندوروک)ەوە بانگێشی

---

[112] ١٨ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ، گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠)

ئەنقەرە کرابوو. (مەهدی سالح) لەبارەی راگەیاندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە بۆ رایگشتی تورک نارەحەتی خۆی دەهێنایە زمان و هەروەها مەهدی پێشنیاری کاری هاوبەشی بۆ دەوڵەتی تورک دەکرد بەیەکەوە ئاسایشی وەلاتی عێراق لە ئەستۆ بگرن. ئەم سەردانەی (مەهدی سالح) سیاسەتمەدارانی تورکیای کرد بە دوو بەشەوە. ئەوانەی لایەنگری ئەمەریکا بوون بە هاتنی (مەهدی سالح) مەمنون نەبوون، ئەوان پێیان وابوو هاتنی سەرۆکی پەرلەمانی عێراق (مەهدی سالح) بۆ تورکیا لەوانەیە نیگەرانی ئەمەریکای لێبکەوێتەوە، بەلام سەردانی مەهدی بۆ تورکیا سەردانی نوێنەری وەلاتێکی هەروا هاکەزایی نەبوو. ئەوانەی نارازیبوون بە پەیوەندی تورکیا لەگەڵ دەسەلاتدارانی باشور پێیان باش بوو تورکیا دژ بە کورد پەیوەندی لەگەڵ سەدام ببەستێت باشترە.

پێش ئەوەی لە ١٥ی هەمان مانگدا (مەهدی سالح) لە تورکیا جیاببێتەوە، سەبارەت بە راگەیاندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان وتی (**ئەو حکومەتەی یەک لایەنە راگەهێنراوە هەرگیز مایەی قەبولکردن نییە**)، (مەهدی سالح) لەبارەی (جەلال تالەبانی و مەسعود بارزانی)یەوە دەیوت (**ئەوانەی هەوڵدەدەن خۆیان بکەن بە سەرکردە**). مەهدی هەردوکیانی بەوە تاوەنبار دەکرد کە لە هێزی دەرەکییەوە هاوکاری وەردەگرن و دەیانەوێت بەنەرخترین بەشی عێراق پارچە بکەن و هەروەها سەبارەی بە شەڕی نێوان (پەدەکە و یەنەکە و پەکەکە) دەیوت (**ئێمە لە نێوانیاندا نەبوینە بە لایەن**)[١١٤].

دوای ئەوەی سەرۆکی پەرلەمانی عێراق (مەهدی سالح) تورکیای جیهێشت، ئەمجارەیان سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان (جەوهەر نامیق)ی سەر بە (پەدەکە) لە ١٧ی تشرینی یەکەم لەگەڵ وەفدێکی یاوەریدا گەیشتە تورکیا. دوای ئەوەی بە کوپتەریکی هێزی (چەکوشی) هاوپەیمانان (جەوهەر نامیق) و وەفدەکەی گەهێنرانە دیاربەکر، پاشان لەلایەن والی دیاربەکرەوە بە فرۆکەیەکی تایبەت رەوانەی ئەنقەرە کران، (جەوهەر نامیق) لەم گەشتەیدا هاتبوو بۆ راگۆڕینەوە[١١٥].

---

[١١٤] ١٨ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ، گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠)

١٨ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حوریەتی تورکی ).[١١٥]

## دژ بە (پەکەکە) پەلاماری زیاد دەکرێت

کاتێک سوپای تورک جموجۆڵی سەربازی دەست پێکرد، گەریلاکانی (پەکەکە) بۆسەر (کیرە و شەرانیش)ی سەر بە (زاخۆ) هێرشێکی نوێیان ئەنجامدا. ئەم پەلامارییە ئەوەندە لە (زاخۆ)وە نزیک بوو تەنانەت خەڵکی دەیانتوانی بە ئاسانی ببینن. ئەم هێرشە بۆسەر بنکەیەکی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) ئەنجامدرابوو کە تاکو سبەی رۆژی دوایی خایاند و چەکی قورسی تێدا بەکار هێنرا، پێشمەرگەکانیش لەهەمبەر ئەم هێرشە خۆیان پێڕانەگیرابوو، هەتاکو نزیک خاڵی پرسگەی (زاخۆ) کشابونەوە. لە هێرشەکەدا فەرماندەی (پەدەکە) بەناوی (زبۆی مەحمود و مەلا رەمەزان قومری) گیانیان لەدەستدا. گوندنشینێک شاهیدحاڵی رووداوێک ببوو، دەیگێڕایەوە کەلە نزیک (چوکورجە) خۆی مەڵاسداوە و لە نزیک گوندی (پردی بادوک) کە ٦ کم دوورە لە (چوکورجە)وە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە بۆسەیەکدا ٢ گەریلایان کوشتووە، لەسەر ئەم رووداوە گەریلاکانی (پەکەکە) ئەم هێرشەیان ئەنجامداوە و لە ئاکامیشدا (رەمەزان قومری) و چەند پێشمەرگەیەکی تریش گیانیان لەدەستداوە. (مەلا رەمەزان و زبۆی مەحمود) کەسانی رێزدار و خۆشەویستی ناو خەڵک بوون و لەناو (پەدەکە) خاوەن پێگەی جەماوەری بوون. بەهۆی ئەو شەڕەی لە (هەفتانین) هاتەئاراوە کە گەریلاکانی (پەکەکە) تێیدا باڵا دەست بوون (پەدەکە) ناچارمابوو لە (ئاکرێ)وە سەدان پێشمەرگە رەوانەی (هەفتانین) بکات. دوای ئەوەی پێشمەرگەکان گەیشتنە (هەفتانین) لەسەر رێنماییەکانی ئەفسەرە تورکەکان سەنگەریان گرت.

دوای ئەوەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە (هەفتانین) ناچارمان پاشەکشێ بکەن، شوێنێکی زۆری ستراتیژی کەوتە ژێر دەستی گەریلاکانی (پەکەکە)وە و فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکیش زۆر بە سەختی کەوتنە بۆردۆمانکردن. هەدەفی سەرەکی بۆردۆمانەکانیش ئەو شوێنانەبوون کە پێشمەرگە جێیان هێشتبوو. فەرماندەکانی پێشمەرگە بۆ ئاڵوگۆڕی

بیروبۆچون و بەدەست خستنی تەکتیکی نویێ زوو.. زوو دەچون بۆ (زاخۆ) تاکو چاویان بە ئەفسەرەکانی تورک بکەویت، بۆ ئەم مەبەستە فەرماندەکانی تورک کە پیلان و تەکتیکی شەڕەکانیان دەبرد بەڕێوە و شوێنی بۆردۆمانی فڕۆکەکانیان دیاری دەکرد زیاتر لە بەشی (زاخۆ) جێگیر ببوون.

## بۆسە دژ بە سوپای تورک

لە بەرواری ١٥ی تشرینی یەکەم سوپای تورک چوونە ناوچەکانی (کانیماسی، هیزل و سنات)ی باشوری کوردستان و لەهەمانکاتیشدا بە درێژایی گوندەکانی (چیمەنلی) سەربە (چوکورجە و قایەدیبی و تاشدەلا)ی سەربە (ئشکفێرەن)ی سەر بە (ئولودەرە) لەگەڵ گەریلاکانی (پەکەکە) کەوتنە شەڕەوە. لە یەکەم رۆژدا سوپای تورک بەهۆی لوغم رێژکردنی ناوچەکانەوە لەلایەن گەریلاوە و بەهۆی بەرپەچدانەوەیەکی بەهێزی گەریلاوە نەیانتوانی پێشڕەوی بکەن، هەروەها لە زۆر شوێنیشدا کشانەوە. دەتوانرێت بوترێت هێزی سوپای تورک لەیەکەم رۆژی جموجۆڵەکەیاندا هیچ شانسێکی ئەوتۆیان نەبوو.

لە ١٦ی تشرینی یەکەم سوپای تورک جموجۆڵێکی بەرفراوانتریان دەست پێکرد کە لەلایەن (٣٢) فەرماندەی پلە بەرزی ناو سوپا دەبرا بەڕێوە. لەکاتی جەولەیاندا دوو فەرماندەی پلە بەرزی سوپای تورک لە ئاکامی تەقینەوەی لوغمی گەریلاکان بریندداربوون کە پێکهاتبوون لە (مەتە سەیار و ئۆنەر هزلان). وەزیری ناوخۆی تورکیا (عیسمەت سەزگین) دەیوت **(پەکەکە دەگەڕێن بەشوێن کولوبەرێک تاکو خۆیانی تێدا بشارنەوە)**[١١٦].

لە هەمان رۆژاندا هێزی سوپای تورک لە بارەگای (خەلیلی) سەربە (ئولودەرە) روبەڕوی هێرشی گەریلاکانی (پەکەکە) بوونەوە، هەروەها هێزێکی یەکینەی زرێپۆش و پیادەی سوپای تورک کە بەسەر (سلۆپی)دا دەچون بۆ (هیزیلچای) کەوتنە ناو بۆسەیەکی گەریلاوە. لەئاکامی ئەو شەڕو پێکدادانەی هاتنە ئاراوە ژمارەیەکی زۆری سەربازی تورک کوژران،

---

[١١٦] ١٨و١٩ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی)

لەهەمانکاتدا ژمارەیەکی تری زۆری سەربازی تورک کەلە (چوکورجە و ئولودەرە)وە سنوریان بەزاندبوو کەوتنە ناو لوغمی گەریلاکانەوە. لە ناوچەکانی (بازینگ و ئاڤاگیزی) شەڕو پێکدادان لە نێوان سوپای تورک و گەریلاکانی (پەکەکە) روویدا، بەگوێرەی سەرچاوەکانی گەریلا لەو شەڕوپێکدادانانەدا بەلای کەمەوە لاشەی (٢٠) سەرباز لە گۆرەپانی شەرەکە بەجێماون. لەهەمانکاتدا بۆردومانی فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک لە ناوچەی (خواکورک) بەبێ وەستان بەردەوام بوو. لە نزیک گوندەکانی (سامانلی، دەرەجیک و بیگاشنە)ی سەربە (شەمزینان) سوپای تورک و جاشەکانیان بە پێشەوایەتی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) چوونە باشورەوە، هەروەها چەند یەکینەیەکی تایبەتی سوپای تورک کە پێیان دەوترا (کۆماندۆی شاخی) بە جلوبەرگی پێشمەرگەوە چوونە باشورەوە. ئەو جاشانەی بەشدارییان پێدەکرا لە ئۆپەراسیۆنەکاندا تاماوەیەکی زۆریش رێگایان پێنەدەدرا بگەڕێنەوە ماڵی خۆیان، لەهەمانکاتیشدا سوپای تورک بەردەوام دەبابە و زرێپۆش و تۆپیان بۆ (شەمزینان) دەگواستەوە.

(٢٠٠) پێشمەرگەی سەر بە (پەدەکە) گەیشتنە بارەگای سوپای تورک لە (سامانلی) و دوای ئەوەی ئازوقە و تەقەمەنییان وەرگرت لەبەرئەوەی ماوەیەکی کەم بوو هێرشکرابووە سەر بارەگاکەیان بارەگا تورکییەکە بەشێکییانی لەلای خۆیان گلدایەوە.

دوای ئەوەی سوپای تورک سنوری بەزاند و دەیانویست هێرش بۆ (خواکورک) بەرن سوپای ئێرانیش ژمارەیەکی زۆری سەربازی خۆیان گواستەوە بۆسەر سنورەکان و بە درێژایی ماوەی شەڕ لە ئینزاردابوون. سەرچاوەیەکی سەر بە (پەکەکە) دەیوت ئەم ئامادەباشییەی سوپای ئێران دژ بە گەریلاکانی ئەمانە، سەرچاوەکە دەیوت (**دەوڵەتی تورک و هێزی پێشمەرگە بوختانی ئەوە دەکەن گوایە ئێران هاوکاری ئێمە دەکەن**). سوپا سالاری سوپای تورک (دۆغان گورێش) سەبارەت بە پەیوەندییەکانی نێوان (پەکەکە) و ئێران دەیوت (**سەبارەت بە هەواڵی ئەوەی ئێران هاوکاری پەکەکە دەکات لەم بارەیەوە ئێمە بەڵگەی تەواومان بەدەستەوەنییە**)، بەڵام هاتنی سوپای ئێرانی بۆسەر سنور پشتڕاست دەکردەوە[١١٧].

---

[١١٧] ١٧ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە .

## (هێشتا هیچ سەنگەرێمان نەگرتووە)

گواستنەوەی پێشمەرگە لە شارەکانی وەک (هەولێر، سلێمانی و ئاکرێ) بۆ بەرەی شەڕی هەفتانین بەردەوام بوو. چەند ڕۆژێک پێشوتر ٤ گردەکەی (ئاڤگەنی) لە ژێر دەستی گەریلاکان دەرکرابوون، دوای هێرشێکی بەرفراوانی گەریلا جارێکی تر کەوتەوە ژێر دەسەلاتی گەریلاکانەوە. لە شەڕەکانی (شابانین، قەلای دێرێ و بۆسەلێ) ٧ پێشمەرگە گیانیان لەدەستدابوو، دوانیان فەرماندەی (پەدەکە و یەنەکە) بوون بەناوی (حاجی مەلۆ و عەلی فەیسەل)، پاشان تەرمەکانیان هێنرایەوە بۆ زاخۆ.

لە بەیانی ڕۆژی ١٦ی تشرینی یەکەم بۆیەکەمجار پەیامنێرەکان توانیان بچنە مەیدانی شەڕەکانی نێوان (باتوفە و زاخۆ)وە. دوای ئەوەی (٣) ڕۆژ شەڕوپێکدادانەکان بەشێوەیەکی زۆر سەخت بەردەوام بوون کپی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا. ڕێگاکان بە چڕی کۆنترۆڵ کرابوون، پەیامنێری کەناڵی (TRT)ی دەوڵەتی تورک بۆئەوەی سەرکەوتنەکانی پێشمەرگە تۆمار بکات لە چاوەڕوانیدا بوو، هەواڵەکانی ئەو ڕۆژانە لەبارەی شەڕەکانەوە بەمشێوەیە بوون :

**(ژمارەی پێشمەرگە لەگەڵ ئەوانەیشی لە هەرێمی سۆرانەوە هێنراون دەگاتە ٥ هەزار، لە کەناری ڕێگاکاندا لە چاوەڕوانیدان).**

**(ڕێگاکانی نێوان زاخۆ و باتوفە بووەتە سنوری نێوان پێشمەرگە و گەریلا. ناوچە دارستانییەکانی نێوان دەرکار و باتوفە بەهۆی بۆردۆمانە ئاسمانییەکانی فڕۆکەی تورکیاوە بەتەواوەتی سوتاون).**

**(پێشمەرگە دەڵێت بەهۆی بۆردۆمانەکانەوە لە هەفتانین بە سەدان کم باخ و ڕەز سوتاون، چیاکانیش بوونە بە خۆڵەمێش).**

**(فەرماندەکانی پێشمەرگە دەڵێن کێشەی تەقەمەنییان سەریهەڵداوە، گەریلاکان لە ڕەوشی بەرگری دەرچونە و کەوتونەتە ئەنجامدانی هێرش و بەردەوام شوێنەکانی خۆیان دەگۆڕن، هەربۆیە پێشمەرگە دەترسێت کە لەوانەیە هەرکاتوساتێک بێت هێرشیان بۆبهێنرێت).**
**(لە هەفتانین تاکو ئێستا هیچ سەنگەرێک نییە لە ژێر دەستی گەریلاکان دەرهێنرابێت، بەهۆی ئابڵوقەی پەکەکەوە برسێتی و نەبوونی لە شارەکانی وەک دهۆک و زاخۆ سەریان هەڵداوە)**[118].

لە شارەکانی وەک (دهۆک و زاخو) گۆرانی سەر بە (پەکەکە) قەدەغە کرا، پێش دەستپێکردنی شەڕ لە کەناڵەکانی (یەنەکە)وە گۆرانی گروپی مۆسیقای (بەرخودانی) ی سەر بە (پەکەکە) لێدەدرا، بەڵام لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕ ئەم تیپەش لەلایەن (یەنەکە)وە قەدەغە کرا.
بەهۆی ئابڵوقەی (پەکەکە)وە بۆسەر باشور لە (دهۆک و زاخو) نرخی ئازوقە بەرز بووە و بەرپرسیارانی (پەدەکە)ش بۆ بەدەست خستنی ئازوقە لە ١٦ی تشرینی یەکەم دەستیان گرت بەسەر ئازوقە و عەمارەی بازرگانەکان و بە بیانوی ئەوەی نرخی ئازوقە بەرز نەبێتەوە گواستنەوەی ئازوقەیان لە نێوان شارەکان قەدەغە کرد. لەهەمانکاتدا خەڵکی شاری (میدیات) بۆ ئەوەی پرۆتیستۆی (پەدەکە و یەنەکە) بکەن کە هێرشی سەر (پەکەکە) دەکەن دوکانەکانیان داخست و هەروەها لە (ئێریڤان)ەوە ئەو رادیۆیەی کە بە کوردی پەخشی دەکرد هێرشەکانی سەر (پەکەکە) یان شەرمەزار دەکرد.

---

[118] ١٨ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم ).

## شەڕی پێنج ڕۆژە و خزمەت

دوای بەسەرچونی چەند ڕۆژێک بەسەر شەڕی دژواری (هەفتانین) کپی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا. لەبەرەی (خواکورک)یش سوپای تورک جموجۆڵی سەربازی دەست پێکرد، هێزی پێشمەرگەش دەیانویست ئەم هەلە بقوازنەوە.

لە ڕاستیدا سوپای تورک و پێشمەرگەی بەرەی کوردستانی لە ١٧ی تشرینی یەکەم پیلانیان دانابوو هێرشی هاوبەش ئەنجام بدەن، بەڵام سەرەڕای بۆردۆمانی فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک هێرشەکانی پێشمەرگەش نەیانتوانی هێزی گەریلا لە شوێنەکانی خۆیان هەڵتەکێنن، هەربۆیە پێویستیان بەوە بوو هەموو هێزەکانیان بە هاوبەش هێرشێکی بەرفراوانی سەر گەریلا بکەن.

پێش ئەوەی هێرشە هاوبەشە سەرتاسەرییەکە دەست پێبکات، سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لە ڕادیۆی خۆیانەوە پەیامێکی ئاڕاستەی پێشمەرگەکانی بەرەی شەڕ کرد و بارزانی دەیوت (**ئەی هێزی پێشمەرگەی قارەمان دەبێت ئەم کارە بە ٥ ڕۆژ تەواو بکەن بە پێچەوانەوە لە بەرەی شەڕ نەگەڕێنەوە**)[١١٩]. دوای ئەم ووشیارکردنەوە و دەرکردنی بڕیارە هێزەکانی پێشمەرگە لە (خواکورک و هەفتانین) هێرشێکی بەرفراوانیان دەست پێکرد. ئەم هێرش و شەڕوپێکدادانە لە چاو شەڕەکانی تر دەبووە خوێناویترین شەڕ. لە هەمان ڕۆژدا دەزگای ئاسایشی بەرەی کوردستانی لە سەڵاحەدین کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا. لەم کۆبونەوەیەدا دەگەڕان بەشوێن ڕێگا چارەیەک، لەئاکامدا بڕیاریاندا فەرماندەی بە ئەزموون ڕەوانەی بەرەی شەڕەکە بکەن، فەرماندە و بەرپرسیارانی (یەنەکە) جارێکی تر ڕوویانکردەوە (خواکورک) و بەنیاز بوون جارێکی تر هێرش بۆسەر سەنگەرکانی گەریلا ئەنجام بدەنەوە. شایەنی باسە بۆدواجار لە ١٥ی تشرینی یەکەم لە ناوچەکە شەڕوپێکدادان

---

[١١٩] ١٩ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حورییەتی تورکی)

هاتبووه هاراوه، لەهەمان رۆژاندا لەناوچەکانی سنوری (شەمزینان) سەرباز و کۆماندۆی شاخی سوپای تورک لە (گەلیشین، ئاڤیا و روبارۆک) جێگیرکران، لەهەمانکاتدا زرێپۆش و یەکینەی دەبابە و تۆپخانەکانی سەربە شاری (تێکیرداغ)ی رۆژئاوای تورکیا و لە شاروشارۆچکەکانی وەک (ئیپسالا، ئەدیرنە، پنارحسار، ئولاش و چۆرلو) لەگەڵ جاشەکانی تورکیا بەش بە بەش هێزی تایبەتیان رەوانەی هەرێمەکە کران. فەرماندەی گشتی ئاسایشی سەربازی هەرێمەکە عەمید (نەجاتی ئۆزگین) بۆ چاودێریکردنی شەڕەکان هاتبوو بۆ هەرێمەکە. دەتوانرێت بوترێت نیوەی سوپای تورکیایان خستبووە گڕ بۆ گیانی ۲۵۰۰ یان ۳۰۰۰ هەزار گەریلای (پەکەکە) .

دوای پەلکێشکردن و جێگیرکردنی هێزی نوێ بۆ (خواکورک) شەڕی ٥ رۆژەی (مەسعود بارزانی) دەستی پێکرد. پێشمەرگە بە هێزێکی (٤٠٠٠) هەزار کەسییەوە دەستیان کرد بە هێرشکردن. لە ١٧ی تشرینی یەکەم هێزی پێشمەرگە هەروەکو ئەوەی چاوەڕوان کراوبوو کەوتنە سەر ئەو لوغمانەی کە پێشوتر گەریلا لەسەر رێگاوبانەکان چاندبویان و دوای دەستکردنەوەی گەریلاکانیش ناچارمان بکشێنەوە، دوای ئەم پاشەکشێیە کاتییە جارێکی تر پێشمەرگە کەوتنەوە خۆیان و دەستیان کردەوە بە هێرشکردن و لە زۆر شوێنی جیاوازدا شەڕی ٥ رۆژە لە نێوان گەریلا و پێشمەرگەکاندا روویاندا و لە ئاکامدا پێشمەرگەیەکی زۆر کوژران کە لە نێوانیاندا فەرماندەیەکی پلە بەرزی (پەدەکە)شی تێدابوو. بەهۆی تێکشکان و رووخانی وورەوە پێشمەرگەکان دەستبەرداری هێرشەکان بوون، پێشمەرگەیەک کەلە شەڕەکاندا بریندار ببوو لە نەخۆشخانەی (دیانە) بە پەیامنێرەکانی وت (**لە دوو رۆژی شەڕەکاندا ٥٠ پێشمەرگە کوژران و نزیکەی ٢٠٠ پێشمەرگەش بریندار بوون**) .

بە گوێرەی رۆژنامەی (Hurriyet)ی تورکی لە ٢١ی تشرینی یەکەمی (١٩٩٢) هاتبوو (٤٣) پێشمەرگە کوژراون کە یەکێکیان فەرماندەیە، بە دەیان برینداریش گواستراونەتەوە بۆ نەخۆشخانەکانی دیانە و هەولێر و سلێمانی. سەبارەت بە زیانی گیانی گەریلاکانی (پەکەکە) هیچ زانیارییەک بەدەستەوە نەبوو. لەو شوێنانەی شەڕ سەخت ببوو هەروەها لەبەرئەوەی نەدەویسترا زیانی گیانی پێشمەرگە بزانرێت نەیاندەهێشت پەیامنێرەکان لە ١٩ی هەمان مانگدا بچنە ناوچەکەوە. پەیامنێری رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم) توانی لە (خواکورک)وە خۆی بگەهێنێتە (شەمزینان) و چاوپێکەوتنێک لەگەڵ گوندییەک بکات، گوندنشینەکە دەیوت

**(سوپای تورک به تۆپەکانیان هاوکاری هێزی پێشمەرگە دەکەن و بەهۆی بۆردۆمانەکانی فڕۆکەکانی سوپای تورکەوە دارێکی زۆر لە ناوچەکان سوتاون)** .
سەرکردایەتی (پەدەکە و یەنەکە) درکیان کردبوو لە بەرەکانی شەڕی (خواکورک) گیریان خواردووە و هەربۆیە هێزی نوێیان نارد بۆ بەرەکە و بۆ ئەم مەبەستەش ئەندامی سەرکردایەتی (یەنەکە) (کۆسرەت رەسول)یان رەوانە کرد. ئەویش بۆئەوەی وورە بە پێشمەرگەکانی بدات قسەی بۆکردن و کۆسرەت دەیوت (**ئەگەر خۆم و دەمانچەکەیشم بمێنینەوە ئیرە جێناهێڵم**). کۆسرەت بەم قسانەی خۆی شکستییەکانی هێزەکەیانی دەسەلماند.
وەزیری کاروباری پێشمەرگەش (کەمال موفتی) لە پرسی رۆژنامە تورکەکاندا کە لێیان پرسی (**ئایا خواکورک کەی لە ژێر دەستی گەریلاکانی پەکەکە دەردەهێنرێت؟**)، کەمال موفتی دەیوت (**دوای ٢ بۆ ٣ رۆژێکی تر بەفر دادەکات و سەرما دەگاتە ٢٠ دەرەجەی خوار سفر**)، مانای ئەم قسەیەی کەمال موفتی بە تورکی پێی دەڵێن (الله بلیر) واتا (خوا دەزانێت). ئەو هەواڵەی لە رۆژنامەکانی تورک بڵاوببووەوە کە گوایە (عوسمان ئۆجالان) کوژراوە، (کەمال موفتی) ئەمەی بە درۆ دەخستەوە و هەروەها ئیدیعای ئەوەی دووبارە دەکردەوە کە ئێران هاوکاری (پەکەکە) ی کردبێت و هەروەها دەیوت (**زانیاری هەواڵگریمان پێگەیشتووە هێزێکی ٢٠٠ کەسی گەریلا لە ئێران جێگیر کراون**)[١٢٠].
لە ناوچە شاخاوییەکانی شارۆچکەی (دیانە)ی سنوری ئێران شەڕ وپێکدادانێکی کەم خایەن لە نێوان هێزەکانی (پاک) و پێشمەرگە هاتەئاراوە، لەهەمانکاتدا سەرچاوەکانی (پەکەکە) دەیانوت ئەو ٧ پێشمەرگە دیلەی لەلایان بووە ئازادیان کردوون و تەنها ٣ فەرماندەی (پەدەکە) هێشتا وەک دیل لەلایان ماوە، هەروەها هێزەکانی (یەنەکە)ش لە (خواکورک) گەریلایەکیان بە دیلی گرتبوو.

---

[١٢٠] ٢١ تشرینی یەکەم ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە.

## شەڕی دژوار لە هەفتانین

کاتێک هێزی پێشمەرگە و سوپای تورک لە بەرەی (خواکورک) ئەنجامێکی ئەوتۆیان بەدەست نەخست، لەهەمانکاتدا هێرشی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) و سوپای تورک لە (هەفتانین) زیاتر چڕبوونەوە. بەشێوەیەکی گشتی لە ناوچەکانی (بێزەنینگ، ئاڤاگیز، چیای سپی، کیرە، باتوفە، کانیماسی، قەڵای شابانی، بێرسڤێ، بانکێ و بۆسەلێ) پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بە هاوکاری سوپای تورک هێرشیان کردەسەر سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە)، تەنانەت شەروپێکدادانەکان بە رۆژیش درێژەیان دەخایاند، هەروەها قەدەغەی سڤیل و رۆژنامەوانەکانیان کرد بچنە ناوچەکە و تەنانەت نەیاندەهێشت نزیکیش ببنەوە. سەرچاوە فەرمییەکانیش بەشێوەیەکی موتڵەق لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە هیچ زانیارییەکیان نەدەدا، بەڵام لە یەکەم رۆژانی شەڕەکەدا سەرچاوەکانی (پەدەکە) باسیان لەوە دەکرد نزیکەی (٢٠) پێشمەرگە کوژراون و ژمارەیەکی زۆریشیان بریندارە و هەروەها ٢ سەنگەری گەریلایان گرتووە و لەهەمانکاتدا (٤) گەریلاش کوژراوە.

سوپای تورک لە باکوری (هەفتانین)ەوە هێرشیان دەکرد، بەڵام لەناوچە سنورییەکانی (سنات و دەرگیش) بەهۆی بەرەنگاربونەوەی گەریلاکان سوپای تورک ناچارمان هێرشەکانیان رابگرن، تەنها بە توپ و هاوان شوێنەکانی گەریلایان بۆردۆمان دەکرد. لەیەکەم رۆژانی هێرشەکاندا فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکیش بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگە و هێزی پیادەی خۆیان بتوانن بە ئاسانی پێشڕەوی بکەن بۆردۆمانێکی سەختیان دەکرد، بەردەوام بە ئاسمانی (جزرە، چوکورجە، ئولودەرە و سلۆپی) کۆپتەر و فڕۆکە بۆ دۆزینەوەی سەنگەر و شوێنی گەریلاکان ماخولانیان بوو. لە ١٧ی تشرینی یەکەم فڕۆکەیەکی تورک کاتێک لە (باتوفە و قەڵای شابانی) سەنگەری گەریلاکانیان بۆردۆمان دەکرد دوای ئەوەی لەلایەن گەریلاکانەوە کاتژمێر(٤)ی ئێوارە لێدرا لە نزیک شارۆچکەی (کورکوتی)ی سەربە شاری (موش) کەوتە خوارەوە، بەڵام فڕۆکەوانەکە توانی پێش ئەوەی فڕۆکەکەی بکەوێتە خوارەوە

لە نزیک چیای (فاسیک) کە ٣٠کم لە شاری (موش)ەوە دوورە خۆی فڕێداتە خوارەوە. لەمبارەیەوە بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک دەیانوت گوایە فڕۆکەکەیان لە ئاکامی کەوتنە ناو پۆلە باڵندەوە زیانی پێگەیشتووە و کەوتنە خوارەوەیشی قەزاوقەدەر بووە[١٢١].

ئەوکاتەی هێرش و پەلامارییەکان بەردەوام بوون، لە ١٧و١٨ی تشرینی یەکەم لەناوچەی (دەرکار) جارناجارێک گەریلاکانی (پەکەکە) دژ بە دوژمنانیان هێرشیان ئەنجامدەدا. بەگشتی شەڕوپێکدادانەکان لە (ئەڤلەهـ و پیربلا)ی نزیک بە (باتوفە) بە سەختی بەردەوام بوون .

لە رۆژی ١٨ی تشرینی یەکەم لەبەردەم نەخۆشخانەی شارۆچکەی (زاخۆ) خەڵک گردبونەوە بۆ ئەوەی کوژرا و بریندارەکانی خۆیان بدۆزنەوە. هەندێک لە بریندارەکان بەهۆی سەختی برینەکانیانەوە لە نەخۆشخانە گیانیان لەدەستدا. لەو شەڕەی لە ١٧ی تشرینی یەکەم هاتبووە ئاراوە بەلای کەمەوە (١١) پێشمەرگە گیانیان لەدەستدابوو، تەرمەکانیشیان هێنرابوونەوە بۆ مزگەوتی گەورەی شارۆچکەی (زاخۆ) .

پەیامنێرەکانی رۆژنامەی (میللییەتی تورکی و ئوزگور گوندەم) هەوڵیاندابوو دیمەنی گردبونەوەکەی  بەردەم مزگەوت و نەخۆشخانەکان بگرن بەڵام لەلایەن پێشمەرگەکانی ئاسایشەوە دەستبەسەر کران و دوای چەند کاتژمێرێک ئازاد کران. هەڕەشەیان لێکرابوو نابێت نزیک مزگەوت و قەڵەباڵغی و نەخۆشخانەکان ببنەوە، لەهەمانکاتیشدا پەیامنێرەکانی (تەرەتە)تورکی کە زمانحاڵی دەوڵەتی تورکە و لەگەڵ (ئاژانسی ئەنەدۆڵو) بە بڕیاری بەرپرسیارانی سەروی (پەدەکە) لەلایەن ئاسایشی (پەدەکە) وە پاسەوانی و هاوکارییان دەکرا. دوای سەخت بونەوەی شەروپێکدادانەکان قەدەغەی ئەوە کرا کە پێشمەرگەکان لە بەرەی شەڕ بگەڕێنەوە و بچنەوەماڵی خۆیان، ئەم بڕیارەش بەهۆی ئەوەوە درابوو ئەو پێشمەرگانەی مۆڵەتیان وەردەگرت و دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە جارێکی تر نەدەگەڕانەوە بۆ بەرەکانی شەڕ. چەند پێشمەرگەیەکی سۆرانی کە بریندارببوون لە نەخۆشخانە لەلای پەیامنێرەکان گازەندەی پێشمەرگە بادینییەکانیان دەکرد و دەیانوت ئەوان شەڕ ناکەن و نایانەوێت لە بەرەکانی شەڕیشدا بن. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بە هاوکاری تۆپ و فڕۆکە جەنگییەکانی تورک شەڕیان دەکرد، لە ئاکامدا لە ١٩ی تشرینی یەکەم شەڕەکە راوەستا. هێزەکانی پێشمەرگە سەرەڕای ئەوەی سوپای تورک هاوپشتیوانیانی دەکرد بەڵام لە

---

[١٢١] ٢١ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ( ئاژانسی ئەنەدۆڵو) .

هێرشەکاندا بە گشتی ئەنجامێکی ئەتۆیان بەدەست نەخستبوو، لەگەڵ ئەمەشدا زیانیشیان بەرکەوتبوو هەربۆیە فەرماندەکانیان سەرقاڵی دارشتنی پیلانی نوێبوون.

ئەوکاتەی شەرووپێکدادانەکان بەردەوام بوون (ئەرنەکە) ئانیە رزگاری نەتەوەیی کوردستان لە روونکردنەوەیەکیاندا دەیانوت ناوچەکانی نێوان (فیشخابور) هەتا (زاگرۆس) لەژێر کۆنترۆڵی گەریلادایە و گەریلا لە شەرەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست خستووە.

قایمەقامی شارۆچکەی زاخۆ (نزار بەرزنجی) دەیوت (**بۆردۆمانەکان کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو هەربۆیە ئامادەباشی دەکرێت تاکو پیلانێکی نوێ بۆ هێرشەکان دابرێژرێت، لەبارەی گۆرانکارییەکانەوە بەردەوام لەگەڵ بەرپرسیارانی تورک لەناو دانوساندنین، مادام سوپای تورک ٥کم هاتونەتە ژوورەوە کەواتە راست نییە کە دەڵێن گەریلاکان کۆنترۆڵی رێگاوبانەکانیان کردووە**). بەگوێرەی بۆچونی (نزار بەرزنجی) ئەگەر هاوکاری کۆپتەری تورکیا زیاتر ببێت ئەوا لەماوەی (٢) رۆژدا گەریلاکان لە هەرێمەکە دەردەکرێن. نزار بەرزنجی دەیوت (**پەکەکە شەر کەری باشن، ئەگەر ئازوقە و پێداویستی پێویست نەگاتە بەرەی شەر ئەوا بێ مۆراڵی و ناحزوری لە نێوان پێشمەرگەدا دێتە ئاراوە**). سەبارەت بە زیانەکانی گەریلا (نزار بەرزنجی) هەواڵی رۆژنامەکانی تورکی بە (درۆزن) ناوزەند دەکرد و دەیوت (**پێمانوایە لە ماوەی ١٦ رۆژی شەردا لەوانەیە ١٠٠ گەریلای پەکەکە کوژرابێت**).

بەگوێرەی (نزار بەرزنجی) ئەگەر هاوکاری ئازوقە و تەقەمەنی پێشمەرگە نەکرێت ئەوا نائارامی دێتە ئاراوە و لەسەر ئەم قسەیەش بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک لە رێگای (ئیبراهیم خەلیل)ەوە بەردەوام ئازوقە و تەقەمەنییان بۆ رەوانە کردن. لە رۆژانی ١٥و١٦ی تشرینی یەکەم دوای ناردنی (٤٥) شاحینە و لۆری بارهەڵگر لەهەمانکاتدا لە ١٨ ی هەمان مانگدا دەزگای خێرخوازی (مانگی سووری تورکیا) لە رێگای (ئیبراهیم خەلیل)ەوە وەک هاوکاری (٢٠) لۆری پڕ لە پێداویستییان رادەستی بەرپرسیارانی (پەدەکە) کرد. بەمشێوەیە (پەدەکە) بۆ بەدەستخستنی هاوکاری و پێداویستی هەرچی لە عەمبارەکانی دەوڵەتی تورک هەبوو بە بیانوی شەری (پەکەکە) وە بۆخۆیانیان دەستەبەر دەکرد، لەهەمانکاتدا دەزگای خێرخوازی (مانگی سووری تورکیا) زۆر بە نهێنی تەقەمنیشیان بۆ (پەدەکە) لە تورکیاوە دەگواستەوە.

## شەڕی نهێنی

یەکێک لە دیمەنە سەیرەکانی شەڕەکان ئەوەبوو رۆژنامەکانی باشوری کوردستان بەهیچ شێوەیەک باسیان لە شەڕەکان نەدەکرد. بۆ نمونە رۆژنامەی (برایەتی) کە زمانحاڵی (پەدەکە) بوو جگە لەوەی لەبارەی (پەکەکە) وە چەند مەقالەیەکی بڵاودەکردەوە لە بارەی شەڕەکانەوە یەک هەواڵیشی بڵاونەدەکردەوە. رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) کە ئەویش زمانحاڵی (یەنەکە) بوو بە درێژایی ماوەی شەڕەکان جگە لە چەند مەقالەیەک لەبارەی (پەکەکە)وە لەبارەی شەڕەکانەوە هەواڵیان بڵاونەدەکردەوە. ئەمە لەوە دەچوو کە شەڕ لە وەڵاتێکی تر بوبێت یان لە حەسارەیەکی تر، یاخود ئەوان پێیان وابوو هیچ لەئارادانییە و نە پێشمەرگە و نە گەریلاش بەهیچ شێوەیەک نەکوژراون و خوێنیان نەڕژاوە. ئەوان ئەوەندە بێدەنگ و قروقپ بوون وەک ئەوا وابوو کە سوپای تورک هێرشی بۆ خاکی ئەوان نەبردووە بەڵکو سوپای تورک روویان لە وەڵاتێکی تر کردووە. سەرکردایەتی باشور لەبارەی شەڕەکەوە نەیاندەویست لەدوای خۆیان بەڵگەی نوسراوە بەجێبهێڵن، لەگەڵ ئەمەشدا رەوش لە تڤ و رادیۆکاندا جیاواز بوو. لە پەخشەکانیاندا بەردەوام (پەکەکە) یان رەخنە دەکرد و تاوەنباریان دەکردن ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو کە شەڕێک لە ئارادایە و بەردەوامیشە. تەلەفزیۆنی (خەبات)ی زمانحاڵی (پەدەکە) لە هەواڵەکانیاندا باسیان لە شەڕەکان نەدەکرد، بەڵام جارناجار دەیانوت (سەدام فەرمانی داوە بە پەکەکە لە هەرێمەکەمان گێرەشێوێنی دروست بکەن و دەسەڵاتی کوردیش سوورە لەسەر ئەوەی پەکەکە لەسەر چیاکانمان دووربخەنەوە و نامانەوێت لە هەرێمەکەماندا دوژمن هەبێت) .

هەندێک رۆژنامە هەبوون کەلەژێر کاریگەری پارتە کوردییەکاندا نەبوون، ئەوان جارناجارێک باسی شەڕەکەیان دەکرد و ناچاریش دەمان زیانەکانیش باس بکەن و باسیش لە دەست تێکەلاوی دەسەلاتیان بکەن لەگەل دەولەتی تورک.

## بریندارەکان بە کۆپتەر بۆ تورکیا دەگوازرێنەوە

لە ١٨ی تشرینی یەکەم چەند فەرماندەیەکی پێشمەرگەی بریندار لەگەڵ چەند بریندارێکی سەربازی سوپای تورک بە ماشێنی فریاگوزاری گواسترانەوە بۆ (ئیبراهیم خەلیل) و پاشان بە کوپتەر بردیانیان بۆ نەخۆشخانەی (دیاربەکر) و ئەوانەیشی برینەکانیان سەخت بوو بە فڕۆکەی تایبەت گواسترانەوە بۆ نەخۆشخانەی سەربازی (گالاتە)ی سەربە (گوڵخانە) لە (ئەنقەرە). دکتۆرەکانی نەخۆشخانە سەربازییەکە روونیانکردەوە پێشمەرگەیەکی زۆری بریندایان تیمار کردووە و هەروەها بۆ تیمارکردنی پێشمەرگە و سەربازە بریندارەکانیان دکتۆرێکی زۆریان رەوانەی بەرەی شەڕەکان کردووە. ئەو ماشێنە (ئیسعاف) فریاگوزارییانەی دەزگای خێرخوازی (مانگی سووری تورکیا) بەکاریان دەهێنا بەردەوام لە نێوان بەرەکانی شەڕ و (زاخۆ) هاتوچۆیان بوو. رۆژنامەوانەکان وێنەیەکی زۆری ئەو ماشێنە فریاگوزارییانەیان گرتبوو. ٢ گەریلای کچ کە بە بریندای بە دیلی گیرابوون و هێنرابوون بۆ نەخۆشخانەی (زاخۆ) ئەوەیان رەتدەکردەوە کە خۆیان ووتەنی لەلایەن (خائین)نانەوە تیمار بکرێن.

گەریلا بریندارەکان لەسەر چرپای نەخۆشخانە پاڵکەوتبوون و پێشمەرگەش بەسەریانەوە پاسەوانییان دەکرد و گەریلاکانیش سلۆگانیان دژ بە (بارزانی و تاڵەبانی) دەووتەوە، ئەمەش دیمەنێکی زۆر واتادار و دڵ تەزینی شەڕی (**براکوژی**) بوو.

## ئێرانیش پاڵپشتی تورکییایە

لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی (پەدەکە، یەنەکە و سوپای تورک) دژ بە (پەکەکە) ئێران دڵنیایی دابوو بە تورکیا کە نابن بە لایەن، ئەوان تەنها ژمارەیەکی زۆری پاسداریان لەسەر سنور جێگیرکردبوو هەروەها چاودێری شەڕەکانیان دەکرد. رژێمی ئێران بەرامبەر بە پاڵپشتیکردنی بۆ تورکیا مامەڵێکی زۆریان لەگەڵ (ئەنقەرە) کردبوو، نازانرێت بە تەعویز دانبێت یان بە زۆربۆهێنان تورکیا توانیبووی ئێران بەلای خۆیاندا رابکێشن. لەگەڵ دەستپێکردنی شەروپێکدادانەکاندا رژێمی ئێران لەناو خاکی خۆیاندا نزیکەی (١٠٠) کەسی سەر بە (پەکەکە)یان دەستبەسەر کرد، لەدوای ئەم گۆڕانکاریانە گەریلاکانی (پەکەکە) لەئەگەری هاتنەئاراوەی هەر رووداوێکی کتوپڕ و نەخوازیاردا لەسەر سنورەکان هێزەکانیان قایمتر کرد، رژێمی ئێران پێیانوابوو گەریلاکانی (پەکەکە) لەهەمبەر ئەم هەموو هێرشانەدا خۆیان پێڕاناگیرێت و لەوانەیە هانا بۆ ئەوان بەرن و سووریشبوون لەسەر هاتنەئاراوەی ئەم گریمانەیان.

لەکاتی شەڕەکاندا فەرماندەیەکی (پەکەکە) بەناوی (حەمید) کە کاتی خۆی لەلایەن ئێرانەوە بە دیلی گیرابوو دوایش ئازادکرابوو، لەبارەی زیندانەکەیانەوە دەیوت (**لە زیندان ژمنراڵێکی پاسداران سەردانی کردین و پێیوتین ئێوە میوانی ئێمەن، چەند گەریلایەکمان و لایەنگرانمان کرابوونە حوجرەکانەوە، تاماوەیەک هەڤالانمان دەستیان کرد بە چالاکی مانگرتن و رژێمی ئێرانیش چاوەڕێی دەرەنجامی شەڕەکان بوون**).

یاریدەدەری سکرتێری وەزیری ناوخۆی ئێران کە لەهەمانکاتدا بەڕێوبەری ئاسایش بوو بەناوی (غولام حوسێنی) لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە دەیوت دڵنیاییانداوە بە تورکیا بەوەی کە ئیحتیاتیان خستووە لێناگەڕین گەریلاکانی (پەکەکە) بەهیچ شێوەیەک بێنە ناو خاکی

ئێرانەوە. دەسەڵاتدارانی ئەنقەرە بۆئەوەی لەکاتی شەڕەکاندا ئێران بۆلای خۆیان رابکێشن ئەوەی لە دەستیان هاتبێت کردبویان و ئەو تەعویزەی ئێرانیش ویستبێتی بەرامبەری دریغییان نەکردبوو، لەهەمانکاتدا لە گەرمەی شەڕوپێکدادانەکاندا (پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران) کە هاوکاری تورکیا بوون بۆ دڵنەوایی تورکیا هەموو چالاکییەکانی خۆیان لەهەمبەر بە ئێران راگرت. لەئاست ئەو گۆڕانکاریانەدا ئەو کەشتییەی کە ناوی (کاپیمالیاس)بوو کە تەقەمەنییان بۆ ئێران دەگواستەوە و لەسەر زانیاری دەوڵەتی (ئیسرائیل) لە (ئیستەنبوڵ) دەستی بەسەردا گیرابوو لەگەڵ یەکەم رۆژی دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەکاندا (ئەنقەرە) دایەوە بە (ئێران)، شایەنی باسە ئەم کەشتییە پڕ لە تەقەمەنییەی ئێران بە بڕیاری دادوەری تورکیا دەستی بەسەردا گیرابوو.

وەزیری ناوخۆی (تورکیا) (عیسمەت سێزگین) پێش دەست پێکردنی شەڕی باشور بۆ ئەوەی ئێران هاریکاریان بکات لە (١٩٩٢/٩/١٣) سەردانی ئێرانی کرد، (عیسمەت سێزگین) پێشنیاری بۆ حکومەتی ئێران کردبوو ئەگەر هاوکاریان بکەن ئەوا کەشتییەکەیان ئازاد دەکرێت. لەهەمانکاتدا رادیۆیەکی ئێرانی ئەم قسانەی (عیسمەت سێزگین)ی پشتڕاست دەکردەوە هەروەها باسیان لەوە دەکرد حکومەتی تورکیا بەنیازە لەم مانگەدا کەشتییەکەیان ئازاد بکات، گرتنی ئەم کەشتییە پێشوتر ببووە هۆکاری کێشەیەکی گەورەی نێوان تەهران و ئەنقەرە، بەڵام ئێستا تورکیا بەبێ هیچ بەرامبەرییەک رادەستی دەکردنەوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا حکومەتی تورکیا زۆر باش دڵنیابوو لەوەی بەرامبەر بەم تەعویزەیان بۆ ئێران بۆ مەسەلەسەی رشتنی خوێنی گەریلاکانی (پەکەکە) هیچ شتێک بەدەست ناخات.

وەزیری ناوخۆی تورکیا (عیسمەت سێزگین) لە ١٠ی تشرینی یەکەم چاوی کەوت بە وەفدێکی ئێرانی و باسی جموجۆڵە سەربازییەکەی خۆیانی بۆ وەفدەکە کردبوو کە بەرامبەر بە (پەکەکە) ئەنجامی دەدەن. سکرتێری یاریدەدەری وەزیری ناوخۆی ئێران (غولام حوسێنی) لە کۆبونەوەکەیان لەگەڵ (عیسمەت سێزگین) وتبووی (**پەکەکە دوژمنی ئێمەشە، چەنێک مەترسی بێت بۆ تورکیا ئەوەندەش بۆ ئێمە مایەی مەترسییە، لەناو خاکی ئێمەدا هەوڵدەدەن خاکەکەمان پارچە بکەن**). بەرپرسیارانی ئەنقەرە نەیاندەشاردەوە کە زۆر دڵنیان لەوەی لەبارەی هێرشەکانیان دژ بە پەکەکە حکومەتی ئێران پاڵپشتییان دەکات. لە سەردانەکەی (عیسمەت سێزگین) بۆ ئێران ئەوەیان بەرقەرار کردبوو کە هەردوولا

لیژنەیەکی هاوبەش پێکبهێنن لە کارمەندانی پارێزگا سنورییەکان و لەبارەی جموجۆڵی قاچاخچێتییەکانیشەوە زانیاری ئاڵوگۆڕ بکەن، لەسەر ئەوەش رێککەوتبوون ئاکامی جموجۆڵە سنورییەکان لەلایەن لیژنە هاوبەشەکەیانەوە بکرێت بە راپۆرت و بەردەوام بدرێت بە بالیۆزخانەی هەردوولا.

ئەوکاتەی شەڕوپێکدادانەکان زۆر چڕببوونەوە سەرۆک وەزیرانی تورکیا (سلێمان دیمیرال) بە گەشتێک خۆی گەیاندە تەهران، (سلێمان دیمیرال) داوای لە جێگیری سەرۆک کۆماری ئێران (حەسەن حەبیبی) دەکرد ئەو گەریلایانەی رادەست بکەنەوە کە لەسەر سنوری ئەوان قەتیس کراون، هەروەها (سلێمان دیمیرال) لەلایەن ئێرانەوە هەموو دڵنیاییەکی وەرگرتبوو کە بەباشی هاوکاریان دەکەن[١٢٢] ، (فەخری ئۆزتورک) کە راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی تورکیا بوو لەگەڵ وەفدێکدا لە (١٩٩٢/١٠/٢٤) چوونە ئێران و لەبارەی مەسەلەی (پەکەکە)وە لەگەڵ بەرپرسیارانی ئێران چەندین دیداری ئەنجامدا. دەوڵەتی تورک توانیبووی بەرەی ئێران بەلای خۆیاندا رابکێشن، ئێرانیش هەموو پیلانەکانی خۆیانیان گرێدابوو بە دۆراندنی (پەکەکە)وە. ئێران پێیان وابوو گەریلاکانی (پەکەکە) لەهەمبەر هێرشەکانی (پەدەکە و یەنەکە و سوپای تورک) خۆیان پێراناگیرێت و هەڵدێن بۆ ئێران و ئەوانیش دەتوانن (پەکەکە) بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە و هەرکاتێک بیانەوێت بە ئارەزووی خۆیان وەک داشی دامە بەکاریان بهێنن. لەم بارەیەوە دەوڵەتی ئێران خاوەن ئەزمونێکی دورودرێژ بوو. لە ساڵەکانی ١٩٤٣ و ١٩٧٤ و ١٩٨٨ و ١٩٩١ بەردەوام پارتەکانی باشور هەڵاتبوون بۆ ئێران و کەوتبوونە ژێر بەزەیی ئێرانەوە. بە تایبەتی (پەدەکە)، ئێران هەمیشە توانیبووی بە ئارەزووی خۆیان پارتە سیاسییەکانی باشور بۆ مەرامی خۆی بەکاریان بهێنێت، هەربۆیە (پەدەکە) لە ساڵەکانی (١٩٧٩ و ١٩٨٨) دژ بە بزاڤی کورد رابەرایەتی بۆ سوپای ئێران کردبوو.

ئێران خاوەن ئەزمون بوو هەروەها ئەزمونەکەیشی دەگەڕایەوە بۆ فەرهەنگی پاشایەتی و پاشانیش بۆ کۆمار و زۆر ژیرانە دەیانتوانی بەردی شەترەنجی خۆیان بجوڵێنن و سەرکەوتن بەدەست بخەن بەڵام ئەمجارەیان بەرامبەر بە حیسابەکانیان لەهەمبەر (پەکەکە) بەهەڵەدا چووبوون.

---

[١٢٢] ٢٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی) .

له سالی (١٩٩٣) (پەکەکە) بەرامبەر بە تورکیا ئاگر بەستی یەکلایەنەی ڕاگەیاند و ئێرانیش زۆر هەوڵیدەدا کۆتایی بەم ئاگر بەستە بهێنرێت، بەڵێ ڕەوشی سیاسی و حیساب و کیتاب لە ڕۆژهەلاتی ناوین وەک ئەوە وابوو کەلەسەر سەهۆڵبەند سەما بکەیت.

## لەو جێگایەی خوا کوێری کردووەتەوە (خواکورک)

هەرچەندە (خواکورک) لە باشور وەک جوگرافییە خاوەن پێگەیەکی گرنگە لەهەمانکاتیشدا بۆ باکوریش هەروایە، شوێنێکە (عێراق، ئێران و تورکیا) بەیەکەوە گرێدەدات. لەئاستی سەربازیدا شوێنێکی زۆر ستراتیژییە. ئەو هێزەی بتوانێت ئێرە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە کەواتە زاڵ دەبێت بەسەر ناوچەیەکی زۆر فراواندا، لە هەمانکاتیشدا زۆر نزیکە لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆسەوە. ناوی زێی (خواکورک) بەگوێرەی خاوەنەکەی دەگۆڕدرێت. دوای جێگیربوونی گەریلاکانی (پەکەکە) لە ناوچەکە، خەڵکی دەڤەرەکە بە زێیەکەیان دەوت (گەلیێ کارکەران) واتا (دۆڵی کرێکاران)، (پەکەکە)ش ناوی زێیەکەی نا (ئوزگور وادەسی) واتا (زێی ئازادی)، لە دێر زەمانەوە خەڵکی باشوریش بەهۆی سەختی و چڕی ناوچەکەوە ناویانناوە (خواکورک)، بۆچی (خواکورک ؟)، چونکە خەڵکی دەڤەرەکە پێیان وابووە ئەم شوێنە لەلایەن یەزدانەوە کوێر کراوەتەوە.

بەدرێژایی شەڕی (٨) ساڵەی نێوان (عێراق و ئێران) سەربازی هەڵاتو و خەڵکی یاخی لە دەست رژێمەکان پەنایان بۆ ئێرە بردووە، ئەم ناوچەیە ماوەیەکی زۆرە فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک بست بە بستی خاکەکەیان بۆردۆمان کردووە و باوەڕ ناکرێت کەلە دونیادا شوێنێک هەبێت ئەوەندەی خواکورک خاکەکەی بەهۆی بۆردۆمانەوە سوتابێت و بریندار کرابێت، تەنانەت لە شەڕی ئەم دواییەی باشوریش ببووە بەرەی دووەمی شەڕەکان.

بەدرێژایی بزاڤی رزگاری باشوری کوردستان، سوپای عیراق لە مێژووی خۆیاندا بۆ یەکەمجار توانی لە شاڵاوی (ئەنفال)دا لە ساڵی (١٩٨٨) بچێتە (خواکورک)ەوە. پێشوتر هەموو هێزە کوردییەکان بە گشتی بارەگایان لێرەدا بوو، لە (خواکورک) لە کاتی زستاندا نزیکەی (٤) مەتر بەفر دەبارێت، ئێرە بەردەوام لەلایەن دەوڵەتەکانی چواردەورییەوە بۆردۆمان دەکرێت و خاکەکەیشی پارەپارە بووە.

گەریلاکانی (پەکەکە) لە ساڵی (١٩٨٣) بەدواوە لە ناوچەکانی (خواکورک) جێگیربوونە. دوای چالاکییە قەڵەمبازییەکەی (١٥ی ئاب) کە راگەیاندنی شەڕی چەکداری (پەکەکە) بوو بەرامبەر

به دەوڵەتی تورک یەکێک لە گروپەکانی گەریلای (پەکەکە) روویان لە خواکورک کرد. لە دوای ساڵی (١٩٩٠)وە گەریلاکانی (پەکەکە) کە جارناجار کێشەیان لەگەڵ پارتە کوردییەکانی باشور دەهاتە ئاراوە توانیان خۆیان بەباشی لە (خواکورک) جێگیر بکەن و بیخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. دوای ئەم جێگیربوونە (پەکەکە) ٢ بارەگای سەرەکیان گواستەوە بۆ (خواکورک). لە دوای ساڵی (١٩٩١) (خواکورک) بەتەواوەتی کەوتە ژێر دەسەلاتی (پەکەکە)وە. لە مانگەکانی (تەموز و ئابی) ساڵی (١٩٩١) هێزی پیادەیی و ئاسمانی دەوڵەتی تورک بۆیەکەمجاریان بوو کە لە (خواکورک) هێرشی فراوان بکەن بۆسەر بارەگاکانی (پەکەکە)، لەم هێرشە بەرفراوانەی سوپای تورک کە هەزارەها کۆماندۆ و جاش و تیمی تایبەتییان بەشداربوو کەچی ئەو ئەنجامەیان بەدەست نەکەوت کە مەبەستیان بوو هەربۆیە بە دەست بەتاڵی لە (خواکورک) کشانەوە.

ئەو شەڕەی کە ناویان ناوە (شەڕی ٩١) و (١٥) رۆژی خایاندبوو بۆ یەکەمجار بووە کە گەریلا شەڕی سەنگەری تێدا بکات، دوای ئەم هێرشەی سوپای تورک ئیتر خاکی (خواکورک) بۆ فڕۆکەکانی سوپای تورک بوو بە مەنزڵی بۆردۆمانەکانیان. سەرەڕای ئەو هەموو بۆردۆمانانەش کەچی (خواکورک) زیانی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەدەبینی، لەئاکامی دەستکردنەوەکانی گەریلاش بەگوێرەی سەرچاوەکانی (پەکەکە) بە درێژایی ئەو ماوەیە نزیکەی (٩) کۆپتەر و فڕۆکەی سوپای تورک خراونەتە خوارەوە.

سەبارەت بە گرنگی (خواکورک)ەوە عوسمان ئۆجالان دەڵێت (**ئێرە ئەو شوێنەیە کە باشور، باکور و رۆژهەلاتی کوردستان بەیەکەوە گرێدەدات، ئێمە یەکێتی نەتەوەیی دەپارێزین، هەربۆیە ئێرە بۆ ئێمە شوێنێکی گرنگە)** .

پێش دەستپێکردنی شەڕی باشور بەهەفتەیەک، سەرکردایەتی (یەنەکە) نزیکەی (٥٠٠٠)هەزار پێشمەرگەیان رەوانەی (خواکورک) کرد. سەرەتا ناردنی پێشمەرگە بۆ ناوچەکە بە نهێنی گرتبوویان. عەشیرەتی (برادۆست) لە شەڕی باشوردا کە هاوکاری (پەدەکە و یەنەکە)یان دەکرد نزیکەی (٣) هەزار پیاوی خۆیان بۆ ئەم شەڕە دیاریکردبوو. دوای دەست پێکردنی شەڕەکان فەرماندەیەکی (یەنەکە) بەناوی (مستەفا چاوڕەش) بە رۆژنامەوانەکانی دەوت کە وەفدێکیان ناردووە بۆلای (عوسمان ئۆجالان) و لەمبارەیەوە (مستەفا چاوڕەش) دەیوت **(ناتوانین زاڵ بین بەسەر ئەو گرووپە گەریلایانەی کە بەباشی سەنگەریان گرتووە، ئەگەر**

**بەو شێوەیە هێرشیان بۆبهێنین ئەوە زیانی گیانیمان زیاد دەبێت**، قسەکانی (مستەفا چاوڕەش) ئەوەیان نیشاندەدا کە وەک دەستپێک لە هێرشەکاندا سەرکەوتنیان بەدەست نەخستووە.

سەرۆکی عەشیرەتی برادۆست (کەریم خان) کە دۆستێکی نزیکی (جەلال تاڵەبانی) بوو دەیوت (**ئەگەر بتوانین بەباشی هێرشی سەر گەریلا بکەین دەتوانین بە ئاسانی نەیانهێڵین، پێویستە هێزی پێشمەرگە بەردەوام هێرش بۆ بەسەر گەریلا بەرێت**) .

(کەریم خان) کە خاوەن نزیکەی (٣٠٠٠) هەزار پیاو بوو هەروەها پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) و دەوڵەتانی وەک ئێران و تورکیا و عێراق هەبوو، سەرەڕای ئەوەی بازرگانی مادە هۆشبەرەکانی دەکرد هەرچی کاری قاچاخچێتی و نایاسایی بوو (کەریم خان) دەیکرد.

ماوەیەک (کەریم خان) ویستبووی لەگەڵ (پەکەکە)دا پەیوەندی ببەستێت بەڵام هیچی لێ سەوز نەبووبوو. هەموو کاتێک ئەندامانی (میت)ی تورک و ساواک میوانی دیوەخانەکەی (کەریم خان)ن. (کەریم خان) بە مەبەستی ئەوەی ئاڵۆزی بێتە ئاراوە لە مانگی حوزەیراندا دەستی گرتبوو بەسەر چەند ماشینێکدا کە ئازوقەیان بۆ گەریلاکانی (پەکەکە) هێنابوو، بۆ ئەم مەبەستەش داوای لە هێزەکانی پێشمەرگە کردبوو بەرگری لێبکەن و هەموو پێشمەرگەکانیان خستبووە ئینزارە و (پەکەکە)ش رایگەیاند ئەگەر لە ماوەی (٣) رۆژدا ئەو ماشینانە بەرنەدرێن ئەوا (کەریم خان) دەکوژن. (کەریم خان) کە درکی کرد مەسەلەکە جدییە سەرەڕای ئەوەی بە هەزارەها پێشمەرگەش پاسەوانییان دەکرد کە چی لە ترسی گیانی خۆی ماشێنەکانی ئازاد کرد. (کەریم خان) ئەوەندە قینی لە (پەکەکە) بوو کە ئامادەبوو بەبێ هیچ بەرامبەرییەک هەموو چەکدارەکانی خۆی بخاتە خزمەت ئەو هێزانەی کە هێرشی سەر گەریلاکانی (پەکەکە)یان دەکرد.

ئەوکاتەی لە (١٩٩٢/١٠/٤) لە (خواکورک و هەفتانین) دەنگی شەڕ و تەقە و تۆپ و فڕۆکە و کۆپتەر دەهات لە شارەکانی باشور بەهۆی راگەیاندنی حکومەتی کوردییەوە سەرقاڵی ئاهەنگ گێڕان و گۆرانی وتن بوون.

کەناڵەکانی (یەنەکە و پەدەکە) بەردەوام دژی (پەکەکە) پەخشیان دەکرد بەڵام لەبارەی شەڕەکانەوە هیچ هەواڵێکیان بڵاو نەدەکردەوە. رۆژنامەکانی (برایەتی و کوردستانی نوێ)

که سەر بە (پەدەکە و یەنەکە) بوون بەردەوام ئەو قسانەی (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی)یان بڵاودەکردەوە کەلە دژی (پەکەکە) دەیانکرد، ئەوانیش لەبارەی شەڕەکانەوە هیچ هەواڵێکیان بڵاو نەدەکردەوە، بەڵام ئەوکاتەی هێنانەوەی تەرمی پێشمەرگە و بریندارەکانی پێشمەرگە بۆ سلێمانی و هەولێر درێژەیان خایاند ئەوانیش لە توانایان نەما راستییەکان بشارنەوە.

لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەکانی (خواکورک) ۲ پەیامنێری رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم) بەناوەکانی (محەمەد بەرواری و زەکییە چانکایە) سەبارەت بە رەوشی هەرێمەکە دەیانوت (**گردە بەرزەکانی خواکورک بۆ مەبەستی چاودێریکردن لەلایەن گەریلاکانەوە گیراون، شەڕوپێکدادانەکان بەتایبەتی بۆگرتنی ئەو گردانە بە سەختی بەردەوامە، ئەو هێرشانەی لەلایەن پێشمەرگەکانەوە دەکرێن ئەو گەریلایانەی بەسەر گردەکانەوەن دەیانتوانی بەرپەرچیان بدەنەوە، فەرماندەیەکی پێشمەرگە پێیان وتین لەهەمبەر هێرشەکانی ئێمە کە بە هەزارەها پێشمەرگە ئەنجام دەدرێت کەچی ٥ بۆ ٦ گەریلایەکی سەر گردەکان دەتوانن بەرپەرچمان بدەنەوە و نەهێڵن پێشڕەوی بکەین، هەربۆیە زیانی گیانیمان زۆرە**) .

لە ٤مین رۆژی شەڕوپێکدادانەکاندا لە (خواکورک) نزیکەی (۲۰) پێشمەرگە کوژرابوون، سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لە روونکردنەوەیەکیدا بۆ (بی بی سی) دەیوت (**وەک زیانی گیانی تەنها ۳ پێشمەرگەمان گیانیان لەدەستداوە**)، پێشمەرەگەکانی بەرەی (خواکورک) قەمسەڵەی سەربازی تورکی و گۆشتی قوتوی تورکییان دەخوارد. لە نزیک چادرەکانی پێشمەرگەوە بە سەدان فەردەی لێبوو کە هەموویان قەمسەڵەی سەربازی تورکی تێدابوون و مارکەی (تیمۆ)ی بوو. ئەوکاتەی پرسیار لە فەرماندەکانی پێشمەرگە دەکرا (**ئایا حکومەتی تورکیا هاوکاریتان دەکەن یاننا ؟**) کەچی دەیانوت (**نەخێر!**)، ئەم وەڵامانە ببوونە مایەی پێکەنینی رۆژنامەوانەکان، تەنها و تەنها پێشمەرگە سادەکان نەیاندەشاردەوە ئەم قەمسەڵانە لەلایەن تورکیاوە بۆیان هاتووە.

شەڕوپێکدادانەکان لایەنێکی گرنگی باری دەروونیشی هەبوو، گرانی پروپاگەندە بەشێک بوو لە شەڕەکان. لە (۸)مین رۆژی شەڕەکاندا ئەوکاتەی گەریلاکان گردێکی بچوکیان جێهێشت، پێشمەرگەکان غەرقی شادی و دڵخۆشی ببوون. پێشمەگەکان چەکە قورسەکانیان نیشان رۆژنامەوانەکان دەداو دەیانوت گوایە ئەم چەکانە چەکی گەریلان و گرتویانن هەروەها

دەیانوت سەنگەرە گیراوەکان پڕن لە تەرمی گەریلا. ئەوکاتەی رۆژنامەوانەکان داوایاندەکرد وێنەی سەنگەرەکان و تەرمی گەریلاکان بگرن بەڵام پێشمەرگەکان ئەم داخوازییەیان رەتدەکردەوە. لە دەوروبەری (شەقڵاوە، هەولێر و سلێمانی) پروپاگەندەی ئەوە دەکرا گوایە گەریلاکانی (پەکەکە) خۆیان رادەست کردووە و ئەوانەیشی رزگاریان بووە خۆیان رادەستی ئێران کردووە و بێچەک کراون، بەڵام کاتێک رۆژنامەوان چوون بۆ بەرەکانی شەڕ پێشمەرگەکان لە خۆشیاندا هەزارە فیشەکیان دەتەقاند و دەیانوت شەڕیان ناوێت و بەڵام بەهۆی فەرمانی فەرماندەکانیانەوە ناچارکراون بێن بۆ ئێرە. دوای خۆر ئاوابوون پێشمەرگەکان هاوانیان دەنا بە بناری شاخەکانەوە، بەڵام ئەوکاتەی رۆژنامەوانەکان لەلای پێشمەرگەکان بوون لەناکاو گەریلاکان تەقە دەکەن و پێشمەرگەیەک بریندار دەبێت و ماشێنێکیشیان زیانی بەردەکەوێت و پێشمەرگەکانیش لە ترسی گیانی خۆیان سەنگەر دەگرن، پاشان فەرماندەی پێشمەرگەکان (مستەفا چاوڕەش) دەڵێت (**لە دوای چەند کاتژمێرێکی تر لە سێ قۆڵەوە هێرش بۆ سەر سەنگەری گەریلاکان دەکەین و لەماوەی ٤ بۆ ٥ رۆژێکیشدا لە هەرێمەکە دەریان دەکەین**)، هەر ئەو ئێوارەیە پەیامنێرەکان فاکسییان نارد بۆ دەزگاکانی خۆیان کە لەماوەیەکی کورتدا پێشمەرگەکان دژ بە سەنگەرەکانی گەریلا هێرشی سێ قۆڵی ئەنجام دەدەن، بەڵام بۆ رۆژی دوایی کە رۆژنامەوانەکان جارێکی تر چوونەوە بەرەکانی شەڕ و ویستییان دەرەنجامی هێرشە سێ قۆڵییە ببینن فەرماندەکانی پێشمەرگە پێیان وتن هێرشەکانیان دواخستووە. ماندوویی و بێتاقەتی ونەمانی وورە بە رووخساری پێشمەرگەکانەوە دیار بوون. دوایی زانرا دەمەوبەیانییەکەی گەریلاکانی (پەکەکە) بە بیکەیسی تەقەیان لە سەنگەرکانی پێشمەگە کردووە، هەربۆیە هێرشە سێ قۆڵییەکەیان دوا خستبوو. رەوش و دیمەنی پێشمەرگەکانی بەرەکە زۆر کۆمێدی بوون، پێشمەرگەیان تێدا هەبوو تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو، زۆربەیان لە جیاتی پۆستاڵ قۆندەرەیان لەپێدا بوو. پێشمەرگەیەکی (٥٠) ساڵە خەنجەرێکی خستبووە بەر پشتوێنەکەی و لەوناوەدا دەسوڕایەوە.

دوای ماوەیەک داوایان لە رۆژنامەوانەکان کرد بگەڕێنەوە بۆ شار. فەرماندەکانی سوپای تورک کە لە ناو بەرەی شەڕەکەدا بوون نەیاندەویست رۆژنامەوانەکان بیانبینن. دوای رۆژێکی تر لە بەرەکە هەمان دیمەن دووبارە بووەوە. ماندویی و ناڕەحەتی لە رووخساری

پێشمەرگەکاندا بە ئاسانی بەدیدەکرا، گەریلاکانیش تەقەیان راگرتبوو. زۆربەی پێشمەرگەکان لە ژێر سێبەری دارەکان پاڵکەوتبوون یان نوستبوون، ئیتر رەوشی پێشمەرگەکان ئەوەندە نارەحەت ببوو کە نارەزایی و سکاڵاکردن بە ئاشکرا دەهێنرایە زمان. پێشمەرگەیەکی بریندار لە نەخۆشخانە باسی رەوشی خۆیانی دەکرد و دەیوت (**بەدووربین تەماشای سەنگەری سەر گردێکمان دەکرد و بۆماندەرکەوت کەسی تێدا نییە، راستەوخۆ ئێمەیان نارد بۆ ئەوێ، سەنگەرەکە گەریلای لێنەبوو، ئەوکاتەی بە شوێن خواردندا دەگەراین لەناکاو تەقەمان لێکرا، دوایی بۆماندەرکەوت کەمینیان بۆداناوین و لە ئاکامدا ٤ پێشمەرگەمان کوژران**) .

لە ١٣مین رۆژی شەروپێکدادانەکاندا پێشمەرگەکان نەیانتوانی بوو پێشرەوی بکەن، هەربۆیە سکرتێری گشتی (یەنەکە) (جەلال تاڵەبانی) لە رێی کەناڵەکەی خۆیانەوە داوای لە پێشمەرگە دێرینەکانیانی دەکرد بچنەوە سەر ئەرکەکانی خۆیان.

ئەگەر بگونجایە و بە ڤیدیۆ دیمەنی پێشمەرگەکانی بەرەکان بگیردرایە لە فیلمێکی زۆر کۆمێدی دەچوو. نەچوونە پێشە و پێشرەوی نەکردنی پێشمەرگەکان لە بەرەکەدا وەکو ئەوە وابوو بڵێی بانگەوازی بۆ سوپای تورک بکەن بە هانایانەوە بچن، هەرچۆنێک بێت سەرۆکی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی بە رۆژنامەوانەکانی وتبوو (**ئەگەر سوپای تورک بێنە ناوەوە ئێمە شانبەشانی ئەوان شەڕ ناکەین و لایەنگری هاتنیشیان نین**)، بەمشێوەیە جەلال تاڵەبانی چاوپۆشی لە هاتنی سوپای تورک دەکرد و لەهەمانکاتیشدا ژیرانە مامەڵەی دەکرد و دەیوت گوایە لایەنگری هاتنی سوپای تورک نییە.

هەر لە سەرەتای هێرشەکانی پێشمەرگە بۆ سەر سەنگەرەکانی گەریلا بە درێژایی ئەو ماوەیە هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆیان بەدەست نەخست و تەنانەت پێشمەرگە زیانێکی زۆریشیان لێکەوت کە ئەمە فەرماندەکانی پێشمەرگەش دەیانهێنایە زمان هەروەها بارگرانی زیانەکان هێواش.. هێواش درکیان پێدەکرا.

پێشمەرگەیەک کە ئەزمونێکی (١٢) ساڵەی هەبوو دەیوت (**بیرم لە کوردستانێکی بەمشێوەیە نەدەکردەوە کە لەپێناویدا شەڕم کردووە، ئەمە هەوڵێکی بێ ئەنجامە، ئەم شەڕە سەرکەوتن بەدەست ناخات، ئەم شەڕە برینێکی قوڵ لە دڵی برا باکوورییەکان دەکاتەوە کە هەرگیز ساڕێژ نابێتەوە، هەربۆیە بڕیارمداوە ئەم شەڕە نەکەم**) .

له ١٤ مین رۆژی شەڕوپێکدادانەکاندا هێشتا هێزی پێشمەرگە لە سەنگەر و شوێنەکانی خۆیاندا بوون، پەیامنێری رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم) لە بەشی تورکیا لە ١٧ی تشرینی یەکەم توانیبووی خۆی بگەهێنێتە ناوچەکە و نا ئارامییەکانی بە چاوی خۆی بینیبوو. چوونە ژوورەوە بۆ ناو شارۆچکەکان دوای هەوڵێکی زۆر پەیامنێرەکان بەدەستیان دەخست، تەنها رێگای ئەو کەسانە دەدرا بچن بۆ ناوچەکە کە ناسنامەیان پێبوو و کە دەیانسەلماند خەڵکی ناوچەکەن. پەیامنێری روژنامەی (ئوزگور گوندەم) (هادی چەلیک) لەبارەی دیمەنەکانی ئەو ناوچەیە دەیوت (**لە خاڵی پشکنینەکاندا ئەوانەی گومانیان لێدەکرێت دەست بەسەر دەکرێن، لە دووری ٨٠ بۆ ٩٠ کم لە شارەوە جەندرمەیەکی زۆر چاودێری رێگاوبانەکان دەکەن، هەروەها ناوچە سنورییەکان بەتەواوەتی لە جیهانی دەرەوە دابڕێنراون، بەهۆی سەرمای زستانەوە نەبوونی خواردن و ئازوقە هاتووەتە ئاراوە، بەگشتی خەڵکی پڕۆتێستۆی درۆ شاخدارەکانی کەناڵە تورکییەکان دەکەن، چاومکەوت بە سەربازێک کە ئەویش وەک من لە دوکانێکدا رۆژنامەی دەکڕی دەیوت تەلەفزیۆن و رۆژنامەکان هەواڵەکان گەورە دەکەنەوە و دوورن لە راستییەوە. بەهۆی بۆردۆمانەکانەوە رەز و باخ و دارستانێکی زۆر سوتاون، لە ناوچەکە ناهێڵن بە ئاسانی رۆژنامەی ئوزگور گوندەم بفرۆشرێت**)[١٢٣] .

ناڕەزاییەکان تەنها بە شوێنێکەوە گرێدراو نەبوو، تا دەهات پەرەیان دەسەند، شارۆچکەکانی وەک (ئیدر، گورچەشی) سەر بە شاری (باتمان) و (یوکسەکئۆڤا)ی سەر بە (هەککاری) و (بولانگ و مەلازگیرد) ی سەر بە شاری (موش) بۆئەوەی هێرشەکانی (پەدەکە و یەنەکە) بۆ سەر (پەکەکە) پرۆتێستۆ بکەن چالاکی دوکان داخستنیان ئەنجامدا. بەرەی رێکخستنەکانی (پەکەکە) بەناوی (ئەرنەکە) بانگەوازی گەلی دەکرد بێنە سەر شەقام و چالاکی ئەنجام بدەن. لە وەڵاتی (سوید) فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردییەکان بانگەوازی ئەوەیان دەکرد لایەنەکان شەڕ رابگرن و کێشەکان لە رێی دیالۆگ و ئاشتی و تەباییەوە چارەسەر بکەن.

---

[١٢٣] ٢٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢، رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم ) .

## حکومەتی هەولێر داوای ئازوقە لە ئەنقەرە دەکات

بەهۆی سەپاندنی ئابلوقە لەلایەن (پەکەکە)وە بۆسەر باشور نەبوونی و گرانی ئازوقەش دەستی پێکردبوو. لە شارەکان بەگشتی نرخی بەنزین زیادی کردبوو هەروەها (١) لیرەی تورکیش گەیشتبوو بە (١٠) دیناری عێراقی، سەرەڕای ئەوەی نرخی هەموو شتێک بەرز ببووە بەڵام لە بازاڕدا هەموو شتێک بەدەست نەدەکەوت. بەهۆی بارگرانی ڕەوشەکەوە بە بیرکردنەوەی ئەوەی (ئایا هاوکاری لەکوێوە بەدەست بخرێت کێشە نییە) داخوازی هاوکاری حکومەتی کوردستان لە تورکیا زیادی کردبوو. قایمەقامی شارۆچکەی زاخۆ (نزار بەرزنجی) بۆ ئەوەی هاوکاری ئازوقە لە تورکیاوە بەدەست بخات زوو.. زوو دەچوو بۆ سلۆپی و چاوی بە بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک دەکەوت. حکومەتی کوردستان کە شەڕیان بۆ تورکیا دەکرد کەوتبوونە گێژاوی نەبوونی ئازوقەوە، ئێستا کاتی ئەوە هاتبوو دەوڵەتی تورک لەسەریان بێتەجواب.

لەو ڕۆژانەدا بەهۆی ڕەوشی نالەباری خەڵکەوە کە لەبەر نەبوونی دەیانناڵاند کۆمیتەیەکی (نەتەوە یەکگرتووەکان) (یوئێن) هاتنە باشوری کوردستانەوە. کۆمیتەکە درکیان بەوە کردبوو بەهۆی سەختی زستانەوە ڕەوشی خەڵکی بە گشتی خراپتر دەبێت و لەحاڵەتی درێژبوونەوەی ئابوڵەقەکەش بە هۆی نەبوونی ئازوقەوە خەڵکی برسی دەبن.

ڕێکخراوی خێرخوازی جیهانی لەمبارەیەوە بە بەشداربوونی (ئەمەریکا، بەریتانیا، فەرەنسا و تورکیا) لە ١٩ی تشرینی یەکەم کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا و وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لەمبارەیەوە دەیوت هەرێمەکە پێویستی بە هاوکارییەکی زۆری مرۆڤی هەیە. نوێنەری ئەمەریکا لە کۆبونەوەکەدا دەیوت (**بەرز بونەوەی ڕێژەی بێکاری و بەرزبونەوەی کێشەی ئابوری وەڵاتان و نەبوونی مادە سەرەکییەکانی ژیان و بەهۆی دەست پێکردنی سەرماوسۆڵە لە هەرێمەکەدا کێشەی گەورەی مرۆیی دێتە ئاراوە هەربۆیە دەبێت یوئێن بە زووترین کات کۆبونەوە ببەستێت**) .

هەموو ئەمانە ئەوەیان نیشاندەدا ڕەوشەکە جدییە و لە مەترسیدایە.

## (کەی تورکیا پەکەکە ی لەناودا سەربازەکانیان دەکشێننەوە)

قایمەقامی شارۆچکەی زاخۆ (نزار بەرزنجی) کاتی خۆی بە روتبەی (عەقید) لە سوپای عێراقدا بوو، لە (٢٠) رۆژەی شەڕەکاندا لە دیمانەیەکیدا دەیوت :

پرسیار (**رەوشی سەربازی شەڕەکان چۆنە؟**) .

وەلام ( پێشمەرگەکانمان بەشێکی ناوچەکانی خواکورک و هەفتانینیان خستووەتە ژێر دەسەلاتی خۆیانەوە، تاچەند رۆژێکی تر هەموو گەریلاکانی پەکەکە لە هەریمەکە دەردەکەین)

پرسیار (**ئایا دەزانن ژمارەی گەریلاکان لە زاخۆوە تاکو سنورەکانی ئێران چەندن؟**).

**وەلام ( ناتوانم ژمارەیەکی دیاریکراو بڵێم بەلام دەوترێت لەوانەیە ژمارەیان ٤٠٠٠ هەزار گەریلایەک بین و ئێستاش ١٠٠٠ هەزار لەوانەش لە هەفتانینن) .**

پرسیار ( **ئایا دەزانن لە ماوەی ١٥ رۆژی شەڕەکاندا پەکەکە چەنێک زیانیان لێکەوتووە ؟**)

وەلام (مەحالە بتوانم ژمارە بڵێم، بەلام دەتوانم بڵێم ژمارەی زیانی گیانیان زورە) .

پرسیار (**ئەی ژمارەی زیانی گیانی پێشمەرگەکانتان چەندە؟**).

وەلام (رەوشی ناوچەکانی تر نازانم بەلام لە ناوچەکانی زاخۆ ١٥ شەهید و دەوروبەری ٥٠ برینداریشمان هەیە) .

پرسیار (**ئایا سوپای تورک لە چی بەشێکەوە هاتونەتە ژوورەوە**) .

وەلام (سوپای تورک لە ناوچەی بەرواری رۆژهەلاتی ئامێدییە تاکو رۆژئاوای زاخۆ و کانیماسی بە پەنتایی ٥کم یان گرتووە) .

پرسیار (**ئایا شەڕی نێوان گەریلاکانی پەکەکە و سوپای تورک لەچی ئاستێکدایە؟**) .

وەلام (بەهۆی کشانەوەی گەریلاکانی پەکەکە لە زۆر شوێندا هێشتا سوپای تورک روبەڕوی شەڕێکی بەرچاو نەبونەتەوە) .

پرسیار (**ئایا پێشمەرگەکانتان لەگەڵ سوپای تورک بەیەک گەیشتوون؟**) .

وەڵام (نەخێر شتی وانەبووە، ئەو شوێنەی سوپای تورکی لێیە پێشمەرگەی لێنییە) .

پرسیار (**ئەگەر سوپای تورک لەو شوێنانەی گیرساونەتەوە جێیان نەهێشت کاردانەوەتان چی دەبێت؟**) .

وەڵام (ئێمە لەگەڵ دەوڵەتی تورک رێککەوتوین، کەی تورکیا پەکەکە ی لەناودا سەربازەکانیان دەکشێنەوە).

پرسیار (**ماوەیەک لەمەوبەر ئێوە دژی بۆردۆمانەکانی سوپای تورک بوون و دژی راوەستان**) .

وەڵام (پێشوتر فڕۆکەکانی تورکیا زیانیان بە گوند و بە خەڵکی سڤیل دەگەیاند، بەڵام ئێستا هیچ زیانێکیان بۆ ئێمە نییە، لەنێوانماندا هێڵی پەیوەندی هەیە) .

پرسیار (**ئەگەر پەکەکە وتیان ئێمە ئامادەین بکشێینەوە ئایا ئێوە رێگایان بۆخۆشدەکەن؟**).

وەڵام (ئەوکاتە پرسیار لە کاک مەسعود و مام جەلال دەکەین) .

پرسیار (**ئایا پێتان وایە ئەو گەریلایانەی لە هەفتانین بەرامبەریان شەڕدەکەن نیەتیان هەبێت بکشێنەوە؟**).

وەڵام (جارناجارێک لە رێی بێتەلەوە قسە لەگەڵ یەکتریدا دەکەین، دەڵێن ئامادەنین بکشێنەوە و دەڵێن تا دوا فیشەکمان شەڕ دەکەین) .

پرسیار (**باشە بۆچی پەکەکە ئەوەندە گرنگی بە هەفتانین دەدات؟**).

وەڵام (لە هەفتانینەوە چوون و هاتنەوە بۆ تورکیا زۆر ئاسانە، چالاکییەکانی بۆتانیان لێرەوە دەبەن بەرێوە، بۆئەوان جێگایەکی ستراتیژییە)[١٢٤].

---

[١٢٤] ٢٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ).

## دەست لەکار کێشانەوە لەناو حکومەتی هەولێر

درێژ بوونەوەی مەودای شەڕەکان و جموجۆڵە سەربازییەکانی سوپای تورک لە باشور و هەروەها ئەو هێرشانەی پێشمەرگە بە هەماهەنگی لەگەڵ سوپای تورک بەرامبەر بە گەریلاکانی پەکەکە ئەنجامیاندەدا و هەرچەندێک لەناو خەڵکیدا ببووە مایەی ناڕەزایی ئەوەندەش لەناو کابینەی حکومەتدا ناڕەزایی لێکەوتەوە. ئەم ناڕەزاییانە ببوونە هۆکار کە (٤) وەزیر دەست لەکار بکشێننەوە. دوای ئەوەی ماوەیەک ئەم دەست لەکار کێشانەوەی وەزیرەکان بە نهێنی گیردرا بەڵام دوای ماوەیەک راگەیاندنەکانی (یەنەکە) باسیان لێوەکرد، نوێنەری (پەدەکە) سەفین دزەیی هەروەکو پیشەی هەموو جارێکی ئەم هەواڵەیشی بە درۆ خستەوە[١٢٥].

لەناو کابینەکەی (یەنەکە و پەدەکە) ئەم وەزیرانەیان بەهۆی پەلامارییەکانی سەر پەکەکە کەبە رەوایان نەزانی بوو دەستیان لەکار کێشابووە پێکهاتبوو لە وەزیری ئەوقاف (مەلا محەمەد مەلا قادر)، وەزیری گەیاندن (پ. د. ئیدریس هادیساڵح)، وەزیری ئیسکان و ئیعمار (شێخ مەمنون نورەدین بریفکانی)، هەروەها وەزیری دارایی (سلاحەدین ئیبراهیم قادر). ئەوانەی لە شوێنەکانی ئەوان دانران ئەم کەسانەبوون، وەزیری دارایی (ئەنوەر قەرەداغی)، وەزیری ئەوقاف (پارێزەر بەختیار حەیدەر عوسمان بەگ)، وەزیری گەیاندن (سەعید رەجەب شەعبان) .

.

---

[١٢٥] ٢٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ، رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ) .

## پەلاماری بۆسەر هەموو ئەوانەی

## گومانی پەیوەندییان لەگەڵ پەکەکە هەیە

لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەکاندا لە باشور کەوتنە گرتنی هەموو ئەوانەی کە گومانیان لەسەر بوو گوایە پەیوەندییان لەگەڵ پەکەکە دا هەیە.
لە ساڵی (١٩٩١) نوسەرێکی باشوری بەناوی (تاریق جامباز) لە (بیقاع) چوو بۆلای سەرۆکی (پەکەکە) عەبدوللە ئۆجالان. تاریق جامباز پەرلەمانتاری (یەنەکە)ش بوو، ئۆرگانی سیاسی (پەکەکە) بەناوی (سەرخوەبوون) دیمانەیەکیان لەگەڵ (تاریق جامباز) ئەنجامدا، دوای بڵاوبونەوەی ئەو دیمانەیە بەهۆی گوشاری (جەلال تاڵەبانی)یەوە تاریق دەستی لەکار کێشایەوە، سەرەڕای ئەمەش هێشتا پەلامار و گوشاری سەر تاریق کۆتاییان پێنەهات، لەهەمانکاتدا وەزیری کشتوکاڵ (سەعید ئەحمەد) توانی گوشاری زیاتر بۆ تاریق بهێنێت و وایلێکرد دژ بە (پەکەکە) نوسینێکی پێبنوسێت و لە رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) بڵاویان کردەوە. لەم نوسینەیەدا ناوبراو لەبارەی بڕیاری ئابڵوقەوە رەخنەی (پەکەکە)ی دەکرد، هەروەها (مومتاز حەیدەر) کە یەکێک لە یاوەرەکانی تاریق بوو لە دۆڵی (بیقاع) چاوی بە (ئۆجالان) کەوتبوو، کە یەکێک بوو لە کارمەندانی رۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، ئەویش لەکارەکەی دوورخرایەوە. یەکێک لە یاوەرەکانی تاریق و مومتاز (محەمەد ئەمین پێنجوێنی) بوو، ئەویش بەهۆی زیادبونی هەڕەشە و گوشار ناچارما بچێت بۆ وەڵاتی ئەڵمانیا. یەکێکی تر کە ئەویش لەگەڵ ئەو گروپە چوبوو بۆ دیتنی ئۆجالان (عەبدولحەکیم عەبدولکەریم) بوو، ئەویش لەلایەن ئاسایشی بەرەی کوردستانییەوە زیندانی کرا و ئەشکەنجەشیان کرد.
لەهەمانکاتیشدا پەلامارییەکان بۆسەر لایەنگرانی (پاک) پارتی ئازادی کوردستان لە زیادبوندا بوو. دەسەڵاتدارانی پارتەکانی باشور دەیانویست لەرێی ئەم تۆقین و گرتنانەوە مەترسی گەشەکردنی پەکەکە لە باشور نەهێڵن. ئەو لایەنانەی لە باشور ئامادەنەبوون شانبەشانی (پەدەکە و یەنەکە) لەهەمبەر پەکەکە شەڕ بکەن بەڵام لایەنەکان گوشاریان بۆدەهێنان کە بەشداری شەڕیان پێبکەن. دوای ئەم گوشارانە ئەوانیش بەهۆی نەبوونی دەسەڵاتیانەوە و

لەبەرئەوەی لاواز بوون بەرگەی هەڕەشەکانیان نەدەگرت، ئەوانیش ناچارمان بلێن پاڵپشتی بڕیارەکانی بەرەی کوردستانی دەکەین.

## کوردی سوریاش ئابلۆقە بەکار دەهێنن

کوردانی سوریاش (رۆژئاوا) بە ئامانجی پرۆتێستوکردنی هێرشەکانی سەر (پەکەکە) ئابلۆقەی ئابوریيان خستە سەر حکومەتی باشوری کوردستان. بازرگانی سنوری سوریا و باشور رۆڵێکی گرنگی دەبینی بەڵام لەژێر دەسەڵاتی (پەکەکە)دا بوو. لە سنوری سوریا ئەو شتومەکانەی هاوردە دەکران زیاتر ئازوقە بوون، بەمشێوەیە دوا دەرگای باشور بۆ هاتنی ئازوقە داخرا.

بەهۆی ئابلوقەکانەوە خەڵکی گوێيان بۆ هەواڵەکانی شەڕ رادێرابوو، رۆژ لە دوای رۆژ قورسایی ئابلۆقە هەستی پێدەکرا، سەرەڕای بەرز بوونەوەی نرخی خۆراک و ئازوقەکان کەچی لەبازاڕدا هەموو شتێک بەردەست نەدەکەوت. بەهۆی راگەیاندنی ئابلۆقەوە لەلایەن (پەکەکە)وە نەبوونی ئارد و رۆن و شەکر و برنج سەريان هەڵدا و بەگشتی خواردەمەنی و ئازوقە بە ئاسانی پەیدانەدەکرا.

سەرکردەکانی باشور ئومێدی خۆیان بە دوو گۆڕانکارییەوە گرێدابوو، یەکێکیان خەرجکردنی ئەو (٢٠٠) ملیۆن دۆلارە بوو کە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ هاوکاریی مرۆیی تەرخانیان کردبوو، ئەویتریان جولانەوەی ئەو لۆریانەبوون کەلە بەشی تورکیا بەهۆی بڕیاری ئابلۆقەی (پەکەکە)وە نەیاندەویست بارەکانیان بهێنن بۆ باشور، بەڵام کردنەوەی ئەو دوو دەرگایەش لەژێر کۆنترۆڵی (پەکەکە)دا بوو. بەرپرسە حکومییەکانی هەولێر دەیانوت (**پێمانوایە دەوڵەتێکی گەورەی وەک تورکیا لەهەمبەر ئابلۆقەی پەکەکە بێدەنگ نابێت**)، ئەم

قسه چەور و قەڵەوانە بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەبوو، حکومەت و بەرپرسیارانی پارتە باشورییەکان بۆ ئەوەی دڵی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانیان نەڕەنجێنن هەتا پێیان بکرایە خۆیان لە ئێران بەدوور دەگرت، هەربۆیە حکومەتی ئێرانیش ڕێگای لە چوونی ئازوقە گرت بۆ عێراق، تەنها لە شارەکانی وەک هەولێر، سلاحەدین و دیانە لە ئێرانەوە ئازوقە بەدەست دەخرا. لەبارەی گرانییەکانەوە هەرێمی بادینان کەمێک باشتر بوو. بەرپرسیارانی حکومەتی هەولێر بە فەرمی قەدەغەی ئەو خواردنانەیان ڕاگەیاند کە لە ئێرانەوە دەهاتن. شەڕی حکومەتی باشور لەهەمبەر (پەکەکە) وایانلێکرد کەلە ئاستی جیهانی دەرەوە بە برسیتی بیانهێڵێتەوە. پێشمەرگەکانی بادینانیش بۆ بەدەستخستنی خۆراک زۆرجار دەچوونە باکوری کوردستانەوە. لە ١٥ی تشرینی یەکەم (١٠٠) پێشمەرگەی (پەدەکە) بۆ بەدەستخستنی خۆراک هێرشیان کردەسەر گوندێکی باکور بەناوی (پرینچێکان)ی سەر بە (یوکسەکئۆڤا)ی سەر بە (هەککاری) کە ژمارەی دانیشتوانیان نزیکەی (٧٠٠) کەسێک دەبوو، پێشمەرگەکان هەڕەشەیان لە گوندنشینەکان کردبوو کە دەبێت ئازوقەیان بدەنێ، بەڵام گوندنشینەکان ئەم داخوازییەی پێشمەرگەکانیان ڕەتکردبووەوە. فەرماندەی بارەگا سەربازییەکەی نزیک گوندەکە بەناوی (عەلی گێزەر) بۆئەوەی ئاڵۆزی نەیەتە ئاراوە ئازوقەی بە پێشمەرگەکان دابوو، خەڵکی ئاواییەکە دەیانوت بارەگا سەربازییەکە بە پڕی (٨) بار هێستر خواردن و پێڵاو و جلوبەرگیان داوە بە پێشمەرگەکان، لەمبارەیەوە گوندنشینەکان دەیانوت (**بەیانییەک کەلە خەو هەڵساین بینیمان پێشمەرگە چواردەوری گوندەکەمانیان گرتووە، هاتنە ماڵەکانمانەوە و دەیانوت دەبێت ئازوقەیان بدەینێ، هەرچەندە هەڕەشەیان کرد و لێمان توڕەبوون بەڵام کەس هیچی نەدانێ، هەربۆیە بەناچاری چوونە لای فەرماندەی بارەگا سەربازییەکە، لە بارەگاکە خواردن و کەلوپەلیان وەرگرت، ماوەی دوو ڕۆژ لە گوندەکەمان مانەوە و دوایش ئەشیاکانیان لە هێستر بارکرد و گوندەکەمانیان چۆڵکرد**)[١٢٦].

لەو ڕۆژانەی کوردانی (ڕۆژئاوا)ی کوردستان دەستیان کردبوو بە ئەنجامدانی ئابڵوقەی ئابوری سەر باشور، گەریلا ڕێگاکانی نێوان چیای (بێخێری دهۆک و زاخۆ) یان گرتبوو. لە نێوان گەریلاکانی (پەکەکە) و پێشمەرگەدا شەڕوپێکدادان هاتبووە ئاراوە، لەئاکامی ئەم شەڕوپێکدادانەدا کە چەند کاتژمێرێکی خایاند ٤ پێشمەرگە بریندار ببوون و هێنابویان بۆ

---

[١٢٦] ٢٥ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ، ڕۆژنامەی (ئوزگور گوندەم)

نەخۆشخانەی زاخۆ. ئەم شەڕوپێکدادانە لە نزیک زاخۆوە روویدابوو هەربۆیە ببووە مایەی دڵەڕاوکێی خەڵکەکە. ئەم شەڕە هەر چەند کەم دوور بوو لە دەرگای (ئیبراهیم خەلیل)ەوە، لەبەر ئەم هۆکارە و بۆ وەرگرتنی ئیحتیاتی خۆیان هاتوچووەکانی (ئیبراهیم خەلیل)یان کەمکردەوە و هەروەها هاتووچۆی رۆژنامەوانەکانیشیان قەدەغە کرد[١٢٧] .

بێدەنگییەکی نوێ باڵی بەسەر (هەفتانین) کێشابوو، تەنها بە هاوان و فڕۆکە بۆردۆمانیان دەکرد. گوزەری شاری (گورەیماکی) سەر بە شاری (بتلیس) بۆ پرۆتێستۆکردنی هێرشەکانی (پەدەکە و یەنەکە) بۆسەر (پەکەکە) لە ٢٠ی تشرینی یەکەم چالاکی دوکان داخستنیان ئەنجامدا، هەروەها کوردستانیان لە تاراوگە لە شارەکانی وەک (ستراستبورگ و پاریس) دژ بە هێرشەکان رێپێوانیان ئەنجامدا.

---

[١٢٧] ٢٤ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە.

## به زۆره‌ملێی به‌ گوندییه‌كان كه‌شف ده‌كه‌ن

خواكورك بۆ سوپای تورك شوێنێكی زۆر مه‌ترسی بوو، هه‌ربۆیه‌ زۆر.. زۆر به‌ وورياييه‌وه‌ هه‌ڵسوكه‌وتيان ده‌كرد. گه‌ريلاكانی (پەكەكە) ڕێگاكانيان لوغم ڕێژ ده‌كرد و بۆسه‌يان داده‌نا و چالاكی كتوپڕيشيان ئه‌نجامده‌دا. سوپای توركيش له‌باره‌ی به‌زاندنی سنوره‌وه‌ زۆر په‌له‌يان نه‌ده‌كرد، به‌ڵام جارناجارێك سوپای تورك له‌ (خواكورك) په‌ره‌يان به‌ هێرشه‌كانيان ده‌دا و بۆ كه‌شفكردنيش زۆرجار به‌ زۆره‌ملێی خه‌ڵكی گونده‌كانيان به‌كار ده‌هێنا، ده‌يانويست به‌م كه‌شفكردنه‌ی گوندييه‌كان بزانن ئايا گه‌ريلاكان له‌ سه‌ر ڕێگاكان لوغم ڕێژيانكردووه‌ يانا و ده‌يانويست بشزانن ئايا بۆسه‌ هه‌يه‌ يانا. به‌هۆی سه‌نگه‌رگرتنی گه‌ريلاكانه‌وه‌ هێرشه‌كانی پێشمه‌رگه‌ سه‌ركه‌وتوو نه‌ده‌بوو، ئه‌مه‌ش وايله‌ سوپای تورك كردبوو زياتر ووريايانه‌ ڕفتار بكه‌ن. له‌ (خواكورك) وه‌ك (هه‌فتانين) ئه‌و شانسه‌يان نه‌بوو زرێپۆش به‌كار بهێنن، هه‌ربۆيه‌ جگه‌ له‌ به‌كارهێنانی هێزی پياده‌ييان بۆ پێشڕه‌وی كردن ڕێگاچاره‌ی تريان نه‌بوو. له‌هه‌مانكاتيشدا گه‌ريلاكانی (پەكەكە) له‌ ناوچه‌كه‌ چه‌ند هێرشێكيان كردبووه‌ سه‌ر باره‌گا سه‌ربازييه‌كانی سوپای تورك. گوندنشينێكی گوندی (گه‌ليی شين) كه‌ ١٠كم له‌ (شه‌مزينان)ه‌وه‌ دووره‌ به‌زۆر بردبويان بۆ كه‌شفكردن، ئه‌م گوندنشينه‌ به‌ په‌يامنێری ڕۆژنامه‌ی (ئۆزگور گونده‌م)ی وتبوو (**له‌ ڕۆژی ٢١ی تشرينی يه‌كه‌م ٦ كه‌سی خه‌ڵكی گونده‌كه‌ له‌لايه‌ن باره‌گا سه‌ربازييه‌كه‌وه‌ به‌زۆره‌ملێی و به‌بێ چه‌ك نێردران بۆ خواكورك تاكو بزانن ئايا له‌ ڕێگاوبانه‌كان گه‌ريلای لێيه‌ يانا**). خه‌ڵكی ناوچه‌كه‌ به‌گشتی به‌هۆی كاری قاچاخچێتی و ئاژه‌ڵدارييانه‌وه‌ زۆر به‌باشی شاره‌زای ڕفتاری گه‌ريلا بوون و گه‌ريلاشيان باش ده‌ناسی. له‌دوا ڕۆژانی شه‌ڕ و پێكدادانه‌كانی (خواكورك) جگه‌ له‌وه‌ی لايه‌نه‌كان به‌ چه‌كی گران ته‌قه‌يان له‌يه‌ك ده‌كرد هيچ هێرشێك نه‌هاتبووه‌ ئاراوه‌ و ئارامانه‌ به‌ڕێوه‌چوو، پێشمه‌رگه‌كان هێشتا له‌و سه‌نگه‌رانه‌دابوون كه‌ له‌يه‌كه‌م ڕۆژدا تێيدا بوون.

له ١٦ى هەمان مانگدا ئەو هێرشەی بیریان لێکردبووه له (خواکورک) ئەنجامی بدەن سەری نەگرت. ئاغای عەشیرەتی برادۆست (کەریم خان) ٣ تۆپی ١٣٠ ملیمی هێنا بۆ گوندی (سیدەکان)، مۆری سەر تۆپەکان لێیان نوسرابوو فەرماندارێتی سوپا سالاری تورک.

فەرماندەیەکی پێشمەرگەی (یەنەکە) له (خواکورک) بەناوی (محەمەد عەلی) سەبارەت به بێدەنگی (خواکورک) بەمشێوەیه روون نه کردنەوەی دەکرد و دەیوت (**هێشتا نەچوبوینه پێشەوه، بۆماندەرکەوت گەریلاکانی پەکەکە له هەموو شتێک زۆر به گومانن، ئەوان کاروباری گەریلایەتی به هزر و به ووردییەوه دەکەن، لەوانەیه هەندێک جار گریمانه و بۆچونەکان پێچەوانه دەرکەون، بەڵام ئێمه لەماوەی ٤ بۆ ٥ رۆژێکی تر پەکەکه له هەرێمەکه دەردەکەین، ئێمه هەدەفی یەکەمان پێکاوه، ئێستاش هەوڵدەدەین بگەینه هەدەفی دووەممان، یارمەتیمان لەکەس وەرنەگرتووه و یارمەتیشمان ناوێت، پەکەکه شەڕی بەها دەکات**) .

## لەشكەنجەدانی زیندانییەكانی پەكەكە

لەگەڵ دەستپێكردنی شەڕوپێكدادانەكاندا، دەنگۆی ئەوە بەرزبووەوە ئەو (٢٦٠) كەسەی كە بە ناوی لایەنگری (پەكەكە)وە لەلایەن (پەدەكە)وە دەستبەسەر كرابوون و خرابونە زیندانی (دهۆك)ەوە ئەشكەنجە درابوون و مامەڵەی نەشیاویان لەگەڵیاندا كردبوو[١٢٨].

رێكخراوی مافی مرۆڤ بەناوی (مێدل ئیست ڤۆیس) لەو راپۆرتەی لەبارەی ناوچەكەوە بڵاویان كردبووە، باسی ئەشكەنجەی ئەو زیندانانەیان كردبوو كە لە زیندانی (دهۆك)ن و بە بیانوی ئەوەی لایەنگری (پەكەكە)ن زیندانی كرابوون، هەروەها باسی ئەوەشیان كردبوو كەسانێكی زۆر گوولە باران كراون و كەسانێكی زۆری تریش رادەستی دەوڵەتی تورك كراونەتەوە.

ئەو راپۆرتە باسی لە ئەشكەنجەدانی زیندانییەكان دەكرد كە لەلایەن (پەدەكە)وە ئەنجام درابوو، هەروەها لەبارەیانەوە چەندین رۆژنامەی تر باسیان لێوەكرد.

(١٨) گەریلای (پەكەكە) كە ٦ یان كچ بوون لەبارەگای (پەدەكە) دەستبەسەر كرابوون، ئەمانە پێش ئەوەی شەڕی باشور دەست پێبكات لە سنوری سوریا بەبێ چەك دەستگیر كرابوون[١٢٩].

---

[١٢٨] ٢٤ی تشرینی دووەم ١٩٩٢، رۆژنامەی ( حورییەتی توركی )

[١٢٩] ٢١ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ( نوزگور گوندەم ).

## (له ٣ رۆژدا پەکەکە لەناو دەبەین) و (شەڕکردن لەگەڵ پەکەکە ئاسان نییە)

ئەو هێرشە قورس و گرانانەی روو لە گەریلاکانی (پەکەکە) ئەنجام درابوون. هاوکات لە ٢٠ مین رۆژی شەڕەکاندا فەرماندەکانی پێشمەرگە دوو رستە هەبوون کە زوو.. زوو دووبارەیان دەکردەوە، یەکێک لەو قسانە (بێ پێشبینی) بوو کە تەنها بە ئامانجی دەروونی دەیانهێنایە زمان، هەروەها دووەمین بە (درۆخستنەوەی قسەکان) بوون، قسەیەک هەیە بە تورکی دەڵێت (ئێڤدەکی حیساب چارشییە ئویمیۆر) واتا ئەو و حیساب و کیتابەی لەماڵەوە دەکرێت لەگەڵ نرخی بازاڕ یەک ناگرێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی ئەنجامەکان بەدەست نەهاتن هەردوولا دەستیان کرد بە بەکارهێنانی چەکی قورس. ئایا هێزی پێشمەرگە چۆن دەیانتوانی لەناو ئەم گێژاوە رزگاریان ببێت؟. هاوکات بەرپرسیارانی (پەدەکە) کە دەیانوت (**ئێمە بڕیاری پەرلەمان جێبەجێ دەکەین**)، هەروەها بەرپرسیارانی (یەنەکە)ش دەیانوت (**پێش ئەوەی پەرلەمان بڕیار بدات پەدەکە دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی هێز و بێگومان ئەوان زوو تر بڕیاریاندابوو کە دەبێت ئەم شەڕە بێتە ئاراوە**) .

بەرەی شەڕی (بادینان) کە لەلایەن ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) (فازل مطنی - میرانی)یەوە دەبرا بەڕێوە، ئەوەی راستی بێت مایەی مەراق بوو کە دەویسترا بزانرێت ئایا فازل چی تۆو کردووە و چی دووریوەتەوە. بێشک هیچ کاتێک رێگایان نەدەدا خەڵکی سڤیل و رۆژنامەوان بچن بۆ بەرەکە، ئەمەش بووە مایەی قسەلۆکەی ناو خەڵک و خەڵکی دەیانوت (**پەدەکە ئەوەی ویستویەتی بەدەستی نەخستووە، ئەوان دۆڕاون بۆیە ناهێڵن رۆژنامەوانەکان بچنە بەرەی شەڕەکانەوە**). ئەوکاتەی رۆژنامەوانەکان پرسیاریان لە

بەرپرسەکان دەکرد و پێیان دەوتن (**ئێوە دەتانوت لە ماوەی ٢ رۆژدا تەواویان دەکەین**)، ئەوانیش بەمشێوەیە وەلامیان دەدایەوە (**ئێمە بیرمان لەوە نەکردبووەوە مەسەلەکە بەمشێوەیە بێت، پەکەکە شەرێکی باش دەکەن**) .

نارەزایی خەلکی کوردستان رۆژ لەدوای رۆژ لە دژی ئەم شەرە پەرەی دەسەند، رۆژنامەوانەکان لەگەل خەلکدا ریپۆرتاژیان دەکرد و خەلکیش دەیانوت (**پێویست ناکات بگەرێین بەدوای ئەوەی ئایا کێ لەسەر حەقە و لەسەر حەق نییە، پێویستە بە زووترین کات کۆتایی بەم شەرە بهێنرێت، ئەو خوێنەی دەرێژرێت خوێنی برایە، ئەم شەرە جگە لەمال وێرانی و زەرەر بۆ میللەت هیچی تری لێ سەوز نابێت، تەنها ئەوانەی گەمەی ئەم شەرەیان دارشتووە براوەن و بەختەوەرن**). بێگومان لە بەشی براوە مەبەستیان لە تورکیا بوو، گەلی کورد لەم شەرەدا هیچ بەرژەوەندییەکیان نەبوو، سەرەرای ئەمەش نارەزایی دەربرینیان لێقەدەغە کرابوو. وەک لە مێژوودا بینراوە ئیمپراتۆرەکان خەلکیان سەرکوت کردووە، ئیستاش هەمانشت لە (زاخۆ و دهۆک) دووبارە دەبووە و خەلکییان سەرکوت دەکرد. رۆژنامە و تەلەفزیۆن و رادیۆکانی باشور سەرەرای ئەوەی رۆژانە بە ١٠ یان کەس دەکوژران هەروەکو ئەوەی هیچ نەبوبێت رفتاریان دەکرد و لەبارەی شەرەکانەوە هیچ هەوالێکیان بلاونەدەکردەوە. بەمشێوەیە عارێکی زۆر پر لە شەرمەزارییان پەردەپۆش دەکرد.

## سوپای تورک له خواکورک لاوازن

هێزی سوپای تورک له ڕۆژی ۲۲ی تشرینی یەکەم له (شەمزینان)ەوه جموجۆڵێکی نوێیان ڕوو له (خواکورک) دەست پێکرد. (خواکورک) ئەو شوێنەیه که زنجیره سنورەییەکانی نێوان عێراق، ئێران و تورکیا بەیەکەوه گرێدەدات. به چوونی سوپای تورک بۆ ناوچەکانی (گادوونی و زەرزا)ی سەر به (شەمزینان) له هەندێک شوێندا ۳کم چوونه باشوری کوردستانەوه، لەهەمانکاتدا گروپێکی سوپای تورک له ۲٦ی هەمان مانگ کەوتنه ناو بۆسەی گەریلاکانی (پەکەکە) وە. لەو شەڕەی هاته ئاراوه ٤ سەربازی تورک کوژران و ۱ گەریلای (پەکەکە) ش گیانی لەدەستدا. لەبارەی شەڕەکانەوه (ئاژانسی ئەنەدۆڵۆ)ی سەر به دەوڵەتی تورک ئیدیعای ئەوەی دەکرد (**ئەوکاتەی تۆپ هاویشتن کەم دەکرێنەوه فڕۆکه جەنگییەکان بۆردۆمان دەکەن، هێزی پیادەی سوپای تورک له خواکورک له پێشڕەویدایه، یەکینەکانی سوپا هەنگاو به هەنگاو دەچنه پێشەوه و پێشی خۆیان پاک دەکەنەوه**).

له ئۆپەراسیۆنەکاندا جاشەکانی عەشیرەتی (هەرکی)ش بەشداربوون. سوپای تورک له ۲۰ی هەمان مانگ یەکینەیەکی تری خۆیان له (ئولودەرە)وه ڕەوانەی (سنات) کرد، بەڵام لێرەش ئەنجامی خۆیانیان بەدەست نەخست. بێگومان جموجۆڵەکەیان به هاوکاری کۆپتەر و فڕۆکه و تۆپ و زرێپۆشەکانەوه دەبرد بەڕێوه. ئەو لوغمانەی گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەر ڕێگاو بانەکاندا چاندوبویان ببوونه هۆکار که سوپای تورک بەخواستی خۆیان نەچنه پێشەوه، لەهەمانکاتدا هێرشەکانی ڕوو له (زاپ) له باشور و له (چوکورجە) و ناوچەکانی (باتوفە و

مەتینە) و شریدەکانی سەر سنور بەردەوام بوون. کۆماندۆی تورک و جاشەکانیان لەهەندێک شوێن ٣کم چوبونە باشوری کوردستانەوە، بەڵام جگە لە هاویشتنی تۆپ و هاوان هیچ شەڕێکی گرنگ نەهاتبووە ئاراوە. یەکێک لە هەواڵە سەربازییەکان ئەوەبوو دەیانوت سەربازێکیان لە ئاکامی تەقینەوەی لوغم بریندار بووە. لە (هەفتانین) گردێک کەوتبووە ژێر کۆنترۆڵی سوپای تورکەوە کە ناویان نابوو گردی ژمارە (٢٨٢١)، بەلام هەتا ئەو کاتەش هیچ شەڕێکی گران نەهاتبووە ئاراوە.

سەرچاوەکانی (پەکەکە)ش دەیانوت (**جموجۆڵە سەربازییەکەی سوپای تورک جدی نەبووە، سوپای تورک تەنها لە باشوری چوکورجە چەند کم هاتوونەتە پێشەوە و زیانی گیانیمان نەبووە**)، هەروەها باسی ئەوەیان دەکرد لە یەکەم پەلاماری بۆسەر (سنات و هێزیل) بە ووریای جوڵاونەتەوە.

## پۆلی فەرماندەیی سێ قۆڵی

لە ٢١ی تشرینی یەکەم گەریلاکانی (پەکەکە) لە (هەفتانین) هێرشیان کردە سەر پێشمەرگەکانی (پەدەکە) و لە ئاکامدا (٥) پێشمەرگە کوژران و (٣) پێشمەرگەش بەدیلی گیران. سەرچاوەکانی (پەکەکە) دەیانوت لەناو دیلەکاندا فەرماندەیەکی (پەدەکە)ی تێدایە و لەبارەی هێرشەکانەوە بەڵگەی گرنگی داوەبەدەستەوە. بەگوێرەی ئەو بەڵگەیەی ئەو فەرماندەیە ئاشکرای کردووە گوایە سەرۆکی (پەدەکە) (مەسعود بارزانی) بە کەسە نزیکەکانی خۆی شەڕەکان دەبات بەڕێوە و جارناجارێکیش خۆی سەرپەرشتی شەڕەکان دەکات. ئەو فەرماندەیەی بە دیلی کەوتبووە دەستی گەریلاکان گوتویەتی (**شەڕ لەلایەن پۆلی سێ قۆڵییەوە دەبرێت بەڕێوە، ئەم پۆلە پێکهاتوون لە فەرماندەیەکی پەدەکە، یەنەکە و سوپای تورک، ئەو سێ فەرماندانەش ئەمانەن پەدەکە فازل میرانی، یەنەکە مستەفا چاورەش و ئەوەی تورکیش جەم ئەرسەڤەر**) .

## لکاندنی سەرکەوتن لەلایەن چاپەمەنییەکانی تورکەوە

سەرکردایەتی گشتی سوپای تورک زۆر بە وورياييەوە لەبارەی شەڕەکان و گۆڕانکارييەکانەوە روونکردنەوەيان دەدا، چاپەمەنی تورکيش زياد لە سوپای تورک هەواڵەکانيان گەورە دەکردەوە و دەگەڕان بە شوێن (سەرکەوتنی لکێندراو)دا. ئەم کردەوەيەی چاپەمەنی تورک تەنانەت لەلايەن سوپای تورکيشەوە بە مەترسيدار دەبينرا. لەحاڵەتی وەرنەگرتنی ئەنجامێکی گرنگ سوپا و کەسايەتی سوپاسالاری تورکی بيدەڕوشا، هەربۆيە ژەنراڵەکانی تورک لە فوو کردنە هەواڵەکان دوو دڵ بوون، بێگومان هەموو ئەمانە بە ئاشکرا باسيان لێوەنەدەکرا ، بێشک لەپشت دەرگا داخراوەکانەوە دەهێنرانە زمان. دوای ئەوەی لەلايەن سوپا سالارەوە کەمێک گوێی راگەياندنەکان راکێشران ئينجا هێواش.. هێواش دەزگا راگەياندنەکانی تورک کەمێک ئيستۆپيان کرد.

روونکردنەوە فەرمييەکان بەرامبەر بە ڕای گشتی لەگەڵ باری دەروونی ناوخۆدا زۆريان جياواز بوو، خۆنەدەکرا ژەنراڵەکانی سوپا بڵێن هەواڵەکان لەسەر خواست و بە بڕياری ئێمە بڵاودەکرێنەوە بەڵام ئەمانە کەمێک زيادەڕۆييان کردووە.

هاوکات جموجۆڵە سەربازييەکان لەلايەن دەزگا راگەياندنەکانەوە زۆر بێبەزەييانە گەورە دەکرانەوە. لەبارەی ئۆپەراسيۆنەکەوە دەزگا راگەياندنەکان ناويان نابوو (گەورەترين ئۆپەراسيۆنی دوا ساڵ). بەگوێرەی ئەم مانشێتانە بێت رايگشتی تورک و ميللەتی تورک چاوەڕێی ئەنجامی زۆر گەورەيان دەکرد، لەگەڵ گەورەکردنەوەی هەواڵەکاندا خودی دەزگا راگەياندن و چاپەمەنييەکان خۆيشيان دەهاتنە جۆش[١٣٠].

---

[١٣٠] ٢٦ی تشرينی دووەم ١٩٩٢ ، ( ئاژانسی ئەنەدۆلو)

بەگوێرەی رایەدارانی سوپای تورک فوو تێکردنێک لەئارادا بوو، بەڵام خۆیشیان باشیاندەزانی کە خۆیان بۆ ئەم هەواڵ و مەسەلانە ئامادە ناکەن. دەزگا راگەیاندنەکانی تورک ئەرکی وەڵامدانەوەی رایگشتی تورکیشیان خستبووە ئەستۆی خۆیان. لەگەڵ درێژ بونەوەی وادەی ئۆپەراسیۆنەکاندا نەهاتنەدی ئەو ئەنجامەی کەلە سوپا سالاری تورک چاوەڕوان دەکرا نوسەرە تورکەکان دەستیان کرد بە هێنانە زمانی سکالاکانیان، نوسەرێکی رۆژنامەی (زەمان)ی تورکی داوای دەکرد ژەنراڵەکانی سوپای تورک لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکانەوە دەبێت روونکردنەوە بدەن [١٣١]، هەمان نوسەر لە گۆشەکەی خۆیدا دەیوت (**پێویستە بزانین گۆڕانکارییەکان لەچی ئاستێکدان**) .

نوسەر (محەمەد عەلی بیراند) کە نوسەری رۆژنامەی (سەباح)ی تورکی بوو دەیوت (**باوەڕ ناکەم هێرشەکانی پێشمەرگە بەرامبەر بە پەکەکە ئەنجام وەرگرێت**)، لەراستیدا ئەم قسەیە ووشیار کردنەوەیەک بوو بۆ ژەنراڵەکانی سوپای تورک و بۆ خاوەنی دەزگا راگەیاندنەکانیش. (محەمەد عەلی بیراند) سەرەنجی بۆ ئەوە رادەکێشا جموجۆڵی سەربازی لە باشوری کوردستان ئەنجام بەدەستەوە نادات، دەیوت (**ئەگەر هەموو گەریلاکانی ئەوێش بە دیلی بگرن دوای ماوەیەکی تر گەریلای تری لێجێگیر دەکرێتەوە**)، هەروەها تیشکی دەخستە سەر ئەوەی رۆژنامەکان مەسەلەکانیان گەورە کردووەتەوە[١٣٢].

هەمان نوسەر واتا (محەمەد عەلی بیراند)، لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی کە بێ ئومێدی خۆی هێنابووە زمان و لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە کە رەش بین بوو کەمی مابوو لەلایەن دەزگا راگەیاندنەکانەوە بە (خائینی نیشتیمانی) لەقەڵەمی بدەن. ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک لەلایەن ژەنراڵ (مەتا سەیار)ەوە دەبرا بەڕێوە. بەدرێژایی یەک مانگی ئۆپەراسیۆنەکان دەزگا راگەیاندنەکانی تورک بەردەوام پەخشی راستەوخۆیان دەکرد، پەیامنێرەکان لە سەنگەری تۆپخانەکانەوە لە چاوەڕوانیدا بوون و لەنێوان خۆیان کەوتبوونە پێشبڕکێی گێڕانەوەی ئەوەی چۆن کۆماندۆ و فڕۆکە و جەندرمەکانیان بەرپەرچی گەریلاکانیان داوەتەوە. ئەفسەرەکانی تورکیش بۆ ئەوەی رۆژنامەوانەکان دیمەنەکان بگرن بە کۆپتەر

---

[١٣١] ٢٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (زەمانی تورکی )

[١٣٢] ٢٤ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( سەباحی تورکی)

دەیانگواستنەوە بۆ ئەو شوێنانەی کە خۆیان مەبەستیان بوو، ڕۆژنامەوانەکانیش لە ڕۆژنامەکانیاندا هاریکاری پێشڕەوی و سەرکەوتنە دروستکراوەکانی سوپایان دەکرد.

لەکاتی شەڕەکاندا پەیامنێرەکان لە سوپای تورک زیاتر کاریان دەکرد و هەندێجار مەسەلەکانیان ئەوەندە گەورە دەکردەوە ئەفسەرەکان ووشیاریان دەکردنەوە کە لەوە زیاتر درۆی گەورە نەکەن. بەگوێرەی پەیامنێرە تورکەکان بوایە بە (عوسمان ئۆجالان)یشەوە دەبوایە هەموو فەرماندەکانی پەکەکە لە بەرەکانی شەڕدا هەریەکەو ٣جار کوژرابێتن. بەگوێرەی ئەو ڕێژەیەی لەبارەی کوژراوەکانی پەکەکە وە پەیامنێرەکان بڵاویان دەکردەوە کوژراوانی پەکەکە (١٠٠٠٠) هەزاری تێپەڕاندبوو، دوای تەواوبوونی ئۆپەراسیۆنەکان ئەم پەیامنێرانە بەهۆی بۆردۆمانە هەواڵە درۆزنانەکانیانەوە پاداشت و خەڵات دەکران و وەک پەیامنێری جەنگ ناوزەند دەکران، ئەم شایەنییە (تەقدیر) کە لەلایەن دوو پەیامنێری (تەرەتە)وە ڕەتکرابوونەوە لە کارەکانیان دوور خرانەوە.

سەرۆکی شارەوانییەکی شارۆچکەیەکی نزیک لە بەرەی شەڕەکانەوە کە نەیدەویست ناوی بهێنرێت لەبارەی درۆ و گەورەکردنەوەی هەواڵەکانەوە هەموو ئەمانەی بە کارێکی بەسزمانانە دەهێنایە زمان و دەیوت **(تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان لەبارەی هەواڵەکانەوە لە پاشا پاشاترن، لە ماوەی ئەو ٢٠ ڕۆژدا وەلاتێکیان نەهێشت کە بیەڵن گەریلا رابکاتە ناوی، گوایە ئاپۆ لە رەوشێکی زۆر خراپدایە، گرد و شاخ نەمان جەندرمە نەگاتە سەر لووتکەکانیان، چیا نەما پێشمەرگە لەژێر دەستی گەریلا دەرینەهێنابێت، ئەگەر قسەکانیان راست بێت ئەوا ژمارەی کوژراوانی گەریلا ژمارەی هەموو گەریلاکانی پەکەکە یە، ئەو ئەفسەرانەی ئەوان مامەحەمەیی بۆدەکەن ئەوانیش لە درۆکانی ئەوان بێزارن، لەم ڕۆژانەدا ئەفسەرێک لەلام دانیشتبوو تەماشای ڕۆژنامەکانی دەکرد و دەیوت بابزانین ئەمجارەیان ڕۆژنامەکان کوێیان بۆگرتوین و چەندیان بۆ کوشتوین)**[١٣٢].

---

[١٣٢] ٢٥ تشرینی دووەم ١٩٩٢ ( نوزگور گوندەم ).

## چەکی ئەڵمان لە شەڕی کورددا

هەتا شەڕەکان درێژەی بکێشایە دیمەنی نوێ و سەرسوڕمانتر دەهاتنە ئاراوە. بەشێکی زۆری ئەو چەکانەی کە لایەنەکانی باشور دژ بە گەریلاکانی (پەکەکە) بەکاریان دەهێنان، خەڵاتی حکومەتی ئەڵمانیا بوو. ٣ ڕۆژ پێش ئەوەی شەڕوپێکدادانەکان دەست پێبکەن حکومەتی ئەڵمانیا بۆ (پەدەکە و یەنەکە) بە تەن چەک و تەقەمەنییان ڕەوانە کرد، بەڵام بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا دەستی گرت بەسەر ئەو تەقەمەنییانەدا. دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی تورک و دەزگا ڕاگەیاندنەکانیشیان دەیانوت حکومەتی ئەڵمانیا چەک دەدات بەو هێزانەی کە دەیانەوێت وەڵاتی تورکیا پارچە بکەن. لەبەرئەوەی ئەم مەسەلەیە گرنگ بوو چەندین ڕۆژ لە ڕۆژەڤی دەزگا ڕاگەیاندنەکانی تورک مایەوە.

ئەوەی مایەی سەیروسەمەرە بوو ئەوەبوو ئەم چەک و تەقەمەنییانە بەرامبەر بە دەوڵەتی تورک بەکار نەدەهێنران و هەمووی چەکی بچوک بوون. زۆر ڕوون و ئاشکرابوو ئەڵمانیا ئەم چەکانەی بە کورد نەدەدا تاکو لەهەمبەر ڕژێمی سەدام بەکاری بهێنن و خۆیانی پێبپارێزن.

ئەو چەکانەی لەلایەن دەوڵەتی تورکەوە دەست بەسەریاندا گیرابوو لە هەفتەی یەکەمین مانگی تشرینی یەکەم درانەوە بە هێزەکانی باشوری کوردستان. ئەو چەک و تەقەمەنییانە

پێکهاتبوون له ١٦ لۆری و ٤ شاحینه[١٣٤]. ئەم چەکانە چەکی سەردەمی ئەڵمانیای شەرقی بوون، کە پێکهاتبوون لە کلاشینکۆفی هەڵوەشاوە و روومانە و فیشەک، لەسەر سنوقی چەکەکان مۆر و ناوی هیچ وەلاتێکی پێوە نەبوو. ئەم چەکانە لەسەردەمی ئەڵمانیای شەرقی بە شێوەیەکی نا قانونی بەرامبەر بە ئەڵمانیای غەربی بەکار هێنرابوون، یاخود لەوانەبوبێت بۆ هاوپەیمانە نهێنییەکانیان تەرخانکرابێت و دروستیان کردبێت. ئەم چەک و تەقەمەنییانە سەرەرای ئەوەی چەند جێبێکی بچوکیشیان لەگەڵدا بوو لە نێوان (پەدەکە و یەنەکە) دابەشکران. ئەم چەکانە لە شەرەکانی ١٢و١٣ ی تشرینی یەکەم لەهەمبەر گەریلاکانی (پەکەکە) بەکار هێنرابوون و هەندێکییان کەوتبووە ژێر دەستی گەریلاکانەوە. فەرماندەکانی پێشمەرگە لە بەرەکانەوە دەیانوت **(ئەو چەکانەی لێرە بە ئێمە دراون چەکی ئەڵمانین، ئەمانە ئەو چەکانەن کە تورکەکان لە دەرگای ئیبراهیم خەلیل دەستیان بەسەریدا گرتبوو)**. حکومەتی ئەنقەرەش دوای ئابڵوقەی (پەکەکە) بۆسەر باشور وەک هاوکاری لەرێی مانگی سووری خۆیانەوە نزیکەی (١٠٠) شاحینەی هاوکاریان نارد بۆ هەولێر، زۆرباشیش دەزانرا کەلە ناو ئەو شاحینانەدا چەک هەیە و رەوانەی بەرەکانی شەریان دەکەن. لەناو ئەو چەکانەی دەوڵەتی تورک دابووی بە (پەدەکە و یەنەکە) ئەو چەکانەیشی تێدابوو کەلە کاتی رەوە مەزنەکەی ساڵی (١٩٩١) لە سەر سنور جەندرمە لە خەڵکییان وەرگرتبوو. بەگشتی لە شەرەکاندا هێزی پێشمەرگە کێشەی نەبوونی تەقەمەنییان هەبوو، حکومەتی تورکیا زیاتر فیشەک و نارنجۆکی بۆ هێزی پێشمەرگە دەنارد. ئەو چەک و تەقەمەنی و نارنجۆکانە لە عەمباری سەربازی (گوڤێرجێلێی) نزیک لە ئەنقەرەوە رەوانە دەکران، چادر و بەتانییەکان لەلایەن مانگی سووری تورکیاوە بۆ پێشمەرگەکان دابینەکران، زۆربەی شوفێرەکان بەناوی ئەوەی گوایە دەچن بۆ (بۆسنا) کاریان دەدانێ و بەلام دەیانناردن بۆ باشوری کوردستان[١٣٥].
ئەم گواستنەوانانە لەکاتی نیوەی شەودا ئەنجام دەدران. رۆژی ٢١ی تشرینی یەکەم کاتژمێر ٤ی بەیانی لەژێر چاودێری پاراستنێکی زۆردا کاروانێک کە پێکدەهات لە (١٥) شاحینە بەسەر (جزرە) دا لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) پەرینەوە. لە پێنج شەممەی هەمان هەفتەدا (١٢)ی شەوی هەینیش ٦ شاحینە لەژێر پاراستنی جەندرمەدا لە (ئیبراهیم خەلیل)وە هێنرانە باشوری

---

[١٣٤] ٢٥ی تشرینی دووەم ١٩٩٢، رۆژنامەی (نوزگور گوندەم )
[١٣٥] ١٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠) .

کوردستانەوە، بەرپرسێکی گومرک دەیوت (**بەهیچ شێوەیەک بەرپرسیارانی بالآمان ڕێگانادەن سەری ئەو شاحینانە هەڵبدرێنەوە**) .

## جەلال تاڵەبانی (جارێکی تر پەلاماری پەکەکە دەدەینەوە)

جەلال تاڵەبانی لە بارەگای سەرەکی خۆی لە (شەقڵاوە) لە ٢٤ی تشرینی یەکەم چەند قسەیەکی بۆ ڕۆژنامەوانەکان کرد، رایدەگەیاند ئەو ماوەیەی داویانە بە (پەکەکە) بۆ بەجێهێشتنی هەرێمەکەیان تەواو بووە، لەمبارەیەوە (جەلال تاڵەبانی) دەیوت (**ئەگەر هەتا نیوەی شەو لە هەرێمەکەمان نەگوازنەوە ئەوا پەلاماریان دەدەینەوە**). بەگشتی لە شەڕەکاندا بە سەدان کەس کوژرابوون، لە ٢٢ یەمین ڕۆژی شەڕەکاندا پرسیاری ئەوەی ئایا شەڕەکان گەیشتوونەتە چی ئاستێک؟، سکرتێری گشتی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی دەیوت (**حکومەتی ئێران بە ئاشکرا یارمەتی پەکەکە دەدات، لە خواکورک چواردەوری گەریلاکانیانمان گرتوون، حکومەتی ئێران کوپتەرەکانیان دەنێرن تاکو برینداری پەکەکە هەڵگرنەوە و لە ئێرانیش تیماریان دەکەن، پێش دوو ڕۆژ لە خواکورک شەڕوپێکدادانەکان زۆر بەدژواری بەسەرچوون، پێشوتر ئاگەدارمان کردوونەتەوە و ئەو شانسەی پێماندابوون ئەم شەو کۆتایی پێدێت، ئەگەر ئەم شەو چۆڵی نەکەن پەلاماریان دەدەین و دەیانخەینە ئێرانەوە**).

لە بیرهێنانەوەیەکی قسەیەکەی (جەلال تاڵەبانی) کە زوو .. زوو دەیهێنایە زمان ئەمەبوو(**لە ماوەی ٢ بۆ ٣ ڕۆژێکدا دەریان دەکەین**) لەسەر ئەم وەبیرهێنانەوەیە (جەلال تاڵەبانی) دەیوت (**ئێوە بە هەڵە حاڵی بوونە، من بەگشتی بە ڕۆژنامەوانەکانم ووتووە ٢ بۆ ٣ هەفتە، پێویستیمان بەکاتە، ئێمە نامانەوێت بیانکوژین، تەنها دەمانەوێت لە هەرێمەکە دەربچن**) .

پێشوتر ئیدیعای ئەوە دەكرا گوایە سەدام هاریكاری (پەكەكە) دەكات، ئێستاش (جەلال تاڵەبانی) هەمان ئیدیعای دووبارە دەكردەوە و كەمێک شتی بوزیاد دەكرد و لەمبارەیەوە دەیوت (**ئەوان تۆمەتی ئەوە دەخەنە پاڵمان گوایە ئێمە لایەنگری ئەمەریكاین، بەلام پەكەكە نەک دژی سەدام حوسێن نییە بەڵكو قسەیەكی كاڵیشیان پێنالێن، هەمیشە لە قسەكانیاندا دەستەواژەی سەدام حوسێن یان رژێمی عێراق بەكار دەهێنن، پەكەكە بانگەوازیمان بۆدەكەن و پێمان دەڵێن لەرێی دیالۆگەوە كێشەكانمان لەگەڵ سەدام چارەسەر بكەین، ئێستا پەكەكە هاوكاری لە عێراق و ئێران وەردەگرێت و لەهەمبەر ئێمە بەكاری دەهێنن، من پێشنیارم بۆكردن بگوازنەوە بۆ بارەگای نێوزەنگ، كەچی هێشتا سوورن لەسەر ئەوەی لەناوچەكانی سەر سنوور بمێننەوە، دیلی پەكەكە مان لەلایە، ئێمە ئەو دیلانە نادەینەوە، مامەڵەیەكی مرۆڤانەیان لەگەڵ دەكەین، ئەو دیلانە دەتوانن لێرە بمێننە و ئەگەر ئارەزووش دەكەن دەتوانین بیاننێرینەوە بۆ وەڵاتەكەی خۆیان**) .

ئەو رۆژەی ناوەرۆكی رۆژنامەوانییەكەی (جەلال تاڵەبانی) لە دەزگا راگەیاندنەكاندا باسكرا، رۆژنامەی فەرمی عێراق بەناوی (الجمهوریيە) نوسی بووی (**پەلامارییەكانی پێشمەرگە بە هەماهەنگی سوپای تورک بۆئەوە ئەنجام دراوە تاكو بزاڤی رزگاری كورد لە توركیا لەناوبەرن**) .

## نییەت خراپی سوپای تورک

لە ناو سوپای تورک باڵێکی گرنگ هەبوون کە لایەنگری نەمانی قەوارەی کورد و وێرانکردنی باکوری عێراق بوون واتا باشوری کوردستان. شەڕوپێکدادانەکان چووە ٢٥مین ڕۆژەوە، سەبارەت بە جموجۆڵی سوپای تورک کێشە لە نێوان حکومەت و باڵی وێرانکاری ناو سوپا هاتبووە ئاراوە. سەرچاوە نزیکەکان لە سوپای تورک لەبارەی جموجۆڵە سەربازییەکانیانەوە دەیانوت (**پێویستە بە شێوەیەکی زۆر جدی ئاسایشی سەرسنورەکان بەرجەستە بکەین، ئەگەر پێویست بکات ئەوا دەتوانین لە مانگی زستانیشدا بەردەوامی بە جموجۆڵەکانمان بدەین، پێویستە یەکینەکانمان لە هەرێمەکە بمێننەوە**). ئەم بۆچونانەیان بە دەنگێکی بەرز دەهێنایە زمان، لە پێچەوانەی خوێندنەوەی ئەم قسانەدا مەبەستیان لە وێرانکاری و پێکهێنانی هەرێمی کۆنترۆڵکراوی ئاسایش بوو. ئەم ڕوونکردنەوانە لە دەزگا ڕاگەیاندنەکانەوە دەهێنرانە زمان، ئەنجومەنی ئاسایشی میللی دەوڵەتی تورک لە ڕوونکردنەوەیەکیاندا دەیانوت (**هەتا سنورەکانمان لە تیرۆریستان پاک دەکەینەوە جموجۆڵی سەربازیمان بەردەوام دەبێت**)[١٣٦].

---

١٣٦ ٢٥ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حوریيەتی تورکی )

بەگوێرەی روونکردنەوە فەرمییەکانیان بێت هەتا جموجۆڵی گەریلا بەردەوام بێت و هەتا کێشەی کورد لە تورکیا بوونی هەبێت دەوڵەتی تورک لەسەر ئەم هەڵوێستەی خۆیان بەردەوام دەبن. ژەنراڵ و کارمەندانی دەوڵەتی تورک باشیان دەزانی هەرگیز گەریلای سەر سنورەکان هەڵناتەکێنرێن هەربۆیە لەبارەی سەرکەوتنی جموجوڵەکانیانەوە بە گومان بوون، هەربۆیە پێویست بوو سوپای تورک دوای ئەو هەنگاو هەڵێنانەیان نەکەونە ناو ئاستەنگییەوە. بەگوێرەی هەواڵی رۆژنامەکانیش بێت (**سوپای تورک لە باکوری عێراق دەمێنێتەوە**)[137].

بێشک ئەمەریکا و وەلاتانی ئەورووپا چاودێری گۆڕانکارییەکانیان دەکرد، ماوەیەک لەمەوبەر گەورەترین شەڕی سەد ساڵە لەم دەڤەرەدا هاتبووە ئاراوە کە ئەویش شەڕی کەنداو بوو. بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک باشیان دەزانی وەلاتانی جیهان بەهۆی سەرشێتی چەند ژەنراڵێکی سوپای تورک دەستبەرداری تورکیا نابن. حکومەتی تورک ئەمەی باش دەزانی و هەربەو شێوەیەش موداخەلەی رەوشەکانی دەکرد و رەوشەکەیان بە ئارەزووی خۆیان هەڵدەسەنگاند و هەرچۆنێک پێویستیان بوایە لە رێی وەزیری دەرەوەی تورکیا (حیکمەت چەتین)ەوە روونکردنەوەیان دەدا. لەناو تورکیادا هیچ رێیەکی قانونی نەبوو بەرەنگاری داخوازی و کارەکانی سوپای تورک ببێتەوە، تەنها بەرەنگاربونەوەیەک هەبێت بێشک جیهانی دەرەوە بوو. وەزیری دەرەوەی تورکیا (حیکمەت چەتین) ناچاردەما بڵێت (**ئەو یەکینانەی سوپای تورکیا کە چونەتە ناو هەرێمەکەوە لەوێ نامێننەوە و هەروەکو چۆن ئیسرائیل لە لوبنان کاری خۆی ئەنجامدا و لەوێ نەمانەوە تورکیاش تا سەر لە باکوری عێراق نامێنێتەوە و تەماحیشمان لە نەوتی کەرکوک نییە**) [138].

وەزیری ناوخۆی تورکیا (عیسمەت سێزگین) دەیوت (**ئێمە نییەتمان نییە لە باکوری عێراق بمێنینەوە، موداخەلەی سوپاکەمان بۆسەر ناوچەکە بە ئامانجی ئەوەبووە رێگری لەو تیرۆریستانە بکەن کە لەسەر سنورەوە دزە دەکەنە ناو خاکەکەمان**)، بەمشێوەیە (عیسمەت سێزگین) دەیویست ئەوە شیکار بکات و روونبکاتەوە کە سوپاکەیان نییەتی خراپیان نییە[139].

---

[137] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( جومهورییەتی تورکی )

[138] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی )

[139] ٢٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( سەباحی تورکی ) .

## هێشتا کادیری کوژراو نییه

له دواهه‌مین هه‌فته‌ی مانگی تشرینی یه‌که‌م به‌سه‌ر (زێی خابور، ئوزونده‌ره و چاغلی)ی سه‌ربه شارۆچکه‌ی (چوکورجه) ی سه‌ر به (هه‌ککاری) سوپای تورک به (٥٠٠٠) سه‌ربازه‌وه جموجوڵێکی سه‌ربازی نوێیان ده‌ست پێکرد، هه‌موو شوێنێکیان به چه‌کی قورس گرتبوو. جه‌ندرمه، جاش، تیمی تایبه‌ت و کۆماندۆی سوپای تورک له‌کاتی سپێده له سنور په‌ڕینه‌وه و له‌هه‌مانکاتدا ده‌بابه و زرێپۆش و تۆپی قورسیان بۆ ناوچه‌که گواسته‌وه و کۆپته‌رێکی زۆریش به ناوچه‌کاندا ده‌سوڕانه‌وه. سوپای تورک پۆل، پۆل سه‌ربازیان ره‌وانه‌ی باشوری کوردستان ده‌کرد و ئه‌م دیو و ئه‌و دیوی سنوریان گرتبوو. سه‌ره‌تا ئه‌و گرووپه سه‌ربازیانه‌ی ره‌وانه کرابوون به کاری سه‌نگه‌ر دروستکردنه‌وه سه‌رقاڵ بوون و په‌یتا.. په‌یتاش سه‌ربازه‌کانیان پێشڕه‌ویان کرد و له‌هه‌مانکاتیشدا له هاتنه‌ئاراوه‌ی شه‌روپێکدادان ده‌سه‌ڵمینه‌وه. سوپای تورک هه‌ر له شاری (عه‌نتاب)ه‌وه تاکو ناوچه سنورییه‌کان بڵاوه‌یان به هێزه‌کانیان کردبوو، به‌گشتی سه‌ربازه‌کانی سوپای تورک به ژینگه و به دژواری ناوچه‌کان نامۆ بوون و ناره‌حه‌تییان ده‌چێژا و ژه‌نراڵه‌کانی تورکیش سه‌رقاڵی دۆزینه‌وه‌ی رێگا چاره‌بوون، هه‌ربۆیه وه‌ک ده‌ستپێک نه‌یانده‌ویست راسته‌وخۆ ده‌ست بکه‌ن به ئه‌نجامی ئه‌و هێرشانه‌ی که پیلان رێژییان بۆکردبوون. پێیان باش بووهێواش،هێواش پێشڕه‌وی بکه‌ن و ترس و دڵه‌ڕاوکێی سه‌ربازه‌کان نه‌هێڵن. پێش ئه‌وه‌ی سه‌ربازه‌کانیان بگه‌نه شوێنی

دیاریکراوی خۆیان کۆپتەری بارهەڵگر بە تەن پێداویستییە سەربازییەکانیان لە شوێنەکان دادەگرت، تۆپێکی زۆری دوور هاوێژی وەک (٦٥،٦٦،٢٠٠ و ٥٠٠) ملیمییان لەناوچەکان جێگیرکرد[١٤٠]. ([١٤١]).

بەگشتی یەکینە سەربازییەکانی سوپای تورک لە ناوچە شاخاوییەکاندا خاوەن ئەزمون نەبوون. ئەو کاتەی ئۆپەراسیۆنەکان بەردەوام بوون سەربازەکان لەسەر گرتنی ئێشکگرتن لەناو خۆیاندا دەبوو بە هەرایان، نزیکەی (٦٠٠٠)هەزار کۆماندۆ، جاش و تیمی تایبەتیان لە سەروبەندی دەست پێکردنی جموجۆڵەکانیاندا بە چەند رۆژێک لە سنورەکانی (ئولودەرە) ئاڵوگۆڕیان پێکراو لە بارەگاکانی (شەنۆبا و شڕناخ) دەیانحەوانەوە، بەمشێوەیە بەرامبەر بە هێرشی گەریلا بەردەوام هێزی تۆکمەیان دەهێنا و دەیانویست وورەی سەربازەکانیان بەرز راگرن. لە چوارچێوەی ئۆپەراسیۆنەکانیاندا فڕۆکە و کۆپتەرەکانی سوپای تورک بەردەوام لە ناوچەکاندا بۆردۆمانیان دەکرد و دوایش سەربازەکانیان دەخستە پێش و هێواش،هێواش پێشڕەوییان دەکرد. یەکەم رۆژی جموجۆڵەکەیان لە ناوچەی (سنات)ەوە دەستی پێکرد، ئەم شوێنە بەردەوام شەڕوپێکدادانی دژواری لێدەهاتە ئاراوە. دەمەوبەیانییەکەی دوای بۆردۆمانێکی چەند کاتژمێری هێزە پیادەییەکانیان بە تۆپ و هاوان گردەکانیان بۆردۆمان کرد. گەریلاکانی (پەکەکە) بە قەنناس و بیکەسی و دۆشکە وەڵامی ئەم تۆپ بارانانەیان دەدایەوە، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەی سوپای تورک بە گرانی خۆیان دادابووە ملەی (سنات) ئەوەبوو بەگشتی فەرماندەکانی گەریلا لە ملەی (هەفتانین) بوون. بۆنمونە ئەو سەردەمە فەرماندەی هێزی گەریلای (هەفتانین) (موراد قەرەیلان)بوو کەلە ناوچەی (سنات) فەرماندارێتی دەکرد، لەکاتی شەڕوپێکدادانەکاندا بەردەوام فەرماندەکانی گەریلا و ئەفسەرە تورکەکان لەرێی بێتەلەوە مشتومڕیان بوو. ئەفسەری هەرەباڵای بەرەی

---

[١٤٠] ٣٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی )

[١٤١] فڕۆکە جەنگییەکانی تورک جارناجارێک لە (خواکورک) یەک دوو گەریلایەکیان بەدیبکردلیە ( بۆردۆمانیان دەکرد، گەریلایەک بەناوی (مستەفا) لە (هەفتانین) مەسەلەی ئەم بۆردۆمانانەی بەمشێوەیە دەگێڕایەوە (ئێمە دوو هەڤاڵ بووین لە گاپێلەکاندا بە ئامانجی کەشفکردن جەولەمان دەکرد، لەناکاو فڕۆکەیەکی سوپای تورک بەدەرکەوت، لەبەرئەوەی کەمێک نزم دەفڕی ئێمەیان بەدیکرد، دوای ئەوەی بەسەرماندا سوڕایەوە جارێکی تر گەڕایەوە، بۆردۆمانمانی کرد، من و هەڤاڵەکەم خۆمان مەڵاسدا و فڕۆکەکەش هەموو تۆپەکانی خۆی لە زنییەکە خستە خوارەوە، واماندەزانی چیاکان بەسەرماندا دەڕوخێن، تەنانەت وتمان ئێتر کاتی مردنمان هاتووە و سڵۆگانیشمان وتەوە، بەڕاستی فڕۆکەوانەکانی سوپای تورک سەبارەت بە خەرجکردنی تەقەمەنی و تۆپەکانی سوپاکەیان زۆر دەست بڵاون) .

سوپای تورک (مەتە سەیار)بوو، ئەو بەردەوام لە ڕێی بێتەلەوە قسەی نەشیاوی بە (موراد قەرەیڵان) دەوت و ئەمەش زۆرجار لەلایەن پەیامنێرەکانەوە دەبینرا. یەکێک لە ڕۆژنامەوانەکان دەیوت (مەتە سەیار) لەڕێی بێتەلەوە لەکاتی قسەکردنی لەگەڵ گەریلاکان قسەی زۆر نەشیاوی دەکرد کە لەگەڵ شانوشەوکەتی ئەودا نەدەوەشایەوە. پێشوتر ئەم ئەفسەرە باڵایەی سوپای تورک (مەتە سەیار)بەهۆی تەقینەوەی لوغمەوە بریندار ببوو، جارێکی تریشیان لە سەرگردی (شیڤە مەرزە) لەدەستی فیشەکی دۆشکەکانی گەریلا زۆر بە زەحمەتی لەمردن ڕزگاری ببوو[142]. ([143]).

لەو سەردەمەدا وەزیری ناوخۆی حکومەتی تورکیا (عیسمەت سێزگین) بانگەشەی ئەوەی دەکرد گوایە پشتی و بڕبڕەی پەکەکە یان شکاندووە[144]. کەچی لە هەواڵێکی ڕۆژنامەوان (سێزایی شێنگوون) کەلە ڕۆژنامەی (حورییەتی تورکی) بڵاوکرایەوە (عیسمەت سێزگین) و ئەفسەرەکانی سوپای تورکی بەدرۆ دەخستەوە. پەیامنێری هەمان ڕۆژنامە کە سەربە سەرکردایەتی گشتی سوپای تورک بوو ئەوکاتەی وەزیری ناوخۆی تورکیا (عیسمەت سێزگین) کە دەیوت پشت و بڕبڕەی پەکەکە مان شکاندووە ڕۆژنامەوان (سێزایی شێنگوون) لەبەری شەڕەکانەوە دەیوت **(سەرەڕای بۆردۆمانەکانی چەند ڕۆژەی تۆپ و فڕۆکەکان کەچی ١٠ بۆ ١٥ گەریلایەک دەتوانن زۆر بە ئاسانی دەست بوەشێن و پاشەکشێ بکەن و پێش ئەوەی ئەم شەڕوپێکدادانەش دەست پێبکات دەوترا نزیکەی (٣٠٠٠) هەزار گەریلای پەکەکە هەن و دەتوانرێت زۆر بە ئاسانی لەناویان بەرین یاخود بەدەست بیانگرین بەڵام**

---

[142] ٣٠ ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

[143] هەندێک لە پەیامنێرەکان کە چاودێری شەڕەکانیان دەکرد لەبەری تورکیاوە، ئەو هەواڵ و ئەو( تێبینیانەی لە ڕۆژنامەکانی خۆیان بڵاویاندەکردەوە لەهەمانکاتیشدا دەیاندە بە لایەنی تریش، یەکێک لە پەیامنێرەکان دەیگێڕایەوە و دەیوت بە کوپتەر ئێمەیان لەسەر گردێک داگرت و لە نزیک (مەتا سەیار) دایاننابین، کۆدی ناوی (مەتا سەیار) لەکاتی شەڕەکاندا (قەساب دۆغان) بوو، شتی زۆر سەیرمان بەرچاوکەوت، بۆنمونە بە بێتەل شوێنی بۆ کوپتەرەکان دیاریدەکرد تاکو بۆردۆمانی بکەن، بەڵام گەریلاکان لە ڕێی بێتەلی خۆیانەوە گوێیان لەم قسانە دەبوو، گەریلاکان لەڕێی بێتەلەکانیانەوە خۆیان دەکرد بە جەندرمە و بانگەوازییان بۆ کوپتەرەکان دەکرد کە لەم شوێنە نەدات و با لە فڵان شوێن بدات، بەڵام لەبەر ئەوەی کود و شفرەی کوپتەرەکانیان نەدەزانی ئەم پیلانەیان سەرینەدەگرت، (مەتا سەیار)یش لە ڕێی بێتەلەوە پێیان دەوت (ئێستا دێم دایکتان .......) .

[144] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

**هەتا ئێستاش نە کادێرێکی کوژراو هەیە و نە کەلوپەلی گرنگی پەکەکە ش بەدەست کەوتوون)**[١٤٥].

## ئامادەکاری بۆ هێرشی هاوبەش

کاتێک هیچ هەواڵێک لەبارەی ئۆپەراسیۆنی ئەو دیو سنور لەبەشی (خواکورک)ەوە بەدەست نەدەکەوت، لە سێیەمین هەفتەی ئۆپەراسیۆنەکاندا سەرچاوە سەربازییەکان دەیانوت نزیکەی (٢٠٠) کۆماندۆ چونەتە کەمپاکانی (ئیرە و گردی ژمارە٢٨٠٠) و هەروەها (١٠) سەنگەری گەریلایان تەفروتونا کردووە.

لەنێوان گەریلاکان و ئەفسەرە تورکەکاندا لە ڕێی بێتەلەوە قسە دەکرا، ئەفسەرەکان بە گەریلاکانیان دەوت (**خۆتان رادەست بکەن**)، گەریلاکانیش وەڵامیان دەدانەوە و دەیانوت (**پێویستە لەسەر مێزی گفتوگۆ دانشین و ڕێککەوتنی سیاسی بکەین**)، لە سەروبەندی ئەم قسانەدا جارناجارێک فڕۆکەوانی کۆپتەرەکانیش دەهاتنە بەینەوە و جوێنیان بە گەریلاکان دەدا، گەریلاکانی (پەکەکە) قسەی نەشیاویان نەدەکرد، هەروەها ئەفسەرەکانیشیان ووشیار دەکردەوە کە جوێندان شەرمە[١٤٦].

فەرماندەی گروپی کۆماندۆی چیایی (شەمزینان) (حەنەفی بۆیوکچارپار) دەیوت (**دوای بەدەست هێنانی سەرکەوتنەکانی خواکورک ئیتر پەکەکە ناتوانێت پشتی خۆی راست بکاتەوە**)[١٤٧]. ئەو بانگەشەیە زۆر کۆمێدی بوو کە دەیوت (**٥٠٠ گەریلای پەکەکە لە خواکورکن و لەلایەن ٢٠٠ کۆماندۆوە چواردەوریان گیراوە**)، سەرچاوەکانی سوپای تورک دەیانوت (٤) رۆژ لەمەوبەر گردی ژمارە (٢٨٠٠)یان گرتووە، لەهەمانکاتدا بە گوێرەی هەواڵی رۆژنامەکانی تورک بوبێت بە درێژایی شەڕی باشور دەبوایە (عوسمان ئۆجالان) سێ جار

---

[١٤٥] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

[١٤٦] ٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠)

[١٤٧] ٢٤ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ( ئاژانسی ئەنەدۆڵو )

کوژرابێت[١٤٨]. ژەنراڵەکانی سوپای تورک لە روانگەی سەربازییەوە سەرکەوتنیان بەدەست نەخستبوو، لە بەشی (خواکورک) زیاتر خۆیان دادابووە بەشی شەڕی دەروونییەوە.

هێرشەکانی پێشمەرگەکانی (پەدەکە و یەنەکە) بۆسەر گەریلاکانی (پەکەکە) ئەنجامێکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نەدا، هەربۆیە ناچارانە دەستبەرداری هێرشکردن ببوون و تەنها لە دوورەوە تەقەیان دەکرد و خەمساردانە لە مەسەلەکەیان دەڕوانی. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە هەفتانین بڵاوەیان کردبوو، بۆ ئەنجامدانی هێرشێکی نوێ بۆسەر سەنگەرەکانی گەریلا سەرلەنوێ کۆکرانەوە. قایمەقامی زاخۆ (نزار بەرزنجی) دەیوت (**بۆ ئەنجامدانی هێرشێکی نوێ هێزی پێشمەرگە سەرلەنوێ کۆکراونەتەوە و ئەو هێرشەیشی ئەنجام دەدرێت بە هەماهەنگی لەگەڵ سوپای تورک ئەنجام دەدرێت و بەتایبەتی داوامان لە سوپای تورک کردووە بە کۆپتەر هاوکاریمان بکەن**)[١٤٩].

ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) (فازل موطنی میرانی) دەیوت (**ئاشکرا نییە کەی کۆتایی بە شەڕەکان دەهێنرێت، لەناوچە شاخاوییەکان پێشڕەوی کردن و چوونە پێشەوە زۆر زەحمەتە، گەریلاکانی پەکەکە لە شێوەی دسپلینی ستالینی خۆراگری و بەرگری دەکەن**)[١٥٠].

لەلایەکی تریشەوە کۆمیتەی باڵای (بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستانی عێراق) لە ١٨ی تشرینی یەکەم بانگەوازییەکیان بۆ (پەکەکە) و بەرەی کوردستانی کرد کە ئەم شەڕە تەنها گەلی کورد تێیدا زەرەرمەند دەبێت و هەروەها داوایان لە لایەنەکان دەکرد بەزووترین کات کۆتایی بە شەڕەکان بهێنن[١٥١].

لە (بۆن)ی پایتەختی (ئەڵمانیا) یەکێتی رۆشنبیرانی وەڵاتپارێزی کوردستان کۆنفرانسێکیان بەست، لەهەمان رۆژدا روونکردنەوەیەکیاندا و دەیانوت (**پێویستە ئەو هێرشانەی لە باشوری کوردستان لەهەمبەر پەکەکە ئەنجام دەدرێن رابوەسترێن وهۆیەکەی هەرچییەک دەبێت ناکرێت داوا لە پەکەکە بکرێت خاکی کوردستان جێبهێڵێت، سەرکردایەتی پەدەکە و یەنەکە ئومێدی خۆیان گرێداوە بە هێزە دەرەکییەکانەوە، پێویستە کۆتایی بە هێرشەکان بهێنرێت**)[١٥٢].

---

[١٤٨] هەمان سەرچاوە

[١٤٩] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[١٥٠] هەمان سەرچاوە

[١٥١] هەمان سەرچاوە

[١٥٢] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

## دواهەمین هێرش لە (خواکورک)

لە شەوی ٢٤ی مانگی تشرینی یەکەم هێزەکانی گەریلا لە (خواکورک) هێرشیان کردەسەر دوو بنکەی پێشمەرگە، لەدوای ئەم هێرشە پێشمەرگەکانی (پەدەکە و یەنەکە) هێرشێکی بەربڵاویان کردەسەر سەنگەرەکانی گەریلا. سەرچاوەکانی (پەکەکە) دەیانوت لەو هێرشەدا (٤٠) پێشمەرگە گیانیان لەدەست داوە و (١) گەریلاش شەهید بووە و ژمارەیەکی زۆری چەکی ئەڵمانی دەستی پێشمەرگەکانیش دەستیان بەسەردا گیراوە و کەلوپەلێکی زۆری سەربازیش گیراون، هەروەها دەیانوت فەرماندەکانی وەک (شەعبان یەران و ئەحمەد عارف) و دوو پێشمەرگەش بەناوی (محەمەد پلور و سەربەست شەعبان) بەدیل گیراون.[١٥٣] سکرتێری گشتی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانیش لە شەقڵاوە روونکردنەوەیەکی کرد و دەیوت (**ئەگەر ئەم شەو پەکەکە هەرێمەکەمان چۆڵ نەکەن پەلاماریان دەدەینەوە**)، لە شەوی ٢٥ی تشرینی یەکەم بە هەزارەها پێشمەرگە هێرشی سەر گەریلاکانیان دەست پێکرد و شەڕوپێکدادانێکی زۆر دژوار هاتەئاراوە. لەسەر ئەو بانگەوازییەی (جەلال تاڵەبانی) لە (خواکورک) پێشمەگەکان هێرشیان بۆسەر سەنگەری گەریلاکان دەست پێکرد. بۆیەکەمجاریان بوو کە تۆپی (١٣٠ملیم) بەکار بهێنن. ئەم تۆپانە چەند رۆژێک پێش ئەم هێرشانە سوپای تورک هێنابویان بۆ ناوچەی برادۆست، دوای ئەوەی گەریلاکان بەرپەرچی هێرشەکانیان دایەوە پێشمەرگەکان ناچارمان پاشەکشێ بکەن.

---

[١٥٣] ٢٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

لەدوای شەڕوپێکدادانەکان سەرچاوەکانی باشوری کوردستان دەیانوت (٤) پێشمەرگە گیانیان لەدەستداوە و (٢٤) پێشمەرگەش بریندار بوونە. لەبارەی زیانی گیانی گەریلاکانەوە هیچ زانیارییەک بەدستەوە نەبوو، لەمبارەیەوە فەرمانەدەیەکی پێشمەرگە بەناوی (عوسمانی حاجی مەحمود) دەیوت **(گەریلاکان زیانێکی زۆری گیانیان هەیە، بەلام تەرمەکانی خۆیانیان لەگەل خۆیاندا بردووە. لەکاتی شەڕەکاندا گەریلاکانی پەکەکە لەرێی بێتەلەوە مارشی نیشتیمانییان بۆلێداوین و پێمانیان دەوت نامانەوێت بتانکوژین، خۆتان بە کوشت مەدەن و وەک فیدایی خۆتان نیشان مەدەن. بێگومان ئێمەش نامانەوێت ئەوان بکوژین، بەلام سەرکردەکانمان هێشتا فەرمانیان نەداوە کە کەی شەڕەکان رادەگیردرێن)**[١٥٤].

لە ٢٣ی تشرینی یەکەم لە زاخۆوە (١٠) لۆری بارهەلگر کە پڕبوون لە خواردن و تەقەمەنی نێردران بۆ (خواکورک)، ئەم پێداویستییانە لەو شەڕەدا بەکار دەهێنران کەلە ٢٥ی مانگ دەهاتنە ئاراوە. هاوکات ئەوکاتەی شەڕی نێوان پێشمەرگە و گەریلاکان ئالۆز ببوو، مایەی سەرنج راکێشان نەبوو کە بۆچی سوپای تورک هێرشی سەر (خواکورک)ی دەست پێکردووە، لەسەر ئەم جموجۆلە سەربازییەی سوپای تورک گەریلاکانی (پەکەکە) دەستیان کرد بە جێگیرکردنی خۆیان لە سنورەکان و چەند گروپێکیان نارد بۆ (شەمزینان). لەگەل هێرشەکانی پێشمەرگە بۆسەر سەنگەرەکانی گەریلا و لەگەل جموجۆلی سەربازی سوپای تورک فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک ماوەی (٣) رۆژ بۆردۆمانێکی چڕی ناوچەکانیان کرد، بێشک (هەفتانین)یش لەناو هەمان رەوشدابوو. لە ٢٣ی تشرینی یەکەم لە رێی (ئۆلودەرە)وە نزیکەی (٥٠٠٠) هەزار کۆماندۆی تورک گواسترانەوە بۆ (ئشکڤێران)، بەهاتنی ئەو کۆماندۆیانە ئەو سەربازانەی ماندوبون و ریش و سمێلیان هاتبوو کشانیاننەوە بۆ بارەگا سەرەکییەکانیان. لەو ناوچەیەدا جگە لەوەی لە ٢٣ و ٢٤ی تشرینی یەکەم لە ئاکامی تەقینەوەی لوغمدا جاشێک و ئەفسەرێک بریندار بوون هیچ شەڕوپێکدادانێک نەهاتبووە ئاراوە، لە ناوچەی (سنات)یش بۆردۆمانی ئاسمانی و هاویشتنی تۆپی قورس و هاوان بەردەوام بوو.

لەناوچەکە بەگشتی سەرماوسۆلە بالی کێشابوو بەسەر هەموو سروشتدا هەربۆیە پێشمەرگەکان بۆخۆگەرم کردنەوە دارەکانی دەوروبەری خۆیان دەسوتاند. رۆژنامە

---

[١٥٤] ٢٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

بیانییەکان کە بۆ چاودێریکردنی شەڕەکان چوبونە ناوچەکانەوە دەیانوت (پێشمەرگە زیاد لەوەی خۆیان بە شەڕەوە سەرقاڵ بکەن کەچی سەرقاڵی کوشتنی سروشتن و دارستان دەسوتێنن)، مەخابن ئەمەش قەدەرێکی نەگریسی تری مێژووی کورد بوو [155].

## ئێمە کۆنترۆڵی شەڕەکانمان کردووە

ئۆفیسی رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم) لە ئەوروپا لەرێی تەلەفونەوە لە ٢٦ی تشرینی یەکەم دیمانەیەکیان لەگەڵ فەرماندەیەکی (پەکەکە) سازدا کە بەمشێوەیە بوو:

**پرسیار** :(**ئەمانەوێت بزانین لەبارەی شەڕوپێکدادانەکانەوە دەڵێن چی؟**).

**وەڵام** :(زیانێکی زۆری بەرچاو لە هێزەکانی پەدەکە و یەنەکە دراون و کشاونەتەوە. دوای ئەوەی هێزەکانی پێشمەرگە سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا ئینجا سوپای تورک ویستی بێنە باشوری کوردستانەوە، هەتا ئەمڕۆش شەڕوپێکدادانەکان بەردەوامن. چەکە قورسەکانی دەستی پێشمەرگە لەلایەن ئەفسەرەکانی تورکەوە بەکار دەهێنرێن، هێزەکانمان لە باشور بەرامبەر بە هێزی خیانەت و لە باکوریش بەرامبەر بە سوپای تورک هێرشی سەرکەوتووانەیان ئەنجامداوە. ئێمە براوەی شەڕەکانین، دەوڵەتی تورک لەرێی پروپاگەندەی خۆیانەوە دەیانەوێت سەرنەکەوتنەکانیان پەردەپۆش بکەن، سەرەڕای هەموو درۆ و بوختان و پروپاگەندە درۆزنانەکانی پەدەکە و یەنەکە بەلام گەل درک بە درۆ و چەواشەکارییەکانیان دەکات و هەست بە راستییەکان دەکەن).

**پرسیار: (بەگشتی ئێستا رەوشی بەرەی شەڕەکان چۆنن؟)**.

**وەڵام** :(شەڕەکان لە باشور لەهەمبەر خیانەت و لە باکوریش لەهەمبەری سوپای تورک بەردەوامن، بەرپەرچی هەموو هێرشەکانی هێزی خیانەتکارانمان داوەتەوە. لە ناوچەی خابور

---

[155] هەمان سەرچاوە .

گەریلاکانمان هێرشیان کردەسەر دوو بنکەیان، زیانی گیانی ئەوان بە ١٥ بۆ ٢٠ کەسێک مەزەندە دەکرێت. لەم هێرشەماندا گەریلایەکمان شەهید بووە، لەم هێرشەدا خاڵێکی زۆر گرنگ کەوتووەتە ژێردەستمان و زیانێکی زۆریان بەرکەوتووە. بەهۆی ئەم زیانەوەیان لە هەرێمی سۆرانەوە پێشمەرگەی نوێیان هێناوە بۆ ناوچەکان و هەتا ئێستاش بەردەوامن لە هێنانی پێشمەرگە. لەبەرئەوەی سوپای تورک لە زۆرلاوە هاتونەتە نێوانمانەوە بەشێکی زۆری شەڕەکانمان لەگەڵ سوپای تورکە، ئەو دیلانەی کە لەم دواییەدا کەوتونەتە بەردەستمان دەڵێن شەڕەکان لەلایەن ئەفسەرە تورکەکانەوە دەبرێن بەڕێوە. لەم ماوەیەدا پێشمەرگەیەکی یەنەکە مان بەدیلیگرت و ئەو هەموو راستییەکانی بۆدرکاندین).

**پرسیار** : (**ئایا دیلەکان باسی چیدەکەن؟**).

**وەلام** :(پێشمەرگەیەکی سەر بە یەنەکە کە لەلامان دیلە بەناوی شەعبان بارانی دەڵێت {بەرەی هەرێمی سۆران لەلایەن ئەفسەرە تورکەکانەوە دەبرێت بەڕێوە} هەروەها دوو فەرماندەی تری پەدەکە کە لەلامان دیلن بەناوەکانی محەمەد پولور و عەبدولرەحمان حەسەن دەڵێن {ئەوانەی ئێمە دەبەن بەڕێوە و ئەوانەیشی پێداویستییەکانمان بۆ دابین دەکەن هەر سوپای تورکە} بەگوێرەی گوتنەکانی شەعبان بێت پێشمەرگەکان لەلایەن ئەفسەرە تورکەکانەوە دەبرێن بەڕێوە. ئەو ئەفسەرانە لەرێی بێتەلەوە قسە لەگەڵ فڕۆکەوانەکان دەکەن، جارێکییان لەبەرئەوەی ئەفسەرەکە شارەزایی ناوچەکە نەبوو بە هەڵە رێنمایی دابوو بە کۆپتەرەکان و شوێنی پێشمەرگەکانیان بۆردۆمان کرد. دیلەکان پێیان وتین {فڕۆکەکان بە هەڵە شوێنەکانی ئێمەیان بۆردۆمان کرد و ئێمەش بە زەحمەتی خۆمان رزگارکرد} بێگومان بەڵگەیەکی زۆرمان لەژێردەستدایە، ئەگەر دەرفەت و ئیمکان هەبووایە هەموومان پێشکەش دەکردن. بەگوێرەی زانیارییەکانی ئەو دیلانە شەڕەکانی ناوچەی باتوفە لەلایەن ئەفسەرێکی تورک و دوو فەرماندەی پێشمەرگەوە دەبرێت بەڕێوە بە ناوەکانی ئەحمەد عارف و دیوان، خودی مەسعود بارزانیش جارناجارێک سەردانی بەرەکانی شەڕ دەکات. بەگوێرەی زانیارییەکانی ئەو دیلانە لە سەرووی خۆیانەوە پێیان وتراوە هەتا پێتان دەکرێت {پەکەکە لەناو بەرن}، ئەو شتومەک و چەکانەی لەلایەن گەریلاکانمانەوە دەستیان بەسەردا گیراوە هەمووی ئەشیای تورک و چەکی ئەڵمانییە، فڕۆکەکانی تورک بۆ ئەوەی رێگریمان لێبکەن و نەهێڵن هێرشی پێشمەرگە بکەین بەردەوام ناوبەرمان بۆردۆمان دەکەن).

**پرسیار : (ئایا ئیستا له بەرەی خواکورک چیدەگوزەرێت؟).**

**وەڵام :** (هێزەکانمان له ٢٥ی تشرینی یەکەم هێرشیان کردەسەر دوو بنکەی خائینان، لەم هێرشەدا زیانێکی زۆری گیانییان لێکەوت. لەدوای ئەم هێرشە پێشمەرگەش له ٤ قۆڵەوە هێرشیان ئەنجامدا، شەڕێکی دژوار له نێوانماندا هاتەئاراوە و توانرا بەرپەرچی هێرشەکانیان بدەینەوە. نزیکەی ٤٠ پێشمەرگەیان کوژراو به دەیانیشیان لێبریندار بوو، زۆربەی کوژراوەکانیان جیهێشتو هەڵاتن. ئەفسەرێکی تورک فەرمانداریتی ئەم هێرشانەی پێشمەرگەکانی کردبوو، لەرێی بێتەلەکانمانەوە بەردەوام گوێ له قسەکانیان دەگرین، بۆنمونە ئەو ئەفسەرەی سەرپەرشتی هێرشەکانی پێشمەرگەی کردبوو ئەویش کرمانج بوو، کوردییەکی باشیشی دەزانی، لەم ناوچانەدا هێشتا شەروپێکدادان بەردەوامن).

**پرسیار : (بەگشتی ئێستا رەوشی هەرێمەکان چۆنن؟).**

**وەڵام :** (له ناوچەکانی هەفتانین و خواکورک شەڕوپێکدادان بەردەوامن، بێگومان فرۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکیش بەردەوام بۆردۆمان دەکەن. بێشک ئەو هەواڵانە درۆن کە دەڵێن هەفتانین و خواکورک کەوتونەتە ژێر کۆنترۆڵی سوپای تورکەوە. ئیمە خومان دەمانەوێت ئەوان بێنە پێشەوە، بەڵام نایەن. ئەوان باش دەزانن کە بێنە پێشەوە دەکەونە ناو قوراوێکەوە رزگاربونیان زۆر زەحمەت دەبێت، زیانێکی گەورە له سوپای تورک کەوتووە و هیچ سەرکەوتنێکی بەرچاویشیان بەدەست نەخستووە، دەیانەوێت ئەم ژێر کەوتنەشیان له رایگشتی بشارنەوە).

## جموجۆڵی زریپۆشەکانی سوپای تورک

ئەو هێرشانەی هێزەکانی پێشمەرگە لە (خواکورک) لەهەمبەر سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە) دەستیان پێکردبوو لە ٢٥ی تشرینی یەکەم لە کاتژمێر ٤ ی بەیانییەوە تاکو دوای نیوەڕۆ بەردەوام بوو. هێرشەکان لە ئێوارەی ٢٦ی مانگدا راگیردران، لەم هێرشەدا نزیکەی (١٥٠٠) پێشمەرگە بەشداریان تێداکرد و لە هێرشەکانی سەر گردی (سور) پێشمەرگەکان لەهەمبەری گەریلاکاندا سەرکەوتنی دڵخۆشکەرەیان بەدەست نەخست.

لەهەمانکاتیشدا لە (ئۆلودەرە و چوکورجە) سوپای تورک بەردەوام بوون لە هێرشەکانیان بۆسەر گەریلا، لە ٢٥ ی هەمان مانگدا لە نزیک شارۆچکەی (سلۆپی) یەکینەکانی دەبابە و زریپۆشی سوپای تورک لەگەڵ تۆپەکانیاندا لە (هێزیلچای) پەڕینەوە و چوونە ناوچەکانی (دەشتەتەخ و بێزەدیک)ی سەر بە (هەفتانین)، شەڕەکانی گەریلا لەهەمبەر ئەم هێزی زریپۆشەی سوپای تورک زۆر بەدژواری پەرەیسەند.

لە ناوچە شاخاوییەکانیش شەڕوپێکدادان بەردەوام بوو، زریپۆشەکان بۆ پێشڕەوی کردنیان بەهۆی نەبونی ریگاوبانی پێویست و گونجاو بەگوێرەی پێویستی خۆیان رێگاوبانیان دەدۆزییەوە. سوپای عێراق کە ساڵانێکی دووردرێژ بوو بەرامبەر بە بزاڤی رزگاری گەلی کوردستان لە شەڕدا بوو لە ناوچەکاندا بۆ هاتوچۆی سوپاکەیان هەندێک رێگاوبانی دروست کردبوو کە بەرەو ناوچە شاخاوییەکان دەچوون، زریپۆشەکانی سوپای تورکیش ئەم رێگاوبانانەیان بەکار دەهێنا. سوپای تورک مەبەستی ئەوەبوو لە رێی ئەم زریپۆشانەوە بەرخودانی گەریلا تێکبشکێنێت و هەتا شوێنی گونجاویش زریپۆشەکانیان بەرن. ئەم زریپۆشانە ئەو شوێنانەیان دەگرت کە بەلای پێشمەرگە و سوپای تورکەوە شوێنی ستراتیژی بوون، زریپۆشەکان بە دەوروبەری جادەکانەوە بوون، لە کاتی پێشڕەوی پێشمەرگە و کۆماندۆکانی خۆیان بۆئەوەی لەلایەن گەریلاکانەوە زیانیان پێنەگات تەقەیان لە چواردەوری خۆیان دەکرد.

گەریلاکانی (پەکەکە)ش بۆ ئەوەی رێ لە پێشڕەوییەکانی ئەم زریپۆشانە بگرن لەسەر رێگاوبانەکاندا لوغمیان دەچاند. لەگەڵ دەستپێکردنی ئەم هێرشانەشدا بۆردومانی فڕۆکە

جەنگییەکانی سوپای تورک چڕتر ببووەوە، لەم بۆردۆمانانەشدا هەندێکجار هەڵەش دەهاتنە ئاراوە. فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک لە (بۆسەڵی) بەهەڵە سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان بۆردۆمان کرد، لەم ڕووداوەدا پێشمەرگەیەک کوژرا و چەند کەسێکی تریشیان بریندار بوون. هەفتەیەک لەمەوبەریش فڕۆکەکان لە ناوچەی (سنات) سەنگەرەکانی خۆیانیان بۆردۆمان کردبوو، لە ئەنجامدا (٣٠) سەربازیان بریندار ببوو[١٥٦].

ئەم هەواڵەش لەلایەن گەریلاوە بە گوێگرتن لە بێتەلەکانەوە بەدەست کەوتبوو، لەو ڕۆژانەدا جموجوڵی زرێپۆش و دەبابەکان دەستیان پێکرد، قایمەقامی شارۆچەکەی (زاخۆ) (نزار بەرزنجی) دەیوت (**پەکینەکانی سوپای تورک نزیکەی ٤٥کیلۆمەتر لەهێڵی سنورەیان خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، وە ٧کم یش هاتونەتە ناو خاکی باشوری کوردستانەوە، هەروەها سەنگەرکانی گەریلا لە پیربلا، ئەولهێ، شابانی، کەشانێ لەلایەن هێزی پێشمەرگە و سوپای تورکەوە گەمارۆدراون، مەحاڵە گەریلاکانی پەکەکە لەهەمبەر ئەم گەمارۆدانەدا رزگاریان ببێت**). (نزار بەرزنجی) بانگەشەی ئەوەی دەکرد جموجوڵی هاوبەشیان لەلایەن سوپای تورکەوە دەبرێت بەڕێوە، هەروەها گلەیی لە دەزگا ڕاگەیاندنەکانی تورک دەکرد گوایە وتویانە پێشمەرگە بەرامبەر بە (پەکەکە) شکستیان هێناوە و ئەم هەوالانەی شەرمەزار دەکرد. سەبارەت بە زیانی گیانی گەریلاکانی (پەکەکە)وە نزار دەیوت ڕۆژنامەکان بەتەواوی درۆیان هەڵبەستووە، دەشیوت لە شەڕەکانی (هەفتانین) (٣٠) پێشمەرگە کوژراون و (١٥٩) پێشمەرگەی دیکەش بریندار بوونە[١٥٧].

بە درێژایی هەفتەیەک لە (هەفتانین) تەقەی نێوان گەریلاکان و پێشمەرگە بێدەنگ ببوو، لەو ماوەیەدا پێشمەرگەکان خۆیان سەرقاڵی دروستکردنی سەنگەری نوێ کردبوو، دەیانویست شوێنەکانی خۆیان تۆکمە بکەن و ئەو کاتەی ڕۆژنامەوانەکانیشیان دەبینی بە مایکرۆفۆن بانگەوازییان بۆ گەریلاکان دەکرد و دەیانوت (خۆتان ڕادەستکەن)، هەروەها گەریلاکانیش بە سلۆگان وەڵامیان دەدانەوە[١٥٨].

---

[١٥٦] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حوریەتی تورکی )

[١٥٧] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم

[١٥٨] هەمان سەرچاوە

پەیتا، پەیتا پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانی زیاتر لە قوڕدا دەچەقین، هەربۆیە سەرکردەکانیان قەدەغەیان لێکردن لێدوان بۆ رۆژنامە و راگەیاندنەکان بکەن. زۆر بە نهێنیش دەسەلاتدارانی باشور سزای کوشنیان دەرکردبوو بۆ ئەو کەسانەی کە پروپاگەندەیان بۆ (پەکەکە) دەکرد، لە (زاخۆ)ش دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی چەکی هاولاتیان و بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش پێشمەرگەکانی (پەدەکە) ریگای نێوان (موسل)یان داخست. لە شاری (دهۆک) پێشمەرگە دەستیان گرت بەسەر دوو ماشێنی پڕ لە (تی ئێن تی) کە موخابەراتی عێراقی ناردبووی تاکو بیتەقێننەوە، شۆفێری هەردوو ماشێنەکە بە سود وەرگرتن لە گردبونەوەی خەلکی و هاتنەئاراوەی ئالۆزی توانیبویان خۆیان رزگار بکەن.

سەرنەکەوتنی پێشمەرگەکان لە هێرشەکاندا بووە مایەی ئەوەی دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک بلێن گوایە پێشمەرگە لەگەل گەریلاکانی (پەکەکە) رێککەوتن لە نێوانیاندا هەیە، لەهەمانکاتیشدا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک باسیان لە سەرنەکەوتنەکانی سوپای تورکیان نەدەکرد ئەمەش ببووە مایەی نیگەرانی و تورەبوونی هێزەکانی باشور. (سەفین دزەیی) نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە دەیوت (**هیچ رێککەوتن و هەماهەنگییەک لەنێوان پێشمەرگە و پەکەکە دا بوونی نییە، ئەو مۆلەتەی دابومان بە پەکەکە کۆتایی هاتووە و لەوانەشە ئێستا گەریلاکانی پەکەکە لە خواکورکەوە بەرەو ئێران چوبێتن**)[159].

لەگەل درێژ بوونەوەی شەڕوپێکدادانەکاندا نارەزایی شەقامی کوردیش پەرەیان سەندبوو، لە شارۆچکەی (تاتڤان)ی سەربە شاری (بتلیس) لە ١٦ی تشرینی یەکەم دوکاندارەکان وەک پرۆتێستۆکردنی هێرشەکانی (پەدەکە و یەنەکە) بۆسەر گەریلاکانی (پەکەکە) دوکانەکانیان داخست، هەروەها قوتابییەکانیشیان نەچوون بۆ قوتابخانە. بەهۆی ئەنجامدانی ئەم چالاکییانەوە هێزەکانی دەولەتی تورک لە ناو شاردا نزیکەی (٥٠٠) هاولاتییان دەستبەسەر کرد، دەولەتی تورک دەیانویست لە رێی ئەم گرتنانەوە رێگری لە خۆپیشاندان و چالاکییەکانی هاولاتی بگرن[160].

---

[159] هەمان سەرچاوە

[160] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم

## نەگونجاندن لەسەر فیدرالییەت

## لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی نەتەوەیی عێراقدا

هاوپەیمانە ئۆپۆزسیونەکانی عێراق بە ئامانجی روخانی (سەدام حوسێن) لە باشوری کوردستان دەستیان کرد بە ریزە کۆبونەوەیەک بەڵام بەهۆی شەڕی باشورەوە جارناجارێک ئەم کۆبونەوانەیان دوادەخرا.

وەفدێکی (٣٠) کەسی بە مەبەستی بەشداریکردنیان لەم کۆبونەوەیە دەیانویست بێنە باشوری کوردستانەوە، بەڵام لەلایەن تورکیاوە لە دەرگای (ئیبراهیم خەلیل) ریگرییان لێکرا و ئەوانەیشی ویستوبویان لە سوریاوە بێنە باشوری کوردستانەوە لە ٢٢ ی تشرینی یەکەم لەلایەن حکومەتی سوریاوە ریگرییان لێکرا. ئەم کۆبونەوەیەی ئۆپۆزسیونەکانی کورد و عێراقی کەلە سڵاحەدین لە ٢٧ی تشرینی یەکەم بەسترا لەسەر پێکهێنانی حکومەتێکی جێگرەوەی حکومەتەکەی سەدام حوسێن هەڵوێستەیان کرد[١٦١].

لە ئاکامی کۆبونەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی لە (سەڵاحەدین) پەرلەمانێکی کاتی عێراقییان پێکهێنا و (حەسەن نەقیب)یان دانا بە سەرۆکەکەی، (حەسەن نەقیب) دەیوت گەلی عێراق و سوپای عێراقیش چاوەڕێ دەرەنجامەکانی ئەم کۆبونەوەیەن. دوای ئەم زنجیرە کۆبونەوانە (حەسەن نەقیب) چوو بۆ (ئەنقەرە) و دەیوت **(لەناو سوپای عێراقدا ئەفسەرێکی زۆر هەن کە پێشبڕکێ دەکەن بۆگرتنە دەستی سەرۆکایەتی عێراق، لەم کونفرانسەدا شتگەلێک هاتنە ئاراوە کە بەوان بدرێن، بۆ گەیشتن بەو نیازانەش لەکۆبونەوەی هاوپەیمانی عێراقیدا دامەزراوە پێویستییەکان پێکهێنران)**[١٦٢].

---

[١٦١] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حوریەتی تورکی )

[١٦٢] ٢٥ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( تورکیە گوندەم )

نوێنەری (پەدەکە) سەفین دزەیی لە ئەنقەرە دەیوت (**لە مانگی تشرینی دووەم سەدام حوسێن لەسەر دەسەلات لادەبرێت و یەکێتی هاوپەیمانی عێراقیش بۆ عێراق دیموکراسی دەهێنێت**)[١٦٣]. بەرەی کوردستانی بۆ هاوپەیمانی عێراقی شێوازی فیدرالییەتی پێشنیار دەکرد بەلام بەهۆی کاریگەری ئێرانەوە شیعەکانی عێراق ئەم شێوازی فیدرالییەتەیان رەتکردەوە. سەرۆکی بزووتنەوەی نەتەوەیی عەرەبی (هانی فیکاکی) دەیوت دژی راگەیاندنی سیستەمی فیدراسیۆنی کوردستان نین، هەروەها دەیوت (**رازی بوونی کوتلە و لایەنەکانی تری عێراقی لەسەر شێوازی ئەم فیدراسیۆنەی کوردستان مەرجێکی سەرەکییە، ئێمە پێشوازییەکی گەرم لە راگەیاندنی ئەم فیدراسیۆنەی برا کوردەکانمان دەکەین، بۆئەوەی دەولەتی عێراقی داهاتوو ئایا مەرکەزی بێت یان فیدرالی ئەوە دوای هەلبژاردنی گشتی لە عێراق پەرلەمانی عێراق بڕیاری لەسەردەدات**)[١٦٤].

سکرتێری گشتی (یەنەکە) جەلال تالەبانی لە کۆبونەوەکەدا (لە داهاتودا ئایا عێراق دەبێت بە سیستەمی فیدرالی یاخود مەرکەزی) هەلوێستەی دەکرد، نوێنەرانی پارتەکان وەک شیعە، ئیسلامی رادیکال، قەومییە عەرەبییە، تورکمانەکان، کورد، ئاشورییەکان، لیبرالەکان، دیموکراتەکان، عەشیرەتەکانی عەرەب و ئەفسەرە کۆن و کەسایەتییە بێلایەنەکان، هاوپەیمانەکان کە بە هەموویانەوە کۆنگرەی نەتەوەیی عێراقییان دەبرد بەڕێوە، هەموویان وەک سەرەتا پێشنیاری ئەوەیاندەکرد نوێنەر و ئەندامانی مەجلیس پێکبهێنرێت. لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون دەستەی پێکهێنانی حکومەت لە ٢٥ کەس پێکبهێنرێت کەلە ئەندامانی پارتەکان دیاریبکرێن، هەروەها ئەوەشیان دیاریکرد کۆمیتەیەکی ٣ کەسی پێکبهێنرێت بۆ پێکهێنانی سیستەمی سەرۆکایەتی مەجلیس.

سەرچاوە کوردییەکانی کورد لە باشور دەیانوت ئەو تاکە مژارەی کە هەموو لایەنەکان لەسەری هاوبیر بوون و لەسەری ڕێککەوتبوون تەنها رووخانی سەدام بوو هەروەها گەنگەشەیەکی زۆر لە نێوانیان هاتبووە ئاراوە لەسەر ئەوەی ئایا وەلاتانی ئەوروپا لەبارەی دوارۆژی عێراقەوە لەدوای سەدام ئامادەکاری چییان هەیە و بەگشتی لایەنەکان و

---

[١٦٣] هەمان سەرچاوە

[١٦٤] ٢٨ی هەمان سەرچاوە .

گرووپەکان هەریەکێکیان وەڵاتێک پشتگیری و هاوکارییان دەکردن، هەربۆیە نەیاندەتوانی بگەنە ڕێککەوتن و کۆبونەوەکە دەرەنجامێکی ئەوتۆی بەدەستەوە نەدا.
ئەوەی لەم کۆبونەوەیە هاتە بەرچاو نییەت و پیلانی لایەنەکان نەبوو تەنها ئەوەبوو ئایا (سەدام حوسێن) لەسەر دەسەڵات دەمێنیتەوە یاخود نا. هەتا بزانرایە (سەدام حوسێن) زیاتر لەسەر دەسەڵات دەمێنێتەوە ئەوا ئەندامانی کۆبونەوەکە دڵیان زیاتر خورپەی دەکرد و گڕوتینیان خامۆش دەبووەوە و بڵاوەیان دەکرد.
ئەو ئەنجامە گشتییەی کە لەم کۆبونەوەیە بەدەست دەهات هەرچۆنێک بێت کورد بە کەمی لێی سودبەخش دەبوو، هەروەکو چۆن ئارەزووی رووخانی (سەدام حوسێن) نەدەبوو بە تەواوکەری خواست و ئارەزووەکان کە هەمووشیانی لە داهاتودا لەیەک شوێندا کۆدەکردەوە، ئیستایش ئەوە بەدیدەکرا لەحاڵەتی رووخانی (سەدام حوسێن)یشدا کێشەکانی نێوانیان کۆتایی پێبهێنرێت و هەمیشە بەردەوامی دەبێت، کارکردن و پەیوەندییەکانی لایەنەکان لەگەڵ یەکتری لەسەر شێوازی تایبەتی خۆیان و لەسەر ستراتیژییەتی دیاریکراوی خۆیان دەهاتنە ئاراوە.

## ناوبژی شیعە لە شەڕی کورددا

بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕی نێوان پێشمەرگە و گەریلاکانی (پەکەکە) گروپە شیعەکان کەوتنە ناوبژیکردن. سەرۆکی پارتی ئیسلامی سەربەخۆ (سەید محەمەد بحرولعلوم) کە بەشداربوو لە کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی روونیکردەوە بۆ ڕێگرتن لە خوێن ڕشتن لە نێوان موسڵمانان و لە نێوان بەرەی کوردستانی و (پەکەکە) دا ناوبژیوانییان کردووە، محەمەد بەحرولعلوم دەیوت (**نامانەوێت لەناو موسڵماناندا خوێن بڕێژرێت، بۆ نەهێشتنی ئەم شەڕەش لەنێوان پەکەکە و بەرەی کوردستانیدا دیدار ئەنجام دەدەین، وەک سەرەتا لەگەڵ بەرپرسیارانی بەرەی کوردستانیدا دانوساندن دەکەین، دوای وەرگرتنی بۆچوونەکانی بەرەی کوردستانی وەفدێک دەنێرینە لای پەکەکە، بۆ رێککەوتن ودانوساندنیان ئەوەی لە دەستمان بێت دەیکەن**)[165].

گروپە شیعەکان سەبارەت بە وەستانی شەڕی نێوان بەرەی کوردستانی و (پەکەکە) ئەو پێشنیارانەی دابویان بە لایەنەکان بە (جەلال تاڵەبانی)شەوە هەموو لایەنەکان قەبوڵیان کردبوو[166].

لە وەڵاتی (نەرویج) لایەنەکانی وەک (پەدەکە ئێران، رابەرایەتی شۆڕشگێران، پارتی سەربەخۆی کوردستان، پارتی یەکگرتن، ڕێکخراوی نەرویج، کۆمەڵەی باڵی کوردستان، نوێنەرانی نەرویج، بەرەی کوردستانی و ئەرنەکە) بڵاوکراوەیەکیان بڵاوکردەوە، نوێنەرانی ئەرنەکە دەیانوت (**هیچ ڕێکخراوێک یان پارتێکی کوردی ناکرێت لەلایەن لایەنێکی کوردییەوە لە کوردستان دەربکرێت، هیچ ڕێکخراوێکی کوردی نابێت هاوکاری دوژمانی کورد بکات و مەحکومی هەموو هۆکارێک دەکەین کە دەبێتە مایەی خوێن ڕشتنی کورد**).

سەرسوڕمانی ئەم روونکردنەوانەی ئەوان ڕێکخراوەکان و مەحکومکردنی شەڕەکە و هۆکارەکانی بوون، هەمان ڕۆژ (پارتی شۆڕشگێرانی کوردستان) روونکردنەوەیەکیاندا و مەحکومی هێرشەکانی (تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)یان دەکرد[167].

---

[165] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

[166] ٣١ تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم )

[167] ٣١ تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم )

## دوا جموجۆڵی هاوبەشی پێشمەرگە و سوپای تورک

دوا رۆژانی مانگی تشرینی یەکەم دوا جموجوڵەکانی زرێپۆشەکانی سوپای تورک بوون و هاوکات لە (هەفتانین) شەڕوپێکدادانەکانیش بەردەوام بوون. لە ناوچەی (هێزیل) پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەگەڵ جەندرمەکانی سوپای تورک بە هاوبەش ڕوو لە سەنگەرەکانی گەریلا سەرلەنوێ هێرشێکی بەرفراوانیان دەست پێکردەوە[١٦٨].

لە نزیک (هێزیلچای) بەشی رۆژهەڵاتی شارۆچکەی (سلۆپی) ئەو شەڕانەی لە (١٩٩٢/١٠/٢٧) لە (ئەولهێ، پیربلا و شەرانش) دەستیان پێکردەوە بەبێ وەستان بەردەوام بوون، لەهەمانکاتدا بریندارێکی زۆری پێشمەرگە هێنرابوون بۆ نەخۆشخانەی (زاخۆ)، هەروەها لە شەڕوپێکدادانەکاندا زیانێکی زۆری گیانیش هاتبوونە ئاراوە. یەکینەکانی زرێپۆشی سوپای تورک بەسەر (هێزیل)دا پەڕینەوە و دەیانویست بگەنە گوندی (دەرکار) و لەگەڵ پێشمەرگەکانی (پەدەکە) یەکتربگرنەوە و ئامانجیان ئەوەبوو گروپەکانی گەریلا لە یەکتری داببڕن.

لەو ناوچانەی پێشمەرگە و زرێپۆشەکان خۆیانیان لێجێگیرکردبوو شەڕی دەستەویەخە لەنێوان ئەوان و گەریلاکاندا هاتبووە ئاراوە و لەهەمانکاتیشدا فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک بێوچان بۆردۆمانیان دەکرد. گەریلایەکی (پەکەکە) ئەو رۆژانەی بەمشێوەیە دەگێڕایەوە (**لەزۆر شوێندا ئەوەندە لەیەک نزیک ببوینەوە نارنجۆکمان دەگرتە یەکتر و زۆرجاریش هەبوو تێکەڵ بەیەک دەبوین و پەلاماری یەکتریمان دەدا**). بۆ هێرشی سەر کەمپەکانی گەریلا لە (ئشکفێران) ئەو تیمی تایبەت و ئەو جەندرمانانەیان دەنارد کە بەباشی مەشقیان پێکرابوو. لەناوچەی (سنات) سەرەتا کۆپتەر و فڕۆکە جەنگییەکان بۆردۆمانیان

---

[١٦٨] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

دەکرد و پاشان سەربازەکانیش دەچوونە پێشەوە. قایمەقامی زاخۆ (نزار بەرزنجی) دەیوت **(ناوچەکانمان لەژێر دەستی گەریلا دەرهێناوە، هەروەها زرێپۆشەکانی سوپای تورک هەتا نزیک شار هاتوون و بە گشتی لە ناوچەکەدا چواردەوری گەریلاکانی پەکەکەیان تەنیوە)**[١٦٩].

لەبارەی ئەو شەڕانەی لە (هێزیلچای) هاتبووە ئاراوە بە بەشداری زرێپۆشەکانی تورک، سەرچاوەکانی گەریلا دەیانوت **(لەناوچەی زاریفەی سەر بە هەفتانین یەکینەکانی سوپای تورک هێرشیان ئەنجامدابوو بەڵام زیانیان لێکەوت و پاشەکشێیان کرد، ئامانجی سەرەکییان ئەوەبوو کەلە سینات و هێزیل لەگەڵ پێشمەرگەکاندا یەکبگرنەوە و هێرشی گەورە ئەنجام بدەن)**.

سەرچاوەکانی پەکەکە دەیانوت بەتایبەت لەناوچەکانی (دەرێ و دەرەجێ) نزیک بە (هێزیل) شەڕەکان دژوار بوونەتەوە و یەکینەکانی سوپای تورک بە تۆپ و هاوان هاوکاری پێشمەرگەکانیان کردووە.

---

[١٦٩] ٢٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

## له (زاپ) جموجۆڵی دووبەشکردن

(زاپ) کەوتووەتە بەرامبەر (چوکورجە)، وەکو ناوچەی (مەتینا) لە شەڕی باشوری کوردستاندا بۆ هێزی پێشمەرگە و سوپای تورک و بۆ گەریلاکانی (پەکەکە)ش یەکێک بوو لە شوێنە ستراتیژییەکان. ئەم ناوچەیە (خواکورک و هەفتانین) بەیەکەوە گرێدەدات، هەروەها خاڵێکە شریدی هەردوو بەرەی شەڕەکە بەیەکەوە گرێدەدات. لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەکاندا، گەریلاکانی (پەکەکە) لە چیای (سەری مەتینا) بەرامبەر بە جموجۆڵەکانی سوپای تورک لە شوێنە بەفرینەکاندا سەنگەریان گرتبوو.

هەتا دوا دەستپێکردنی جموجۆڵی پیادەیی سوپای تورک بە ماوەیەکی کەم لە زنجیرە چیاکانی (زاپ) خوێناویترین شەڕوپێکدادان هاتبووە ئاراوە. فەرماندەی گروپەکانی گەریلا لە (زاپ) (جەمیل بایک) بوو، لەم ناوچەیەدا پەلامارییەکان لە ٢٢ی تشرینی یەکەم دەستیان پێکرد و هێزی پێشمەرگە و سوپای تورک روبەڕوی بەرپەرچی توندی گەریلاکان بوونەوە. جموجۆڵە سەربازییەکانی سوپای تورک بە درێژایی تاقگەکانی (زاپ) دەستیان پێکردبوو لەهەمانکاتیشدا لە ناوچەکانی (خابور، ئولودەرە، دێرەجیک و چاغلی)ی سەر بە (چوکورجە) هەموو ناوچەکانی تریش دوای بۆردۆمانی فرۆکە و کۆپتەری کۆبرا، کۆماندۆ و جاشەکانی سەر بە دەوڵەتی تورک دەستیان کرد بە هێرشی پیادەیی خۆیان، بەڵام سوپای تورک وەکو ناوچەکانی تر لێرەدا خاوەن ئەو هاوکارییەی پێشمەرگە نەبوون کەلە ناوچەکانی تر پێشکەشیان دەکردن. ناوچەکانی نزیک لە سنور و رێگاوبانەکانی بەشی باشوری کوردستان بەتەواوەتی لەژێر رکێفی گەیلاکاندا بوون، پێشمەرگە بۆئەوەی خۆیان بگەهێننە ئەم بەرەیە پێویستی دەکرد لە ناو تورکیاوە بسوڕێنەوە و بەو ناوچانەشدا تێبپەڕن کەلە ژێر رکێفی گەریلاکاندا بوو، لەئاکامدا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) سنوری تورکیایان بڕی و خۆیان گەیاندە ناو سوپای تورک و لەناوچەی (زاپ) چاوساغییان بۆ سوپای تورک دەکرد. گەریلاکانی (پەکەکە)ش لە ناوچەی (شیوێنی) ی سەر بە (زاپ)بە دۆشکە و چەکی قورس وەڵامی هێرشەکانی سوپای تورک و پێشمەرگەکانیان دایەوە و لەم ناوچەیەدا بە گشتی شەڕوپێکدادانەکان بە شەو و رۆژ بەردەوام بوون.

## دوای مانگێک یەکەم روونکردنەوەی والی هەرێمەکە

والی تایبەتی هەرێمی قەدەغەکراو لە باکوری کوردستان لە ٢٩ی مانگی تشرینی یەکەم سەبارەت بە جموجۆڵی سەربازی سوپای تورک بۆسەر سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە) یەکەمین روونکردنەوەی خۆیکرد، لە روونکردنەوەکەدا هاتبوو کە لە رۆژهەلات و باشوری (ئولودەرە) و (سلۆپی) بە قولایی ١٥کم و بە پانی ٣٠کم لە (هەفتانین) هێزی یەکینەکانی سوپایان لەناوچەکانی تری (هەفتانین)یش خستووەتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە، لەهەمانکاتیشدا ئەو ئۆپەراسیۆنەی لە (خواکورک) دەستیان پێکراوە بەردەوامن.
لەگەڵ دەست پێکردنی ئۆپەراسیۆنەکان لە ٢٨ی تشرینی یەکەم دەوترا لەو شەڕانەی هاتبوونە ئاراوە ٣٩ گەریلا کوژراون و یەک ئەفسەر و یەک عەریف و سەربازێکیان گیانیان لەدەستداوە و هەروەها ٣٢ سەربازیشیان بریندار بوونە[١٧٠].
والی هەرێمی قەدەغەکراو کە دوای مانگێک لەدوای ئۆپەراسیۆن و شەڕوپێکدادانەکاندا روونکردنەوەیدا مایەی سەرسوڕمان بوو کەلەبارەی زیانی گەریلاوە ژمارەیەکی کەمی وەک ٣٩ کەسی بهێنێتە زمان، لەهەمانکاتدا لەبارەی زیانی گەریلاوە رۆژنامەکان و بەرپرسیارانی سوپای تورک ئەو رێژەیەی باسیان دەکرد بەقەد ژمارەی گەریلاکانی (پەکەکە) لە باشور سێقات زیاتر گەریلایان کوشتبوو.

---

[١٧٠] ٣٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم ) .

## کاری هاوبەشی (پەدەکە لێران) و (سوپای تورک)

لەو ڕۆژانەی شەڕوپێکدادانەکان ئاڵۆز و دژوار ببوونەوە، ناوچەی (زرار)ی نزیک لە (شەمزینان) لە سنوری عێراق، ئێران و تورکیا لەو شوێنەی هەرسێ وەلاتەکەی بەیەکەوە گرێدەدا لە گوندەکانیانەوە هەواڵی ئەوەدەهات ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگەی (پەدەکە ئێران) جێگیر کراون. دانیشتوانی گوندی (گەلیەشین) دەیانوت **(ئەفسەرێکی باڵای تورک و لەگەڵ کۆماندۆکانیدا هەروەها لەگەڵ ٢٥ پێشمەرگەی پەدەکەی ئێران هاتن بۆ گوندەکەمان، لە شێوەی گرووپ بەسەر ماڵەکاندا دابەشبوون، باسی ئەوەیان دەکرد ماوەیەکی تر لەگەڵ یەکینەکانی سوپای تورک بەشداری ئۆپەراسیۆنەکانی ئەودیو سنور دەکەن)**. زوربەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە ئێران) بەتایبەتی لە گوندی (مەلایان) جێگیربوون و ئەوانەی تریشیان لە گوندەکانی دەوروبەر جێگیرکرابوون.

گوندنشینەکانی ئەو گوندانەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە ئێران) لێیجێگیربوون دەیانوت سەربازەکانی سوپای تورک هاوکاری پێشمەرگەکانیان کردووە، خواردن و جلوبەرگ و پێداویستییەکانیان بۆدابینکردوون[١٧١]، لەگەڵ دەستپێکردنی چاوساغیکردنی پێشمەرگە بۆ سوپای تورک ئێتر جاشەکانی سەر بە دەوڵەتی تورک بە ڕەزامەندی خۆیان بەشدارییان لە ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورکیان دەکرد.

شایەنی باسە ئەم پەیوەندییەی سەرکردایەتی (پەدەکە ئێران) لەگەڵ دەوڵەتی تورک دەگەڕایەوە بۆ کۆن و ئەمەش ناکۆکییەک بوو کە ببووە مایەی نارەزایی دەوڵەتی ئێران، بێشک ئەم کارەشیان نهێنی نەبوو، یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکان کە نێوان تورکیا و ئێرانی پێتێک چووە بێشک ئەم هۆیەبوو. سەرچاوەکانی (پەکەکە)ش ئەم ڕاستییەیان دەسەلماند،

---

[١٧١] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم )

بانگەشەی ئەوەش دەکرا پێشمەرگەکانی (پەدەکە ئێران) لە بارەگا سەربازییەکانی سوپای تورک دەمێننەوە، لەو بارەگایانەدا سوپای تورک ئێشکگرییان پێدەکردن و هەروەکو بارەگای (ئالان) لە هەندێک هێرشدا دژ بە گەریلاکانی (پەکەکە) لەلایەن سوپای تورکەوە بەشداریان پێکراوە.

(پەدەکە ئێران) پەیوەندییەکی باشیان هەبوو لەگەڵ هێزەکانی باشوردا، سەرەڕای ئەوەی هەندێکجار هەڵویستی نیگەتیڤیشیان هەبوو بەڵام بە گشتی لە روونکردنەوەکانیاندا درک بەوە دەکرا بەرامبەر بە (پەکەکە) ڤینێکیان هەیە. ([١٧٢]).

گوتەبێژی (پەدەکە ئێران) لە ئەوروپا (ئازاد) بەرامبەر بە شەڕی لایەنەکان و بەرامبەر بە (پەکەکە) ناوبراو لە دیمانەیەکیدا بەرامبەر بە هەڵوێستی پارتەکەیان دەیوت:

**پرسیار : (شەڕی نێوان پەکەکە و پێشمەرگە چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟).**

**وەڵام :** (هەرشەڕێکی ناوخۆی کورد کارەساتێکی دڵتەزێنە، لەیەکەم رۆژی بەرپابونی ئەم شەڕە ئێمە بانگەوازی ئاشتەوایی و دیالۆگمان کرد).

**پرسیار: (ئایا لایەنەکان داوایان لێکردن بین بە ناوبژیوان؟).**

**وەڵام :** (کەسایەتییەکانی باشوری کوردستان داوای ئەمەیان لێکردین، لەگەڵ پەدەکە عێراق ئامانجێکی هاوبەشمان هەیە و ماوەیەکی دووررودرێژیش بەیەکەوە کارمان کردووە، بەڵام لەگەڵ پەکەکە دا ژیانێکی هاوبەشمان نەبووە و پەیوەندی سیاسیشمان نییە).

**پرسیار: (لە هەولێر کۆبونەوەیەکی فراوان ئەنجامدرا کە نوێنەری ئێوە و پەدەکە و رێکخراوی کاوە و یەکبوون بەشداربوون...؟)**

**وەڵام :**(سەبارەت بەم بابەتە زانیارییەکی ئەوتۆم نییە، بەڵام ماوەی ١٣ ساڵە لە نێوان کوردی عێراق و ئێراندا شەڕی جۆراجۆر هاتنە ئاراوە، لەئاکامدا وتمان ئەگەر خەباتی چەکداری هەبێت بێشک یاساش هەیە، ئەگەر لایەنێک یان پارتێک لەگەڵ ئەو یاسایەدا نەگونجێت و پابەندی نەبێت ئەوا هەموو کێشەیەکی سیاسی لەرێی شەڕی چەکدارییەوە چارەسەر دەکات، پەکەکە وەکو ئێمە خاوەن مێژوویەکی دێرین و خەبات و ئەزمونی وەکو ئێمەی نییە، هەربۆیە

---

[١٧٢] (جەلیل گاوانی) رەخنەی سیاسەتی سەرکردەکانی وەک قاسملو و سادق شەرەفکەندی دەکرد، ( سەبارەت بە بۆچونیان لەبارەی ئێرانەوە لەسەر دامەزراندنی (رابەرایەتی شۆڕشگێڕ) لەگەڵ ئێران بۆچونی جیاوازیان هەبوو، لەگەڵ لایەنگرانی بە جیابونەوەیان لە پەدەکە ئێران لە ساڵی ١٩٨٨ پەدەکە ئێران بوو بە دوو بەشەوە ).

دەڵێم پەکەکە لەگەڵ ئێمە و پەدەکە عێراق پەیوەندییەکی باشیان نەبووە، پێموایە پەکەکە خۆیان لە راستییەکان بەدوور گرتووە، ئەو دەستور و رێنماییانەی دامانناون پەکەکە لەگەڵیاندا نەگونجاوە، ئێمە لایەنگری ئارامی هەرێمەکەین، ئەگەر شەڕ و جەرگ سوتاندن بەردەوام بێت ئێمە ناچارین هەڵویست وەربگرین، ئەگەر پارتێک لە کوردستانی تورکیا یان عێراق یاخود ئێران هەوڵبدات بۆ تێکدانی ئەو دەرفەتەی هاتووەتە ئاراوە ئەوە روبەڕوی نارەزایی دەبێتەوە، بەڵام هێشتا کاتی ئەمە نەهاتووە).

**پرسیار :(ئایا پەیوەندیتان لەگەڵ پەدەکە عێراق لەچی ئاستێکدایە؟).**

**وەڵام** :(سەبارەت بە هەڵسەنگاندنەکانی بەرپرسیارانی باشور کە روژانە دەیکەن لەوانەیە نەگونجاندنیشمان لەگەڵیاندا هەبێت بەڵام بەگشتی پەیوەندییمان باشە، بێگومان ئەمڕۆ پەرلەمان و حکومەتی کوردی لە باشور بونیان هەیە و دەست بەکارن، ئێمە موداخەلەی ئەوان ناکەین).

**پرسیار: (ئایا پەکەکە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟).**

**وەڵام** (پەکەکە خۆی وەک پارتێکی لینین و مارکسی دەناسێنێت، من خۆم وەکو کەسێکی دیموکرات دەبینم، ئایدۆلۆژی مارکس و لینینیزم بەسەرچوون، لە دونیای سێیەم و لە ئەوروپاش بەکەڵکی هیچ نەهاتوون، مەحاڵە ئەم ئایدۆلۆژیایە مایەی قەبوڵ بێت، کوردستان دابەشکراوە و ئەمڕۆ هەر بەشێکی پارتی خۆیان هەیە و نوێنەرایەتی پارچەی خۆیان دەکەن، شێوازی بیرکردنەوەی پەکەکە ئەوەیە خۆیان بە خاوەن هەر چوار پارچەی کوردستان دەزانن، ئەمە هەڵەیە، ئەمە تەڵەیە، لە کوردستانی ئێراندا کەس پەکەکە ناناسێت، پەکەکە ناتوانێت کاریگەری بخاتە سەر کوردەکانی ئێمە، ئەو کاتەی لە کوردستانی عێراقدا خەبات هەبوو لە کوردستانی تورکیا ئەو خەباتە نەبووە، پەکەکە جیهان بیر نییە، ئەوان لە خەیاڵدا دەژین، پێیان وایە کوردی عێراق ئەچنە ناو پارتەکەیانەوە، ئەمە مەحاڵە).

**پرسیار: (ئایا پەکەکە لە کوردستانی ئێراندا هێزی سەربازییان هەیە؟).**

**وەڵام** :(لە کوردستانی ئێران رژێمی ئێران کەمپێکی بۆ پەکەکە کردووەتەوە، لەهەمان شوێندا رێک بەرامبەریان بارەگای پاسداران هەیە، ئەم کەمپە لە ئاکامی ئاگەدارکردنەوە و لە ئاکامی رەزامەندی ئێمە دروست نەکراوە، رژێمی ئێران بۆ نارەحەتی دروست کردن بۆ تورکیا کورد و حزبولله بەکار دەهێنن، ئەم سیاسەتەی ئێران بەهیچ شێوەیەک کورد ناگرێتەوە).

**پرسیار : (ئایا هەڵویستی رژێمی ئێران بەرامبەر بە شەڕی پێشمەرگە و پەکەکە چۆنە؟).**

**وەڵام** (ئێران لایەنگری ئەوەیە ئەم شەڕە درێژە بخاهێنێت، بۆ بەردەوام بوونی ئەم شەڕە ئێران ئامادەیە بە هەردوولا چەک و تەقەمەنی بدات، بۆ ئێران پێشمەرگە و پەکەکە یەک شتن، ماوەی ٤ بۆ ٥ مانگێکە راگەیاندنەکانی رژێمی ئێران رایدەگەهێنن دژی حکومەتی کوردین لە عێراق، بێشک ئەوان ترسی ئەوەیان هەیە لەوانەیە ئەم حکومڕانییەی کوردی عێراق ماوەیەکی تر کاریگەری بکاتە سەر کوردی ئێران هەربۆیە دژی دەبنەوە، ئەوان بە گشتی دژی هەموو حکومڕانییەکی کوردین چی لە تورکیا، عێراق یان ئێران بێت)[١٧٢].

لە هەمان رۆژاندا لە سنوری (بادینان) هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی جاشایەتی دەستی پێکردبوو، ئەم مەڵبەندە بە گرنگترین مەڵبەندی جاشایەتی دەناسرێت، یەکێک لە عەشیرەتە گەورەکان عەشیرەتی (پینیانشی)ە کە زیاد لە (٢٠٠) جاشیان چەکی دانابوو، ئەندامانی ئەم عەشیرەتە دەمێک بوو دەیانویست چەکی جاشایەتی دابنێن، دواجار بە بیانوی ئەوەی گوایە جەندرمەکان دەیانەوێت بە زۆرەملێی بیانبەن بۆ شەڕی ئەو دیو سنور چەکیاندانا، دوای دەست پێکردنی شەڕی باشوری کوردستان لە گوندی (کاڤاکلی)٤٠ کەس چەکی جاشایەتییان دانا، جاشی گوندەکانی وەک (پینیانش، ئەرتوشی، ئەربیش، شیڤارەزا و مێرکانیس) کەسەر بە (چوکورجە) بوون کە بەشێکی عەشیرەتی (پینیانیش) بەشداربوون لە جموجۆڵی ئۆپەراسیۆنی (ئەودیوسنور) ئەمانە بەتایبەت بە هێستر شتومەکیان دەگواستەوە بۆ جەندرمەکانی سەر سنور.

---

[١٧٢] ٢٥ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠) .

## له کۆتایی تشرینی یەکەم چاوپێکەوتنی ئاگربەست

هاوکات شەڕوپێکدادانەکانی دژ بە (پەکەکە) لە ٢ی تشرینی یەکەم دەستی پێکردبوو تا دەهاتیش لە ئەنجامەکەی دوور دەکەوتەوە. کەشوهەواش ساردی کردبوو، ئەمەش مانای وابوو شەڕەکان بەشێوەی سرووشتی کۆتاییان پێدێت. بەفر و بارانیش دەستیان پێکردبوو، بەتایبەتی سوپای تورک بۆ ئەوەی جموجۆڵی زرێپۆش و دەبابەکانیان بێکاریگەر نەبێت پەلەیان بوو. دەیانویست پێش ئەوەی پێیان لە قوڕ گیربێت ئەنجام وەربگرن. هاوکات نارەزاییەکانی دژ بەم شەڕەش زیادیان کردبوو. کات و رەوشی سیاسی شەڕەکانیش پەیتا ،پەیتا لە بەرژەوەندی (پەکەکە) گەشەیان دەکرد، بەتایبەتی ئەو وێنانەی پێشمەرگە کە لەگەڵ سەبازە تورکەکان لەلایەن رۆژنامەوانەکان گیرابوون و خەڵکی باشور بەچاوی خۆیان بینیبویان دەسەڵاتی باشوری تەنگەتاو کردبوو. لە هەندێک ناوچەی (هەفتانین) پێشمەرگە لەگەڵ سەربازە تورکەکاندا بەیەک گەیشتبوون، پێشمەرگەکان لەسەر زرێپۆش و دەبابەی تورک پۆزیان لێدەدا و ئەفسەر و سەربازی تورکیش لە پشتیانەوە بزەیان بوو. ئەوانەی ئەم پۆزانەیان بۆ سەرکردە و بۆ فەرماندەکانیان لێدەدا بەسزمانانە خۆشیان نەیاندەزانی چیدەکەن و درکیان بە قەدەری خۆیان نەدەکرد، ئەوانەی لە دەرەوەی بازنەی ئەم شەڕەدا ئەم وێنانەیان دەبینی موچرکە بەلەشیاندا دەهات.

ئەوەی راستیبێت شتێکی ئەوتۆی نوێش لەئارادا نەبووکە ببێتە مایەی نیگەرانی. مێژووی کورد جارێکی تر خۆی دووبارە دەکردەوە، پاشەڕۆژی زۆرێک لە سەرکردەکانی وەک (سەید رەزا، شێخ سەعید، عەلی شێر، شێخ عوبەیدولا، سمکۆ، قاسملو، بەدرخان و دکتور شڤان) کەسانی تریش، زۆربەی ئەو سەرکردانانە لەلایەن براکانیانەوە فرۆشرابوون یاخود

بەهۆی نییەت باشییانەوە ببوون بە قوربانی، **(ئەوەی ئێستا دەویسترا بفرۆشرێت پەکەکە بوو، بەلام لەوەدەچوو پەکەکە هیچ نییەتی ئەوەی نەبێت رێگابدات بیفرۆشن).**

سەبارەت بە پارتەکەی و هێزەکەی (مەسعود بارزانی)ییەوە شتێکی ئەوتۆی سەرسوڕمان لە ئارادا نەبوو، چونکە مێژووی ئەوان پڕبوو لەم تابلۆی خیانەتە.

بەگوێرەی ئەوەی دەویسترا ئەنجام بەدەست نەخران، هەر لەسەرەتاوە (پەکەکە) دەرگای خۆی لەئاستی دانوساندن کردبووەوە، دەسەلاتدارانی باشور ناچارمان وەلامی بانگەوازی ئاگربەست بدەنەوە. هەتا سەرماوسۆڵە تەنگی پێهەڵنەچنیون و هەتا بەهۆی هەماهەنگی نێوان پێشمەرگە و سوپای تورکەوە نارەزاییەکان پەرەیان نەسەندووە و بەهۆی خۆڕانەگرتنی هێزی پێشمەرگە بەرامبەر بە گەریلا تەشەنەی نەسەندووە هەموو ئەمانە بوونە هۆکاری سەرەکی کە سەرکردایەتییەکانی باشور هەنگاو بەرەو ئاگربەست بنێن.

یەکەم پەیوەندی لەرێی بێتەلەوە لە ٢٦ی تشرینی یەکەم ئەنجامدرا، لەئاکامی پەیوەندی نێوان (عوسمان ئۆجالان و مستەفا چاوڕەش)دا لە (لۆلان) چاوپێکەوتنێک لە نێوان نوێنەرانی (پەکەکە) و بەرەی کوردستانی ئەنجامدرا. هاوکات پێشنیاری راگرتنی شەڕ لەلایەن (پەکەکە)وە کرابوو، (مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی)ش ئەمەیان بەگونجاو بینی بوو، دواتریش لە (هەولێر) بەردەوامی بە دیدارەکان دران. یەکەم دیدار لە هەولێر لەنێوان (عوسمان ئۆجالان و مەسعود بارزانی)دا هاتەئاراوە، دوایش لەگەڵ (جەلال تالەبانی)، هەروەها لەمبارەیەوە لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێم (فوئاد مەعسوم)یش دیدار ئەنجامدرا[١٧٤]، هەتا دوا رۆژانی مانگی تشرینی یەکەم دیدارەکان بەردەوام بوون، لەهەمان کاتیشدا شەڕوپێکدادانی خوێناوی بەردەوام بوون، شەڕ و ئاشتی بەیەکەوە دەچوون بەڕێوە.

---

٣٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (نوزگور گوندەم ) .

١٧٤

## (عەبدوللە ئۆجالان) بوونی دیدارەکان دەسەلمێنێت

لەگەڵ دژواربوونی شەڕوپێکدادانەکاندا، لایەنی دەسەڵاتدارانی باشور پێش ئەوەی چاوپێکەتنەکان ئەنجام وەربگرن، ئەم چاوپێکەوتنانەیان کرد بە ئامرازی شەڕی دەروونی. سەرچاوەکانی باشور باسیان لەوە دەکرد لەسەر داخوازی (پەکەکە) دیدارەکان ئەنجامدراون و لەئاکامدا پرۆتۆکۆلێکی لێکەوتووەتەوە و (پەکەکە)ش چەکیان داناوە. سەبارەت بە چاوپێکەوتنەکان لەیەکەم هەواڵدا و لەیەکەم رۆژدا ئەندامی سەرکردایەتی (یەنەکە) دکتۆر (کەمال فوئاد) ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە، دکتۆر (کەمال فوئاد) لە روونکردنەوەیەکیدا بۆ دەزگا تورکییەکان قینی خۆی دانەدەمرکاندەوە و دەیوت (**پەکەکە چەکیان داناوە**)[175] ، لەهەمانکاتدا بەرپرسێکی (پەکەکە) چاوپێکەوتنەکانی بە (تەکتیک) دەهێنایە زمان و ئەو بانگەشەیەی کە گوایە (پەکەکە چەکی داناوە) بە (ساختەکاری) ناوزەند دەکرد[176]، لە روونکردنەوەیەکی (عەبدوللە ئۆجالان)دا کەلە ٣٠ تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٩٢) کردی چاوپێکەوتنەکانی پشتڕاست دەکردەوە، لەهەمانکاتدا (عەبدوللە ئۆجالان) ئەوەی بەدرۆ دەخستەوە کە گوایە پرۆتۆکۆڵیان واژۆ کردبێت، لە دیمانەیەکیدا (عەبدوللە ئۆجالان) بەمشێوەیە وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە :

**پرسیار : (لەم رۆژانەدا لە دەزگا راگەیاندنەکانی پەدەکە و یەنەکە باس لە رێککەوتنێک دەکرێت، ئەوان دەڵێن لەگەڵ پەکەکە دا چاوپێکەوتن کراوە و هەموو مەرجەکانیشیان قەبوڵی کردووە، ئایا هەموو ئەمانە راستن؟).**

**وەڵام :** (بەڵی چاوپێکەوتن لە ئارادایە، بەڵام هێشتا بە ئەنجامێکەوە گرێنەدراوە، بەتایبەتی دەمانەوێت گەمەکانی دەوڵەتی تورک ڤاڵا دەربخەین، بێشک گەمەی کورد بە کورد شکاندن، دەوڵەتی تورک سیخوڕەکانی خۆیانیان لەناو بەرەی کوردستانی جێگیرکردووە، ئێمە

---

[175] ٢٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حوررییەتی تورکی )

[176] ٢٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم )

هەوڵدەدەین گەمەکانیان پوچەڵ بکەینەوە، وەکو دەزانن بۆ دواجار چوون زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورکیایان هێنا، هێزی پێشمەرگە لەهەمبەر سوپای تورک وەکو سەربازی بەکرێگیراو و نۆکەر بەکاردەهێترێن، دەوڵەتی تورک ئەو پێشمەرگانە دەخەنە پێشی خۆیان و دەیانەوێت بەیەکماندا بدەن، بەتایبەتی بە فیتی هەندێک کەس و لایەن کە سیخوڕی بۆ دەوڵەتی تورک دەکەن بە کاروبارەکانی ئەوان دەیانەوێت پەرە بە کوشتار بدەن، ئێمە بۆئەوەی ئەو کوشتارییانە ئەنجام نەدرێن هەندێک دەست پێشخەریمان کردووە و دەمانەوێ ڕێگاچارە بدۆزینەوە. یەکێک لە پارچەکانی ئەو ڕێگا چارییانە بێشک ئەنجامدانی دیدارەکانە، بێشک هەندێک کێشە هەن کە دەکرێت لە چوارچێوەی سیاسەتدا چارەسەر بکرێن، بۆئەم مەبەستەش هەندێک کەس خراونەتە ئاراوە. باوەڕیشمان وایە ئەنجامی باشیش بەدەست بخرێت، بێگومان هەندێک قسەی بێ بنەما دەکرێت گوایە (تەسلیم بوون، هەڵاتن) ئەم قسانە دروستکراوی دەوڵەتی تورکە بە ئامانجی پروپاگەندە دروستی دەکەن و دەیانەوێت لەم ڕێیەوە سەرکەوتن بۆخۆیان دابتاشن کە هیچ مانایەک نابەخشێت. خەباتی ئێمە بەشێوەیەکی فراوانتر و باشتر و خولقێنەرتر بەردەوام دەبێت و پەرە بە تەکتیکی نوێش دەدەین، بەمشێوازە دەتوانرێت تێکۆشان فراوانتر و باشتر ببرێت بەڕێوە، بەواتایەک گەریلاکانمان خەباتی سەرتاسەری پێشدەخەن و سەرەڕای سنورەکانیش لەهەموولایەکەوە بواری باشتر بەدەست دەخەن. بەمشێوەیە گەمەی دەوڵەتی تورک پوچەڵ دەکرێتەوە، لەلایەکی تریشەوە ئەو جێگیربوونە بەرفراوانەی سوپای تورک دەستیان پێکردووە ریشەکێش دەکەین. وەکو دەزانن دەوڵەتی تورک بەتەواوەتی دەستیان داوەتە جێگیربوون، بەتەواوەتی دەیانپوکێنینەوە و نایەڵین بە ئاسانی ئەو پارووە بخۆن و لە قورگیان دەریدەهێنین. بەڵێ هەموو ئەمانە بەشێک لە چاوپێکەوتنەکان پێکدەهێنن، لەلایەکی تریشەوە بوارنادەین سیاسەتی کورد بە کورد تێکشکاندنیان سەربگرێت. پێویستە هۆی هاتنە ئاراوەی چاوپێکەوتنەکان لەو چوارچێوەیەدا هەڵسەنگاندنی بۆبکرێت، تەنانەت ئێمە هەوڵدەدەین خوێنی خائینانیش نەڕێژرێن و ناشمانەوێت خوێنی بێکەڵکەکانیش بڕێژرێت. بێگومان بەرەی کوردستانیش بەهەمان شێوەیە داخوازی خۆیان هەیە، هەڤاڵانمان هەندێک ڕووبەڕویان بونەتەوە، وەکو گوتم لە چوارچێوەی سیاسیدا دەخوازرێت بەرەو ڕێککەوتن و پرۆتوکۆڵێک هەنگاو بنرێت. بەمشێوەیە زەمینەی تێکۆشانێکی چڕتر لەدایک دەبێت. دەوڵەتی تورک هەندێک سیخوڕی

خۆیان هەیە، ئەوانیش روبەڕوی بە تەنیایی مانەوە دەبنەوە، کارێکی گونجاوە ئەگەر لەسەر ئەم بنەمایانە رێککەوتنەکان هەڵسەنگاندنیان بۆبکرێت. ئەگەر بەتەواوەتیش نەگەینە ئەنجامیش ئومێدەخوازین دەرگای باشتر بۆ پێشکەوتنەکان والابین).

**پرسیار:(بەگوێرەی قسەوباسەکان دەوترێت لەئاکامی چاوپێکەتنەکاندا پەکەکە چەک دادەنێت و مەرجەکانی بەرەی کوردستانیشیان قەبولکردووە، ئایا ئێوە ئەمە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟).**

**وەڵام** :(نەخێر ئێمە چەکمان دانەناوە، واز لە چەکەکانیشمان ناهێنین، تەنانەت لە هەندێک شوێنی گونجاودا پەرە بە فراوانکردنەوەی کەمپەکانیشمان دەدەین، بەپێچەوانەوە بواری کارکردنی باشتر رەخساوە، ئەمە بەدڵنیاییەوە دەتوانم باسیشی بکەم، ئەوان تەنگەتاون نەک ئێمە، ئەوان زیانی گەورەیان بەرکەوتووە و لە مێژووشدا بە خیانەتکار تۆمارکران. لەم رەوشەدا رووی راستەقینەیان بەدەرکەوت، نزیکەی مانگێکە بەرخودان و تێکۆشانێکی بێوێنە نیشاندران و تەنانەت دەتوانم بڵێم سوپاکەی سەدامیش نەیاتوانیوە ئەوەندەی ئێمە خۆراگری بکەن. ئەم بەرخودان و بەرگرییە پەردەی خیانەتی سەر روویانی هەڵماڵی، لەلایەکی تریشەوە توانراوە هێرشەکانی سوپای تورک پوچەڵبکرێنەوە و گەریلاکانمان بەشێوەیەکی زۆر قارەمانانە تێکۆشانیان کردووە. هەموو ئەمانە زۆر روون و لەبەرچاون، پێویست ناکات جارێکی تر لەسەر ئەم مژارانە بووەستریتەوە، ئەمە قارەمانترین بەرخۆدانی ناو هەناوی مێژوویی بووە. ئەم بەرخودانەی ئەم مانگە پێشوتریش نمونەیان هەبووە، ئەو تەکتیکانەی لە شەڕی کەنداو بەکارهێنراون لەهەمبەر ئێمەدا لەوە زیاتریان بەکارهێنا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لەهەمبەرمان بەکریگیراویان قیتکردەوە، بەرامبەر بە هەموو ئەمانەش ئەوەندەش بەرخودان وتێکۆشان کراوە. دەتوانرێت ناوێکی قارەمانانە لەم بەرخودانە بنرێت، ئەوان دەیانەوێت دەست بکەن بە پروپاگەندەیەکی چڕ، دەیانەوێت لەم رێیەوە ئەو رەوشەی تێی کەوتوون رووە راستەقینەکەی بشارنەوە. بێشک زیانێکی زۆر دراوە لە سوپای تورک و لە هێزە خیانەتکارەکانی هاوپەیمانیان، وەکو دەڵێن گوایە نزیکەی (٤٠٠ بۆ ٥٠٠) گەریلامان کوژراوە ئەمانە راست نین، بە هەموویەوە ژمارەی زیانی گیانیمان ناگاتە (١٠٠) شەهیدێک. خەباتی فراوانمان لە هەموو کوردستاندا بەردەوامە، مەسەلە مەسەلەی باسکردنی زیانی سیاسی یاخود زیانی سەربازی ئێمە نییە، بەپێچەوانەوە دەبێت باس لە مەسەلەی سەرکەوتنی سیاسی و سەربازی ئێمە بکرێت. ئێمە چەکەکانمان بەدەستەوەیە و ئەوەیشی

باسی دەکەن گوایە چەکمان دانابێت تەنها پروپاگەندەیە و هیچی تر کە دەیانەوێت لەسایەیدا ڕەوشی نالەباری خۆیانیان پێ پەردەپۆش بکەن. ئەوەی دەیڵێن پێکدێت لە پروپاگەندەیەکی هەرزان بەها و هیچی تر)[177].

لە قسەکانی (عەبدوللە ئۆجالان)دا ئەوە ڕوونبووەوە کە هێزەکانی باشور چاوپێکەوتنەکانیان دەست پێکردووە. هاوکات سەرچاوەکانی باشور هەواڵی چاوپێکەوتنەکانیان پشتڕاست دەکردەوە بەڵام سەبارەت بە ناوەڕۆکی ڕێککەوتن پروپاگەندەیان دەکرد. لە یەکێک لە هەواڵەکانی ڕادیۆی (بی بی سی) پەیامنێرێکی فەرەنسی پشتبەست بە هەواڵەکانی باشوری کوردستان ئەوەی بڵاوکردەوە گوایە (عوسمان ئۆجالان) ئارەزووی کردووە و وتویەتی (واز لە چەک دەهێنین) .

لەهەمانکاتدا سەرچاوەکانی (پەکەکە) لەبارەی هەواڵەکانەوە دەیانوت ڕاست نین و ئەم هەواڵە بیروبۆچونی پەیامنێری (بی بی سی)بووە و بە درۆیان دەخستەوە[178]، ئەم هەواڵە لەلایەن ڕاگەیاندنەکانی تورکەوە ببووە بنێشتە خۆشەی سەر زمان کە زوو زوو دووبارەیان دەکردەوە. ڕاگەیاندنەکانی تورک دەیانویست ئەم هەواڵە وەکو شکستییەکی گەورەی (پەکەکە) لە قەڵەم بدەن. لەبەر ئەوەی چاوپێکەوتنەکان بە نهێنی ئەنجام دەدران (پەکەکە) پێیان باش بوو ڕوونکردنەوە نەدەن، ئەوان لەوە دەترسان ئەگەر ناوەڕۆکی چاوپێکەوتنەکان ئاشکرا بکرێن دەوڵەتی تورک دەکەوێتە پیلانگێڕی، لەوانەبوو دەوڵەتی تورک پەنجەی تێوەردایە و کۆتایی بە چاوپێکەوتنەکان بهێنرایە. پێیان باش بوو دوای چاوپێکەوتنەکان ئەگەر ڕێککەوتنیشی لێ سەوز نەبوایە ئەگەر ڕوونکردنەوە بکرایە مەترسییەکی ئەوتۆی نەدەبوو.

---

[177] ٢٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی (ئوزگور گوندەم )

[178] ای هەمان سەرچاوە .

## زریپۆشەکانی سوپای تورک لە زاخۆ

چاوپێکەوتنەکان لە نێوان هێزەکانی کوردییەکاندا لە کاتێکدا هاتبووە ئاراوە کە شەڕوپێکدادانەکان چۆکیان بە گەریلاکانی (پەکەکە) دانەدابوو، ئەمەش بووە مایەی پەستی و نیگەرانی دەوڵەتی تورک، لەولاشەوە سەرمای زستان دەستی پێکردبوو، بەشێوەیەک بوو کە سرووشت بە دەسەلاتی خۆی ئاوێک بەو ئاگرەدا بکات و کۆتایی بە شەڕوپێکدادانەکان بهێنێت.

بەهۆی ئەم گۆڕانکارییانەوە سوپای تورک پەلەپەلیان بوو. لە ئێوارەی ڕۆژانی ٢٨و٢٩ی تشرینی یەکەم یەکینەکانی زریپۆشی سوپای تورک لەگەڵ کۆماندۆکانیان لە دەرگای (ئیبراهیم خەلیل)ەوە چوونە باشوری کوردستانەوە، لە هەمان ٢٨ی تشرینی یەکەم ماشێنی بارهەڵگری سەربازی و (٣٠) زریپۆش کاتژمێر ٥ و نیوی ئێوارە لە (ئیبراهیم خەلیل)ەوە چوونە (زاخۆ)وە و لەوێشەوە خۆیان گەیاندە ناوچەی (هیزۆ). زریپۆشەکان بەسەر جادەکانی (زاخۆ و ئامێدی)یەوە بەرەو (باتوفە) چوون و دوای ماوەیەکی کەمیش لە ناوچەکەدا لەگەڵ گەریلاکانی (پەکەکە) کەوتنە شەڕەوە، هەروەها لە ڕۆژی ٢٩ی تشرینی یەکەم کاتژمێر ١٠ی بەیانی (١٠) دانە زریپۆش چوونە (زاخۆ)وە و لەوێشەوە بەرەو (باتوفە) بەڕێکەوتن، ئەم هێزانە سەرەتا لە (بانیک و هیزۆ)ی باشوری (هەفتانین) سەنگەریان گرت. یەکینەکانی سوپای تورک بە هەماهەنگی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) چوونە (هیزیل) و بەیەکەوە هێرشی سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە)یان کرد و لە نزیک (بانیک)یش بەدرێژایی ئەو ڕۆژە شەڕوپێکدادانی خوێناوی هاتنەئاراوە.

تیڤییەکانی تورک بەردەوام دیمەنی قۆڵبەقۆڵی پێشمەرگە و جەندرمەیان نیشاندەدا و هەروەها دیمەنی فەرماندەیەکی (پەدەکە)یان زۆر دووبارە دەکرد بە ناوی (فاتیح عوسمان) کە شانبەشانی سەربازەکانی تورک بەشداری شەڕەکانی کردبوو. لەو شەڕەیان کە (فاتیح عوسمان) تییدا بەشداربوو ٢ گەریلایان بە دیلی گرتبوو، رەوانەی زیندانی (زاخۆ)شیان کردبوو. لە هێرشەکانی (هێزیل)دا نزیکەی (١٠٠٠) کۆماندۆ و ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگەی (پەدەکە) و (٢٠) زرێپۆش بەشداریان لەم هێرشەدا کردبوو. هاوکات ئەوکاتەی ٣کم لە ناوچەی (بانیک) نزیک ببوونەوە، یەکینەکانی زرێپۆشەکان چوونە (زاخۆ)وە و لە ناوچەی (سیندی)دا ٦کم چوونە پێشەوە.

## لەو رۆژنامەوانانەی (پەدەکە) رادەستی تورکیانی کردنەوە

لەو رۆژانەی شەڕی باشوری کوردستان دەستی پێکرد (ستیڤن والدبیرگ) پەیامنێری رادیۆی (فرێیبۆرگ)ی ئەڵمانی لە (هەفتانین) لە کەمپێکی (پەکەکە)بوو، ئەم پەیامنێرە لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە دەستبەسەر کرا و رادەستی تورکیایان کردەوە، ئەم پەیامنێرە لە سەروبەندی شەڕوپێکدادانەکاندا بۆ ئەوەی زیانی بەرنەکەوێت گەریلاکانی (پەکەکە) لە رۆژی ٢٣ی تشرینی یەکەم لە رێگای (زاخۆ) جێیانهێشتبوو.

بەتۆمەتی ئەوەی هاریکاری (پەکەکە)ی کردووە ئاسایشی (پەدەکە) ئەم پەیامنێرەیان خستە زیندانەوە، ماوەی (٦) رۆژ لە زیندان هێشتیانەوە و پاشانیش رادەستی تورکیایان کردەوە.

لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) لەبەشی تورکیا چەند جەندرمەیەک لە چاوەڕوانی هینانی پەیامنێرەکە بوون، بەمەشیان دەوت (سنورداش)، واتا دەرکردن بۆ ئەودیوی سنور. لەناو جانتاکەی پەمانێرەکە کاسێتێکی ریپۆرتاژ و چەند وێنەیەکی گەریلای تێدابوو، سەرچاوە تورکییەکان دەیانوت لەکاتی پەڕینەوەی بۆ تورکیا لە باخڵیدا بەڵگەی ستراتیژی گرنگ دۆزراوەتەوە.

پەیامنێر و رۆژنامەوان (ستیڤن) لە ئەڵمانیا پەیوەندییەکی باشی لەگەڵ کوردا هەبوو، پێشوتریش چەندینجار هاتبوو بۆ باشوری کوردستان، بۆدواجار لە ١٨ی ئەیلول هاتبوو بۆ (ئەنقەرە) و لەوێشەوە هاتبوو بۆ (ئامەد) و لە ٢٩ی ئەیلولیشدا خۆیگەیاندبووە باشوری کوردستان.

نوێنەری (پەدەکە) سەفین دزەیی لە (ئەنقەرە) لەبارەی ئەم مژارەوە دەیوت (**یەکێکی لەو شێوەیە لەژێر چاودێریدایە، بەڵام رۆژنامەوان نییە، کاری سەربەخۆ دەکات، تەنها نووسەرە و لەسەر کورد دەنوسێت**)[١٧٩].

---

[١٧٩] ٢٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

ئەم جۆرە کارانەی (پەدەکە) وەکو پیشەی لێهاتبوو، یاخود کردبوویان بە قانونی خۆیان، باوکی (ستیڤن) زۆر پەشۆکاوی کوڕەکەی بوو، دەیوت (**کوڕەکەم تەنها دۆستی کوردە، کەچی هەر لەلایەن کوردیشەوە رادەستی تورکەکان کراوەتەوە**).

ئەو کاسێتەی کە دەیانوت لە جانتای (ستیڤن) گیراوە و لەبارەی (پەکەکە)وەیە بەڵام کاسێتێک بوو باسی لە رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسی کوردی دەکرد لە شارەکاندا. لەدوای رادەستکردنەوەی (ستیڤن) بە تورکیا زیندانیکرا و رەوانەی دادگای (ئامەد)یان کرد، بە تۆمەتی ئەوەی هاوکاری (پەکەکە)ی کردووە دادگا بە (٣) ساڵ زیندانییانکرد. ئەم پەیامنێرە کە قوربانی دەردی خیانەتی (پەدەکە)بوو، دوای ئەوەی کەوتە بەر غەزەبی شەڕی باشورەوە، (ستیڤن) بەردەوام لە زیندانەکان جێگۆڕکێیان پێدەکرد، رۆژێکیان گاردییانەکانی زیندانەکە بەبیانوی گەڕان بەدوای شتومەکی نایاسایدا لێدانێکی خەستی (ستیڤن)یان کردبوو. دوای ئەوەی (ستیڤن) بۆ ماوەی ساڵێک لە زیندان بوو، حکومەتی ئەڵمانیان لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٣) لەهەمبەر دەزگا و لایەنگرانی (پەکەکە) ئۆپەراسیۆنێکیان ئەنجامدا، دوای ئەم ئۆپەراسیۆنە رەشبگیرییەی سەر رەوەندی کورد لە ئەڵمانیا، سەرۆک کۆماری تورکیا (سلێمان دیمرال) بە بڕیارێکی تایبەت (ستیڤن)ی ئازاد کرد.

لە ماوەی شەڕوپێکدادانەکاندا ئەفسەرە تورکەکان و فەرماندە و پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەهەمبەر رۆژنامەوانەکاندا مامەڵەیان باش نەبوو. پەیامنێری رۆژنامەکانی (حورییەتی تورکی و ئۆزگور گوندەم) دوای ئەوەی لە رێی (ئیبراهیم خەلیل)ەوە لە ٣٠ی تشرینی یەکەم هاتنە باشورەوە لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە دەستبەسەر کران و دوایش سنورداشیان کردنەوە، هۆکاری ئەم سنورداشکردنەوەشیان ئەوەبوو گوایە پێیانیان وتوون (**بەرپرسیارەکانتان نایانەوێت لێرە راتانبگرین**)[١٨٠].

ئەم قسەیان راست بوو، ئەفسەرە باڵاکانی تورک کە هێزی پێشمەرگەیان دەبرد بەڕێوە، جگە لە خۆیان نەیاندەویست هەواڵی هیچ پەیامنێرێک بڵاوببێتەوە و نەیاندەویستیش کەس ببێت بە شاهیدحاڵی رووداوەکانی هەرێمەکە. جارێکی تر لەسەرخواستی بەرپرسیارانی تورک ئاسایشی (پەدەکە) کەوتنەوە گرتنی پەیامنێرەکانی رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم). لە یەکەم رۆژانی دەست پێکردنی شەڕوپێکدادانەکاندا لە (زاخۆ) بە نیازی گرتنی دوو پەیامنێری

---

[١٨٠] ٢ی هەمان سەرچاوە .

رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم) بەناوی (محەمەد بەرواری و زەکییە چانکایە) هەردووکیان لەلایەن پێشمەرگەوە روبەڕوی هەڕەشەی کوشتن ببونەوە و ناچارکرابوون شار جێبهێڵن. هەرهەمان ئەو پێشمەرگانە پێش دەستپێکردنی شەڕوپێکدادانەکان ئەو کاتەی لە کەمپی پەنابەرانی (ئامەد) کە راگیرابوون لەلایەن خودی ئەو پەیامنێرانەوە چەندینجار هاوکارییان کرابوو. لە (زاخۆ) پێشمەرگەکان پاساویان بۆخۆیان دەهێنایەوە و دەیانوت (**ئێمە جێبەجێکەین فەرمانەکان بەوشێوەیەن**). پەیامنێرەکانی رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم) بەناچاری لە شوێنی جیاواز و بە پچڕ پچڕ کارەکانی خۆیانیان ئەنجامدەدا.

## پرۆتۆکۆڵی نێوان حکومەتی هەرێم و پەکەکە واژۆ دەکرێت

لە هەفتانین سوپای تورک دەستی کرد بە دووەمین جموجۆڵی زرییۆشەکانی خۆیان و لە ٢٦مین رۆژی شەڕی باشوریشدا لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی (١٩٩٢)دا دوای چاوپێکەوتن لە نێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێم لە هەولێر لە بارەی ئاگر بەستەوە پرۆتێکۆلێک واژۆکرا. بەگوێرەی ئەو رێککەوتن نامەیەی خرایە بەردەستی رایگەشتی خواستەکانی هەردوولا قەبوڵکرابوون. هەرچەندە لەم هەرێمەدا رێکەوتنەکان بە گشتی بەهایەکی ئەوتۆیان نییە و زۆر گرنگیش نین بەڵام لەنێوان لایەنەکان ئەو پرۆتۆکۆڵەیان واژۆ کرد، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند وەک دەستپێک کۆتایی بە شەڕوپێکدادانەکان دەهێنرا.

بەگوێرەی رێککەوتنەکە (پەکەکە) دانبە حکومەتی هەرێم دەهێنێت و لەناو خاکەکەیدا دژ بە تورکیا چالاکی سەربازی ئەنجام نادات، هەروەها پابەندیش دەبێت بە یاساکانی هەرێمی کوردستانەوە، گەریلاکانیشیان بە چەکەکانی خۆیانەوە لەو شوێنانە دەگیرسێنەوە کە حکومەتی هەرێم بۆیان دیاریدەکات و لەهەمانکاتیشدا دەتوانن کاروباری سیاسی خۆیان بکەن. بەرامبەر بەمەش حکومەتی هەرێمی کوردستان خزمەت و پێداویستییەکانی وەک پاراستن و تەندروستی و هەروەها یارمەتی جۆراوجۆریشیان بۆ دابیندەکات و دەشتوانن بە ئازادیانە لە هەرێمەکە بگەڕێن.

ئەم پرۆتۆکۆڵە لە نێوان فەرماندەیەکی (پەکەکە) بەناوی (عوسمان ئۆجالان) و سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان (فوئاد مەعسوم) واژۆکرا، پرۆتۆکۆڵی نێوان (پەکەکە) و حوکمەتی هەرێمی کوردستان بەمشێوەیە بوو:

لە رۆژی (١٩٩٢/١٠/٢٩) بە هاتنی نوێنەری پەکەکە بەڕێزعوسمان ئۆجالان (فەرهاد) بۆ باڵەخانەی سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستانی عێراق، رێککەوتوین لەسەر ئەوەی ئەو کادیر و گەریلایانەی کە لەناو خاکی هەرێمی کوردستاندان دەپارێزرێن و ئەوانیش ئەو بریارانەی لە پەرلەمانی هەرێمی کوردستانەوە دەردەچن لە (١٩٩٢/١٠/٥) وە پابەندی دەبن. بەیانولعەلا مایلی:

ماددەکان:

١/هەموو گەریلا و فەرماندە و لایەنگرانی پەکەکە کە لەناو خاکی هەرێمی کوردستانی عێراقدان ئەوەیان پەسەندکردووە کە پابەندی یاساکانی هەرێمی کوردستانی عێراق دەبن.

بەگوێرەی ئەمە:

آ / پەکەکە خاکی کوردستانی عێراق بۆ چالاکی سەربازی بەکار ناهێنێت.

ب / ئەو گەریلایانەی دەیانەویت لەناو خاکی کوردستانی عێراق بمێننەوە دەگوازرێنەوە بۆ دوور لە سنور و لەو شوێنانە جێگیردەبن کە حکومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق بۆیاندیاری دەکات.
ج / بەو بەڵگەنامانەی لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە بۆیان دەکرێت دەتوانن سەربەستانە لەناو خاکی هەرێمی کوردستانی عێراقدا گەشت بکەن.
د / ئەوان ناتوانن دژ بە حکومەتی هەرێم و پارتەکانی بەرەی کوردستانی چالاکی سیاسی ئەنجام بدەن.
/ ٢
آ / ئەو کوردانەی خەڵکی کوردستانی تورکیان کە دەیانەوێت لەناو خاکی هەرێمی کوردستانی عێراقدا بمێننەوە حکومەتی هەرێم پارێزگاریان لێدەکات.
ب / هەرچییەک پەکەکە هەیەتی لە هەرێمی کوردستانی عێراق خۆیان دەتوانن بیانپارێزن.
ج / لە هەرێمی کوردستانی عێراق ئازادی چالاکی سیاسی دەدرێت بە پەکەکە.
د / کارگێرانی هەرێمی کوردستانی عێراق پێداویستی بۆ بریندار و نەخۆشەکانی پەکەکە دابیندەکات.
ئەوانەی ئەم پرۆتۆکۆڵەیان واژۆ کردووە:
بەناوی (پەکەکە)وە (عوسمان ئۆجالان)، سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستانی عێراق (فوئاد مەعسوم)
ئەندامی نێردراوی (پەکەکە)(نەعمان سمۆ)          جێگیر سەرۆک وەزیران (رۆژ نوری شاوەیس)
(١٩٩٢/١٠/٣٠).
لە رۆژی (١٩٩٢/١٠/٣٠) کەناڵی (خەبات)ی سەر بە (پەدەکە) هەواڵێکیان بڵاوکردەوە کە بەمشێوەیە بوو (**لە ئاکامدا ئەو دیدار و چاوپێکەوتنانەی لەگەڵ پەکەکە دا دریژەیان هەبوو بە پرۆتۆکۆڵێک کۆتایی پێهات، هەروەها ئەم پرۆتۆکۆڵە باس لەوە ناکات کە پەکەکە دەستبەرداری چەک دەبن**). لەهەمان رۆژاندا کەناڵەکانی (یەنەکە) دوای ئەم پرتۆکۆڵە وازیان لە پروپاگەندەی ناشرینکردنی (پەکەکە)یان هێنا[١٨١].

[١٨١] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) .

## لەهەندێک شوێن گەریلا پاشەکشێیانکرد

ئاکامی دیدارەکان لە نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) پرۆتۆکۆڵێکی فەرمی لێکەوتەوە، دوای بڵاوبونەوەی هەواڵی رێککەوتن گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەندێک شوێندا لە سەنگەرەکانی خۆیان پاشەکشێیان کرد، بەڵام سوپای تورک بە هەموو هێزی خۆیانەوە دەیانویست چواردەوری گەریلا بگرن و شوێنەکانیان وێران بکات. سوپای تورک ئەگەر شانسی ئەوەیان هەبوایە چواردەوری گەریلا بگرن و لەناویان بەرێت، ئەوا بەبێ ئەوەی گوێبدەنە پرۆتۆکۆڵی نێوان لایەنەکان درێژەیان بە ئۆپەراسیۆنەکانی خۆیان دەدا و سەنگەرەکانی گەریلایان وێران دەکرد.

سوپا سالاری تورک (دۆغان گورێش) دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی رێککەوتنی لایەنە کوردییەکان دەیوت (**ئەم رێککەوتنە ئێمە ناگرێتەوە، سوپای تورک هەتا ئەگاتە ئامانجی خۆی لەو هەرێمە دەمێنێتەوە**).

لە هەمبەر ئەم رێککەوتنە (دۆغان گورێش) بە قین بوو بۆیە دەیوت (**چیکاتێک لەوێ کارەکانمان تەواوبوون ئینجا تۆبە دێتەسەر ئەوانەی ناوەوە**)[١٨٢].

یەکینەکانی زرێپۆش و هاوان و تۆپی دوور هاوێژی سوپای تورک رێگایان بۆ هێزی پیادەی سوپاکەیان خۆشدەکرد و ئەوانیش دەهاتنە پێشەوە. دوای ئەوەی لەسەر کشانەوەی گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەنگەرەکانیان رێخۆشکەری بۆ هێزی پیادەیی سوپای تورک و پێشمەرگەکان خۆشتربوون، دوای ئەوەی فەرماندەکانی (پەکەکە) درکیان بەم نییەتەی سوپای تورک کرد، دوای رێککەوتنەکە ئەو سەنگەرانەیان چۆڵکرد کە دانرابوون بۆئەوەی بەرپەرچی هێرشەکانی سوپای تورک بدەنەوە.

---

[١٨٢] ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

گەریلاکانی (پەکەکە) لە یەکەمین شەوی مانگی تشرینی دووەمدا لە سەنگەرەکانی (بانیک، ئەولهێ و پیربلا) کشانەوە، ئەو گەریلایانە بەسەر (هەفتانین)ەوە پەڕینەوە و چوونە هەرێمی سۆرانەوە، فەرماندەیەکی (یەنەکە) دەیوت (**چۆلکردنی ئەم سەنگەرانە لەلایەن گەریلاوە ئەوە نیشاندەدات پابەندی ڕێککەوتنەکەن**).

لە سەنگەرەکانی (بانیک) کە گەریلا کشانەوە لەدوای خۆیان زۆربەی ڕێگاوبانەکانیان لوغم ڕێژکرد. زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک لەم ناوچەیەدا بێچارە مانەوە و نەیاندەتوانی پێشڕەوی بکەن، لەگەڵ ئەمەشدا سوپای تورک نەیاندەوسیت کۆماندۆکانیان زیانیان بەرکەوێت. دەزگای ئاژانسی (ئانادۆلو) بە پشتبەستن بە سەرچاوە سەربازییەکان لەبارەی سەنگەرەکانەوە دەیوت (**لەئاکامی دەستوبرد کردن و بەخێرایی پێشڕەویکردنی یەکینەکانی سوپای تورک سەنگەرەکانی پەکەکە یەک لەدوای یەک گیراون**).

سەبارەت بە چۆلکردنی سەنگەرەکان لەلایەن گەریلاوە بەرپرسێکی دەوڵەتی تورک لەبارەی ناوچەی (هەفتانین)ەوە قسەی بۆ ئاژانسی (ئانادۆلو)کرد و دەیوت (**لەم ناوچەیە پەردەکان دادرانەوە، لەشەڕەکانی ئێرەدا بە گشتی ٤٥ تیرۆریست کوژراون**)[١٨٣] ، پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ش دەیانویست لەو سەنگەرانە جێبگرن کە گەریلاکان چۆڵیان کردبوو، بۆ ئەم مەبەستەش فەرماندەکانی (پەدەکە) لە (زاخۆ) دەستیان گرت بەسەر (١٠٠) پاس و لۆریدا تاکو پێشمەرگەکانیان بگوازنەوە بۆ ناوچەکان.

پێشمەرگە لەبەرئەوەی لەهەمبەر تەکتیکی گەریلا بێ ئەزموون بوون و پێشوتریش شەڕی پارتیزانیان نەکردبوو کاتێک بەشێوەیەکی هەڕەمەکی ڕوو لە سەنگەرە چۆڵەکانی گەریلاکان دەکەن دەکەونە سەر ئەو لوغمانەی کە گەریلاکانی (پەکەکە) ناشتبویانی و پێشمەرگەیەکی زۆر بریندار دەبن. دوای ئەوەی پێشمەرگەکان بە گیانی خۆیان ڕێگاوبانەکانیان بۆ سوپای تورک پاککردەوە پاشان سەربازی تورک هاتنە سەنگەرەکانەوە. لە تیڤییەکانیش ئەمەیان وەک سەرکەوتن ناوزەند دەکرد، ڕۆژنامە و کەناڵەکانی تورک دەیانوت گوایە سوپای تورک چونەتە ناو هەفتانین و زیانێکی زۆریان لە (پەکەکە)داوە [١٨٤].

---

[١٨٣] ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[١٨٤] ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( سەباحی تورکی )

گەریلاكانی (پەكەكە) لەدوای خۆیان چەند فەردە ئازوقەیەكیان جێهێشتبوو كە پێكهاتبوو لە ئارد و نیسک و فاسولیا و هەروەها چەند شوێنێكیش دۆزرانەوە كە چەكیان تێدا حەشاردابوو هەروەها چەند گۆڕێكی شەهیدی گەریلایان دۆزیبووە كە گەریلاكان خۆیان تەرمەكانیان ناشتبو، ئەمەش بووە مایەی دڵخۆشی دەزگا راگەیاندنەكانی تورک و ئەوەیان رادەگەیاند (هەفتانین)یان خستووەتە ژێر كۆنترۆڵی خۆیانەوە. دوای ئەوەی رێككەوتنەكە بە فەرمی راگەهێنرا و لە رۆژنامەكان بڵاوكرایەوە و گەریلاش چەند سەنگەرێكیان چۆڵكرد دەزگا راگەیاندنەكانی تورک دەستیان كرد بە گوتنی ئەوەی (پەكەكە) لە رەوشێكی خراپ دایەو لەبەرئەوەی زیانێكی زۆریان بەركەوتووە ناچارماوە رێككەوتن بكات.

ئەرنەكە باڵی سیاسی (پەكەكە) لە ئەوروپا سەبارەت بە پروپاگەندەكان روونكردنەوەیەكیاندا كە بەمشێوەیە بوو **(بێشک ئەو خەیاڵانەی خەوی پێوەدەبینن هەرگیز نایەتە دی. پروپاگەندەی ئەوەی گوایە تەنها رێگاچارەی پەكەكە تەسلیم بوونە یاخود لەناو چوونە ئەمە بەشێكە لە خەیاڵەكانیان. پەكەكە چارەیەكی زۆری هەیە، بەڵام ئەو تەنها چارەیەی كە هەرگیز پەكەكە روبەروی نابێتەوە تەسلیم بوون و لەناوچونە، هەربۆیە دەڵێین پروپاگەندەكانی دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەكان ناڕاستن و ئەو دیمەنانەیشی كە وەكو سەركەوتن نمایشی دەكەن درۆی هەڵبەستراوە، هەموو ئەمانە پێكدێن لە كارە ساختەكانیان)**[١٨٥].

[١٨٥] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەكانی ( سەباح، حورییەت و میللییەتی توركی ) .

## بنکەی فەرماندارێتی تورک لە زاخۆ

یەکێک لە دیمەنە سەیروسەمەرەکانی باشوری کوردستان ئەوەبوو کەلە دووری ٥کم لە دەرگای (ئیبراهیم خەلیل)ەوە لە بارەگایەکی کۆن بەناوی (مەڤکی) بوونی (٢٥) فەرماندەی تورک بوو کە پۆشاکی پێشمەرگەیان پۆشی بوو. شەڕی باشور لەلایەن ئەم بنکە فەرمانداریتییەوە هاوکێشە و بەرنامەکانیان بۆساز دەکرا کە فەرماندەکانی پێشمەرگەش ئەمەیان دەزانی. لەو شوێنانەی جموجۆڵی لێبوو ئەم فەرماندارانە سەنگەری تایبەتیان بۆدروست دەکرا و لەناو ماشێنی جام رەشدا هاتوچۆیان دەکرد و دوای کۆتایی شەڕوپێکدادانەکانیش فەرماندارێتی هێزی (یەنەکە) هەموو ئەمانەی پشتراست کردەوە. دوابەدوای دەستپێکردنی جموجۆڵی زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک رۆژانە لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل)ەوە نزیکەی (٢٠) لۆری بارهەڵگری بێ رەقەم دەهاتنە باشوری کوردستانەوە. ئەم لۆریانە خواردەمەنی و پێداویستی و هەروەها تەقەمەنییان بۆ کۆماندۆ و سەربازەکانی سوپای تورک دەگواستەوە. بۆ شاردنەوەی زیاتری ئەم هاتوچۆیە بەرپرسیارانی تورک پارەیان دەدا بە کارمەند و فەرماندەکانی (پەدەکە) بۆئەوەی چاوپۆشی بکەن و دەمی خۆیان بگرن و بەمشێوەیە پەیوەندی کاروباری سیخوڕی و هەماهەنگی فەرماندەکانی (پەدەکە) بۆ سوپا و دەوڵەتی تورک گەشەی کرد و ببووە کارێکی رۆتینی و خوازیار. سەرەڕای ئەوەی لە نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) رێککەوتنیش هاتبووە ئاراوە، سەرەڕای ئەوەی (پەدەکە) بەهۆی واژۆکردنی رێککەوتنەکە ئەم کارانەی فەرماندەکانیشیان پێقەبوڵ نەبوبێت بەڵام فەرماندەکانیان بەردەوام بوون لەسەر چاوساغی و هاوکاریکردنی سوپای تورک. یەکێک لەو فەرماندانەی (پەدەکە) کە بەهۆی کار و هاوکاری و پشتیوانی کردنی سوپای تورک بووە مایەی ئەوەی لە ئاستی رایگشتیدا بناسرێت (فەتاح عوسمان) بوو.

سەنگەرەکانی (پیربلا)ی نزیک لە (هەفتانین)کە گەریلاکان چۆڵیان کردبوو، (فەتاح عوسمان) وەکو سەرکەوتنی خۆیان نیشانی رۆژنامەوانەکان و بەرپرسیارانی تورکی دەدا. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) رابەرایەتییان بۆ زریپۆشەکانی سوپای تورک کرد، خەندەیان بۆ رۆژنامەوانەکان دەکرد و دەیانویست ئەوە بسەلمێنن چەنێک دڵسۆزن بۆ خزمەتکردنی سوپای تورک.

والی هەرێمی قەدەغەکراو (ئونال ئەرکان) و فەرماندەی ئاسایشی هەرێمەکە (نەجاتی ئۆزکان) چاویان بەو حەشارگا و ئەو عەمارانەدا دەخشان کە گەریلاکان چۆڵیان کردبوو کە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) دۆزیبویانەوە. ئەم دیمانانەش لەلایەن تیڤییەکانەوە بە بەردەوام نیشان دەدران. ئەفسەرە تورکەکان (فەتاح عوسمان)یان نیشاندەدا کە فەرماندەیەکی (پەدەکە) بوو دەیانوت ئەم کابرایە چاوساغی و رابەرایەتی بۆ سوپای تورک کردووە و داوایان لە فەرمانداریێتی گشتی سوپاکەیان دەکرد خەڵاتی (فەتاح عوسمان) بکەن، لەهەمانکاتیشدا لەهەمبەر تیڤییەکاندا (فەتاح عوسمان) بەشێوەیەکی وەک پاڵەوانی جەنگ بزەی دەکرد، شایەنی باسە لەم دیمەنەدا راستییەک بەدیدەکرا ئایا چیبوو!!؟؟؟.

ئازوقە و کەلوپەلەکانی گەریلاکانی (پەکەکە) کە جێمابوون بەسەر پێشمەرگەکاندا دابەشدەکران و ئەو چەکانەیشی دۆزرابوونەوە سوپای تورک دەستی بەسەردا دەگرت [186].

---

[186] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) .

## (فڕۆکەکانی ئاپۆ)

لەگەڵ دژواربوون و سەختی شەڕەکان لە ناوچەی (زاپ)، لەهەمانکاتیشدا سوپای تورک بۆردۆمانی ئاسمانی خۆیانیان چڕکردەوە. فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک زۆر بە نزمی بەسەر گوندەکانی (چایرلی و ئشکلی) سەربە (چوکورجە) دەفڕین و ئەمەش کاریگەری لە منداڵانی گوندەکان دەکرد. بەهۆی دەنگ و ترسی فڕۆکەکان منداڵان بە شەو خەویان لێدەزڕا و زۆرجاریش ژێر خۆیان تەڕدەکرد، زۆربەشیان توشی نەخۆشی دڵەڕاوکێ و دەروونی ببوون. ژنانی ئاوایی و دایکانی ئەو منداڵانە کە بەهۆی دەنگی فڕۆکەکانەوە لە رەوشی منداڵەکانی خۆیان دەترسان، بۆئەوەی ترسیان بڕەوێنەوە و دڵیان بدەنەوە پێیانیان دەوت (**رۆڵە مەترسن ئەمانە فڕۆکەی ئاپۆن**)، ئەم شەڕە نەگریسە تەنانەت منداڵەکانیشی فێرکردبوو کە بزانن کێ دۆستە و کێ دوژمنە .!

## به هێستر تەرمەکان دەگوازنەوە

کاتێک سوپای تورک روو لە کەمپەکانی گەریلای (پەکەکە) ئۆپەراسیۆنەکانیان چووە دووەمین هەفتەوە، لەهەمانکاتدا هێرشەکانی روو لە (هاکان تەپە و چایرلی) سەر بە (چوکورجە) و هەروەها لە چیاکانی (زاپ و ئولودەرە)ش شەڕ بەردەوام بوون[١٨٧]، بەڵام بەهۆی گرنگی و ستراتیژییەتی ناوچەکانەوە گەریلاکانی (پەکەکە) سەنگەرێکی باشیان گرتبوو. لەکاتی شەڕەکاندا نەیاندەهێشت یەکینەکانی سوپای تورک بێنە پێشەوە، لەبەرئەوەی یەکینەکانی سوپای تورک لە ناوچەی (چایرلی و هاکان تەپە) نەیانتوانی بچنە پێشەوە و پێشڕەوی بکەن بۆردۆمانی ئاسمانی و هاویشتنی هاوان و تۆپی دوورهاوێژ چڕبوونەوە. سەرچاوە فەرمییەکان بەبێ ئەوەی شوێنێکی دیاریکرا بهێننە زمان بە گشتی دەیانوت لە ناوچەکەدا شەروپێکدادان بەردەوامە [١٨٨].

بەگوێرەی گێڕانەوەکانی جاشەکانی (ئوزوندەرەلی) کە بەشدارییان لە هێرشەکانی (زاپ) کردبوو دەیانوت لە شەڕەکانی (سنات و خانتور) بە دەیان سەرباز و فەرماندە و جاش کوژراون و بریندار بوونە، روونکردنەوە فەرمییەکانیش هەتا پێیان بکرایە زیانە گیانییەکانی خۆیانیان بە ڕێژەیەکی زۆر کەم دەهێنایە زمان [١٨٩].

یەکێک لە دیمەنە ترسناکەکانی شەڕەکان مانەوەی تەرمەکان بوون کەلەژێر دەوەن و بەردەکاندا جێیانیان هێشتبوو. فەرماندە باڵاکانی تورک بۆئەوەی ئەو تەرمانە بهێنرێنەوە دانیشتوانی گوندەکانی (قایەدیبی، گولیازی، یەمیشلی، تاشدەلان و ئشکفێران)یان بە هێسترەکانیانەوە بەکرێ دەگرت، ئەوانیش دەچوون و تەرمەکانیان دەخستە سەر پشتی هێسترەکان و دەیانهێنانەوە، لەوێشەوە بە کۆپتەر تەرمەکانیان دەبرد بۆ بارەگا سەربازییەکان. گواستنەوەی تەرمەکان بە هێستر لەو رۆژانەدا ببووە کارێکی رۆتینی بەشێک لە شەڕەکان. بەهۆی هاتنی سەرماوسۆڵە و زیاد بوونی زیانی گیانیشەوە ژمارەیەکی زۆری جاش کە بەشداری ئۆپەراسیۆنی (ئەودیو سنور)ببون دەستیان کرد بە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانی خۆیان.

---

[١٨٧] ٣٠ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی )

[١٨٨] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[١٨٩] ای هەمان سەرچاوە

یەکێک لەو عەشیرەتانەی کە زۆر دڵسۆزی دەوڵەتی تورک بوون بەناوی (خێڵی شانۆبالی و باباتلەر) بوون سەرەڕای ئەوانیش زۆربەی جاشەکانی سەر بە گوندەکانی (قایەدیبی، یەمیشلی و گولیازی)ی سەربە (چوکورجە و ئولودەرە) گەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان، لەسەر ئەم کارە دەوڵەتی تورک چەکەکانیان لە جاشەکانی (گولیازی) سەندەوە کە پێشیان دەوترێت (بێژەهـ).

سەنگەرەکانی سەر گردی (شکەوتەڕەش) کە گەریلاکانی لێبوو، لەبەرئەوەی بەرخودانێکی بێوێنەیان دەکرد سوپای تورک چەنێک هەوڵیاندا نەیانتوانی ئەوی بگرن، هەربۆیە بە جاشەکانی (گولیازی)یان وتبوو ئەگەر بتوانن ئەو گردە بگرن ئەوا هەریەکە و ١ ملیۆن لیرەی تورکی وەردەگرن و ڕەوانەی ماڵەوەشیان دەکەن، بەڵام جاشەکان ئەم داخوازییەیان قەبوڵ نەکردبوو، هەربۆیە چەکەکانیان لێسەندنەوە.

جاشەکان کە نێردرابوونە ناو جەرگەی شەڕەکانەوە، دەیانوت (**لە شەڕەکاندا جگە لەو گەریلایانەی چەکی قورسی وەک دۆشکە و هاوان بەکار دەهێنن گەریلای تر بەرچاو ناکەوێت، یان لە حەشارگاکاندا خۆیان شاردووەتەوە یان خۆیان مەڵاسداوە، ئەو سەربازانەیشی سەنگەری پتەویان نەبوو یان شوێنەکانیان باش نەبوو بە نەزانی خۆیان دەکەوتنە سەر لوغم و زیانێکی زۆری گیانیان لێکەوتووەتەوە**)[١٩٠].

جگە لەو جاشانەی کەلە شەڕەکانی (زاپ) بەشداریان کردبوو پاشان چوبونەوە بو ماڵی خۆیان هەروەها جاشێکی زۆری تریش چەکەکانیان دانا. نەمانی جاش و نەمانی چاوساغی و ڕێزانان ببووە مایەی وورە ڕوخانی سەربازەکانی سوپای تورک.

ئەو جاشانەی سەربە بارەگای (کۆپرلی) بوون کە جموجۆڵەکانی لێدەبرا بەڕێوە و سەر بە (چوکورجە) بوو، فەرماندەی بارەگاکە کۆبونەوەیەکی بە جاشەکان کرد، داوای لێدەکردن بەردەوام بن لە ئۆپەراسیۆنەکە و هەروەها پێیانی دەوت (**ئێوە دەکەم بە تیمی تایبەت**)، هەروەها هەڕەشەی ئەوەشی لێدەکردن ئەگەر بەشداری ئۆپەراسیۆنەکان نەبن ئەوا چەکەکانیان لێدەستێنێتەوە [١٩١].

---

[١٩٠] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[١٩١] هەمان سەرچاوە .

## ناڕەزایی کۆنگرەی نەتەوەیی عێراقی دژ بە زریپۆشەکان

لەو ماوەیەی کاروباری کۆنگرەی نەتەوەیی عێراق بەردەوام بوو، ئەو زریپۆش و دەبابانەی سوپای تورک کەلە (خابور)ەوە تێپەڕ بوون، ببووە مایەی ناڕەزایی کۆمەڵێک لە نوێنەرانی کۆنگرەکە. هەندێک لە ئەندامانی کۆنگرەکە پێشنیاری ئەوەیان دەکرد پرۆتێستۆی تورکیا بکرێت. بۆ نەرمکردنەوەی رەوشەکەش سکرتێری (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی دەیوت (**سەرەتا دەبێت کاری دیبلۆماسی پێشبخەین**)، (جەلال تاڵەبانی) سەبارەت بە زریپۆش و دەبابەکان زانیاری دابوو بە ئەندامانی کۆنگرەکە و لەبەردەم ناڕەزاییەکان ببوو بە ڕێگر[١٩٢].

(جەلال تاڵەبانی) تکای ئەوەی دەکرد لەهەمبەر ئەم رەوشە بێدەنگ بن، بەمشێوەیە کوردانی باشور لەهەمبەر نییەتی دەوڵەتی تورک دوودڵ بوون. کەناڵەکانی باشور خەریک بوو وایانلێبێت بەردەوام پەخشی جموجۆڵە هاوبەشییەکەی پێشمەرگە و جەندرمەی تورک بکەن. هاوکات ئەوکاتەی ناڕەزاییەکان لەهەمبەر (پەدەکە و یەنەکە) زیادیان کرد، سەرکردەکانی باشور دەستیان بە مناوەرەی تر کرد. نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) دەیوت (**لەگەڵ پەکەکە ڕێککەوتوین و نێوانیشمان باشە و لێرە بەدواوە لە هەرێمەکە پێویست بە بوونی هێزی بێگانە ناکات**)[١٩٣] ، سەفین دزەیی پێیوابوو سوپای تورک لەسەر داخوازی و بۆ هاوکاریکردنی ئەوان هاتوونەتە باشوری کوردستانەوە، ئەو پێیوابوو چیکاتێک ئەوان بیانەوێت سوپای تورک لە باشور پاشەکشێ دەکات ! .

لە ئێوارەی ٣٠ تشرینی یەکەم تەلەفزیۆنی (خەبات)ی سەربە (پەدەکە) هاوکات باسی قسەکانی (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی)ی دەکرد کە وتبویان (**سوپای تورک بەبێ داخوازی ئێمە هاتونەتە خاکەکەمانەوە و دەمانەوێت بکشێنەوە**)، دوای دوو رۆژیش لەدوای ئەم قسانە نوێنەری بەرەی کوردستانی لە ئەڵمانیا دەیوت (**لەنێوان پەکەکە و حکومەتی هەرێمدا ڕێککەوتنێک هاتووەتە ئاراوە، هەربۆیە دەمانەوێت سوپای تورک لە ناو خاکەکەمان**

---

[١٩٢] ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[١٩٣] ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

**بکشێنەوە**)، نوێنەری بەرەی کوردستانی لە ئەڵمانیا هاوکات داوای لە حکومەتی ئەڵمانیاشی دەکرد زەخت لە حکومەتی تورکیا بکەن لەناو خاکی کوردستانی عیراقدا بکشێنەوە.

لە هەمان رۆژاندا لە شاری (کۆلن) لە ئەڵمانیا پارتی تورکی بە ناوی (تکپمل) (پارتی کۆمۆنیستی تورکیا - مارکسیز و لینینیزم) گروپێک لە لایەنگریان لەدژی هێرشەکانی سوپای تورک بۆسەر باشور خۆپیشاندانیان ئەنجامدا[194].

جموجۆڵەکانی زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک لە شەڕەکانی باشوری کوردستان ئەو پێشمەرگانەی کە لەم شەڕەدا بەشداربوون مەترسی ئەم کارەی کردبویان بە سیمایانەوە دیاربوو، فەرماندەیەکی سەر بە هێزەکانی (یەنەکە) کەچاوی بە هاتنەژوورەوەی زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک کەوتبوو کە هاتبوونە باشوری کوردستانەوە، لەبارەیانەوە بە رۆژنامەوانەکانی دەوت (**لەژیانی خۆمدا ئەوەندەی دیتنی ئەو دیمەنە شەرمم لەخۆم نەکردووە، ئەگەر دەبابەکانی سەدامیش بهاتنایە ئەوەندە دڵگران نەدەبووم**).

دەبابەکانی تورک لەلایەن پێشمەرگە و خەڵکیشەوە بە تورەییەوە پێشوازیان لێدەکرا، بەڵام بەهۆی ترسییان لە سەرکردایەتییان ناچاربوون بێدەنگی هەڵبژێرن.

دوای هاتنەئاراوەی رێککەوتن لەنێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) دەولەتی تورکیش بە دەستپێکردنی هێرشی سەربازی لەهەمبەر ئەم رێککەوتنە نارەزایی خۆی نیشاندەدا، لەمبارەیەوە جێگری سەرۆکی (هاپ .. پارتی رەنجی گەل) (مەحمود قلنچ)کە دەیوت حکومەتی تورکیا هەرلە سەرەتاوە درکیان بە رێککەوتنێکی لەوجۆرەیان کردووە، لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە (مەحمود) دەیوت (**ئەو جموجۆڵە سەربازییەی دەوڵەتی تورک لە هەرێمەکە دەستیان پێکردووە دەکەوێتە چوارچێوەی وێرانکاری و داگیرکارییەوە، ئۆپەراسیۆنی ئەودیو سنوری سوپای تورک درکی پێدەکرێت کە سەرکەوتنی بەدەست نەخستووە، کاتێک زانیان جموجۆڵەکەیان وەکو خواستی خۆیان سەرکەوتو نەبووە ئینجا دەستیان کرد بە هێرشی پیادەیی**)[195].

---

[194] ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[195] ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

## نەگەیشتن بە (مەتینا)

دوای ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێمی کوردستان)لە (هەفتانین) گەریلاکانی (پەکەکە) هەندێک سەنگەریان چۆڵکرد و کشانەوە بۆ ناوچەکانی ناوەوە. سوپای تورک کاتێک ئۆپەراسیۆنی دەبابە و زرێپۆشەکانیان ئەنجامێکی ئەوتۆیان بەدەستەوە نەدا ناچارمان قورسایی خۆیان بدەنە سەر (زاپ) و بەهۆی ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم)وە بەشداری نەکردنی هێزی پێشمەرگە بەشێوەیەکی کاریگەریانە لە ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک، هەربۆیە شەڕەکانی (زاپ) بوونە چەقی هێرشەکانی سوپای تورک.

سوپای تورک هێشتا سوربوون لەسەر نییەتی خۆیان، لە ناوچەکانی نزیک لە (هەفتانین) دەبابە و زرێپۆشەکانیان ڕاگرتبوو، هەروەها ئارەزووی ئەوەیاندەکرد لە (زاپ) کەموکوڕییەکانی ناوچەکە تەواو بکەن و دەست بکەن بە جموجوڵێکی تر. ئەگەر خۆیان بیانتوانیایە لەم هێرشانەدا بەبێ پێشمەرگەش سەرکەوتن بەدەست بخەن ئەوا بەبێ هیچ پشتیوانییەک پەرەیان بە ئۆپەراسیۆنەکان دەدا و بەهۆی نزیک بونەوەی سەرماوسۆڵەشەوە بۆ ئەنجامدانی هێرشەکانیان پەلەیان دەکرد.

یەکینەکانیان وەک سەرەتا لەبەری (زاپ) پەرەیان بە هێرشەکانیان دەدا و کۆماندۆ و جەندەرمەکانیشیان بەهەموو توانایەکی خۆیانەوە ڕوویان لە سەنگەرەکانی گەریلا کردبوو.

لە (شیوێ)کەلە ناوچەکەدا بە (ئاوە شین) ناسراوە، هەرلێرەدا دژوارترین شەڕ لە نێوان گەریلاکانی (پەکەکە) و سوپای تورک هاتنەئاراوە.

لە کاتژمێر ٥ی بەیانی ڕۆژی (١٩٩٢/١٠/٣٠) ژمارەیەکی زۆری فڕۆکە و کۆپتەری کۆبرای سوپای تورک لە (ئاوە شین) بۆردۆمانی سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە)یان کرد. گەریلاکان

بەشێوەیەکی زۆر سەخت وەڵامی هێرشەکانی سوپای تورکیان دەدایەوە، بۆردۆمانی فڕۆکە و کۆپتەر و هاویشتنی هاوان و تۆپی دوور هاوێژ لە هاکان تەپە (شیوە رەزا)، چایرلی(ئێریش) و (مەڤزی تەپە) هاوکاری پێشڕەوییەکانی سوپاکەیان دەکرد. یەکینەکانی پیادەیان دوای ئەو بۆردۆمانانە دەچوونە پێشەوە، بەتایبەتی لەناوچەی (چیای رەش) گەریلاکان بەرپەرچێکی باشی هێرشەکانیاندایەوە. سوپای تورکیش سووربوون لەسەر هێرشەکانیان و دەیانویست گەریلاکان لەسەنگەرەکان هەڵتەکێنن[196].

جاشێکی زۆری هەرێمەکە بەهۆی دژواربوونی شەڕوپێکدادانەکانەوە کە دەستبەرداری بەشداربوون ببوون لە بەرەکاندا لە دواهەمین هەفتەی مانگی تشرینی یەکەمدا دەیانوت لە ناوچەکاندا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەگەڵ سوپای تورک بۆ ئۆپەراسیۆنێکی نوێ ئامادەباشی دەکەن. بەگوێرەی روونکردنەوەکانی کارمەندانی دەوڵەتی تورک لە هێرشەکانی (زاپ) نزیکەی (١٠٠٠)هەزار پێشمەرگە بەشداریان کردووە[197].

ناوچەی (مەتینا) ببووە خاڵێکی گرنگی شەڕوپێکدادانەکان، هاوکات دەزگا راگەیاندنەکانی تورکیش زوو زوو دیمەنی شەڕ و ناوچەکەیان نیشاندەدا. ئەو ناوچانەیشی پیشانیاندەدا وەکو ناوچەی ناوخۆ پێناسەیان دەکرد، ئەو ناوچانەش بە قوڵایی ٣کم لەناو خاکی خۆیاندابوو. سوپای تورک دەیانویست گەریلاکانی (پەکەکە) لە سەنگەرەکان هەڵبتەکێنن کە هەرلە ٣ی مانگی تشرینی یەکەمەوە دەستیان بە هێرشەکانیان کردبوو و بۆیان نەچوبووەسەر. سەرەڕای ئەوەی رێککەوتن لەنێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم)دا هەبوو کەچی نزیکەی (٣٠٠) پێشمەرگەی (پەدەکە) شانبەشانی سەربازەکانی سوپای تورک بەشداریان لەم ئۆپەرسیۆنەدا کرد [198]، بەگوێرەی سەرچاوەکانی گەریلا لە دوا رۆژانی مانگی تشرینی یەکەم لەو شەڕوپێکدادانەی لە ناوچەی (زاپ) هاتبوونە ئاراوە سوپای تورک و پێشمەرگە زیانێکی زۆریان لێکەوتووە، هەروەها لە ناوچەی (سنات)یش کۆپتەرێکیان خستووەتە خوارەوە[199].

---

[196] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی )

[197] ای هەمان سەرچاوە

[198] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی )

[199] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

لەو ماوەیەدا ئۆپەراسیۆنی ئەودیو سنوری سوپای تورک لە (خواکورک) کە غەرقی بێدەنگی ببوو لەبارەیەوە هیچ زانیارییەک نەدەزانرا، تەنهاوتەنها چەند شەڕێکی بچوک هاتبووە ئاراوە، دوایش یەکینەکانی کۆماندۆ و جاشەکانیان کشانەوە و لە بارەگای (مەزارگوداغی) گیرسانەوە، لەکاتی کشانەوەشیاندا لە بارەگای (مەزارگوداغی) روبەڕوی پەلەماری گەریلاکان ببووەوە. ئەم هێرشەی گەریلا ئەوکاتە هاتەئاراوە کە باسدەکرا گوایە (خواکورک) لە گەریلاکانی (پەکەکە) پاککراوەتەوە، لەم هێرشەی گەریلا بۆسەر بارەگای ناوبراو بەگوێرەی روونکردنەوە فەرمییەکان بێت تەنها (٥) سەرباز کوژراوە و هەروەها (٩) سەربازیشیان بریندار بووە [٢٠٠]، ئەو جاشانەی لە (خواکورک)بوون دەیانوت (**هەرچەندە ئەفسەرەکان باوەڕیشمان پێناکەن، بەڵام لە هەموو ئۆپەراسیۆنەکاندا بەشداریمان پێدەکەن، دوای ئەوەی پێشمەرگە رابەرایەتییان بۆکردن ئیتر ئێمەیان ئیزندا**).

سوپای تورک لەسەر ئەنجام وەرنەگرتنیان لە هێرشەکانی سەر (خواکورک)، داوایان لە هێزەکانی (پەدەکە) کرد هێڵە سنورییەکانی (شەمزینان)یان بۆبگرن، بەڵام بەهۆی بوونی گەریلا لە (خواکورک) و بە درککردن بە مەترسییەکان پێشمەرگەکان ئەم داخوازییەیان رەتکردەوە[٢٠١].

لەو ماوەیەدا لە (یوکسەکئۆڤا) واتا (گەوەر) دروستکردنی فڕۆکەخانەی سەربازی بەردەوام بوو کە ماوەیەکی زۆر بوو دەستیان پێکردبوو. لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕی (خواکورک) سوپای تورک سەرەڕای ئەوەی هێشتا فڕۆکەخانەکە بەتەواوەتی تەواو نەکرابوو کە کەموکوڕیشی هەبوو بەڵام کردیانەوە، لەرێی ئەم فڕۆکەخانەیەوە کۆپتەر زوو زوو پێداویستی و تەقەمەنییان بۆ بەرەی شەڕەکان دەگواستەوە، ئەم فڕۆکەخانەیە لە ساڵی (١٩٨٥)وە لەلایەن کەمپانیایەکی ئەمەریکییەوە دەست بە دروستکردنی کرابوو.

---

[٢٠٠] ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

[٢٠١] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) .

## بۆردۆمانکردنی ڕێککەوتنەکە لەلایەن سوپای تورکەوە

لە بەیانی ڕۆژی (١٩٩٢/١١/١) لە گوندەکانی (سۆریە و دێمکا)ی نزیک لە (باتوفە) فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان بۆردۆمانکرد، لەم بۆردۆمانەدا نزیکەی (١٩) پێشمەرگە کوژران کە زۆربەیان پێشمەرگەی (یەنەکە)بوون و نزیکەی (١٢٠) کەسی تریشیان بریندار بوون کە لەناویاندا گوندنشینیش هەبوو، لەهەمانکاتیشدا بەهۆی بۆردۆمانەکانەوە خانویەکی زۆری گوندەکان زیانیان بەرکەوت. سەرچاوەکانی پێشمەرگە دەیانوت ئەو تۆپانەی فڕۆکەکان پێوەیان ناون لە جۆری ناپاڵم بووە. دوای ئەم ڕووداوە کەناڵی (خەبات)ی سەر بە (پەدەکە) بەردەوام بانگەوازی بەخشینی خوێنی لە خەڵکی دەکرد، هەروەها زۆر بە بێدەنگییانە تەرمی (٧) کوژراویان ناردەوە بۆ شاری (دهۆک). بەرپرسیارانی (پەدەکە) دەیانویست ئەم ڕووداوە بە نهێنی بگرن، دەستوەشاندن لەم گوندانەی سەرەری هەرگیز لەوە نەدەچوو بە هەڵە بووبێت[٢٠٢].

لەم بۆردۆمانە زیانێکی زۆری گیانی هاتبووە ئاراوە، شاردنەوەی ئەم ڕووداوە لە یەکەم ڕۆژدا لەناو خەڵکیدا نیگەرانی و ناڕەزایی لێکەوتەوە. لەناو کوژراوەکانی (یەنەکە)دا پێشمەرگەی دێرینیشی تێدابوو. (٩) پێشمەرگە کە برینەکانیان سەخت بوو بە کۆپتەر گوازرانەوە بۆ نەخۆشخانەکانی تورکیا. سوپای تورک برینی ئەو بریندارانەی سارێژ دەکرد کە برینداریانی کردبوون و پارەی خوێنیشیانی دەدا و قەرەبووی دەکردنەوە و دەیویست ناڕەزاییەکان دابمرکێنێتەوە. سەکردایەتی سوپای تورک دەیانویست دیدارەکانی نێوان هێزە کوردییەکان تێکبدات.

---

٢٠٢ ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

بەگوێرەی دەوڵەتی تورک و سوپاکەیان چۆن دەکرا لەکاتێکدا چەکی قورسیان هێنابێت بۆ باشور و گەریلاش بەهۆی شەڕەکانەوە شەکەت کەوتبن ئێستاش دیدار و ڕێککەوتن لە نێوان هێزە کوردییەکاندا بکرێت و هەوڵیان دەدا جارێکی تر (پەدەکە و یەنەکە) بهێننەوەسەر خەتی خۆیان. ئەوان پێیان وابوو ئەگەر (پەدەکە و یەنەکە)ش گوێیان لێنەگرن ئەوانیش بخەنە ناو لیستی ڕەشی خۆیانەوە، هەربۆیە سوپای تورک لەڕێی بۆردومانەکانی (باتوفە)وە یەکەم پەیامی خۆی بە هێزەکانی باشوردا. بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک دەیانوت گوایە ئەو بۆردومانە بەهەڵە ئەنجامدراون، بێشک دۆستێکی دێرین و دڵسۆزی دەوڵەتی تورکی وەک (پەدەکە) جگە لە قوتدانی ئەم پارووەی دەوڵەتی تورک شتێکی تری لێچاوەڕوان نەدەکرا. سوپای تورک چوبووە ناو خاکی باشوری کوردستانەوە، زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک لەسەر بانگەوازی (پەدەکە) بوبێت یان لەسەر ڕەزامەندییان نەبوو بێت، لەناو شارۆچکەی (زاخۆ)تەراتێنیان دەکرد.

وتەبێژی (پەدەکە) هۆشیار زێباری ناچارمابوو بڵێت (فڕۆکەکانی تورک سەرەڕای ئەوەی لە ناوچەکانمان گەریلاکانی پەکەکە ی لێنییە کەچی بۆردومانی گوندەکانمانیان کردووە) [٢٠٣].

لە بنەڕەتدا هۆکاری ئەم بۆردومانەی سوپای تورک ڕێککەوتنی نێوان (پەدەکە، یەنەکە و پەکەکە) بوو، نوێنەرانی ئەم پارتانە، لەو گوندەی لە (باتوفە) بۆردومانکرا بەنیازبوون کۆبونەوەی لێبکەن. فەرماندەکانی سوپای تورک لە ڕێی بێتەلەوە گوێیان لە قسەکانی فەرماندەکانی (کۆمیتەی دانوساندن) گرتبوو، بەمشێوەیە شوێنی کۆبونەوەکەیان بۆئاشکرا ببوو. دەوڵەتی تورک دەیانویست لەڕێی ئەم بۆردومانەوە هەڵویستی خۆیان لەبارەی ڕێککەوتنەکە نیشانبدەن، بەڵام لەم کارەیان پەلەیان کردبوو. پێش ئەوەی نوێنەرانی (پەکەکە) بگەنە شوێنی کۆبونەوەکە فرۆکەکانی تورک شوێنەکەیان بۆردومانکردبوو کە تەنها لایەنە دۆستەکانی خۆیانیان پێوەببوون. دەوڵەتی تورک لەم ڕێککەوتنە ئەوەندە بە قین بوون تەنانەت بە ناپاڵم لێیانیدابوو. ئەوکاتەی سوپای تورک فەرماندە و پێشمەرگەکانی (پەدەکە)یان دەکوشت لەهەمانکاتیشدا لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) و لە دەوروبەری (زاخۆ) زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک جریدبازییان دەکرد.

---

[٢٠٣] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( حورییەتی تورکی ) .

پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەلایەکی تریشەوە پاراستنی زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورکییان لە ئەستۆدا بوو، پێشمەرگەکان جارناجارێک پۆشاکی سەربازی تورکیان دەپۆشی و سەربازەکانیش پۆشاکی پێشمەرگەیان دەپۆشی، نازانرێت ئایا لەژێر ئەم تابلۆیە چی بنوسرێت؟، ئایا بنوسرێت جەهالەت یاخود....

شەڕ و ناکۆکییەکان و خیانەت هەمووو ئەمانە لە بارودۆخێکی زۆر تاڵدا دەهاتنە ئاراوە.

## تورکیا سووره لەسەر ئەوەی گەریلاکانی پەکەکە لەناوبەرێت

فرۆکە جەنگییەکانی تورک بەردەوام بوون لەسەر بۆردۆمانکردنی دیدار و چاوپێکەوتنەکانی هێزە کوردییەکان. نوێنەری (یەنەکە) لە ئەنقەرە (سەرچڵ قەزاز) لەمبارەیەوە دەیوت **(پێشنیاری تورکیا ئەوەبوو گەریلاکانی پەکەکە چەک دابنێن و سەنگەرەکانیان چۆڵبکەن بەڵام ئەم پێشنیارە رەتکراوەتەوە، لە شەوی ١ی تشرینی دووەم پەیامەکەی مام جەلالم رادەستی بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک کرد، بەڵام بەرپرسیارانی دەوڵەت پێیانوتین بەبێ چەندوچون دەبێت ئەو گەریلایانەی لە باکوری عێراقن تەسلیم بە دەوڵەت ببن و هەتا گەریلاکانی پەکەکە ش بەتەواوەتی خۆیان رادەست نەکەن ئۆپەراسیۆنەکانمان بەردەوام دەبن)** [٢٠٤].

ئەوکاتەی لە تورکیا (سلێمان دیمیرال) سەرۆک وەزیران بوو قسەکانی (سەرچڵ قەزاز)ی پشتراست دەکردەوە و هەروەها هەڕەشەی لە (پەکەکە) دەکرد و ئەوەشی دەوت **(داوا دەکەم چەکدارانی پەکەکە خۆیان رادەستی داد و یەکسانی و یاساکانی دەوڵەت بکەن)**، و بەپێچەوانەیشەوە ئەگەر گەریلاکانی (پەکەکە) خۆیان رادەستی تورک نەکردایە (سلێمان دیمیرال) دەیوت **(هەموویان لەناودەبەین)**.

(سلێمان دیمیرال) لەبارەی هەواڵی ئەوەی گوایە (جەلال تاڵەبانی) داوای لە وەڵاتانی رۆژئاوا کردووە داوا لە تورکیا بکەن بۆئەوەی ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانیان لەناو خاکەکەیان رابگرن دەیوت **(سوپاکەی ئێمە دژ بە جەلال تاڵەبانی و عێراق ئۆپەراسیۆنیان دەست پێنەکردووە، ئێمە لەو شوێنانە ئۆپەراسیۆن ئەنجام دەدەین کە کاری تیرۆریستانەی لێدێتە ئاراوە، ئایا کەس هەیە بتوانێت پێمان بڵێت ئەم ئۆپەراسیۆنانە مەکەن؟، ئایا وەڵاتلنی رۆژئاوا دەتوانن پێمان بڵێن ئەم ئۆپەراسیۆنانە مەکەن؟، ئایا بۆچی ئێمە ئەم ئۆپەراسیۆنانە نەکەین؟، ئەگەر نەیکەین ئەوا تیرۆریستەکان رۆژانە هێزی ئاسایش، سەرباز، پۆلیس، دادوەر و**

---

[٢٠٤] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( تورکگور گوندەم )

**حاكمەكانمان دەكوژن، باشە ئەگەر ئێمە ئەم ئۆپەراسیۆنانە نەكەین ئەی تیرۆریستان بەردەوام نابن لە كوشتنی خەڵكی بێتاوانی ئەو ناوچەیە؟، بێگومان بەردەوام دەبن، ئایا ئەمە رەوایە؟، دڵنیام هیچ كەس و هیچ لایەنێک ئەمە بە رەوا نابینێت).**

لە وەڵامی پرسیارێک كەلە (سلێمان دیمیرال) كرا (**ئایا نیازتان هەیە لە هەرێمەكە جێگیرببن؟**)، دەیوت (**لە ئێستادا شتێكی وانییە قسەی لەبارەوە بكرێت، تەنها ئامانجی ئێمە لە ئێستادا ئەوەیە هێزە تیرۆریستەكانی ئەوێ لەناوبەرین**)[٢٠٥] ، بەمشێوەیە رایەدارانی بالای دەوڵەتی تورک ئەوەیان رادەگەیاند داشی دامەكان بەگوێرەی خواستی خۆیان دەجولێنن، هەروەها (كەڵپە)ی خۆیشیان نیشانی (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) دەدا.

بۆردۆمانەكانی (باتوفە) لەگەڵ قسەكانی (سلێمان دیمیرال) یەكییان دەگرتەوە. وەڵاتانی رۆژئاواش بەهانای هاوارەكانی (مامە و كاكە)وە نەهاتن، ترسی (جەلال تاڵەبانی) ئەوەبوو ئەو ئۆپەراسیۆنەی سوپای تورک لەهەمبەر گەریلاكانی (پەكەكە) دەستیان پێكردووە لەحاڵەتی بەردەوام بوونیدا و لەدوای رێككەوتنێكی توركیا لەگەڵ وەڵاتانی رۆژئاوا ببێتە ئۆپەراسیۆنێكی وێرانكارانە و لەوانەیشە لە هەرێمەكە دایبكوتن، هەربۆیە (جەلال تالەبانی) لەبارەی كردارەكانی دەوڵەتی تورک هەڵوێستەی دەكرد.

(جەلال تاڵەبانی) لەبەر ترسی نییەت خراپی دەوڵەتی تورک نەیدەویست توردیان بكات. نوێنەرانی كۆنگرەی نەتەوەیی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی كەلە خۆی جوامێرانەتر رفتاریان دەكرد جارێكی تر پێشنیاری بێدەنگ بوونیانی بۆكردنەوە.

---

[٢٠٥] ٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی توركی ) .

## ژەنراڵ (ئەشرەف بیتلیس) هەڕەشە لە هاوپەیمانەکانیان دەکات

یەکێک لە قسەکانی ژەنراڵ (ئەشرەف بیتلیس) روو لە سەرکردەکانی باشور ئەمەبوو (**لەگەڵ ئێوەدا رێککەوتنێکمان کردبوو، پەکەکە لەناودەدرا، کەچی ئێوە لەگەڵ پەکەکە رێککەوتنتان کرد، بەمشێوەیە رێککەوتنەکەی نێوانمانتان تێکدا، ئەگەر پێویست بکات دەچینە سەر هێڵی ٣٦**).

ژەنراڵ (ئەشرەف بیتلیس) کە ئەندازیار و بەرپرسی گشتی جموجۆڵەکانی باشوری کوردستان بوو، ئەو قسانەی لەسەرەوە هاتوون بە نوێنەری (پەدەکە و یەنەکە) سەفین دزەیی و سەرچڵ قەزاز وتبوو کە بانگیانی کردبوو بۆ بارەگای گشتی خۆی، هەروەها دەیانوت لەم دیمانەیەدا (ئەشرەف بیتلیس) زۆر تورە بووە.

فەرماندەی گشتی هێزی پیادەیی جەندرمەی سوپای تورک (ئەشرەف بیتلیس) کە هەڕەشەی لە نوێنەرانی پارتە کوردییەکان دەکرد لە ئەنقەرە، پێی دەوتن (**بەسەر هەموو رێگرییەک دەپەڕینەوە و هەر رێگرییەش بێتە پێشمان لەناوی دەبەین**)، بەمشێوەیە (ئەشرەف بیتلیس) هەڵویستی خۆی نیشاندەدا کەبەچی چاوێکەوە لە رێککەوتنی نێوان (پەکەکە) و بەرەی کوردستانی دەڕوانێت [٢٠٦].

(ئەشرەف بیتلیس) زۆر شڵەژاوببوو لەبارەی ئەو ئۆپەراسیۆنە گشتییەی دەستیان پێکردبوو کە هیچ ئەنجامێکی دڵخۆشکەرەی بەدەستەوە نەدابوو. گەریلاکانی (پەکەکە) سەنگەرەکانی خۆیانیان چۆڵکردبوو، دەوڵەتی تورکیش دەیانویست لەسایەی هێرشی زریپۆش و دەبابەکانیانەوە هەموو سەنگەرەکانی (پەکەکە) تەفروتونا بکەن و زیانێکی کوشندە لە هێزەکانی گەریلا بدەن بەڵام بەهۆی کشانەوەی گەریلا لە سەنگەرەکانیان هەموو خەون و خەیاڵیان والا دەرچووبوو. ژەنراڵەکانی تورک بە گشتی ئەو گەریلایانەی کە نەیانتوانی بوو

---

[٢٠٦] ٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ گۆڤاری ( بەرەو ٢٠٠٠)

له مەیدانی شەڕەکاندا لەناویان بەرن ئێستا داوایان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکرد رادەستیان بکەنەوە. سوپای تورک بەگشتی لەم هێرش و ئۆپەراسیۆنانەیاندا بە ملیۆنەها دۆلاریان خەرج کردبوو، سەرەڕای ئەمەش ئەو ئەنجامەیان بەدەست نەخستبوو کە ئاواتەخوازی بوون و بەسەر ئەمەشەوە زیانێکی زۆری گیانیشیان لێکەتبوو، هەربۆیە دەیانویست ئەو گەریلایانەی لە ناوچەی (هەفتانین) ماون لەدەستی خۆیانیان نەدەن. تیڤییەکان و رۆژنامەکان لە بارەی شەڕەکانەوە دەیانوت سوپای تورک سەرکەوتنی بەدەست خستووە، هەربۆیە سوپای تورک دەیویست بۆ بەدەستهێنانی ئەو سەرکەوتنانەی دەزگا راگەیاندنەکان باسیان لێوەی دەکرد هەندێک سەرکەوتن بەدەست بخەن و لەماوەی مانگێکی شەڕوپێکدادانەکاندا سوپای تورک بە هەزارەها کۆماندۆ، تیمی تایبەت و جاشیان رەوانەی بەرەی شەڕەکان کردبوو. جگە لە هاوکاری پێشمەرگەکانی بەرەی کوردستانیش، سەرەڕای ئەوەی بە بۆردۆمانی فڕۆکە و کۆپتەر و تۆپی هاوان و تۆپی دوورهاوێژ هاوکاریشدەکران هەموو ئەمانە ئەو سەرکەوتنانەیان بەدەست نەخستبوو کە تیڤی و رۆژنامەکان باسیان لێوەی کردبوو. فەرماندەیەکی بالای ناو سوپای تورک هەڵویستی (ئەشرەف بیتلیس)ی بەمشێوەیە هەڵدەسەنگاند (ژەنراڵەکانی هێزی پیادەیی جەندرمە و هێزی ئاسایشمان دەیانەوێت سەرکەوتن بەدەست بخەن، لەڕاستیدا پێویستیشمان بەمە هەیە، هەتا ئەم سەرکەوتنانە بدەست نەخرێن نییەتی ئەوەمان نییە پاشەکشێ بکەین)[٢٠٧]. **بێشک ئەمە راستییەکی حاشاهەڵنەگر بوو!**

ئەم هەڵوێستانەی (ئەشرەف بیتلیس) کە نەدەگونجا لەگەڵ کاروباری دیبلوماسیدا، لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی تورکیا ئەم توڕەیی و نارەزاییانەی نەرم دەکرایەوە. کارمەندانی کاروباری دەرەوەی تورکیا کە دەوری (قەشەیان) دەبینی تیمارکەری برینەکانی کاروباری دەرەوە بوون، بە نەرمی روبەڕوی نوێنەرەکانی پارتەکانی باشور دەبونەوە و دەیانویست ئەو گرە خامۆش بکەنەوە کە ژەنراڵەکانیان گڕیان تێبەردابوو، هەروەها دەیانویست رێگری لە هاتنە ئاراوەی نارەزاییەکان بکەن. کارمەندانی وەزارەتی دەرەوە پەیامەکەی (سلێمان دیمیرال)یان گەیاندبوویانە نوێنەرانی کورد لە ئەنقەرە، دەوترا سوپای تورک لە عێراق نامێنێتەوە و رێککەوتنی هێزە کوردییەکان لەگەڵ پەکەکەدا وەکو (ئەشرەف بیتلیس) سلێمان

---

[٢٠٧] ١٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ نوسەر (ئێرتوغرول ئۆزکۆکک) رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

دیمیرال توڕه ناکات، (سلێمان دیمیرال) بۆئەوەی داخوازییەکانی سوپاکەیان بێتەجێ و لەگەڵ حکومەتی هەولێردا ڕێککەوتن بکەن بڕیاری دابوو دوای ماوەیەک کەسانی وەک (جەنگ دوعاتەپە) لەگەڵ وەفدێکی دیبلۆماتدا بە سەرۆکایەتی (تورکەکول یورتتەکین) و وەفدێکی (میت)یش ڕەوانەی باشوری کوردستان بکات [٢٠٨].

[٢٠٨] ١٢ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ نوسەر (ئێرتوغرول ئۆزکوکک ) ڕۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

## فەرماندەکانی گەریلا لە هەولێرن

دوو فەرماندەی (پەکەکە) کە ئەندامی کۆمیتەی رێککەوتن بوون لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان، بۆچاودێریکردنی بە پراکتیزە بوونی رێککەوتنەکەیان کە واژۆیان کردبوو لەگەڵ بەرەی کوردستانیدا لە ١ی مانگی تشرینی دووەم گەیشتنە هەولێر. ئەم دوو فەرماندەیە لە بارەگایەکی سەربازی (یەنەکە) چاویان کەوت بە رۆژنامەوانەکان و دەیانوت (**بەتایبەتی سەرکردایەتی یەنەکە حاڵی بوون شەڕکردن لەگەڵ پەکەکەدا هیچ قازانجێک بەدەستەوە نادات، پێشمەرگەکانی (پەدەکە)ش لە هەفتانین شانبەشانی سوپای تورک بەردەوام پەلامارمان دەدەن)**.

یەکێک لە فەرماندەکانی (پەکەکە) کە هاتبوو بۆ هەولێر سەردەمی شەڕوپێکدادانەکانی بەمشێوەیە دەهێنایە زمان (**هێرشەکانی پێشمەرگە بەگشتی کاریگەرییەکی ئەوتۆیان بۆسەر ئێمە نەبوو، لە ٣٠ مانگی تشرینی یەکەم لە هەفتانینەوە هاتم بۆ ئێرە، پێشتر لە خواکورک بووم، زریپۆشەکانی سوپای تورک لە هەفتانین دەیانویست بە هاوکاری پێشمەرگەکانی پەدەکە بێنە پێشەوە، لەیەکەم هەوڵدانیاندا شەڕوپێکدادانێکی سەخت هاتە ئاراوە و ژمارەیەکی زۆری پێشمەرگە ژیانیان لەدەستدا، گەریلاکانمان لەشێوازی گەڕۆک لەجولەدان و زیانیان بەرناکەوێت، ئەتوانم زۆر بە راشکاوانە بڵێم هێرشەکانی پێشمەرگە و هێرشەکانی سوپای تورکیش تەنها ئەو گەریلایانەمان لەئاستیاندا نارەحەت دەبن کە هێشتا خولی مەشقکردنیان تەواو نەکردووە. لەخواکورک لە شەوێکدا نزیکەی ٢٠٠ پێشمەرگە هێرشیان کرد بۆ سەنگەرەکانمان بەڵام گەریلاکانمان توانییان بەباشی بەرپەرچیان بدەنەوە. ئێستا لە دیدارەکاندا بەرەی کوردستانی دانبەوەدا دەهێنن زیانی گیانیان زۆربووە، سەرکردایەتی یەنەکە زوو درکیان بە گەمەکانی دەوڵەتی تورک کرد، سەرەڕای رێککەوتنیشمان واژۆ کردووە بەڵام تەدبیر لەدەستی خۆمان بەرنادەین، ئەگەر ئارەزوو بکەین دەتوانین لە خواکورک دەرنەچین، هێشتا ئەمە روون نەبووەتەوە، لەهەمانکاتدا ئەمە پەیوەستە بەو**

**ڕێککەوتنەی کە یەنەکە واژۆیان کردووە، هەواڵی ئەوە هەرگیز ڕاست نییە کە چەکمان دانابێت)** [٢٠٩].

فەرماندەیەکی گەریلا کە ناوی (سەرحەد) بوو، دەیوت **(سەربازەکانی تورک لە ناوچەی سەرحەدەوە نەهاتوونەتە ناو خواکورکەوە، لەسەرەتای ئۆپەراسیۆنەکانیاندا کۆماندۆکانیان دەیانویست بێنە ناوچەکەوە، لەئاکامی بۆسەکانی گەریلاکانمان لە ناوچەکانی زاگرۆس کشانەوە و لەو شەڕانەی لەوێدا هاتنە ئاراوە ژمارەیەکی زۆری سەربازیان لێکوژرا و ١١ تفەنگیان کەوتنە بەردەستی گەریلاکانمان و تەقەمەنییەکی زۆریشیان گیرا)**، بەگویرەی قسەکانی (سەرحەد) لە شەڕەکانی خواکورک زیانی گیانی خۆیان بە گشتی ئەگەیشتە (٣٠) گەریلا، بەرامبەر بەمەش بەلای کەمەوە (٤٥٠) پێشمەرگە کوژراوە و (١٠٠٠) یش بریندار بووە.

لەبارەی ڕێککەوتنەکەی نێوان (پەکەکە و بەرەی کوردستانی)شەوە دەیوت **(بەگوێرەی ڕێککەوتنەکەی نێوانمان بێت دەبێت پێشمەرگە کۆتایی بە هێرشەکانیان بهێنن، بەڵام لە هەفتانین هەندێک پێشمەرگە لەگەڵ سوپای تورک هێرش بۆسەر گەریلاکانمان دەهێنن، ئێمە پێمانوایە ئەوانەی ڕێککەوتنیان لەگەڵ ئێمەدا کردووە ناتوانن قسەی خۆیان بەسەر پێشمەرگەکانیاندا زاڵ بکەن)** [٢١٠].

لەدوای ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە) لەگەڵ (بەرەی کوردستانی) گەریلاکانیان وایان پێباش بوو لە (خواکورک) بگوازنەوە بۆ (زەڵێ)ی سەر سنوری ئێران.

---

[٢٠٩] ٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[٢١٠] ٦ی هەمان سەرچاوە .

## ئەمەریکا رازییە سوپای تورک ئۆپەراسیۆن بکات بەڵام تەنها لە ئاستی پەککە دا

ئەو قسانەی دەکرا لەبارەی ئەمەریکاوە گوایە لەئاستی ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک روو لە باکوری عێراق نیگەرانە، لەبارەیەوە وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا (فەرهاد ئەتەمان) روونکردنەوەیەکی کرد و دەیوت (**ئەمەریکا دژ بە ئۆپەراسیۆنەکانی ئێمە نین**)، هەروەها دەیوت ئەو لیژنەیەی کەلە وەلاتانی تر پێکهێنراون بۆ کاروباری عێراق ئێمە لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکانمان زانیاریمان داوە بە بالیۆزەکانیان و (فەرهار ئەتەمان) دەیوت (**ئاگاداری زۆربەی وەلاتانمان کردووەتەوە ئۆپەراسیۆنەکانمان تەنها بە ئامانجی لەناودانی ئەو تیرۆریستانەیە کەلە باکوری عێراقەوە دزە دەکەنە وەلاتەکەمان و کاری تیرۆرسیتی ئەنجام دەدەن، هەرکاتێک ئۆپەراسیۆنەکانمان گەیشتنە ئامانجی خۆیان وەکو بەرپرسیارانی بالای سوپاکەمان هێناویانەتە زمان دەکشێینەوە. بێشک ئەمەریکا دژ بە کاروباری تیرۆرسیتییە و هەمیشە پاڵپشتی تورکیا بووە، ئەمەریکا دژ بەو ئۆپەراسیۆنانەمان راناوەستن کە دژ بە تیرۆریستان لە باکوری عێراق دەستمان پێکردووە، ئۆپەراسیۆنەکان زۆر بەخێرایی دەبرێن بەرێوە، چیکاتێک گەیشتە ئامانجی خۆی کۆتایی پێدەهێنرێت و هیچ کێشەیەکیش لەئارادا نامێنێت**).

لەراستیدا وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا (فەرهاد ئەتەمان) نارەحەتییەکانی ئەمەریکای پشتراست دەکردەوە، هەربۆیە دەوڵەتی تورک ناچارمابوون لەبارەی ئۆپەراسیۆنەکانیانەوە ئەمەریکا و وەلاتانی تر ئاگەدار بکەنەوە و پێیان بڵێن کە بەردەوامە

و تا ماوەیەکی تریش دەخایەنێت. قسەکانی (فەرهاد ئەتەمان) ئەوەی دەسەلماند لەنێوان ئەمەریکا و ئەواندا لەسەر ئۆپەراسیۆنەکانی دژ بە (پەکەکە) ڕێککەوتون.

سەبارەت بە قسەکانی وتەبێژی دەرەوەی حکومەتی تورکیا، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا روونکردنەوەی کرد و دەیوت (**ئێمە پشتگیری ئۆپەراسیۆنەکانی دەوڵەتی تورک دەکەین کە دژی پەکەکە لە باکوری عێراق ئەنجامیانداوە**) هەروەها وتەبێژ ئەوەشی لەبیر نەدەکرد سەبارەت بە مافی مرۆڤ و ئازادی کلتوری هاولاتیان لە تورکیا حکومەتی ئەنقەرە هۆشیار بکاتەوە، لەڕاستیدا ئەم هۆشیارکردنەوەیە پێویستیش نەبوو بەلام بۆخۆشیش بێت هێنابوویە زمان.

## گروپێکی وون بوو لە (زاپ)

٣کیلۆمەتر لەولای سنورەوە لە ناوچەکانی (تەپەی مەلیل، شیوێ، باشێ، چیایرەش و کانیە پینک) گەریلاکانی (پەکەکە) سەنگەریان گرتبوو، بێ وەستانیش بۆردۆمانەکانی سوپای تورک بەردەوام بوون. یەکینەکانی سوپای تورک نەدەچوونە پێشەوە، جەندرمەی سوپای تورک لە خاڵی سفر یاخود ١کیلۆمەتر لەولای سنورەوە سەنگەریان گرتبوو. لەکاتی بۆردۆمانی ئاسمانی سوپای تورکدا هەندێکجار سەنگەرەکانی سەربازی سەر سنورەکان زیانیان بەردەکەوت، لەکاتی بۆردۆمانەکاندا دوو جاش پەردەی گوێیان دڕابوو، هەردوکیشیان گواستەوە بۆ گوندی (ئشکلی). شەڕوپێکدادان لە (زاپ) بەردەوام بوو، ئەمەش لە سەردەمانێک بوو کە ناوچەکانی (هەفتانین و خواکورک) بێدەنگی باڵی بەسەریاندا کێشابوو.
لە ٣ی تشرینی دووەم گروپێکی (١٢٠) کەسی سەربازی تورک کەلە ناوچەکەدا بڵاوەیان کردبوو کەوتنە بۆسەی گەریلاکانەوە، لەئاکامی ئەم بۆسەیەدا لە نێوان گەریلاکان و جەندرمەکاندا شەڕوپێکدادان هاتەئاراوە. ئەم گروپە (١٢٠) کەسییەی سەربازی تورک کە ئەفسەرێکی باڵاشیان لەگەڵدا بوو هەرهەموویان وون بوون. دوای چەندین رۆژیش لەبارەیانەوە هیچ هەواڵێک بەدەست نەکەوت، ئەو جاشانەی لەناوچەی ئۆپەراسیۆنەکاندا گەڕابونەوە دەیانوت ئەو سەربازانە کوژراون یاخود بەدیلی گیراون [٢١١].
جاشێک کە بەشداری لە ئۆپەراسیۆنی (زاپ) کردبوو لە ٥ی تشرینی دووەم دەیوت (**لەو بۆسەیەی گەریلاکانی پەکەکە نابویانەوە بۆ ئێمە ٩ جاشی گوندەکانی ئۆزوندەرە و ئۆزوملو و ژمارەیەکی زۆری سەربازیشی تێدا کوژرا**)، ئەم جاشە وون بوونی ئەو گرووپە سەربازانەی (زاپ)ی بەمشێوەیە دەهێنایە زمان (**ڕۆژی ١٩٩٢/١١/٣ بوو، ئامادەباشی دەکرا**

---

[٢١١] ٥ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم )

**بۆئەوەی لە شێوێ هێرش بۆسەر سەنگەرکانی گەریلا بهێنرێت. کەشوهەوا زۆر ساردبوو، کەس نەیدەتوانی بەسەر چیایەکی ۳۰۰ مەتریدا هەڵگژێت. لەوکاتەدا ئێمە لە گوندی نەفێ بووین. ئەفسەرێک فەرمانداریێتی دەکردین، ئەفسەرەکە درکی بە دڵەڕاوکێی سەربازەکان کردبوو، پێیوتین کێ جوامێرە و لەگەڵ مندا دێت با جیابێتەوە، لەسەر ئەم قسەیە نزیکەی ۱۰۰ کەسێک جیابوینەوە کە جاشیشی تێدابوو. بەیانی زوو کەوتنە رێ، ئێمە ئەرکی پاراستنی ناوچەکەمان پێراسپێردرا. دوای ئەوەی دوو کاتژمێرێک ڕێمانکرد پشوماندا. دوای ماوەیەک گەریلاکانی پەکەکە هێرشیانکرد، من و چەند جاشێک و چەند سەربازێک هەڵاتین و پاشەکشێمان کرد. ئەو گرووپەی جیابونەوە هەتا دوو رۆژیش لەبارەیانەوە هیچ هەواڵێکمان نەزانی، دوایش گەڕامەوە بۆ تورکیا. دوای من ئەو برادەرانەی گەڕانەوە دەیان وت لەناو گروپەکەدا تەرمی ۲۰ سەرباز و جاش دۆزراونەتەوە، هەروەها سەبارەت بەوانی تر هیچ زانیارییەکیان بەدەست نەکەوتووە)** [۲۱۲].

بەگوێرەی سەرچاوەکانی سوپای تورک لەو شەروپێکدادانەی لە ناوچەکانی (زاپ) هاتبوونە ئاراوە، هەتا رۆژی ٤ی تشرینی دووەم گوایە گردەکانی ژمارە (١٩٤٤ و ٢٠٤٩) یان گرتووە و بۆئەوەی تیرۆریستان بنبڕ بکرێن ئۆپەراسیۆنەکانیان بەردەوامە [۲۱۳].

ئەم ئۆپەراسیۆنەی سوپای تورک بەهۆی سەرماوسۆڵەوە هەرچەند رۆژێکی خایاند.

---

[۲۱۲] ۹ی هەمان سەرچاوە

[۲۱۳] ٥ی تشرینی دووەم ۱۹۹۲ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی ) .

## كشانەوەی گەریلا و پێشمەرگە لە بەرەکاندا

دوای ئەوەی لە نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێمی کوردستان) ئاگربەست و ڕێککەوتن هاتەئاراوە، لە یەکەم ڕۆژانی مانگی تشرینی دووەم بەشێکی زۆری هێزەکانی پێشمەرگە و گەریلا لە سەنگەرەکانی خۆیان لە (خواکورک) کشانەوە.

بەگوێرەی ڕێککەوتنەکەی نێوانیان وەک سەرەتا گروپێکی گەریلا کەلە (١٥) کەس پێکهاتبوو لە (خواکورک) هەروەها گروپێکی تر کە پێکهاتبوون لە (٣٥٠) گەریلا لە (هەفتانین)ەوە چوون بۆ (زەلێ)ی سنوری ئێران و دوای ماوەیەک لەوێ جێگیربوون.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم ڕێککەوتنە ببووە مایەی دڵخۆشی هەموو کەس و لایەک، گروپێک کە (٣٥٠) گەریلابوون بە ماشێن چوونە ناو شاری هەولێرەوە، لەلایەن پێشمەرگەکانی (یەنەکە)وە زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێکرا. گەریلاکان ئەو شەوە لە هەولێر مانەوە و بۆسبەیش بەرەو (زەلێ)بەڕێکەوتن، بەڵام لەماوەی ئاگربەستدا ئەو گەریلایانەی پێشوتر لە سەنگەردا بوون و ئێستاش لەشێوەی گروپی بچوک کشابونەوە بۆ هەولێر بەتایبەتی لەگەڵ پێشمەرگەکانی (پەدەکە)دا ناحاڵی بوون و نا پابەندی بوونێک لە نێوانیاندا سەریهەڵدابوو. ئەو گەریلایانەی چوبونە ناو شارەکانەوە و ئەوکاتەی بەرەو (زەلێ) بەڕێکەوتن بەردەوام سلۆگانیان دەوتەوە، لەهەمبەر ئەم سلۆگان ووتنەوەیەدا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) نارەزاییان نیشاندەدا. لەهەندێک شوێندا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) داوایان لە گەریلاکان دەکرد چەکەکانیان دابنێن، گەریلاکانی (پەکەکە) ئەم داخوازییەیان ڕەتدەکردەوە و بەشێوەیەک بەرامبەر بەیەک دەبونەوە کە لەوانەبوو جارێکی تر لە نێوانیان شەڕ سەرهەڵبداتەوە.

لەلایەکی تریشەوە پێشڕەوییەکانی سوپای تورک لە (هەفتانین) بەردەوام بوو، سەرەڕای ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە) و (بەرەی کوردستانی) بەڵام پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بەردەوام

پێشڕەویان بۆ سوپای تورک دەکرد. پێشمەرگەکان دەگەڕان بەشوێن حەشارگا و عەمارەکانی گەریلا، لەهەمانکاتیشدا سوپای تورک لە (زاخۆ)وە بەردەوام بوون لە هێنانی زرێپۆش و دەبابە و لۆری بارهەڵگر بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانیان. سەرەڕای ڕێککەوتنی نێوانیان بەڵام لەبەر ئەوەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە هەندێک شوێنی (هەفتانین) بەردەوام بوون لە پێشڕەوی بۆ سوپای تورک لە نێوان گەریلا و پێشمەرگە و سوپای تورک شەڕ دەهاتە ئاراوە. لەدوا ڕۆژانی دوایدا (پەکەکە) شانسێکیدا بە (پەدەکە) کە وەک دواجار پێشمەرگەکانیان لەناو سوپای تورک بکشێننەوە. لە (هەفتانین) کۆمەڵە کارێک دەکرا کە لەگەڵ ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکە نەدەگونجا، فەرماندە باڵاکانی (پەدەکە) وەک (فازڵ موطنی و فەتاح عوسمان) بۆ هێرشکردنە سەر گەریلاکان هاوکاری سوپای تورکیان دەکرد. کۆمیتەی دانوساندن و ئاگربەست بۆئەوەی شەڕوپێکدادان جارێکی تر سەرهەڵنەداتەوە موداخەلەیەکی باشی ڕەوشەکەیان کرد. (فازڵ موطنی) و پیاوەکانی هەوڵی ئەوەیاندەدا ئەو ڕەوشە تێک بدەن کە بەهۆی ئاگربەستەوە هاتبووە ئاراوە، تەنانەت بۆ دامرکاندنەوەی ئەم ڕەوشە و موداخەلەکردنی ڕاستەوخۆ ئەندامی سەرکردایەتی (پەنەکە) (کۆسرەت ڕەسول) چوو بۆ (زاخۆ). کۆسرەت دەیویست لە ڕاستی ئەم کارانە تێبگات و ڕێگاچارە بۆ کێشەکان بدۆزێتەوە. (فازڵ موطنی) دەیویست هەموو گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەرێمی (بادینان) دەربکات، بەڵام (پەکەکە) پێشنیاری کشانەوەی سەرتاسەری ڕەتدەکردەوە. بەچونی (فازڵ موطنی) بۆ سەنگەرەکانی هەفتانین کەلە شوێنی گەریلاکانەوە نزیک بوو، فازڵ موطنی هێنابوویە زمان ١ ڕۆژیان داوە بە (پەکەکە) تاکو ناوچەکان چۆڵبکەن، هەروەها وتبووی ئەگەر پابەندی ئەم بڕیارەی ئێمە نەبن هێرشیان بۆ دەکەین. لەسەر ئەم قسانەی (فازڵ موطنی) گەریلاکانی پەکەکە وتبویان (ئەگەر زۆر مەبەستانە هەر ئێستا هێرش بکەن) [٢١٤].

---

[٢١٤] ١١ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی (ئوزگور گوندەم ) .

## (شەڕ زۆر بە قوڵیی کاریگەری دەکاتە سەر مێژوومان)

سەرۆکی گشتی پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) (عەبدوڵلە ئوجالان) سەبارەت بە بەڕێوەچوونی شەڕ و ئاشتی لەیەککاتدا، لە رۆژی ٤ی مانگی تشرینی دووەم سەبارەت بە رێککەوتن لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان و رەوشی ناوچەی (زاپ) لە دیمانەیەکدا بۆچونەکانی خۆی هێنایە زمان کە بەمشێوەیە بوو:

**پرسیار: (شەڕی نێوان ئێوە و بەرەی کوردستانی کۆتایی پێهات، ئایا ئەم رەوشە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟).**

**وەڵام** :(ئەوکاتەی کەوتنە ناو تەنگەتاوییەوە بانگی سوپای تورکیان کرد، فڕۆکەکانی سوپای تورک فریادڕەس نەبوون. کۆماندۆکان تەواوکەر نەبوون، دواجاریش زرێپۆش و دەبابەیان هێنا. ئێستاش بەم هێزە سەربازییەوە بەردەوامی بە هێرشەکانیان دەدەن، بەگوێرەی ئەو هەواڵەی تازەبەتازە بە دەستمان گەیشتووە، پێشمەرگەکان پێشڕەوی بۆ زرێپۆش و دەبابەکانی تورک دەکەن. ئەو هەڤاڵانەی دەستیان لە هێزەکان وەشاندووە و کەوتونەتە ناو شەڕەوە هەموو ئەمانەیان بەچاوی خۆیان بینیوە. هەموو بانگەشەکانی راگەیاندنەکانی تورک مایەپوچن، ئەوان دەیانەوێت مەسەلەکان گەورە بکەنەوە و هیچی تر. وەکو باسی لێوەی دەکەن هێزەکانیان ئەوەندە کاریگەر نییە، ئەوان لەسایەی زرێپۆش و دەبابەکانیانەوە دەتوانن کەمێک پێشڕەوی بکەن. هێزەکانمان بەگوێرەی ئەو رەوشە نوییەی دێتەئاراوە جێگیردەبنەوە، جارێکی تر دەیهێنمەوە زمان، قسەکانی وەک ئەوەی گوایە دەڵێن پشتی (پەکەکە)مان شکاند و لەناویانماندا هەموو ئەمانە پێکدێن لە درۆی شاخدار. زیانی ئەوان قاتبەقات لەچاو ئەوانەی ئێمە زیاترە، مەسەلەی هێرشێکی نوێ لەئارادایە. شەڕەکانی بەرەی (زاپ) یش هێشتا بەردەوامە، ئەوێ بووە بە بەرەی سێیەمی شەڕ، لەم بەرەیەشدا دوژمن زیانێکی زۆریان

لێکەوتووە. سەرەرای ئەوەی پێشمەرگەکان لەژێر سێبەری زرێپۆش و دەبابەکانیش بوونە، بەڵام هێشتا نەیانتوانیوە ئامانجی خۆیان بپێکن).

**پرسیار: (ئایا لەناو بەرەی کوردستانیدا گۆڕانکارییەکی چۆن دەبینن؟).**

**وەلام** :(ئێستا ئەوان بوونە بە شەریکە بەشی ئەو گەلەکۆمەیەی کە تورکیا پیلانی بۆ دارشتووە، وەکو دەڵێن گوایە دوا هێرشەکان لەلایەن فلان فەرماندەی پەدەکە وە براوەبەڕێوە نەخێر وانییە، بەپێچەوانەوە شەڕەکان سیخوڕەکانی دەوڵەتی تورک دەیبەن بەڕێوە. نمونەی ئەو شێوە ناوانە گەلێک زۆرن. ئەو کەسانە تەنانەت سەر بە پەدەکەش نین، ئەوانە ئەو سیخوڕانەن کە دەوڵەتی تورک راستەوخۆ لەناو ئەواندا جێگیریان کردوون. بێشک مەسعود بارزانی رووح و ئیرادەی خۆی بەشێوەیەکی پتەو بە تورکیاوە گرێداوە، هەربۆیە ئەگەر دەستبەرداری شەڕیش ببن ناتوانن لەژێر فەرمانی تورکیا دەربچن. ئەوان بە هەموو توانا و بونێکی خۆیانەوە خۆیان بە تورکیاوە چەسپاندووە، هێزێکی تایبەت و دیاریکراوی خۆیان نییە تاکو پشتی پێببەستن، هەربۆیە لەهەمبەر زرێپۆشەکانی سوپای تورک وەکو سەربازی بەکرێگیراویان لێهاتووە. سوپای تورکیش بە شاخ و کەژوکێودا لەپێش خۆیان دەیانگێڕن، هێزەکانی جەلال تاڵەبانیش لە پاشەکشێدایە. ئەوان نییەتی زۆری شەڕکردنیان نییە هەروەها لەو حاڵەتەشدا نین شەڕ بکەن. ماوەیەک لەمەوبەر بە دەزگا راگەیاندنەکانیان وت چاوپێککەوتن هاتووەتە ئاراوە، هەڤالانمان لە بەرەی خواکورک لەسەر تێڕوانینی خۆیان وەلامی داواکارییەکانی بەرامبەریان داوەتەوە. هەواڵی ئەوە هەیە لەو بەرەیەدا نزیکەی (١٠٠٠) کەسێکیان لە دەستدابێت، فەرماندەکانی ئەوێمان پێیان دەڵێن درێژە پێدانی ئەم شەڕە لە بەرژەوەندی کەس نییە، پێیان دەڵێن هێرشمان بۆمەهێنن، پێیان دەڵێن ئێمەش لایەنگری ئەوەنین زیانی گیانیتان لێبکەوێت. سەرەرای هەموو شتێک ئەم شەڕوپێکدادانانە گەلەکۆمەیەکی تۆکمەی دوژمنە، هەڤالانی ئەوێمان پێیان دەڵێن ئەگەر کەمێک رووحی وەلاتپارێزی لە رووحتاندا هەیە کۆتایی بەم شەڕە بهێنن و لێرە بڕۆن، نامانەوێت هەتا هەتایە شەڕتان لەگەڵ بکەین. لەناو ئەوانیشدا هەندێک فەرماندە هەن هەموو ئەم قسانە بە گونجاو دەبینن، بەڵێ لە دەرەنجامدا ئەو چاوپێکەوتنانە هاتنەئاراوە).

**پرسیار : (ئایا لە چاوپێکەوتنەکاندا باسی چیدەکرێت؟، لەمبارەیەوە کێ پێشنیاری چیدەکات؟).**

**وەڵام :** (شتێکی ئەوتۆ لەئارادا نییە، هەوڵدان هەیە گەلەکۆمەکانی دەوڵەتی تورک پوچەڵ بکرێتەوە. بەشێوەیەکی قین لەدڵانە ئەوان بەشدارن لەناو ئەو گەلەکۆمەیەدا. بەرخودانی ئێمە لەهەمبەر ئەم گەلەکۆمەیە لەناو گەلی کوردستاندا بووە مایەی بەختەوەری و بە دڵخۆشییەوە پێشوازی لێکراوە. سەرەتا پێشمەرگەکانی مەسعود بارزانی روبەڕوی شکست بوونەوە، ئەگەر سوپای تورک نەهاتایە و موداخەلەیان نەکردبایە ئەوە هەر لە زووەوە بەرەکانیان چۆڵدەکرد و هەڵدەهاتن، لەوانەش بوو کۆتاییان پێبهاتایە، بەمشێوەیە کۆمەڵێک کەسی کۆنەپەرست و دواکەوتوو لە گۆرەپانەکەدا بونیان نەدەما. لەمەدا خەڵکی هەست بە خۆشبەختی دەکەن، بەمشێوەیە زیاندان لەم هێزی خیانەتکار و نەخوازیارە خۆیلەخۆیدا سەرکەوتنە. ئەو میکانیزم و تەکنیکانەی لە شەڕی دژ بە سەدام لە کەنداودا سەرکەوتنیان پێهێنا ئێستا لەهەمبەر ئێمە هەمان شت دووبارە دەکەنەوە. سوپاسالاری تورک دۆغان گورێش خۆی دەڵێت لە شەڕەکاندا بۆمبی فسفۆریان بەکارهێناوە، رۆژانە بەتەن بۆمبمان بەسەردا دەبارێنن. لەهەر بستێکی ئەم خاکەدا بۆمبێک دەتەقێننەوە، ئەگەر لەبەرەکانی شەڕدا تەنها گەریلایەکیشمان بمێنێتەوە ئەمە بە مانای دۆڕاندنمان نایەت. ئەوان هێزەکانی ناتۆ و وەڵاتە زلهێزەکان دەخەنە پشتی خۆیان و درێژە بە تەمەنی هێرشەکانی خۆیان دەدەن، بێشک ئەوانەی بەشداری ئەم گەلەکۆمەیەن دەیانکەنە پشتگیری خۆیان و کارەکانی خۆیان لەسایەیاندا ئەنجام دەدەن، هەڵبەت پێویستە بوترێت کەسانی دڵسۆز و پاکیش هەن لەناویاندا. لەناو بەرەی کوردستانیدا کەسانی پاک و وەڵات پارێز هەن، پێویستیشە ئەم راستییە بهێنرێتە زمان، بەڵی بۆ ئەوەی ئەو پاکانە لەناو ئەو پۆخڵەواتانەدا جیابکرێنەوە چاوپێکەوتن و شێوازی دیدار پێش خران کە ئەمەش کارێکی رەوایە. لەچوارچێوەی هێڵی رەوان هەموو کاتێک ویستومانە پەیوەندییەکان نوژەن بکرێنەوە و یەکگرتن و پەیوەندییە دیموکراتییەکان یاخود بە بۆچونێکی تر لەچوارچێوەی سیاسیدا خوازیاربووینە هەنگاو بنێین. قسەلۆکەی ئەوە دەکەن گوایە پەکەکە چەک دادەنێت ئەمانە دوورن لە راستییەوە، پێمان وایە ئەو بەرخودانە قارەمانانەی ئەنجامانداون دڵنیاین کە لەسایەیدا خەڵکی باشور بەرەو رێیەکی رەوان و راست دەبەین، بەمشێوەیە هاوپەیمانەکانی دەوڵەتی تورک پەراوێز دەخرێن. ئێمە هەموو ئەوانە دەست نیشان و دیاریان دەکەین و وەک هێلکەی کوڵاو دەیانخەینە سەر مێز،

ئەمەش ئەو ڕێچکەیەیە کە هەر لە سەرەتاوە سیاسەتی بناغەیی بزووتنەوەکەمان بووە. بەکورتییەکەی لەسەر هێڵی ڕاستەقینە و بونیادنەردا شەڕێکی ١ مانگیمان بردەسەر کە زۆر واتادار و گرنگ بوو. ئەم شەڕەی یەک مانگییەمان زۆر لە قولاییەوە کاریگەری دەخاتە سەر مێژوومان، لەوەدەچێت لێرە بەدواوە ئەم شەڕەش زیاتر پەرەبستێنێت، پێموایە ئەم شەڕە لە ناخەوە بەشێوەیەکی تەندروست بواری پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی نێوان باشور و باکور پێشبخات. ئەوانەی لایەنگر و پشتیوانی ئەم شەڕەن لەوانەیە هەندێک توانای تر بەدەست بخەن و لەگەڵ بەسەر چوونی ئەم ڕەوشەدا زیاتر هەل دەرەخسێت کە هاوکارانی دوژمن دیارییبکرێن و تەسفییەش بکرێن. لەهەموو شەڕو ناهەمواریییەکدا هاتنەئاراوەی زیان شتێکی سرووشتییە، بەڵام ئێمە شەڕێکی سەردەمیانەی پڕ ماناداریمان بردەسەر کە قازانجەکانمان لە زیان زۆر زیاترە).

**پرسیار: (دوای هاتنە ژوورەوەی سوپای تورک بۆ باشوری کوردستان، گفتوگۆی ئەوەی لێهاتە ئاراوە، ئایا دەوڵەتی تورک دەکشێتەوە یاخود نا، ئایا ئێوە ئەمە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟).**

**وەلام** :(سەبارەت بە ئێمە بەلامانەوە هیچ گرنگ نییە، دەمێننەوە یاخود نامێننەوە، ئێمە کارقایمی خۆمان بەگوێرەی ئەوە دەکەین، مانەوەیان پەیوەندی بە ئامانجەکانیانەوە هەیە. ئەگەر مەرجەکانی نێو دەوڵەتی لە هەرێمەکە هەلیان بۆ بڕەخسێنیت ئەمێننەوە، ئەگەر نەشمیننەوە پیاوەکانی خۆیان لەوێ جێگیردەکەن. بۆنمونە هاریکارییەکی زۆری پارتە تورکمانییەکان دەکەن، کەواتە دەتوانین بڵێین وێرانکارییەکی جدی لەئارادایە. هەدەفی سەرەکی ئەوان ئەوەیە ئەگەر دەسەلاتێکی سیاسی پاکژ و کوردپەروەر یاخود سیاسەتێکی ڕاستەقینە بێتە ئاراوە ئەوان دەیانەوێت تەسفییەی بکەن. ئەو شتە گرنگانەی هێنایانمە زمان ئەگەر پەرەی پێنەدرێت و خواستەکانیان نەیەنەدی هەموو ڕێگایەکی تر تاقیدەکەنەوە. هەروەکو دەزانن لە ڕۆژی ١٥ی تشرینی یەکەم ٣ بۆ ٤ وەزیرێکی دەرەوەی وەلاتانی تریان بانگهێش کرد بۆ تورکیا تاکو پشتیوانی ئەو مەبەستانە بکەن کە خوازیارین. دەیانەوێت هەردەسەلاتێکی کوردپەروەر و ڕاستەقینە دێتە ئاراوە لەناویبەرن، هەوڵی پەیوەندیکردنی بەرەی کوردستانی لەگەڵ ئێمەدا هەربۆ هەمان مەبەستە. ئەم ڕەوشەی ئێستا هاتووەتە ئاراوە تورکیا لێنارەحەتە، لەڕاستیدا نەک لەبەرئەوەی ئێمە زۆرمان بۆهێناون، بەڵکو لەبەر ئەوەی تورکیا زۆری بۆهێناون دەیانەوێت پەرە بە چاوپێکەوتنەکان بدرێت. بێشک ئێمەش

زۆر به توندی لەهەمبەر سیاسەتی تەسفییەی تورکیا رادەوەستینەوە، تورکیا دەیەوێت سوپاکەیان له هەرێمەکە بمینێتەوە، دەیانەوێت دەست بخەنە بیناقاقای ئیرادەی سیاسی گەل و هێرشیان بۆبهێنن، دەیانەوێت ئەوانەی دیموکراتخوازن بیانخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، هەموو ئەمانەش ئەوە نیشاندەدەن کە بەنیازن لە هەرێمەکە بمێننەوە. بەڵی ئەگەر کەشوهەوای نێو دەوڵەتی زۆریان لێبکات و ئێمەش ناچاریان بکەین و بەگیریان بخەین ئەوا ناچاردەبن پاشەکشێ بکەن) [٢١٥].

[٢١٥] ٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ کورتە نوچەی ( گۆڤاری ( ئانکا ) .

## سوپای تورک لێتر وێرانکارەا

ئەو ڕۆژانەی جموجۆڵی زرێپۆش و دەبابەکانی سوپای تورک بەردەوام بوون، لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) بە هۆی هاتنی لۆری بارهەڵگری تورکیا کە هەموو جۆرە پێداویستییەکی سەربازیان بۆ سوپاکەیان بەرەو باشور دەگواستەوە هەموو ڕێگاوبان و خاڵە پشکنینەکانی ڕێی زاخۆیان داخست. لە ٥ی تشرینی دووەم (٨) لۆری کە ڕەقەمیان ژمارە (٣٢) بوون خۆیانکرد بە باشوری کوردستاندا. کاتژمێر ٦ی بەیانی تاکو ٩ لە دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل)ەوە ئەو لۆریانە دەچوون بۆ (زاخۆ) لەوێشەوە دەیانویست بچن بۆ ناوچەکانی (شەرانیش و بێرسیڤ)، هەندێک لۆریش هەبوون عامودی کارەبا و شتومەکی کارەباییان بارکردبوو. ئەم شتومەکە کارەباییانە بۆ ئەو بارەگایانە بەکار دەهێنران کە لە باشوری کوردستان بۆ سوپای تورک دروست دەکرا [٢١٦].

دەوڵەتی تورک بەو لۆرییە بارهەڵگرانە دەیانسەلماند بەنیازی مانەوەن لە باشوری کوردستان، لەهەمانکاتدا ترس و نیگەرانی و ناڕەزاییەکانی خەڵکی باشور درکیان پێدەکرا. ئەو ڕۆژەی عامود و شتومەکی کارەبایی بە لۆری دەگوازرانەوە بۆ باشور و ئەو جەندرمانەی هاتبوونە ناو (زاخۆ)وە لەلایەن دوکاندار و خەڵکی ناو بازاڕەوە پرۆتێستۆ کران. جەندرمەکان دەیانویست لەناو بازاڕی (زاخۆ) شت بکڕن بەڵام دوکاندارەکان پێیانیان نەدەفرۆشتن، کەچی لە یەکەم ڕۆژانی دەستپێکردنی شەڕی باشوردا لایەنگرانی (پەدەکە) لە (زاخۆ) چەپڵەیان بۆ ئەو جەندرمانە لێدابوو، بەڵام ئێستا جەندرمەی تورکیان وەک داگیرکەر دەهاتە بەرچاو و لە دژیاندا ناڕەزاییان نیشاندەدا. ئەم ناڕەزاییانە پێشمەرگەیشی گرتبووەوە، لە شەڕەکانی (هەفتانین) پێشمەرگە ڕابەرایەتییان بۆ سوپای تورک دەکرد، سەرەڕای ناڕەزای نیشاندانی فەرماندەکانیشیان کەچی ئێستا پێشمەرگەکان ئامادە نەبوون ڕابەرایەتی

---

[٢١٦] ٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) .

بۆ سوپای تورک بکەن. هەندێک فەرماندەی پێشمەرگە هەبوون وەک رژێمی سەدام لەبارەی هێرشەکانی سوپای تورکەوە گومانیان هەبوو، تەنانەت رژێمی سەدام لە سەرکردەکانی کورد زیاتر لەئاستی هێرشەکانی سوپای تورک گوماناویتر بوون و تەنانەت زووتر هاتنە دەست و لە ترسی هێرشی داگیرکەرانەی دەوڵەتی تورک (سەدام حوسێن) لە ٢ی تشرینی دووەم فەرمانی بە سوپاکەی کرد چواردەوری شاری (موسڵ) بگرن. رژێمی سەدام دەیانوت لەهەمبەر تورکیا و هێرشی سوپاکەیان بە گوماناوین و ئەگەر پێویست بکات هەرچەندە ئەمەریکاش رازی نەبێت روبەڕویان دەبنەوە.

سەربازی عێراقی لە ناوچەی (فائیدە)ی نێوان (موسڵ و دهۆک) لە سەنگەردابوون و کەوتبوونە حاڵەتی ئینزارەوە. (سەدام حوسێن) لەسەر ئەم هەڵوێستەی خۆی وەک ئەوەوابوو بە سەرکردە کوردەکان بڵێت (ئەم خائینانە وەڵاتەکەی خۆیان پێشکەش بە دەوڵەتی تورک دەکەن).

ئەندامانی عەشیرەتی (هەرکی و زێباری) لە موسڵ دژ بە هاوکارییەکانی (پەدەکە و یەنەکە) بۆ دەوڵەتی تورک ریپێوانیان ئەنجامدا و نارەزاییان دەردەبڕی لەهەمبەر هێنانی سوپای تورک بۆ باشوری کوردستان.

رۆژنامەی (الجومهورییە) کە ئۆرگانی حزبی بەعس بوو لە ٢ی تشرینی دووەم مانشێتێکی بڵاوکردوە کە بەمشێوەیە بوو (پشت شکاندنی کورد بە خودی کورد)، هەروەها دەیانوت ئەو هێرشانەی (پەدەکە و یەنەکە) دژ بە (پەکەکە) دەستیان پێکردووە و بانگهێشکردنی سوپای تورک بۆ باکوری عێراق نیشانەی خیانەت و رشتنی خوێنی برایەتییە.

## بەفر جموجۆڵە سەربازییەکانی راگرت

کاتێک لە دوا رۆژانی دوا هەفتەی مانگی تشرینی دووەم نزیک دەبووەوە، سوپای تورک بۆئەوەی بگاتە (موراد)ی خۆی لە ناوچەی (زاپ) دوا شانسی خۆیان تاقیدەکردەوە، بەڵام بەهۆی بەفر بارین لە سنورەکانی (چوکورجە) هەروەها بەهۆی بەرخودانی گەریلاکانی (پەکەکە) لە (زاپ) سوپای تورک نەگەیشتنە مەرامی خۆیان. بەهۆی بارینی بەفر لە ٦ی هەمان مانگدا جموجۆڵەکان بەتەواوەتی راگیردران. لە دووری (زاپ) بە ٢٠کم لەناو تورکیادا ئەو سەربازانەی کەلە چاوەروانیدابون بۆئەوەی بەشداریان پێبکرێت لە هێرشەکاندا ئەوانیشیان کشاندەوە، دوای خاڵی پاشەکشێکەی سوپای تورک (شیوێ و چیای رەش)بوو. بەهۆی بۆسەکانی گەریلاکانەوە لەکاتی کشانەوەی سەربازەکانی سوپای تورک لە هەندێک شوێندا شەروپێکدادان دەهاتە ئاراوە. لە ٦و٧ی هەمان مانگدا لەناو خاکی تورکیادا بەهۆی شەڕوپێکدادانەکانەوە (٤) گەریلای (پەکەکە) گیانیان لەدەستدابوو هەروەها (٢٠) سەربازی سوپای تورکیش کوژرابوون، هەرلە سەرەتای دەسپێکردنی شەڕی باشور گەریلاکانی ناو خاکی تورکیا (باکوری کوردستان) بەردەوام هێرشیان بۆ سەر هێزەکانی سوپای تورک ئەنجامدابوو.

گەریلاکانی (پەکەکە) بەگوێرەی ناوەڕۆکی رێککەوتنەکەیان لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان لە (زاپ) لە هەندێک سەنگەردا کشابونەوە. ئەو سەربازانەی لە شەڕەکانی (زاپ) بریندار ببوون بە کۆپتەر دەگوازرانەوە بۆ نەخۆشخانەی (گاتا) لە شاری (وان)، زۆربەی سەربازەکان پێ و قۆڵیان پەڕی بوو، هەندێکیشیان بەهۆی سەرماوسۆڵەوە رەق ببوونەوە. (ئوتکو گونەی) کە ژەنراڵی هێزی کۆماندۆی شاخییەکانی هەرێمی (هەککاری)بوو کە شەڕەکانی (زاپ)ی دەبرد بەڕێوە، لەبارەی دوا شەڕ و پاشەکشێیان ئیدیعای ئەوەی دەکرد

که له شەڕەکانی (زاپ)دا به گشتی (۹۷) گەریلا کوژراون [٢١٧]، بەمشێوەیه لەبارەی راگەیاندنی ژمارەی کوژراوانی پێشو و ئێستادا ناکۆکی دەهاته ئاراوه. (ئوتکو گونەی) دەیوت له هەرێمەکەدا چالاکی و ئۆپەراسیۆنەکان لەتەواوبووندان و بەگوێرەی ئەو فەرمانەی لەسەرووی خۆیانەوه بۆیاندێت هەنگاو دەنێن.
کشانەوه له ناوچەکانی وەک (قایەدیبی، تاشدێلان و ئشکڤیران)یی سەر به (ئولودەره) بەردەوام بوون. له باکوری (هەفتانین) ئەو هێزەی لەلایەن گەریلاکانەوه چواردەوریان گیرابوو لەگەڵ ئەو هێزەی که بەنیازبوون بچن بۆ (سنات) یەکیان گرتەوه و کشانەوه، لەهەمانکاتدا ئەو زرێپۆش و دەبابانەی که هەرلەسەرەتاوه بەشداریان له ئۆپەراسیۆنەکاندا کردبوو (۱۵) دانەیان کەله باشوری کوردستان بوون بەسەر (هێزیل)ەوه گەڕانەوه بۆ تورکیا [٢١٨].

[٢١٧] ۹ی تشرینی دووەم ۱۹۹۲ رۆژنامەی ( سەباحی تورکی )

[٢١٨] ۷ی تشرینی دووەم ۱۹۹۲ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) .

## پێشمەرگە پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ سوپای تورک دەپچڕن

بەرپرسیارانی تورک دەیانوت لەناوچەکانی (کەشان، باتوفە و شەرانیش) کەلە هەفتانینەوە نزیک بوون لە ٧ی تشرینی دووەم شەڕێکی درێژخایەن هاتووەتە ئاراوە، سەدان پێشمەرگە و سەرباز بەشداریان تێداکردووە. دەنگی تەقە گەیشتبووە شارۆچکەی زاخۆ، ئەم شەڕانە لە ئاکامی خواستی چوونە پێشەوەی یەکینەکانی زریپۆش و دەبابەکانی تورکەوە هاتبووە ئاراوە. گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەر ئەو ڕێگایانەی دەچوون بۆ (هەفتانین) سەنگەریان گرتبوو هەروەها بەرەنگاری هێزەکانی سوپای تورک ببوونەوە، بەڵام ئەمە دوا شەڕ بوو کەلە باشور پێشمەرگە هاوشانی سوپای تورک بەشداری تێدابکات.

ئەم بەشداربونەی هێزی پێشمەرگە لەگەڵ سوپای تورک لەگەڵ ڕێککەوتنەکەی نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) ناتەبا بوو، دوو ئەندام سەرکردایەتی (پەدەکە) بەناوی (فازڵ موطنی میرانی و کەمال کەرکوکی) بەردەوام بە پێشمەرگەکانی خۆیان لە شەڕەکانی زاپ و هەفتانین بەشداریان لە هێرشەکانی سوپای تورک پێدەکرد و لەهەمانکاتیشدا کە هەردووکیان پەیوەندییەکی دۆستانەی باشیشیان لەگەڵ دەوڵەتی تورکدا هەبوو. لەئاکامدا کۆمیتەی ڕێککەوتنەکە هەردووکیانی ئاگادار کردەوە و پێیانیان وتبوو ئەگەر بەردەوام بن لە هاوکاریکردنی سوپای تورک ئەوە موداخەلەیان دەکەن و بەرەنگاریان دەبنەوە. لەسەر ئەم ئاگادارکردن و هۆشیار کردنەوەدا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە سەربازەکانی سوپای تورک جیابونەوە و لە دەستپێکی مانگی تشرینی دووەمدا کشانەوە بۆ بنکەکانی خۆیان لە دەوروبەری شارۆچکەی (زاخۆ) [٢١٩].

---

[٢١٩] ٨ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )..

لەسەر بنەمای گرێدراوی بە خاڵەکانی ڕێککەوتنەکەوە گەریلاکانی (پەکەکە) لە ڕۆژانی ٥و٦ی مانگی تشرینی دووەم بەردەوام بوون لە کشانەوە. لە ناوچەی (هەفتانین) نزیکەی (٢٠٠) گەریلا بەخۆیان و چەکی قورسیانەوە بەیانییەکی زوو بەرەو شاری هەولێر بەڕێکەوتن. لە ٣ی هەمان مانگدا نزیکەی (٣٥٠) گەریلا چوونە هەولێرەوە، بەگوێرەی ڕێککەوتنەکەی نێوانیان لە هەولێروە دەچوون بۆ (زەلێ) .

بەگوێرەی ڕوونکردنەوەکانی وەزیری ناوخۆی هەرێمی کوردستان بێت بە گوێرەی ڕێککەوتنەکە لەسەر سنوری ئێران گەریلاکانی (پەکەکە) بەردەوامن لە جێگیربوون و ئەو گەریلایانەیشی کەمپەکانی نزیک سنوریان جێهێشتووە دەگەنە (١٠٠٠)هەزار گەریلایەک و بەگوێرەی ڕوونکردنەوەکەی وەزیری ناوخۆی هەرێمی کوردستانیش بێت لەناو ئەوانەی چوونە بۆ سەر سنوری ئێران (عوسمان ئۆجالان)یشی تێدابووە [٢٢٠].

---

[٢٢٠] ١٠ی هەمان سەرچاوە .

## ئەنقەرە بەرامبەر بە حکومەتی هەولێر

## کارتی (هێزی چەکوش) بەکاردەهێنێت

سەرۆک کۆماری تورکیا (سلێمان دیمیرال)، لە ٥ی تشرینی دووەم وەفدێکی نارد بۆلای (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) و پێشنیاری ئەوەی بۆکردبوون بەرامبەر بە درێژ کردنەوەی ماوەی مانەوەی (هێزی چەکوش)ی هەوپەیمانان لە تورکیا سوپاکەیان لە باکوری عێراق واتا لە باشوری کوردستان بمێنێتەوە [٢٢١] ، بە پێچەوانەیشەوە ئەگەر بەم داخوازییە رازی نەبن ئەوا تورکیا ماوەی مانەوەی هێزی چەکوش لە تورکیا درێژ ناکاتەوە. ئەمەش مانای وابوو ئەگەر هێزی هاوپەیمانەکان کە ناویان نابوو (هێزی چەکوش) پاشەکشێ بکەن ئەوا هێزە کوردییەکانی باشور بێ پشتیوان دەمێننەوە، ئەوەی راستی بێت ئەم تەکلیفە راستەوخۆ بۆ مل شۆڕکردن بوو.

(سلێمان دیمیرال) بۆئەوەی ماوەیەکی درێژخایەنی تر لە باشوری کوردستان بمێننەوە، داوای لە (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) دەکرد بە فەرمی بانگهێشتی سوپای تورک بکەن بۆ باشور، بە فەرمی کردنی ئەم سوپایە لە باشوری کوردستان بە فەرمی کردنی (وێرانکاری)ییەکان بوون و بەمشێوەیە رێگری لە نارەزاییەکانی ناوەوە و دەرەوەش دەگیرا. هەروەکو چۆن لە ساڵی (١٩٧٩) (بابراک کارمال) بانگەوازی بۆ سوپای (قزلای) کردبوو بۆ (ئەفغانستان).

دەسەڵاتدارانی باشور چاویان کەوت بە وەفدەکەی (سلێمان دیمیرال)، ئەم پێشنیارەی (سلێمان دیمیرال)یان وەک ملکەچکردنی زۆرە ملێی هەڵسەنگاندبوو، بەڵام لەئاستی ئەم پێشنیارە رونکردنەوەی فەرمیان نەکرد. بەرپرسیارانی حکومەتی هەرێم ئەقڵیان نەیدەبڕی خەت کێشان بەسەر هێڵی (هێزی چەکوش)ی هاوپەیمانان ئایا لەلایەن ئەمەریکاوە چۆن هەڵدەسەنگێنرێت و چۆن پێشوازی لێدەکرێت!؟.

---

[٢٢١] ٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

(مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) داوایان لە وەفدەکەی تورکیا کردبوو بەشداری ئەو کۆبونەوە سێ قۆڵییە ببن کە سوریا و ئێران بەشداری تێدادەکەن لە تورکیا کەلە ١٤ی مانگی تشرینی دووەم دەبەسترا، بەلام بە زمانێکی دیبلۆماسیانە وەلامی کاکە و مامەیان دابوونەوە و پێیان وتبوو (**شمولی ئێوە ناکات**)، بێگومان دەوڵەتی تورک دەیویست بەرنامە لەگەڵ ئێران و سوریا دابنێت کە چۆن بتوانن نەیارانی خۆیان بکوژن، ئێستا چۆن بانگهێشی هەمان نەیارانی خۆیان بکەن بۆئەوەی کۆببنەوە و ببن بە شاهیدحاڵی ئەوەی کە چۆن پیلان دادەنرێت بۆ کەوڵکردنیان و بانگیان بکات بۆناو چادری ماتەمینی خۆیان! .

ئامانجی سەرەکی (هێزی چەکوش) ئەوەبوو بەرژەوەندی باڵای ئەمەریکا لە رۆژهەلاتی ناوین بپارێزێت. ئەم رەوشە بە بیانوی پاراستنی کورد بەرگێکی تریان بەسەریدا دادابوو. لە حاڵەتی هاتنەئاراوەی رووداوی نەخوازیاردا ئەمەریکا دەیانتوانی هێزەکانی خۆیان لە فڕۆکەخانە شڕەکەی (بامەڕنی) جێگیربکەن لە باشوری کوردستان. سەرەرای ئەوەی لە شەڕی کەنداودا ئەم فڕۆکەخانەیە لەلایەن هاوپەیمانانەوە لێدرابوو بەلام ئێستا دەتوانرا بۆ چەند هەفتەیەک بەکار بهێنرێت. بەڵێ سەرانی کورد لە باشور خاوەن کارتێکی لەو شێوەیەبوون کەدەیانتوانی سودی لێوەربگرن، هەربۆیە دەیانتوانی بە ئاسانی داخوازییەکەی دەوڵەتی تورک رەتبکەنەوە کە سوپاکەیان لە باشوری کوردستان جێگیر ببێت. هەروەها سیاسەتی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمەریکا (بیل کلینتون) لەبارەی (هێزی چەکوش)ەوە دژ بە سیاسەتی تورکیا بوو، هەربۆیە دەوڵەتی تورک جگە لە کشانەوە لە باشوری کوردستان رێگاچارەیەکی تریان نەبوو. دوای ئەوەی ناوەرۆکی کۆبونەوەکەی سەرانی کورد و وەفدی تورکیا ئاشکرابوو بۆ راگەیاندنەکان، زانرا کە (جەلال تاڵەبانی) پێشنیاری بۆ وەفدی تورکیا کردووە تاکو ٢٠ی مانگی تشرینی دووەم سەربازەکانیان بکشێننەوە [٣٢٢].

سەرکردایەتی سوپای تورک ترس و ئەندێشەی ئەوەیان هەبوو گەریلاکانی (پەکەکە) جارێکی تر بگەڕێنەوە ئەو ناوچە و سەنگەرانەی کە چۆڵیان کردبوو هەروەها دەیانویست هەرهیچ نەبێت لە رێگاوبان و شوێنە ستراتیژییەکانی (بادینان) بمیننەوە. ئەو وەفدەی (سلێمان دیمیرال) رەوانەی باشوری کوردستانی کردبوون پێکهاتبوو لە یاریدەدەری راوێژکاری گشتی بۆ کەیسی رۆژهەلاتی ناوینی سەر بە وەزارەتی دەرەوەی تورکیا (تورککەکول

---

[٣٢٢] ٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

یورتتەکین) هەروەها بەرپرسی لیژنەی لێکۆڵینەوەی ئیستیخبارات (جێنگ دوعاتەپە)، هەروەها چەند ئەندامێکی موخابەراتی سەربازی و ئەم وەفدەش لەرێی کۆپتەرێکی تایبەتەوە هێنرابوون بۆ باشور و هەروەها هەردوو نوێنەرانی (پەدەکە و یەنەکە) (سەفین دزەیی و سەرچڵ قەزاز)یشیان لەگەڵدابوو. (سەفین دزەیی) کە لەگەڵ وەفدەکەدا گەڕابووە بۆ ئەنقەرە ئیدیعای ئەوەی دەکرد گەشتکردن لەگەڵ دیبلۆماتانی تورکدا مایەی شانازییە و هەروەها دەیوت (**دیدارەکان لەناو کەشوهەوایەکی زۆر خۆشدا بەسەرچووە**).

(سەفین دزەیی) کە نوێنەری (مەسعود بارزانی) بوو لە ئەنقەرە شایەنی باسە لە بەریتانیا خوێندویەتی، سەرەڕای ئەوەی کارتی مل کەچکردنیان بۆ درێژ کردبوو لەجیاتی ئەوەی هەڵوێست وەربگرێت کەچی دەستبەرداری رێزی دیبلۆماسییانە نەبووا!

هەڵبەت دەوڵەت و سوپای تورک دەگەڕان بەدوای دەرفەت و بوارێک تاکو بتوانن لەسایەیدا لە باشوری کوردستان بمێننەوە، کەچی وەزیری دەرەوەی ئێران (عەلی ئەکبەر ویلایەتی) دەستی کرد بە وتنی (دژی پارچەکردنی عێراقین و لایەنگری سەروەری عێراقین)، ئێران رازی نەبوو بەوەی سوپای تورک لە عێراق وێرانکاری یاخود جێگیرببێت و سەقامگیری وەلاتەکە تێکبدات، چونکە شەڕی باشوری کوردستان بەگوێرەی خواستی ئێران کۆتایی پێنەهات [٢٢٣]، ئێران نارەحەت ببوو بەوەی لە باشوری کوردستان دەرفەت بۆ سوپای تورک دروستبووە، ئەم نیگەرانییە و هەڵوێستەی خۆیانیشیان بە زمانی جۆراوجۆر دەردەبڕی.

رژێمی ئێران دەیانویست هەرهیچ نەبێت بە زیانێکی کەمەوە لە مەسەلەکان و گۆڕانکارییەکان بێنە دەرەوە. ئەوان نەیاندەویست (پەکەکە) بەشێوەیەکی بەرچاو لەخۆیان بووروژێنن، هەربۆیە ئەو گومان و گریمانەی هەیانبوو لەئاستی ئەنقەرە نەیاندەشاردەوە. هەڵبەت ئۆپەراسیۆنی سوپای تورک و هەوڵی جێگیربونیان لە باشوری کوردستان بەردەوام بوو. دەرەنجامی هەڵبژاردنەکەی ئەمەریکا ئاشکرابوو، (بیل کلینتۆن) ببوو بە سەرۆکی ئەمەریکا، ئەمەش دەرەنجامێکی باش نەبوو بۆ دەوڵەتی تورکیا. بەرپرسیارانی ئەنقەرە نزای ئەوەیان دەکرد (جۆرج بۆش) سەربکەوێت، ئەوکاتەی کلینتۆن تورکیای بەرامبەر بە هێزی چەکوش لە عێراق بەچۆکدا هێنا ئینجا لە نزاکردن کەوتن.

---

[٢٢٣] ٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( جومهورییەتی تورکی ) .

## (ئەگەر بانگەشەکان راستبونایە دەوڵەتی تورک پەرۆیان دەبەست و سەمایان دەکرد)

دوای هاتنە ئاراوەی ریکەوتن لە نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) و بە کشانەوەی گەریلاکان لە هەندێک شوێن و بە چونیان بۆ هەرێمی سۆران، ئۆرگانی (پەکەکە) کەناوی (سەرخوەبوون)ە لە ٦ی تشرینی دووەم دیمانەیەکی لەگەڵ یەکێک لە فەرماندەکانی گەریلا سازدا کە بەمشێوەیە بوو:

**پرسیار: (سەرکردایەتی سوپای تورک رایدەگەهێنن گوایە (٤٥٠٠) گەریلای ئێوەیان لەناوداوە، لەناو ئەو ژمارەیەدا (١٨٠٠) کوژراوی گەریلا هەیە، هەروەها دەڵێن دەستیان بەسەر هەزارەها چەکی ئێوەدا گرتووە، ئایا ئەم بانگەشانە تاچیرادەیەک راستن؟).**

**وەلام :** (بێشک لە هەموو شەڕێکی گەرمدا هەموو لایەنێک پروپاگەندە بۆخوی دەکات. بەلام تورکیا چیکاتێک زیانی زۆریان بەرکەوتبێت پروپاگەندەکانیان زیاتر چرکردووەتەوە. بۆ نمونە ئەگەر ئاورێک لە قسەکانیان بدەینەوە بەراستی ئەگەر (٤٥٠٠) گەریلامان زیانیان پێبگەیشتایە و بەکەڵکی شەڕ نەمانایە، ئەوا بێشک دەوڵەتی تورک پەرویان دەبەست و سەمایان دەکرد. ئێمە نالێین شەڕ بێ زیان دەبێت، بەلام لەپاڵ زیانی گەریلادا زیانی سوپای تورک چەند قاتێک زیاترە. سوپای مەرکەزی هەمیشە لەهەمبەر شەر و تەکتیکی گەریلا لاوازە، ئەگەر چەتونی جوگرافیای نیشتیمانەکەمان و کەم ئەزمونی سوپای تورک لە باشوری کوردستان بهێنینە پێش چاو ئەو ژمارەیەی ئەوان باسی لێوەدەکەن بە بەراورد ئەوەی باسیدەکەن زیانی ئەوانە نەک هی ئێمە).

**پرسیار : (کەواتە ئێوە دەڵێن ئەو رێژەیەی ئەوان باسی دەکەن راست نییە؟).**

**وەلام :** (بێگومان راست نییە، ئەمە ئامانجە بۆ سەرخستنی پروپاگەندەیان و پەردەپۆش کردنی سەرنەکەوتنەکانیان لە باشوری کوردستان. سەرەڕای ئەوەی بستبەبستی ئەم

ناوچانەیان بۆردۆمانکرد کەچی زیانی ئەوان لەوەی ئێمە زیاترە، بێگومان لە شەڕێکی دەستەویەخی یەک مانگیدا زیان هەردەبێت).

**پرسیار** :(ئایا چۆن لە زیانەکانی هێزی پێشمەرگە و سوپای تورک دەڕوانن؟).

**وەڵام** :(ئێمە پێشوتر ئامادەییمان کردبوو بۆ ئەم هێرشانە، تەدبیرێکی زۆریشمان وەرگرتبوو. پێمانوایە زیانی گیانی هێزی پێشمەرگە بگاتە (١٠٠٠) هەزار کوژراوێک. زۆربەی ئەو کوژراوانە لەئاکامی تەقینەوەی بۆمب بووە کە ناشتبوومان. سەرەڕای هەموو نییەت باشییەکی ئێمە مەخابن ئەم زیانانە هاتووەتە ئاراوە. تەنها لە هەفتەی یەکەمی شەڕی باشوردا زیانی گیانی سوپای تورک نزیکەی (٥٠٠) کوژراو بووە. زۆربەی تەرمی کوژراوەکان بە گوندنشینەکان گواسترانەوە، تەنانەت ئەو هەڤاڵانەی کە بەشداری ئەو شەڕانە بوون ئەمەیان بەچاوی خۆیان بینیبوو، هەروەها گوندنشینەکان خۆیان هاتن و باسی ئەمەیان کرد لەیەک رۆژدا نزیکەی (٥٠) تەرمی سەربازیان گواستووەتەوە. نزیکەی (٢٧٠) سەرباز لە ئەنجامی کەوتنەسەر لوغم گیانیان لەدەستدا، لەماوەی یەک مانگی شەڕەکاندا بەگشتی ٥ فڕۆکە و ٤ کۆپتەر خراونەتە خوارەوە، تەنانەت ئەم هەواڵە لەلایەن دەزگا راگەیاندنەکانیشەوە باسیان لێوەکرا. سەربازی دیلمان لەلا هەیە، دەبێت باسی ئەوانەش بکەین. ئەو هاوانە ٦٠بۆ١٢٠ ملیمەی داویان بە هێزەکانی پێشمەرگە کەوتوونەتە دەستی ئێمە. لە ناوچەی زاپ تەنها لە ئەنجامی بۆسەیەکی هەڤاڵاندا (١٠٠) سەرباز و پێشمەرگە کوژران، هەموو چەکەکانیشیان کەوتنە ژێردەستمان).

**پرسیار** :(**لەم رۆژانەی دوایدا دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک دەڵێن کەمپێکی زۆرتان کەوتووەتە ژێر دەستی سوپای تورک؟**).

**وەڵام** :(لەلای هێزی گەریلا کارێک یاخود تاکتیکێک نییە کە پێیبوترێت شەڕی بەرەیی یاخود شوێنێک کە هەردەبێت بپارێزرێت. ئێمە گەریلاین و پارتیزانین و هەمیشە لە جەولەداین. سوپای تورک ویستیان پەلکێشمان بکەنە ناو شەڕی مەیدانییەوە، دەبابە و تۆپیان هێنا و فڕۆکەکانیشیان بەردەوام بۆردۆمانیان دەکرد. دەیانویست زۆرمان بۆبهێنن و لە شوێنێک گیرمان بکەن و شەڕی مەیدانی بکەین، بەڵام ئێمە توانیمان ئەم شێوازە تەکتیکەیان مایەپوچ بکەینەوە. بۆنمونە لە (هێزێل)ەوە ئەو دەبابە و زرێپۆشانەی هێنایان بۆ ناوچەکە دەستیان کرد بە ئەنجامدانی ئەو تەکتیکەیان. ئەو شوێنانەی ئەوان روویان لێدەکرد ئێمە بە زانابونی

خۆمان چۆڵمان کردبوو هەروەها توانیمان بچینە پشتییانەوە. لەئاکامی هێرشەکانماندا نزیکەی (٥٠) سەربازیان کوژرا. کاتێک ئەوان پێشڕەوییان دەکرد و دەهاتنە پێشەوە ئێمەش پشتییانمان دەگرت و شوێنی زیاتریان لەدەستدەدا. ئەو شوێنانەی ئەوان بانگەشەی بۆدەکەن کە گوایە گرتوییانن ئەو شوێنانەن کە دەیانویست ئێمە شەڕی مەیدانی تیدابکەین. نەمانی گەریلاش لەو شوێنانەدا دەبوو بە گەوایی ناسەرکەوتنی سوپاکەیان، بەلام لەماوەی یەک مانگی شەڕەکاندا دەزگای راگەیاندن و چاپەمەنی تورک لەئاستی چالاکییەکانی گەریلاکانمان لە باکوری کوردستان چاویان گرتووە. تەنها لەو ماوەیەدا لە باکور هەڤالانمان دەستیان لە (١٧) بنکەی سەربازی وەشاندووە).

**پرسیار** :(**٣٥٠ گەریلاتان چوونە هەولێرەوە، ئایا دیدارەکان لەچی ئاستێکدان**؟).

**وەلام** : (دیدارەکان بەردەوامن، چوون بۆ هەولێر پێموابێت شتێکی ئەوەندە سەرسورمان نییە. ئێرە وەلاتی ئێمەشە، ئەو جێگایەی بمانەوێت دەتوانین بۆی بچین. ئامانجمان پتەوکردنی پەیوەندییەکانە، هەوڵدەدەین بۆ یەکڕیزی گەلەکەمان و هەوڵدەدەین لەهەموو پارچەکانی نیشتیمانەکەماندا دانوساندن هەبێت) [٢٢٤].

---

[٢٢٤] ٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ) .

## دەبابەکانیش دەکشێنەوە

ئەو(٢٠٠) زرێپۆش و دەبابانەی لە ناوچەی (هێزێل) لە دەرگای (ئیبراهیم خەلیل)ەوە هاتبوونە باشوری کوردستانەوە، لە ١٢و١٣ی مانگی تشرینی دووەم ژمارەیەکی بەرچاویان لەگەڵ لۆری بارهەڵگر و ئەمبولانسەکانیان گەڕانەوە بۆ تورکیا. ئەم کشانەوەیە ئەوکاتە روویاندا کە حکومەتی هەرێم و بەرپرسیارانی ئەنقەرە لە گەرمەی مامەڵە و سەوداداببوون، لەهەمان ئەو رۆژانەدا لە شوێنە جیاوازەکانی باشوری کوردستانەوە نزیکەی (٢) هەزار سەرباز کشانەوە بۆ بنکە زستانییەکانی خۆیان لەناو تورکیا. ئەو کاتەی گەیشتنەوە بنکە و بارەگاکانی خۆیان لە (تەکەڤلە، ئشکلی و چایرلی) سەربە (چوکورجە) سەربازەکان بەگشتی ماندووببوون و جلوبەرگیشیان دڕابوو. چەکە قورسەکانیان بە سواری هێستر گواستبووەوە، لەهەمانکاتیشدا باران و بارینی بەفری زستانیش بەردەوام بوون. سرووشت ڕێی نەدەدا کە بە هەزارەها سەرباز بۆ گەیشتن بە مەرامەکانیان لە مەیدانەکاندا بمێننەوە. سەربازەکان بە پاسی سڤیل بە ناوچەکاندا بەسەر بارەگاکاندا دابەشکران [٢٢٥]، سوپای تورک پەیتا، پەیتا لەبەرەی (زاپ) دەکشانەوە. بەگوێرەی گێڕانەوەی ئەو جاشانەی کە گەڕابوونەوەماڵی خۆیان دەیانوت گەریلایەکی زۆر هێشتا لە ناو سەنگەرەکانی خۆیاندان. جاشەکانی (چیمەنلی) دەیانوت تەرمی هەندێک سەرباز هێشتا لە هەندێک شوێندا هەڵنەگیراونەتەوە، لەلایەکی تریشەوە بەهۆی سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەو تەرمانە سوپا ناچارمابوو کشانەوەکە بە هێواشی بکەن[٢٢٦].

کاتێک کشانەوەی سوپای تورک بەردەوام بوو، گەریلاکانی (پەکەکە) لە ناوچەی (شیوێ) گروپێکی جەندرمەیان خستە ناو بۆسەی خۆیانەوە. بەگوێرەی روونکردنەوە فەرمییەکان لەو شەڕەی هاتبووە ئاراوە بە تێکڕا (١١) گەریلا و سەرباز کوژراون، هەروەها (٥)

---

[٢٢٥] ١٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

[٢٢٦] ١٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

سەربازیشیان بریندار بووە. سەرچاوەکانی ناوچەکەش دەیانوت ئەو شەڕەی لەناوچەی (دیزیی) خاڵی سفری سنور هاتووەتە ئاراوە زیانێکی گیانی زۆری لێکەوتووەتەوە و شەڕەکە بەدرێژایی ئەو رۆژە بەردەوام بووە. لەهەمانکاتیشدا (٢) فڕۆکە بەردەوام بۆردۆمانی ئەو ناوچەیان کردووە. ماشێنێک کە هەمووی باری تەقەمەنی بووە لەلایەن گەریلاکانەوە دەستی بەسەردا گیراوە[٢٢٧]. سەرۆک وەزیرانی تورکیا (سلێمان دیمیرال) لەکاتی کشانەوەی سەربازەکانیان دەیوت (لە سنورەکان هێزی پێشمەرگە جێگیر دەکرێن)[٢٢٨]. لە هەمان رۆژ ئەو کۆبونەوە مەزنە سێ قوڵییەی لە ئەنقەرە ئەنجامدرا، کە وەزیرانی دەرەوەی تورکیا، ئێران و سوریا تێیدا بەشداربوون دەیانوت (**بەگشتی کوردی عێراق لەحەد زیاتر مەینەتییان چێژت، بەڵام ئەمە ئەو مافە بەوان نادات دەوڵەت دروست بکەن**)، هەروەها بە ئاشکرا دەیانوت دژی پێکهاتەی فیدراسیۆنی باشوری کوردستانن[٢٢٩].

---

[٢٢٧] ١٣ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[٢٢٨] ١٣ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[٢٢٩] ١٣ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

## فازڵ موطنی دەڵێت (تورک لەبارەی جموجۆڵە سەربازییەکەیانەوە دڵنیاییان بە ئێمە دابوو)

کاتێک سوپای تورک سەرقاڵی کشانەوەی سەربازەکانیان بوون، ئەندامی سەرکردایەتی و فەرماندەی هێزەکانی (پەدەکە) لە بادینان (فازڵ موطنی میرانی) هاوکات روونیکردەوە کە **(تورکەکان پێشوتر لەبارەی جموجۆڵی سەربازییانەوە دڵنیایی پێداون)**، بەمشێوەیە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ فازڵ پیلانی پێشوەختەی دەوڵەتی تورکی ئاشکرا دەکرد. (فازڵ موطنی) کە قسەی بۆ کەناڵی (خەبات) دەکرد لەبارەی دەرەنجامی ڕێککەوتنی (پەکەکە) و حکومەتی هەرێم، هەروەها باسی لە بەرژەوەندییەکانی هێزە دەرەکییەکان دەکرد لەم شەڕەدا و فازڵ کە یەکێک بوو لە ئەندازیارانی ئەم شەڕەی باشور، سەرەڕای ئەوەی رەخنەی (پەکەکە)شی دەکرد، بەڵام ئسلوبە دیبلۆماتکارییەکانی سەرنجی رادەکێشا[230]، بە گشتی خاڵە سەرنجڕاکێشەکانی قسەی (فازڵ موطنی) کە باسی لێوەدەکرد و گرنگ بوون بەمشێوەیە بوون:

**( ئەگەر هێزەکانی پەکەکە لە سەر سنوری بادینان پەلاماری تورکیا نەدەن ئەوا لە هەرێمەکەی ئێمەدا دەبن بەخاوەنی ئازادی و دەتوانن سیاسەتی خۆیان بکەن ).**

**( حکومەتی هەرێم یاخود دەسەلاتدارانی باشور مافی ئەوەیان نییە بە پەکەکە بڵێن لەناو خاکی تورکیا چالاکی ئەنجام مەدەن، لەهەمانکاتیشدا مافی ئەوەیان نییە لەناو تورکیا موداخەلەی چالاکییەکانی پەکەکە بکەن، کێشەی حکومەتی هەرێم لەگەڵ پەکەکە تەنها لەناو خاکی هەرێمدایە ) .**

**( حکومەتی هەرێم ئەو مافەی داوە بە پەکەکە کاروباری رۆژنامەگەری بکەن و رادیۆ و تەلەفزیۆنیش بکەنەوە ) .**

---

[230] ١٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

**( لەچی رەوشێک و لەچی بوارێکدا دەبێت ببێت، ئەگەر پەکەکە ئەم رێککەوتنەی نێوانمان تێکبدات ئەوکاتە حکومەتی هەرێم مافی خۆیەتی وەک بارمتە لەگەڵ گەریلاکانی ئێرە مامەڵە بکات ).**

**( لە کوردستانی عێراقدا بەتایبەتی لە سلێمانی و دەوروبەری خەڵکی پشتگیری پەکەکە دەکەن ) .**

**( ئەمەریکا ئاگاداری هاتنە ناوەوەی تورکیایە بۆ کوردستانی عێراق، دەسەڵاتدارانی ئەمەریکا دڵنیایی ئەوەیان پێدابووین سوپای تورکیا تەنها ١٥ رۆژ لە کوردستانی عێراق دەمێننەوە و دوایش پاشەکشێ دەکەن ).**

بەڵێ ئەمە سەردێڕی قسەکانی (فازڵ موطنی میرانی) بوو، بەڵام لەهەمانکاتدا سوپا سالاری تورک (دۆغان گوریش) دەیوت **(ئەنجامی جموجۆڵەکەمان هێشتا نەهاتووەتەدی، ئەگەر پێویست بکات ئۆپەراسیۆنێکی لەمەی کردمان گەورەتر ئەنجام دەدەینەوە)**[٢٣١].

**بەمشێوەیە پەردەی سەربازی شەڕی یەکەمی باشوری کوردستان دادرایەوە!.**

---

[٢٣١] ١٩ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

## هەوڵی کوشتنی (جەلال تاڵەبانی)

دوای هەفتەیەک تێپەڕبوون بەسەر ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم)لە ٦ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٢)دا هەوڵی کوشتنی سکرتێری گشتی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی ئاشکرابوو[٢٣٢]. لەهەمانکاتدا سوپای تورک بە هاوکاری هەندێک پێشمەرگە لە (زاپ و هەفتانین) درێژەیان بە ئۆپەراسیۆنەکانی خۆیاندەدا.

هەوڵی کوشتنی (جەلال تاڵەبانی) کەلە ڕایگشتی شاردرایەوە، بەگوێرەی گێڕانەوەیەکی ئەندامێکی سەرکردایەتی (یەنەکە) ڕووداوەکە بەمشێوەیە بووە:

(لە نیوەڕۆی ٦ی تشرینی یەکەم لە قەڵاچۆلان لەبەردەم ماڵی مام جەلال ماشێنێک بەردەوام دەسوڕێتەوە، کاتێک پاسەوانەکان داوای لێدەکەن ڕابوەستێت کەسانی ناو ماشێنەکە تەقە لە پاسەوانەکان دەکەن. دوای ئەوەی پاسەوانەکانیش لێیان دێنە دەست شۆفێرەکە دەکوژرێت و ئەوانی تر بە برینداری دەگیردرێن. لەناو ماشینەکەیاندا (تی ئێن تی) و چەکی هەمەجۆر دۆزرانەوە. دوای لێکۆڵینەوە لە بریندارەکان دەرکەوت چاوەڕێی هاتنەوەی مام جەلال یان کردووە، دوای گەڕانەوەی تەقەی لێبکەن و بیکوژن. دوای لێکۆڵینەوەی زیاتر بەهۆی دانپیانانی بریندارەکان نزیکەی (٥٠) کەسی تر دەستبەسەر کران کە پەنجەیان لەم کارەدا هەبووە، هەروەها دەگەڕێین بەشوێن (١٠) کەسی تردا).

لەناو ئەو (٥٠) کەسەی کە گردبویان کەسانی پەنابەری کەرکوکی و بزووتنەوەی ئیسلامی و ئێرانیشی تێدابوو.

---

[٢٣٢] مانگی تشرینی دووەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ) .

لەو ماوەیەدا لە باشوری کوردستان تەقینەوەیەکی زۆر هاتبووە ئاراوە و ئەوانەیشی دەگیران کە پەنجەیان هەبووە لەم کارانە زۆر بە نهێنی گوولە باران دەکران. هاوکات ئەوانەی هەوڵی کوشتنی (جەلال تاڵەبانی)یان دابوو دەرکەوتبوو کە پەیوەندییان لەگەڵ ئێراندا هەبووە، لەهەمانکاتدا لەکاتی راگەیاندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، حکومەتی ئێران رەخنە گەلێکی زۆری (جەلال تاڵەبانی)یان کردبوو کە مایەی سەرنج بوو. کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی کەلە مانگی تشرینی یەکەم بەسترا، لەنێوان شیعە عەرەبەکانی لایەنگرانی ئێران و پارتە کوردییەکان لەبارەی بردنەڕێوەی عێراقەوە گەنگەشەیەکی زۆری چڕ لە نێوانیان هاتبووە ئاراوە. ئەو گروپە شیعانەی سەربە ئێران بوون بەتایبەتی (جەلال تاڵەبانی)یان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە مەیلداری پارچەکردنی عێراقە. لەمانگی تەموزدا لەو شەڕەی لە نێوان پێشمەرگەکانی (جەلال تاڵەبانی) و بزووتنەوەی ئیسلامیدا هاتبووە ئاراوە ژمارەیەکی زۆر لە هەردوولایان کوژران، بەڵام بەهۆی ئەو نزیک بونەوە و ئەو رێککەتنەی (جەلال تاڵەبانی) لەگەڵ (پەکەکە) کردبووی یەکێک لەو دەوڵەتانەی کەبە کوشتنی (جەلال تاڵەبانی) دڵگران و غەمگین نەدەبوو بێشک دەوڵەتی تورک و ئەو خائین و سیخوڕانەبوون کە دەیانویست لەدوای نەمانی (جەلال تاڵەبانی) ئەسپی خۆیان تاوبدەن.

## ( له هێرشەکاندا هەست بە مەحکومییەتی خۆیان دەکەن )

له شەڕی باشوری کوردستاندا فەرماندەیەکی (پەکەکە) بەناوی (عوسمان ئۆجالان) فەرماندەی گشتی بەرەی (خواکورک)بوو، هەروەها یەکێک بوو لەوانەی کە بەناوی (پەکەکە)وە رێکەوتنی نێوان خۆیان و حکومەتی هەرێمی واژۆکردبوو. لەو کاتەی شەڕوپێکدادانەکان لە باشوری کوردستان بەردەوام بوو، لە ١٠ی مانگی تشرینی یەکەم پەیامنێری رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم) بەناوی (محەمەد بەرواری) دیمانەیەکی لەگەڵ (عوسمان ئۆجالان)ئەنجامدا کە بەمشێوەیە بوو:

**پرسیار** :**(ئایا کێ وەک سەرەتا دەستپێشخەری بانگەوازی بۆ ئاشتی کرد؟).**

**وەڵام** (هەرلەسەرەتاوە ئێمە جارناجارێک بانگەوازی ئاگربەستمان دەکرد، بێشک ئەو پروپاگەندەیەی کەلەناو گەلیشدا پێشوتر دەمانکرد لەپێناو رێگری کردنبوو لەمجورە شەڕانە. ئەمجۆرە بانگەوازییانەمان پێش شەڕ و دوای هاتنەئاراوەی شەڕیش هەمیشە بەردەوام بوو، بێشک ئەم بانگەوازییانەمان وەڵامی باشیشی وەرگرت. بۆئەوەی رێگری لە پارچەبوونی گەلەکەمان بگرین ئەمجورە بانگەوازییانەمان بەردەوام بوو، دوای ئەوەی وەڵامی ئەرێنیمان وەرگرت سەرەتا لە خواکورک پاشانیش لە ناوچەکانی تر بە گشتی ئاگر بەست راگەیەنرا).

**پرسیار** :**(باشە بۆچی بانگەوازییەکانتان دوای هاتنەئاراوەی شەڕ وەڵام درانەوە، ئەگەر زووتر بەدەنگ بانگەوازییەکانتان بهاتنایە بێشک ئەم شەڕەش روونەدەدا، بەرای ئێوە بۆچی لەم بارودۆخەدا ئەم رێککەوتنەیان قەبوڵکرد؟).**

**وەڵام** :(هەموو زەخت و زۆر بۆهێنانەکانی ئەمەریکا و تورکیا بۆهاتنەسەر ئێمە بوو، بەرەی کوردستانی بەهاتنەسەر ئێمە خۆیان بە مەحکوم دەزانی. دوای ئەوەی لە نێوانمان شەڕ هاتەئاراوە و هەموو جیهانیش ئەمەی زانی، پێیان وابوو کە بەشێکی زەخت و زۆربۆهێنانەکان تاڕادەیەک قورساییان نەماوە. لەوانەیە درککردن بەم مەسەلەیە وایانی

لێکردبێت کەلە ئێمە نزیک ببنەوە. بێشک زیانێکی زۆریشیان لێکەوت وهەروەها لەلایەن گەلیشەوە روبەڕوی نارەزایی بوونەوە. ئەم شەڕە بووە هۆکار کە گەلی کورد لە باشور و لە باکور نارەزایی نیشانبدەن. سەرانی بەرەی کوردستانی کەوتنە ژێر زۆربۆهێنانێکی زۆرەوە، نەک تەنها لەئاستی گەل بەڵکو پارت و رێکخراوە کورد و نا کوردییەکانیش بەرامبەریان نارەزاییان نیشاندا. سەرەتا لە دەستپێکی شەڕەکان خۆیان لە ئاگربەست نزیک نەدەکردەوە بەڵام دوای ئەوەی شەڕوپێکدادانەکان چڕبوونەوە چارەیان نەما و خۆیان لە بانگەوازی ئاشتی نزیک کردەوە).

**پرسیار :(ئێوە دەڵێن ئیرادەی پەدەکە و یەنەکە بە ئەمەریکاوە گرێدراوە، بەم تێڕوانینەی ئێوە بێت پەدەکە و یەنەکە بە ئیرادەی خۆیان لەگەڵ ئێوە لەسەرمێزی گفتوگۆ دانانیشن، ئەو رێکەوتنەی ئێوە کردوتانە لەگەڵ حکومەتی هەرێمدا ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەلەگەڵ ئەمەریکا و تورکیادا کردبێتان؟).**

**وەلام** :(هەرچەندە پارتەکانی باشور ئیرادەی خۆیان رادەستی ئەمەریکا و تورکیا کردووە، لەگەڵ ئەمەشدا بێشک پێویستییان بە هاوکاری و بە پاڵپشتی گەلیش هەیە. بەتەواوەتی درکیان بەوەش کردووە کە بەبێ گەلیش ناتوانن سیاسەتی خۆیان بەڕێوە بەرن. رۆژ لەدوای رۆژ گەل ئیرادەی خۆیان بەسەریاندا زاڵ دەکات، هەربۆیە ئەو هێزانە ناتوانن وەکو جاران و بە ویستی خۆیان ئەسپی سیاسەتی خۆیان تاوبدەن. ناچاریش دەمێننەوە داخوازی گەل رەچاوبکەن. بوونی ئێمە لە سنورەکان دڵنیاییە بۆ ئاسایشی رەوشی باشوری کوردستان، پێشوتریش ئەمەمان هێناوەتە زمان. لەسەروبەندی شەڕەکاندا دەوڵەتی تورک راستەوخۆ دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی پیلانی خۆیان. تورکیا بانگەوازی بۆ ئێران و سوریا کرد کەلەبارەی رەوشی باشوری کوردستانەوە کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی لەئاستی وەزارەتی دەرەوەیان ئەنجام بدەن، مژاری کۆبونەوەکەشیان سەبارەت بە ئایندە و رەوشی پەرلەمان و قەوارەی باشوری کوردستانەوە بوو. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت بوونی ئێمە لە سنورەکان رێگرە لە هەڵوێستی ناحەزانەی تورکیا بەرامبەر بە قەوارەی باشوری کوردستان).

**پرسیار** :(وەک دەوترێت ئەوکاتەی چوون بۆ شوێنی دیدار لەگەڵ وەفدەکەی حکومەتی هەرێم لەلایەن پێشمەرگەکانی پەدەکە وە تەقەتان لێکراوە ئایا ئەمە راستە؟).

**وەڵام** :(بەڵێ ڕووداوێکی لەو جۆرە هاتەئاراوە. ئێمە لەگەڵ وەفدێکی حکومەتی هەرێم دیدارمان ئەنجامدا و ڕێککەوتین چاومان بە وەفدێکی بالاتر بکەوێت و بەرەو شوێنی دیاریکراو کەوتینە ڕێ. لەوکاتەدا تەقە لە گروپەکەمان کرا، پێکدادانێکی نوێ هاتەئاراوە. بەڵێ ئێمە ناڵێین ئەم تەقانە هەوڵدان بووە بۆ کوشتنی کەسێکی دیاریکراو بەلام یەکەم تەقە لەوانەوە دەستی پێکرد. ئەم تەقانە لەوکاتەدا هاتنە ئاراوە کە ئێمە سەرقاڵی دیداربووین لەگەڵ وەفدێکی بالای ئەوان).

**پرسیار :(ئێوە پێشوتر وتوبوتان بەرەی کوردستانی ٦مانگ پێشوتر دەستیان بە ئامادەباشی ئەم شەڕە کردووە، لەهەمانکاتدا ئێوەش ئامادەباشیتان کردووە، ئایا ئەو ئامادەییانەتان سەبارەت بە دەستپێکی شەڕەکان و بۆ کۆتاییەکەیشی چی قازانجێکی بەئێوە گەیاندووە؟).**

**وەڵام** :(ئەم هێرشانە بەردەوام لەناو قسەوباسی ناو کۆبونەوەکانماندا بوو. ساڵێک لەمەوبەر ژێرخانی هێرشەکانیان ئامادەکردبوو. ئەو شەڕە تاکوتەرایانەی دەهاتنە ئاراوە لە ئاستی ناوچەی بچوک بوون. لەساڵانی ڕابوردودا چەندین گەریلای قارەمانی ئێمەیان شەهید کرد، چەندین گەریلاشمانیان دەستبەسەر کرد، هەندێکیشیان ڕادەستی تورکیا کردەوە. ئەوانەی هاوکاری ئێمەیان دەکرد لە هەرێمەکە هەڕەشیان لێدەکرێت و چاویان لێسوور دەکەنەوە، هەربۆیە دەتوانین بڵێن هێرشەکان لە زووەوە دەستیان پێکردووە. ئێمە چاوەڕێی ئەم هێرشە بەفراوانەشمان دەکرد، بەردەوام لەناوخۆماندا باسمان لێدەکرد. ئێمە پێشوتر دەمانزانی ئەم ئامادەباشییانە لەلایەن تورکیاوە بۆیان ئامادەکراوە و چاوەڕێی ئەوەشبوین هێرشمان بۆدەهێنن. بەرامبەر بە هەموو ئەمانەش ئێمە خۆمان بۆ بەرگرییەکی ڕەوا ئامادەکرد، بێگومان هەرلەسەرەتاوە بە نیازبووین ئەگەر هێرشمان بۆبهێنن ئێمەش وەلامیان بدەینەوە. بەگشتی لە ئاستی هۆشیارکردنەوەی گەل بوبێت یان لەئاستی درکاندنی مەترسییەکان و بۆ بەرگریکردن لەخۆمانیش ئامادەباشیمان هەبوو، هەربۆیە هەلمان بۆنەڕەخساندن بگەنە مەرامەکانی خۆیان. ئامانجی سەرەکی ئەوان ئەوەبوو لەسەرەتادا دەستمان لێبوەشێنن و دوایش لە ڕیشەوە لەناومان بەرن).

**پرسیار: (بەڕای ئێوە بەرامبەر بەم هاوکارییە و پاڵپشتییەی بەرەی کوردستانی بۆ دەوڵەتی تورک دەبێت چییان وەرگرتبێت؟).**

**وەلام** :(دەستپێکردنی شەڕی باشوری کوردستان کە لەلایەن بەرەی کوردستانییەوە دەستی پێکرا گرێنەدراوە بە هێزی خۆماڵی خۆیان و بە ئیرادەی گەلەوە. ئەم گۆڕانکاریانە لەسەر خواستی ئەمەریکا و تورکیا هاتنەئاراوە، لەژێر ناوی پاراستنی کورد لە دژی رژێمی سەدام شێوازێکی بەرەی کوردستانیان پێکهێنا. گەلیان مەحکومکردووە کە تەنها بەو ئازوقە و بەو هاوکاریانە بژین کە لەدەرەوە بۆیان رەوانە دەکرێت. بەڵێ بە ملکەچکردنی حکومەتی هەرێم بۆ بە دەستخستنی هاوکاری ناچاربوونە شەڕی ئێمە بکەن. رەوشی ئێرە گرێنەدراوە بە ئیرادەی گەلەوە، هێزە کوردییەکانی ئێرە مەحکومکراون بە ئەمەریکا و تورکیا و هێزە دەرەکییەکانی ترەوە. بەرەی کوردستانی بە هێرشکردنە سەر ئێمە پێیانوایە دەتوانن قەرزەکانی خۆیان بە تورکیا و ئەمەریکا بدەنەوە. بەڵێ هەموو ئەمانە هۆکاری بنگەیین بۆ هاتنە ئاراوەی ئەم شەڕەی باشوری کوردستان).

**پرسیار: (باشە ئەگەر شەڕوپێکدادانەکان درێژبخایەنن چی روودەدات؟).**

**وەلام** (بەگشتی ئومێدی هاتنە ئاراوەی رەوشێکی جیاوازتر دەکرێت. هەندێک پەندی مێژوویی هەن کە دەبێت سودیان لێوەربگیردرێت. خەباتی کورد لە عێراق لەپێناو ئازادیدا هەمیشە بەردەوام بووە، هێزە دەرەکییەکانیش بەردەوام ئەم جولانەوەیەیان بەرامبەر بە عەرەب وەک کارتی فشار بەکارهێناوە، لەئاکامیشدا دەسەلاتدارانی ئەمەریکا و ئێرانیش بۆئەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لە کوردستان بپارێزن بەردەوام هاوکاری (پەدەکە)یان کردووە. ئەوکاتەی کێشەی نێوان عێراق و ئێران لەرێی رێکەوتننامەی جەزائیر چارەسەر کران، رژێمی عێراق کەوتە ژێر کاریگەری هەژمونی ئەمەریکا و دەستبەرداری هاوکارییەکانیان بوون بۆ کورد. ئەمە ئەو راستییەیە کە هەموو کورد دەیزانێت. بەگشتی ئەمەریکا و ئەوروپا بەرژەوەندییەکانیان لە رووخانی سەدامدایە، هەربۆیە هێرشی سەدامیان کرد، نەک لەبەرئەوەی کە سەدام حوسێن دیکتاتۆرە. ئەو سیاسەتەی سەدام لەئاستی کوردا پەیرەوی دەکات هەرهەمان سیاسەتی تورکیایە کە بەرامبەر بە کورد پەیرەوی دەکەن، بەلام ئەمەریکا و ئەوروپا لەئاستی سیاسەتی تورکیا چاوپۆشی دەکەن. سەدام حوسێن بەهۆی شەڕی نێوانیان لەگەڵ ئێراندا توانی سوپایەکی بە ئەزمون پێکبهێنێت، ئەم سوپایە بۆ ئیسرائیل بە مەترسی دەبینرا، لەهەمانکاتیشدا هەڕەشەش بوو بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا و تورکیاش، هەربۆیە بە پێویستیان بینی ئەم هێزە لەناوببرێت. بێشک شەڕی کەنداو هەرلەبەر

ئەو هۆیەبوو روویدا، وەک دەزانرێت سەدامیان گەیاندە حاڵەتێک کە نەتوانێت هەناسەش بدات، بەڵام هەتا ئێستاش جێگرەوەی سەدامیان نەدۆزیوەتەوە. لەبارەی جێگرەوەی سەدام وەکو دەسەڵاتێکی عەرەبی نارەحەتی دەچێژن. هەتا بەدیلێکی تر دروست دەکەن لەشوێن سەدام ناچارن بهێڵن سەدام لەسەر حکوم بمێنێتەوە، ئەمەش هۆی سەرەکی هاوکاریکردنی کوردە لە عێراق)[٢٣٢].

[٢٣٢] تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ) .

## خەیاڵەکان، خەونەکان، تابلۆی سەرکەوتن و راستییەکان

لەسەروبەندی تەواوبوونی شەڕوپێکدادانەکاندا، دەوڵەتی تورک نەگەیشتنە ئەو ئامانج و مەرامانەی مەبەستیان بوو، هەربۆیە دەگەڕان بەشوێن کەسێکدا کە دەرەنجام و قورسایی شەڕەکە بدەن بە تەنگەیدا. بۆئەم مەبەستەش ئەو تابلۆ سەرکەوتنانەی کە دەوڵەتی تورک بۆ رایگشتیان کێشابوو، یەکێکیان هەڵبژارد کە باجی چەواشەکارییەکانی بخەنە ئەستۆ. ئەویش رۆژنامەوانێکی تورک بوو بەناوی (محەمەد عەلی بیراند) کە پێشکەشکاری بەرنامەی (٣٢رۆژ)بوو کە دیمانەی لەگەڵ گەریلاکانی (پەکەکە)دا کردبوو. ئەویان بۆ ئەم مەبەستەی خۆیان هەڵبژارد. هاوکات رۆژنامەوان (محەمەد عەلی بیراند) لە (زەلێ) دیمانەی لەگەڵ گەریلاکان کردبوو، بەڵام نەیانهێشت لەو کەناڵە پێشکەشی بکات کە کاری تێدا دەکرد. پێشوتر و دوایش دەوڵەتی تورک هەمیشە پروپاگەندەی ئەوەیان دەکرد (پەکەکە) لەناو تەنگەتاویدان و پەرشوبڵاوبونەتەوە و هەریەکەیان بەرەو وەڵاتێک هەڵدێن، کەچی ئەم بەرنامەیەی (محەمەد عەلی بیراند) هەموو ئەو بانگەشە و پروپاگەندانەی دەوڵەتی تورکییان بەدرۆ دەخستەوە. کەناڵەکانی لایەنگری دەوڵەت و کەناڵەکانی دەوڵەتی تورکیش بانگەشەی ئەوەیان دەکرد پێشمەرگە گورزی کوشندەیان لە گەریلاداوە و زۆربەیان خۆیان رادەستی پێشمەرگە کردووە، بەڵام ئەم بەرنامەیەی (محەمەد عەلی بیراند) سەلماندی هەموو ئەم هەواڵانە درۆن. (محەمەد عەلی بیراند) دیمانەی لەگەڵ گەریلاکان کردبوو بەمەش دەردەکەوت لە شەڕەکاندا گەریلا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە نەک سوپای تورک و هێزی پێشمەرگە. بەهۆی ئەم کارەی (محەمەد عەلی بیراند)ەوە رایگشتی تورک و دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک کەمیان مابوو رۆژنامەوان (محەمەد عەلی بیراند) بە (خائینی نیشتیمانی) تاوانبار بکەن.

ڕۆژنامەوان (محەمەد عەلی بیراند) کە ساڵەهای ساڵە وەکو سەربازێکی ڕۆژنامەوان خزمەتی دەوڵەتی تورک دەکات ئەو ڕیپۆرتاژەی لە ساڵی (١٩٨٧) لەگەڵ سەرۆکی (پەکەکە) (عەبدوللە ئۆجالان)دا کردبووی لە ڕۆژنامەی (میللییەتی تورکی) بڵاویکردەوە. ڕایگشتی تورک (محەمەد عەلی بیراند)یان وەکو کەرەسە و ئامرازێکی پڕوپاگەندەی (پەکەکە) تۆمەتبار دەکرد، بێشک ئەم کارەی (محەمەد عەلی بیراند) کارێکی پیشەیی و ڕۆژنامەگەریی بوو کە دەستی بۆبردبوو. پاشانیش چەند دیمانەیەکی لەو کاسێتە بڵاوکردەوە کە لەگەڵ عەبدوللە ئۆجالاندا قسەوباسی تێدا کردبوو. لەڕێی بڵاوکردنەوەکانی دیمەنی گەریلا و بە بەڵگەکردنی سەرکەوتنەکانی گەریلا لە باشوری کوردستان دەیانویست (محەمەد عەلی بیراند) بە (خائینی نیشتیمانی) تاوانبار بکەن. دەوڵەتی تورک دەیویست بیسەلمێنن سوپاکەیان و هێزی پێشمەرگە لە شەڕەکاندا بەرامبەر بە گەریلا سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە، بەڵام ئێستا (محەمەد عەلی بیراند) هاتووە هەموو ئەو ڕاستییانە سەروبن دەکات، بێشک ئەمە لەلایەن ئەوانەوە مایەی قەبوڵکردن نەبوو.

لەدوای کۆتایی پێهێنانی شەڕەکاندا لە ١٩ی تشرینی دووەم سوپاسالاری تورک (دۆغان گورێش) لە دیمانەیەکیدا بۆ ڕۆژنامەی (حورییەتی تورکی) بانگەشەی ئەوەی دەکرد لە شەڕەکاندا (١٠٠٠)هەزار گەریلا کوژراون و هەروەها (١٠٠٠)تریشیان بریندارە، ئەوانەیشی ماونەتەوە بۆ وەلاتانی تر هەڵاتوون. بەرنامەکەی (محەمەد عەلی بیراند) کە ناوی (٣٢ڕۆژ) بوو سەوڵی دەستی سوپای تورک و دەزگا ڕاگەیاندنەکانی شکاند بوو، هەربۆیە داواکاری گشتی لەهەمبەر (محەمەد عەلی بیراند) دۆزی کردەوە بیدەن بە دادگا. مەسەلەیەکی تریش هەبوو کە پەیوەندی بە دواچونەکانی ڕۆژنامەوانی تورک (میدحەت بەرەکات)ەوە بوو. بەگوێرەی قسەکانی سوپا سالاری تورکیا (دۆغان گورێش)بێت ڕوژنامەوان (میدحەت بەرەکات) بەهیچ شێوەیەک دیمانەی لەگەڵ (عوسمان ئۆجالان)دا نەکردووە. بەگوێرەی پێداچوونەوەکانی کەناڵی فەرمی دەوڵەت بەناوی (تەرەتە) گوایە ئەو کاسێتە مۆنتاژکراوە، تەنانەت دەیووت ئەوەی دیمانەی لەگەڵ (عوسمان ئۆجالان)دا کردووە میدحەت بەرەکات نییە بەڵکو کادیرێکی (پەکەکە)بووە. بەمشێوەیە دەیانویست ڕوژنامەوانەکان بەوە تۆمەتبار

بکەن گوایە ئەوەی (پەکەکە) باسی نەکردووە ئەوان بەناوی (پەکەکە)وە باسی دەکەن، بێگومان هەموو ئەمانەش بیروبۆچونی سوپا سالاری تورک (دۆغان گورێش) بوو [٢٣٤].

دوابەدوای ئەم تومەت و رق و قینەی سوپا سالاری تورک (دۆغان گورێش) بەرامبەر بە رۆژنامەوان (محەمەد عەلی بیراند)، نوسەرە تورکەکانیش لە گۆشەکانی خۆیان لە رۆژنامەکاندا دەستیان کرد بە نوسینی تاوانبار کردن و تەشهیرکردنی (محەمەد عەلی بیراند) [٢٣٥]، بەلام ئەم پەڕۆی درۆیانەیان پینەکەی نەدەگرت. ماوەی مانگێک بوو هەمان رۆژنامەوان و نوسەران و کەناڵ و رۆژنامەی خۆیان کە بەردەوام گەریلاکانی (پەکەکە)یان وەک زەرنەقوتە بچوک کردبووە و کردوبویان بە پۆڕی خوراوی بەردەست سوپای تورک کەچی ئێستا (محەمەد عەلی بیراند) هاتووە هەموو ئەم بانگەشانەیانی ڤالا دەردەخست، بێگومان ئەمەش مایەی قەبوڵکردنی ئەوان نەبوو. بەگوێرەی سوپا سالار و نوسەر و رۆژنامەوان و سیاسەتمەداران و رۆژنامە و کەناڵەکانی تورک بێت سوپاکەیان لەهەمبەر (پەکەکە) سەرکەوتنێکی زۆر مەزنیان بەدەست هێناوە کە (دۆغان گورێش) سەرۆکایەتی دەکرد ،(گوایە) .

---

[٢٣٤] ٢٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حوریەتی تورکی )

[٢٣٥] ٢٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ نوسەر ( ئەمین چۆلاشان ) رۆژنامەی ( حوریەتی تورکی ) .

## (پەکەکە) لۆژیکی شەڕیان گۆڕی

دوای ئەوەی شەڕی باشوری کوردستان بەتەواوەتی کۆتایی پێهات، لەبەرەی جیاوازەوە هەڵسەنگاندن بۆ شەڕەکان دەکران. یەکێک لەهەڵسەنگاندنەکان کە ببووە مایەی سەرنج، بۆچونەکانی فەرماندە (عەزیز ئاکرەیی)بوو، لەساڵی (١٩٦٢) (عەزیز ئاکرەیی) لە کەرکوک و هەولێر یەکێک بوو لە فەرماندە باڵاکانی (پەدەکە). لەدوای رێککەوتنی نێوان شۆڕشی کورد و رژێمی عێراق لە ساڵی (١٩٧٠) ئیتر ناوبراو لە ناو سوپای عێراقدا وەکو فەرماندە دەست بەکار بووە. لە شەڕی ئەم دواییەی نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەریم) لە (خواکورک) چاودێری هێزەکانی (پەکەکە)ی کردووە. (عەزیز ئاکرەیی) کە سەردەمانێک لەناو حکومەتی عێراقدا وەزیریش بووە، ئاستی سەربازی شەڕی باشوری بەمشێوەیە هەڵدەسەنگاند :

**(مەحاڵە کەسێک بتوانێت بڵێت لە شەڕی خواکورک لە لۆژیکی شەڕی گەریلاکانی پەکەکە حاڵی بوبێت. من هێشتا ئەقڵم ئەو شتانە ناگرێت کە بە چاوی خۆم بینیومن و گوێبیستیان بووم. گەریلاکانی پەکەکە راستەوراست لۆژیکی جەنگیان گۆڕیوە. بێشک ئەو شەڕەی گەریلاکانی پەکەکە کردویانە شەڕێکە کە پێچەوانەی لۆژیکی شەڕی کلاسیکییە. لەو ماوەیەی پێشو ئەوەندەی بزانم هێزێکی چەکداری هێرشیان کردووەتە سەر گەریلاکانی پەکەکە، هێشتا تازەبەتازە لەناو دوکەڵی شەڕێکی نوێدا دەربازیان ببوو کەوتنە ناو جەرگەی ئەم شەڕەوە و شەڕێکی باشیان کردبوو. لەسەر هەر گردێکی ستراتیژیدا نزیکەی ١٥ بۆ ٢٠ گەریلایەکیان جێگیرکردبوو، ئەمانەش دژ بە کاری سیخوڕی، هێرشی پیادەیی، زرێپۆش و دژ بە هێرشە ئاسمانییەکان شەڕیان دەکرد. ئەوان شەڕێکی دژواریان دەکرد و بەتایبەتی پەلامارییە ئاسمانییەکانیان بە تەکتیکی نوێی خۆیان مایەپوچ دەکردەوە. لەلایەکی تریشەوە هێزەکانی پێشمەرگە هاوشانی سوپای تورک هێرشیان بۆدەهێنان، لەبەرئەوەی پێشمەرگە لەبارەی شەڕی گەریلایەتییەوە بێ ئەزمون بوون و بە شەڕی مەیدانی راهاتوون نەیادەتوانی بەرامبەر بە گەریلاکان سەرکەوتن بەدەست بخەن، بەڵام گەریلا بە شێوەیەکی دسپلینی شەڕ دەکەن و خاوەن توانایەکی بزوێنەرن. لەهەموو نەهامەتی و زۆربۆهێنان و نارەحەتییەکاندا**

گەریلاکان دەیانتوانی بەهانای یەکترەوە بچن. بەرپەچدانەوەکانی گەریلا بەسەر پێشمەرگەدا زۆر کاریگەر بوو، لەبەرئەوەی زۆر بە سەرنج و وریایانە دەجولانەوە. ئەو سەنگەرەی مەبەستیان بوایە بەباشی قایمیان دەکرد. بەدرێژای شەڕەکان لە نێوان گەریلا و فەرماندەکانیاندا ڕێڕەوێکی پەیوەندی هەبوو کە دەیانتوانی بەردەوام لەنێوان خۆیاندا دیالۆگ هەبێت. فەرماندەکانی پێشمەرگە بەگشتی بە لۆژیکی ئەوەی گوایە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا گەریلاکان لەناودەبەن کەوتنە شەڕەوە، بەڵام زۆر بە خراپی کەوتنە هەڵەوە. لەم شەڕانەدا گەریلاکانی پەکەکە بۆ سوپای تورک و هێزەکانی پەدەکە و یەنەکە یان سەلماند کە بەهیچ شێوەیەک بەهێزی چەکداری ناتوانن لەناویان بدەن. پەکەکە لە ئاستی سەربازیدا لە پێشکەوتندایە و پێشیش دەکەوێت)[٢٣٦].

---

[٢٣٦] قسەی نێوان وتەبێژ (ڕەجەب باتور) لەگەڵ ( عەزیز ئاکرەیی ) خواکورک ساڵی ١٩٩٢ .

## مامەڵەی (سلۆپی)

سەرۆکی (پارتی دیموکراتی کوردستانی -عێراق) پەدەکە (مەسعود بارزانی) و سکرتێری گشتی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) یەنەکە (جەلال تاڵەبانی)، لەدوای کۆتایی هێنانی شەڕی باشور، لە بەیانی رۆژی ١١ی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٢) هاتن بۆ فەرماندارێتی جەندرمە لە شارۆچکەی (سلۆپی). ئەمە یەکەمین چاوپێکەوتنی نێوان دەسەلاتدارانی کورد و تورک بوو کە لەئاستی باڵادا ئەنجام بدرێت. لەبەشی تورک کەسانی وەک فەرماندەی گشتی هێزی پیادەیی جەندرمە (ئەشرەف بیتلیس) و ئەفسەرە باڵاکانی وەک (مەتا سەیار و نەجاتی ئۆزکان) بەشدارییان لەم کۆبونەوەیە کردبوو. لەکاتی ئەم دیدارانەدا ئاستی پاراستن و چاودێری شارۆچکەی (سلۆپی) چڕکرابووە و لەهەمانکاتیشدا دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) بۆماوەیەکی کاتی داخرا.

لەبارەی ئەم چاوپێکەوتنەدا دەوترا گوایە لەبارەی ئاسایشی سنورەکانەوە قسەکراوە و دیدارەکان سەرکەوتووانە بووە، بەڵام لەبارەی ناوەڕۆکی چاوپێکەوتنەکەیان هیچ لێدوانێکیان نەدا. مامە و کاکە لەدوای دیدارەکانیان لەکوێوە هاتبوون گەڕانەوە هەمان شوێنی خۆیان.

دەرەنجام و مامەڵەکانی نێوان ئەو دوو لایەنە بەمشێوەیە بوو:

(مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) داوایان لە ئەشرەف بیتلیسی کردبوو زرێپۆش و دەبابەکانیان بکشێننەوە، بەڵام ژەنراڵ ئەشرەف سوور بوو لەسەر ئەوەی لە سنورەکانی باشوری کوردستان بارەگای سەربازی خۆیان جێگیربکەن. ئەم بیرۆکەیە لەلایەن هەردوو سەرکردەی کوردەوە بە گەرمی پێشوازی لێنەکرابوو. جارێکی تر ژەنراڵ ئەشرەف کارتی هێزی (چەکوش)ی نێودەوڵەتی بۆ هەردوو سەرکردەی کورد دەرهێنابووەوە، بەڵام لایەنی کورد بە ئەشرەف یان وتبوو ئەگەر پێویست بکات بارەگاکانی هێزی (چەکوش) دەگوازنەوە بۆ ناو هەرێمی کوردستان. بڕیاری مانەوەی هێزی (چەکوش)ی نێودەوڵەتی جارێکی تر لە کۆتایی مانگی تشرینی دووەم لە پەرلەمانی تورکیا تاوتوێ دەکرایەوە.

بەرپرسیارانی باڵای دەوڵەتی تورک دەیانویست ئەو فەرماندە و گەریلایانەی بەرامبەر بە تورکیا تاوانیان ئەنجامداوە و ئێستا لە (زەلێ)ی سنوری ئێران جێگیربوونە رادەستی تورکیایان بکەنەوە، وەیاخود بەلای کەمەوە دەست بگیردرێت بەسەر کەمپەکانیاندا. دەوڵەتی

تورک دەیانویست ڕێگای هاتووچونەکانی گەریلا بخرێنە ژێر چاودێری خۆیانەوە و هەروەها داوایان لە بەرپرسیارانی حکومەتی هەرێم دەکرد گەریلاکانی (پەکەکە) چەک بکەن.

لەسەر ئەم داخوازییانەی دەوڵەتی تورک، سەرکردەکانی کورد وتبویان (هێزەکانی پەکەکە لەژێر دەسەلاتی ئێمەدا نین، چۆن دەتوانین ئەوانتان رادەست بکەینەوە!؟)، (جەلال تاڵەبانی) بە رۆژنامەوانەکانی دەوت (**ئێمە پابەندین بە ڕێککەوتنی جەنێفەوە**). بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتنە بێت کەسی پەناهەندە نادرێتەوە بەو وڵاتەی کە تێیدا هەڵاتووە[٢٣٧]، ژەنراڵ ئەشرەف بیتلیس دەیوت کە ناو و دۆسیەی تۆمەتبار و تاوەنبارانمان ئامادەکردووە و ئەیاندەین بە هاوپەیمانەکانمان. سەرۆکەکانی (پەدەکە و یەنەکە) لەبارەی کۆبونەوە سێ قۆڵییەکەی ئێران و سوریا و تورکیا نیگەرانی خۆیان هێنابووە زمان و هەروەها ناڕەزایشیان نیشان دەدا بەرامبەر بە هەمان کۆبونەوە سێ قۆڵییەکەی کەلە ١٤ی تشرینی دووەم بۆ دووەمجار دەبەسترایەوە. بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک لەبارەی ئەو کۆبونەوەیەی کە ناوزەند دەکرا بە (موداخەلەی ناوخۆیی) دەیانوت ئێمە نییەتێکی لەوجۆرەمان نییە موداخەلەی کاری ناوخۆیی هیچ وەڵاتێک بکەین [٢٣٨]، کەچی بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک بۆیە بانگهێشی وەزیرەکانی دەرەوەی ئێران و سوریایان کردبوو کە وەکو خۆیان بەرامبەر بە حکومەتی هەولێر و قەوارەی باشوری کوردستان ناڕەزایی نیشان بدەن. ئەو دڵنیاییەی (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) دابویان بە دەوڵەتی تورک تەنها ئەوەبوو چارەسەری دەدۆزنەوە بۆ ڕێگری کردن لە چالاکییەکانی گەریلاکانی پەکەکە لەسەر سنوری باشوری کوردستان.

بۆئەوەی ئەم بیرۆکەیان سەربگرێت بیریان لە چۆنیەتی ناوەڕۆکەکەی کردبووەوە. بەگوێرەی پیلانە نوێیەکەیان بەشی سنوری باشور (٧٠) بنکە دادەمەزرێنرێت و پێشمەرگەی تێدا جێگیر دەکەن و دەوڵەتی تورکیش خەرجی ئەو بنکانە دەگرێتە ئەستۆ. لەم بنکانە جیهازی راکاڵ دادەنرێت کە هەموویان گرێدراودەبن بە بارەگای گشتی سوپای تورکەوە و ئەگەر پێویست بکات ئەفسەرە باڵاکانی سوپای تورک دەتوانن موداخەلەی راستەوخۆی ئەو بنکانە بکەن. بەرامبەر بە پاراستنی ئاسایشی سنورەکان لەلایەن پێشمەرگەوە دەبێت دەوڵەتی تورک

---

[٢٣٧] ١٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی )

[٢٣٨] ٢٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( تورگور گوندەم )

دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل) بە کراوەیی بهێڵنەوە و بەردەوام هاوکاری ئازوقە و پێداویستی بێتە باشوری کوردستانەوە. لەهەمانکاتیشدا وەزیری ناوخۆی حکومەتی هەولێر (رۆژ نوری شاوەیس) لەمبارەیەوە وتبووی ٦بۆ ٨ هەزار پۆلیس لە پێشمەرگە پێکدەهێنن بۆ ئاسایشی سنورەکان[٢٣٩]، (جەلال تاڵەبانی)ش لەبارەی پاراستنی ئاسایشی سنورەکانەوە دەیوت **(ئەمکارانە لەئاکامی دانوساندن لە نێوان ئێمە و یەکینەکانی سوپای تورک دەخرێنە بواری جێبەجێکردنەوە)**[٢٤٠].

لە شارۆچکەی (سلۆپی) جارێکی تر هەمان نوێنەرانی سەرکردایەتی کورد و تورک لە ١٦ی مانگی کانون چاویان بەیەککەوتەوە. کۆبونەوەی ئەمجارەیان لەبارەی چۆنییەتی دەستبەکارکردن و شێوازی رێککەوتنەکانیان بوو. بەمشێوەیە جارێکی تر دوا پەردەی شەڕێکی تری باشوری کوردستان دادرایەوە.

---

[٢٣٩] ١٠ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( تورگور گوندەم )

[٢٤٠] ١٣ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( حورییەتی تورکی ) .

## (بەکەسمان نەوتووە پەکەکە چەک دەکەین)

دەوڵەتی تورک لەبارەی پێشهات و گۆڕانکارییەکانەوە بەختەوەر نەبوون و لەهەمانکاتیشدا لەئاستی سیاسیدا ناڕەحەتییان دەچێژا. سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان (فوئاد مەعسوم) دەیوت (**بەڵێنمان بەکەس نەداوە گەریلاکانی پەکەکە چەک دەکەین، دەستبەسەریان دەکەین یاخود لەناویان دەدەین**). بەمشێویە لەلایەن بەرزترین ئۆرگانی حکومەتی هەولێرەوە رێککەتنی نێوان ئەوان و (پەکەکە) دەسەلمێنرا، ئەم قسانەی (فوئاد مەعسوم) لەناو دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک شوێنێکی فراوانی گرتەوە. سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستان جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە تەنها لە ئاستی پاراستنی سنورەکاندا لەگەڵ حکومەتی تورکیا رێککەوتون. باسی ئەوەشی دەکرد چەکی شانی گەریلا چەکی قورس نین و بە ئامانجی خۆپاراستنە.

سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستان (فوئاد مەعسوم) لە ١٧ی مانگی تشرینی دووەم بەمشێوەیە وەڵامی پرسیارەکانی رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم) (عابید هۆشیار)ی ئەدایەوە:

**پرسیار :(لەم مانگەدا لە پەرلەمانی تورکیا تاوتوی مانەوە و نەمانەوەی هێزی (چەکوش)ی نێودەوڵەتی دەکرێت، بەڕای ئێوە چاوەڕێی ئەوە دەکرێت بڕیارێکی نەخوازیار دەربچێت؟، لە رەوشێکی ئاوادا چی باروردۆخێک دێتە ئاراوە؟).**

**وەڵام** :(لەو بڕوایەدام پەرلەمانی تورکیا بڕیاری مانەوەی هێزی چەکوش دەدات).

**پرسیار:(لەم رۆژانەی دواید هەندێک لە دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک هەوڵی ئەوەیاندا حکومەتی هەولێر تاوانبار بکەن بە هاریکاری پەکەکە؟).**

**وەڵام** :(ئەو رەخنە و تۆمەتانەی ئەوان ئەیدەنە پاڵ حکومەتی ئێمە و سەرکردەکانمان ئەمە نەک وەک رەخنە بەڵکو وەک پەلاماری هەڵدەسەنگێنین).

**پرسیار :(لەم دواییەدا حکومەتی ئەنقەرە بڕیاریدا جگە لە پێداویستییە سەربازییەکانی خۆیان لە ناوچەکە ناهێڵن هیچ لۆرییەکی تری بارهەڵگر لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە بێت بۆ باشور، بەواتایەک دەکرێت بوترێت لەسەر ئێوە ئابڵۆقەیان پێکهێناوە، بەڕای ئێوە کاردانەوەی ئەم بڕیارەیان چۆن دەبینن؟).**

**وەڵام** :(ئەم بڕیارەی حکومەتی تورکیا زەرەرێکی زۆری لە ئێمەداوە، لەبەرئەوەی داهاتی گومرکی نێوان ئێمە و تورکیا داهاتێکی باش بۆ حکومەتی هەرێم دەستەبەر دەکات، لەمبارەیەوە چاوپێکەوتنەکانمان لەگەڵ بەرپرسیارانی حکومەتی ئەنقەرە بەردەوامە).

**پرسیار :(دەزگا ڕاگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورک باسی ئەوەدەکەن دەوڵەتی تورک لەبارەی چەککردنی گەریلاکانی پەکەکە یاخود لەبارەی ڕادەستکردنەوەیان ئێوەیان هۆشیار کردووەتەوە، ئایا ئەمە تاچ ڕادەیەک ڕاستە؟).**

**وەڵام** :(ئێمە بەڵێنمان بەکەس نەداوە گەریلاکانی پەکەکە لەناو ئەدەین، ئێمە تەنها بەڵێنی ئەوەمانداوە گەریلاکانی پەکەکە لەسەر سنورەکان دووردەخەینەوە و ناهێلین لەسەر سنورەکانمان پەلاماری تورکیا بدەن و هەتا ئێستایش لەسەر ئەو بەڵێنانەی خۆمانین).

**پرسیار :(هەواڵەکانی تورک دەڵێن گوایە حکومەتی هەرێم بەڵێنی چەککردنی گەریلاکانی پەکەکەیان بە دەوڵەتی تورک داوە و هەروەها دەڵێن گوایە گەریلاکانی سەر سنوری ئێران هێشتا چەک نەکراون و بەرامبەر بە هەموو ئەمانەش حکومەتەکەی ئێوە تۆمەتبار دەکەن، لەمبارەیەوە ئێوە دەڵێن چی؟).**

**وەڵام** :(چەکەکانی دەستی گەریلاکانی پەکەکە بۆپاراستنی خۆیان بەکاری دەهێنن، پێشمەرگەکانمان سنورێکی دوور و درێژ دەپارێزن، چەکی دەستی گەریلاکان چەکی قورس نین و بەو چەکانەش هێرش ئەنجام نادرێن).

**پرسیار :(ئەنجامی کۆبونەوە سێ قۆڵییەکەی وەزیرانی دەرەوەی تورکیا، سوریا و ئێران کەلە تورکیا بەسترا دەرەنجامەکانی چۆن هەڵدەسەنگێنن؟).**

**وەڵام** :(بێشک هەندێک لە وەلاتە دراوسێکان لەبارەی گۆڕانکارییەکانی عێراق و کوردستانەوە نیگەرانیان هەیە، ئێمە هەوڵ دەدەین ئەو نیگەرانی و ترسانەیان نەهێڵین. ئێمە لایەنگری پارچەکردنی عێراق نین بەڵکو لایەنگری عێراقێکی دیموکراتین. سەرەتا لە کۆبونەوەی

یەکەمیان ئەنجامیان وەرنەگرت هەربۆیە جارێکی تر بە نیازن کەلە مانگی شوباتدا هەمان ئەو وەڵاتانە کۆبونەیەکی تر ئەنجام بدەن).

دوای بڵاوبونەوەی ئەم ریپۆرتاژەی (فوئاد مەعسوم) (پەکەکە) ئابڵوقەی سەر باشوری کوردستانی لادا، کە پێشوتر بەهۆی شەڕی باشورەوە سەپاندبوی[٢٤١].

[٢٤١] ١٨ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم ) .

## جموجۆڵی باکوری عێراق لەئاستی سیاسییەوە پێچەوانەی سەرکەوتنەکان بوو

لە تورکیا سەبارەت بە رەوشی سەربازی و سیاسییەوە هیچ کاتێک هەڵسەنگاندنێکی راست و رەوان نەکرا. لێکدانەوەکانی شەڕ وئەنجامە راستییەکان خرانە ناو قاسەی سەرۆکایەتی سوپای تورکەوە. ئەو روونکردنەوانەی بەرپرسیارانی دەوڵەت بۆ رایگشتی تورکیا دەیانکرد جگە لە دووبارەکردنەوەی رستە کۆن و بێکەڵکەکانی وەک (پشتی چەتەکانمان شکاند)، (بە هەزارەهامان لێکوشتن) ، (تیرۆریستەکان وەکو زەرنەقوتەی بەر باران لە گیانەلاندان) و (پەکەکە زیانێکی گەورەی گیانیان لێکەوتووە) هیچی تر نەبوو، بەردەوام ئەم قسانەیان دەهێنا ودەبرد و ئەیانکولان و دەیانبرژاندن. ئەم قسانەش زۆردوور بوون لە ئاستی راستی رووداوەکانەوە. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دورودرێژ بەسەر شەڕەکاندا ئینجا پەیتا.. پەیتا لەبارەی شەڕوپێکدادانەکانەوە هەندێک هەواڵی راست دەکەوتە بەرگوێ. یەکێک لەو کەسانەی کە کەمێک راستی دەردەبڕی ئەفسەر (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) بوو.( ئەحمەد جەم ئەرسەڤەردامەزرێنەری ژیتەم بوو).واتا ( تەشکیلاتی ئیستیخباراتی جەندرمە).

لە رووداوێکی تەمومژاویدا کۆپتەرێکی سەربازی سوپای تورک کەوتە خوارەوە و هەموو سەرنشینەکانی مردن. یەکێک لە سەرنشینەکان فەرماندەی گشتی پیادەیی جەندرمەی سوپای تورک ژەنراڵ (ئەشرەف بیتلیس)بوو کە تێیدا مرد. (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) یەکێک بوو لە دەستە راستەکانی (ئەشرەف بیتلیس) کە ساڵانێکی دوورو درێژ بوو دژ بە (پەکەکە) لە باکوری کوردستان شەڕی کردووە و بەرپرسی ئیستیخباراتی سەربازی بوو. وەکو دەوڵەتی تورک دەڵێت (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) ئەفسەرێک بووە دژی تیرۆر جەنگاوە. سوپای تورک (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر)یان کرد بە سەرۆکی (ژیتەم) واتا (تەشکیلاتی ئیستیخباراتی

جەندرمە). ناوبراو بۆ ماوەی (١٥) ساڵ لە هەرێمی (بۆتان و ئامەد) بەردەوام ئەرکی جیاواز و فەرمانداریتی گرووپی جیاوازی کردووە و لە شەڕی دژ بە (پەکەکە) جەنگاوە. ناوبراو بە گشتی لە هەرێمەکە ناوی لەگەڵ بکوژی نادیار و قاچاخچێتی و ئەشکەنجەدان و رفاندنی خەڵکی وەڵاتپارێز و دەستی لە خوێنی گەریلایەکی زۆری (پەکەکە) سوورە و خەڵکێکی زۆری ناوچەکانی بە زۆرەملێ کردووە بە سیخوڕ و یەکێکە لە دامەزرێنەری (کۆنترا گەریلا) کە تەشکیلاتێکی نایاسایی بووە. هەموو لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی خەڵکی و کەسانی وەڵاتپارێز بەتایبەت لەلایەن (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) ئەنجام دراون.

(ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) یەکێک بوو لە ئەندازیارانی تەکتیکی شەڕی باشوری کوردستان و لەناو سوپای تورکیشدا بە ئەفسەرێکی سەرکێش ناسراوە. پێش دەستپێکردنی شەڕی باشور (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) بە جلوبەرگی پێشمەرگایەتییەوە هاتووەتە بۆ باشور و کەشفی هەموو ناوچەکانی کردووە. لەگەڵ فەرماندە و سەرکردایەتییەکانی باشوری کوردستان تەکتیکی شەڕی باشوری داهێناوە. بەگوتەی خۆی گوایە چووەتە بنجوبنەوانی کەمپەکانی (پەکەکە) و وێنەیانی گرتووە، وەک خۆی دەڵێت لەگەڵ (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی)دا دانیشتووە و پیلانی شەڕی باشوریان داڕشتووە. لەکاتی شەڕوپێکدادانەکانی باشوردا لەرێی بێتەلەوە بەردەوام چاودێری شەڕەکانی کردووە لە (هەفتانین و خواکورک)، (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) لەرێی بێتەلەکەیەوە بەردەوام شوێنی گەریلاکانی بۆ فرۆکە جەنگییەکانی تورک و هاوان و تۆپە دوورهاوێژەکان دەستنیشانکردووە و هەروەها رێنمایی و فەرمانی داوە بە هێزی پێشمەرگە و سەربازەکان. ئەویش وەکو (ئەشرەف بیتلیس) بەرپرسی دۆسیەی کورد بووە لە باکوری کوردستان، ئەویش کەوتە بەرغەزەبی ململانێیەکانی ناو سوپای تورکەوە. سەرەڕای ئەوەی ناوبرا ماندونەناسێکی رەگەزپەرستی تورک و دڵسۆزێکی بێوێنەی دەوڵەتی تورک و دوژمنێکی سەرسەختی کورد بوو، بەڵام بەهۆی ترسی کوشتنییەوە لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی هاوپیشەی دەستبەرداری پێگەکەی خۆی بوو لە ناو سوپای تورک، ئەویش هەروەکو چەند هاوپیشەیەکی خۆی لەلایەن کەسانی

نادیارەوە ڕەوانەی ئەو دونیا کرا (٢٤٢)، لەدیمانەیەکیدا (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) کە ڕەوشی شەڕەکانی هەڵدەسنگاند، زۆر بە ووردی سەرنجی دەخستە سەر پێکهاتەکان. لەو دیمانەیەدا دانی بە شکستی سوپای تورک دەهێنا، کەبەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەیهێنانە زمان. ئەو دەیوت هۆکاری جیابونەوەی لەناو سوپای تورک ڕکەبەرایەتی و ناکۆکی و ململانێی کەسایەتی بووە. ئەوەشی دەدرکاند بەهۆی کێشە ناوخۆییەکانی ئەفسەرەکانی ناو سوپای تورکەوە سوپای تورک لە شەڕەکانی باشوری کوردستاندا سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە. (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) لەکاتی هەڵسەنگاندنی شەڕوپێکدادانەکاندا ئەوەی دەهێنایە زمان هەرگیز نەیویستووە قسەی کاڵ بکرێت بە سەربازەکانی، ناوبراو شرۆڤەی سەربازی و شەڕ و جەنگی زۆر بەباشی دەکرد، بەڵام لەبارەی سەرنەکەوتیان لەئاستی گەریلاکانی (پەکەکە) ئەرسەڤەر خۆی لەم مەسەلەیە بەدوور دەگرت و خۆی لە ڕەخنەکان دەپاراست و هۆی سەرنەکەوتنەکانیان بە خیانەتکردنی (جەلال تاڵەبانی)ییەوە گرێدەدا کە نەیتوانیوە و مەبەستی نەبووە بەباشی ڕێنمایی و فەرمانی باش بە هێزەکانی خۆیان بدات. ئەرسەڤەر کە هاوپەیمان و دۆستێکی نزیکی (مەسعود بارزانی) بوو باسی ئەوی نەدەکرد و بەهیچ شێوەیەکیش باسی لە هەڵە و کەموکوڕی (فازڵ موطنی میرانی و کەریم خانی برادۆست)ی نەدەکرد،

---

[٢٤٢] (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) بەوە ناسراوبوو لەناو سوپای تورک لایەنگری ماستاوچێتی و مامەحەمەیی نەبووە. چڕبونەوەی پاوانخوازی و خواستی دەسەڵاتدارێتی و ئارەزووی بەرزبونەوەی پلەی ئەفسەری وایکرد کە ئەویش وەک (ئەشرەف بیتلیس) ببێت بە قوربانی ململانێیەکانی ناو ئیستخبارات و سوپای تورک. ئەرسەڤەر لە ٢٦ی مانگی ئەموزی ساڵی (١٩٩٣) لە ئەنقەرە رفێنرا، لە ١ی تشرینی دووەمی هەمان ساڵ لە نزیک (ئێلماداغ) لە ئەنقەرە لاشەکەیان دۆزییەوە کە ٢ فیشەکیان بە سەرییەوەی نرابوو. ئەو بەردەوام ڕیپۆرتاژی لەگەڵ ڕۆژنامەکاندا دەکرد، هەربۆیە چەندینجار لەلایەن سەرکردایەتی فەرماندەیی جەندرمە و سەرکردایەتی گشتی سوپای تورک و دائیرەی ئیستیخباراتەوە بەوە تۆمەتبار دەکرا گوایە (زانیارییە نهێنییەکانی سوپای)ی لەلای خەڵکی تر درکاندووە و بەو هۆیەوە چەندینجار خراوەتە ژێر لێپرسینەوە.

ناکۆکییەکانی ناو خودی سوپای تورک ئەوەندە چڕببووەوە تەنانەت گوێیان بە پلەوپایەش نەدەدا. کەسانی وەک (ئەشرەف بیتلیس، ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر و ژەنراڵ بەختیار ئایدن) لەئاکامی ئەو ململانێیانەدا ژیانیان لەدەست دابوو، هەروەها بەهۆی ئەم ناکۆکییانەوە فەرماندەی هێزی پیادەیی سوپای تورک ژەنراڵ (محیەدین فیانتۆغلو) لەسەر کورسییەکەی لابرا. بازنەی سەرەکی ناو ناکۆکییەکانی سوپای تورک دەوترا بەهۆی لایەنگری ئەفسەرە باڵاکانی ناو سوپاوە بووە کەگوایە هەندێکیان لایەنگری (ئەڵمانیا)ن و هەندێکیشیان لایەنگری (ئەمەریکا)ن.

لەهەمانكاتیشدا بۆئەوەی نەزانرێت كە دۆستی دێرینن و هاوپەیمانیانن هەتا پێیبكرایە لەئاستیاندا خۆی لەگێلی دەدا.

لە شەڕی باشوردا دەوڵەتی تورك گەلێك زووتر پیلانەكەیان داڕشتبوو، لەمبارەیەشەوە سەركردایەتی كورد رۆڵێكی بەرچاویشیان بینیبوو. قسەكانی (ئەرسەڤەر) هەموو ئەمانەی پشتراست دەكردەوە. لەدرێژەی قسەوباسەكانی (ئەرسەڤەر) ووردەكاری پاڵەوانێتی و دەست بڵاوی و دەست رەنگینی سەركردە كوردەكانی باشوری دەخستە سەر ئاو.

(ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) شەڕی باشوری كوردستانی لەئاستی سەربازییەوە بۆ توركیا بە (سەركەوتن) و وەكو (سیاسی)یش وەكو (جوڵانەوەیەكی كوێرانە) هەڵدەسەنگاند. لەم بارەیەوە ئەرسەڤەر دەڵێت (**ئێمە خیانەتمان لێكرا، دەوڵەتی تورك روبەڕوی خیانەتی دۆستەكانیان بووەوە. توركیا روبەڕوی خیانەتی جەلال تاڵەبانی بووەوە، نزیكەی ٢٥٠٠ بۆ ٣٠٠٠ هەزار گەریلایەكی پەكەكە پەنایان بردووەتە لای جەلال تاڵەبانی. تاڵەبانی ئەوانی لە هەولێرەوە برد بۆ ناوچەكانی ژێر دەسەلاتی خۆی، ئەگەر بپرسین ئایا دوای ئەم هەموو شەڕە توركیا زیانی چیكردووە؟، بێگومان كردوویەتی. لەدوای شەڕی دژی گەریلا لە باكور عێراق خەریكە پەكەكە بگاتە ئاستی ئارتەشی رزگاریخوازی فەلەستین، ئێستا كەشوهەوایەكی سیاسی سامالاوییان بۆرەخساوە، پەكەكە یان گەیاندووەتە ئاستێك گوایە بەرگری لە مافی كورد دەكات و رێكخراوێكە گوایە خەباتی سیاسی دەبات بەڕێوە**)[٢٤٣].

---

[٢٤٣] ١٨ای گوڵانی ١٩٩٣ گۆڤاری ( ئاكتوێل) .

## (جەلال تاڵەبانی جموجۆڵی سەربازی باکوری عێراقی ویست)

(ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) کە بەشێوەیەکی وەستایانە باسی بارودۆخەکەی دەکرد، نەک بە شێوەیەکی زانایانە رۆژنامەوان قسەی پێبدرکێنێت بەڵکو خۆی دەیویست زانیارییەکان بدرکێنێت، (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) دیمانەیەکی لەگەڵ رۆژنامەی (ئایدن) سازدا کە بەمشێوەیە بوو :

**پرسیار :(پێش ئەوەی لەگەڵ هاوپەیمانەکانتاندا واتا پێشمەرگە جموجۆڵی سەربازیتان دژ بە پەکەکە لەساڵی ١٩٩٢ دەست پێبکات، ئێوە یەکێکن لەو ئەفسەرە باڵانەی کە پەیوەندی نێوان دەوڵەتی تورک و سەرانی بەرەی کوردستانیتان بەستووە، ئایا ئەو پەیوەندییانە چۆن بەستران؟).**

**وەڵام** :(جەلال تاڵەبانی سەرەتا پێشنیاری ئەوەی بۆ دەوڵەتی تورک کرد کە بارەگای عەبدوللە ئۆجالان لە شامەوە بگوازێتەوە بۆ هەولێر. تاڵەبانی دەیوت 'لییان گەڕێن بابێن بۆلای ئێمە دەیانخەینە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە، بەمشێوەیە دەتوانین ڕێگرییان لێبکەین چالاکی روو لە تورکیا ئەنجام نەدەن'. من ئەقڵم ئەمەی نەگرت، بەلام دەوڵەتیش ئەم پێشنیارەی قەبوڵ نەکرد. ئەو سەردەمە جەلال تاڵەبانی بەردەوام لە پەنای تورگوت ئۆزال بوو، بێگومان رۆژنامەوانەکان مەراقی ئەوەیان هەبوو ئایا ئەم جەلال تالەبانییە لەرێی کێوە هاتووە بۆ ئەنقەرە؟. وەکو ئێوەش دەزانن دوای رەزامەندی ژەنراڵەکانی سوپای تورک توانی بێت بۆ تورکیا، لەڕاستیدا جەلال تاڵەبانی لە باکوری عێراقدا خاوەن هێزێکی ئەوتۆی کاریگەر نییە. هێزێکی ئەوتۆی چەکداریشی نییە، خەزوری لە لەندەن دادەنیشێت، خەزووری کۆڵەکەی فکرەکانی ئەوە. جارناجارێک دەزگا ئیستیخباراتییەکان و حکومەتەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا گوێی رادەکێشن و وەلاشی دەخەن. ئەو گرنگی و بەهای تورکیا دەزانێت بۆیە بە پێوە

ماوەتەوە، جەلال تاڵەبانی دەیەوێت ببێت بە هێزێک کە بتوانێت بەرامبەر بە مەسعود بارزانی و پەدەکە قیت ببێتەوە و بۆئەم مەبەستەش پێویستی بە زەلامە. ژمارەیەک گەریلای پەکەکە هەن کە دەگەنە (١٠٠٠٠)هەزارکەسێک، ئەو دەیەوێت ئەم هێزە بەلای خۆیدا رابکێشێت. هەمیشە ویستویەتی بەرامبەر بە تورکیا گەمە بە کارتی ئاپۆ بکات. پێش دەستپێکردنی جموجوڵە سەربازییەکان لە باکوری عێراق جەلال تاڵەبانی رووبەکی خۆشی لە تورکیاوە نەبینی، دوایش یەک بۆ دوو سەرۆک عەشیرەتی ناوداری هەرێمەکەی نارد بۆ تورکیا. یەکێک لەوانە کەریم خانی برادۆست بوو کە بە بازرگانی شەڕ ناسراوە. نوێنەرێکی جەلال تاڵەبانی هەیە لە ئەنقەرە ناوی سەرچڵ قەزازە، ئەم زەلامانە کە هاتن لەرێی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا نێردران بۆلای سەرکردایەتی گشتی سوپای تورک. ئەگەر بپرسن لە تورکیا کێ بەرپرسیارە لە ئۆپەراسیۆن و دۆسیەی کورد بێگومان جەندرمە و ئیستیخبارات، ئەوانیش جەلال تاڵەبانیان نارد بۆلای جەندرمە وئیستیخباراتەکەی ئێمە، ئیتر هاتن و نوسان بە جەندرمەوە. لەناو سەرۆکایەتی گشتی جەندرمەدا کەسانێکی باشی ئەفسەر هەن کە سەرقاڵی دۆسیەی کورد و پەکەکە ن. کارەکانیان نارد بۆلای ئەو جۆرە ئەفسەرانە، فەرماندارێتی گشتی وتیان چاوپێکەتنیان لەگەڵ بکەن بزانن چییان دەوێت؟. لەگەڵ سەرچڵ قەزازدا قسەمان کرد، لێیانم پرسی چیتان دەوێت؟، پێیان وتین سەرۆکی عەشیرەتی برادۆست کەریم خان لە پەکەکە نارەحەتە، فرۆکەکانتان هێرش دەکەنە سەر ناوچەی برادۆست، خەڵکی سڤیل دەکوژرێت، بەهەڵە شوێنێکی زۆر بۆردۆمانکراوە، گوندنشینەکان ناچارماون کۆچ بکەن، کەریم خان دەیەوێت پەکەکە لە ناوچەکە دەربکات، دەمانەوێت ئێوەش هاوکاربن. داوایان کرد بەیەکەوە پەکەکە لە ناوچەکە دەربکەین، ئێمەش پێمانوتن زۆر باشە. پێمانوتن کەریم خانی برادۆست بێت بۆلامان. کەریم خان هات بۆ ئەنقەرە، کەریم خان چی لە دڵدابوو هەڵیڕشت، پێیوتین من دەمەوێت پەکەکە لە ناوچەکەمان دەربکەم، پەکەکە دوژمنی منە، لەتوپەتیان دەکەم. منیش ئەم مەسەلەیەم گەیاندە سەرووی خۆمان. لەگەڵ خوالێخۆش بوو ئەشرەف بیتلیس قسەمان کرد، پێموت ئەگەر ئەوان جدین با ئەم کارە بکەین، بێشک بەرژەوەندی ئێمەی تێدایە، بەلام بۆئەوەی زیاتر لە ووردەکاری مەسەلەکە حاڵی ببین پێویستە بچین بۆ ئەوێ و چاوێک بە ناوچەکە بگێڕین. ئەشرەف بیتلیس پرسی، کێ بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە گونجاوە؟، منیش پێموت من ئامادەم بڕۆم، هەروەها پێموت چەند

کەسێکی گونجا و بە ئەزموون لەگەڵ خۆم دەبەم و دەچم بۆ ئەوێ، ئەم دیدارەمان لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٢ ئەنجامدا).

**پرسیار : (لەکاتی ئەم دیدارەتاندا ناوی ئەشرەف بیتلیس لە ناوی یەکەمی لیستەکەتاندا بوو، بەڕای ئێوە قورسایی ئەشرەف بیتلیس لەم کارەدا چی بوو؟، هەروەها لە ناو سوپادا نوێنەرایەتی چی چەمکێکی دەکرد؟).**

**وەڵام** :(من وەکو بەرپرسی گرووپی ئیستیخباراتی سەر بە ئەشرەف بیتلیس کارم دەکرد، ئەویش دەیویست سەربەخۆ کارێک بکات و بە ئەنجامی بگەهێنێت. لەناو خەباتی دژ بە تیرۆر وەکو ئەفسەرێکی قارەمان و بێ وێنە تێدەکۆشا، لەبەر ئەوەی کوچی کردووە نامەوێت لەبارەیەوە زۆر قسە بکەم. گرووپێکی ٤ کەسیمان پێکهێنا و چووین بۆ باکوری عێراق، لە ناوچەی برادۆست چوینە گوندەکانی کەریم خانەوە لە خواکورک کە کەمپی پەکەکەیشی لێوە نزیک بوو. چووینە هەموو سوچ و پەنایەکی خواکورک، ئەتوانم بڵێم لە کەمپەکانی پەکەکە زۆر نزیک بوینەوە و لە سیدەکان لەناو گوندەکانی کەریم خان بووین. هەتا لیواری کەمپەکانی پەکەکە چوین، وێنەیانم گرت، تەنانەت بە کامیرەی ڤیدیۆش دیمەنیانم گرت. بێگومان هەمووومان جلوبەرگی پێشمەرگەمان لەبەردابوو، لەم دواییانەش کەناڵەکانی تورکیا دیمەنی ئێمەیان بڵاوکردەوە کە جلوبەرگی پێشمەرگەمان لەبەردابوو. ڕۆژنامەکانی وەک دێلی نیوز، سەباح، میللییەتی تورکی و ئێوەش لە ڕۆژنامەی بەرەو ٢٠٠٠ نوسیتان ئەو ئەفسەرە ئیستیخباراتچییانەی ناو سوپا کەبە کرمانجی قسە دەکەن. بەڵێ یەکێک لەو ئەفسەرانە من بووم. بەهیچ شێوەیەک شتێکی وانییە کە دەوترێت گوایە ڕێککەوتنی نهێنی واژۆ کراوە، تەنانەت بەڵگەی نوسراوەش نییە لە نێوانماندا. هەرکەسێک پرسیاریش بکات هەمان ئەم قسەیە دووبارە دەکەمەوە. لە گوندی کەریم خان ماینەوە، دوایش بەیەکەوە چووین بۆ سلێمانی. ماوەی ٢ ڕۆژ میوانی جەلال تاڵەبانی بووم، ئەو ڕۆژانەی مامەوە هەرلە سبەینێیەوە تاکو نیوەی شەو قسەوباسمان دەکرد. جەلال تاڵەبانی قسەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشەری باسکرد، جەلال تاڵەبانی پێیوتین "گەلی کورد بەرەچەلەک تورانییە"، ئێمە ڕابردوی جەلال تاڵەبانیمان دەزانی. لەو دەمەوە دەیناسین کەلە کۆلیژی یاسا لە بەغداد دەیخوێند. ژیان و ڕابردوی ئەومان بۆباسکرد. جەلال تاڵەبانی هەندێک تایبەتمەندی کۆنی خۆی هەبوو.

له کتێبخانەکەیدا هەندێک کتێبی نیشاندایـن، جەلال تاڵەبانی وتی " ئەو سەردەمە مارکسیزم مۆدێل بوو"، بۆیە کتێبی لەو شێوەیەی نوسیوە).

**پرسیار : (بێگومان چاوتان کەوت بە جەلال تاڵەبانی، بەیەکەوە بریاری ئۆپەراسیۆنەکانتاندا، ئێوە بەناوی دەوڵەتەوە کارتان دەکرد، ئایا ئەگەر ناڕاستەوخۆش بێت دانپیانانێک نییە بە حکومەتی کوردی لە باکوری عێراق؟).**

**وەڵام** :(ناسینێکی فەرمی نییە، هەموو شتێک ئادابی خۆی هەیە. ئێمە تا ئاستێک پەرەمان بەکارەکاندا و گەیشتینە ئاستێک و ئۆپەراسیۆنیش ئەنجامدرا. هەموو دەوڵەتێک بەبیانوی ئەوەی هێزی سوپای خۆماڵی خۆی بەکار نەهێنێت ئەتوانێت بۆ ئامانجی تایبەتی خۆی کۆمەڵێک کار بکات. کەریم خانی برادۆست زۆر بە بڕیاربوو دەیوت " من ئەم کارە دەکەم بەڵام هێزی پێشمەرگە بۆئەم کارە تەواوکەر نییە، با مام جەلالیش هاوکاریم بکات، ئەگەربێت و مام جەلال ۱۰۰۰ هەزار پێشمەرگەی خۆیم بداتێ ئەوا دەتوانم گەریلاکانی پەکەکە لەناوبەرم"، کەریم خان باوەڕی وابوو ئەم کارە بە ۲ بۆ ۳ ڕۆژێک تەواوی دەکات، جەلال تاڵەبانیش دەیوت "ئامادەم پێشمەرگە بدەم"، کاتێک ئێمە گەڕاینەوە بۆ تورکیا جەلال تاڵەبانی هەندێک شتی بە ڕۆژنامەوانەکان وت، تاڵەبانی پێیوتبون "من داوای دیبلۆماتم کردووە لە تورکیا کەچی ئیستیخباراتچییان ناردووە بۆلام". گەڕامەوە بۆ تورکیا لەبارەی گەشت و تێبینییەکانم ڕاپۆرتی خۆمم پێشکەش بە فەرمانداریێتی گشتی جەندرمە کرد. ماوەی ۱۵ بۆ ۲۰ ڕۆژێک بە چاوەڕوانییەوە بەسەرچوو، لەدوایدا جەلال تاڵەبانی وتی "لە کوردستان من تاکە هێز نیم، پەدەکە ش هەیە، پەرلەمان هەیە، دەبێت بەرەی کوردستانی بڕیار بدات، دەبێت هەموو هێزی پێشمەرگە بەشداری لەم کارە بکەن، بەمشێوەیە دەتوانین لە ماوەی ۳ ڕۆژدا پەکەکە لە هەرێمەکە دەربکەین"، ئێمەش ڕەزامەندی خۆمان لەسەر ئەم بۆچونەی جەلال تاڵەبانی نیشاندا، پێمانوت "هێزی دەوڵەتی تورکتان لەپشتە، هەرچییەک لە ئارادا هەیە بێشک هێزی دەوڵەت دەتوانێت بەرەنگاری ببێتەوە"، دوایش پەرلەمانی کوردستان لەمبارەیەوە بڕیاری خۆیدا. بە ئەشرەف بیتلیسم وت " ڕاستە ئەم زەلامانە ئەم کارە ئەنجام دەدەن، بەڵام پێویستە کۆنترۆڵ بکرێن، من دەزانم ئەمانە هێشتا پەکەکە ناناسن"، دوایش بەلایەنی کوردیم وت "ئێوە پێتانوایە پەکەکە مریشکە و کە کشەتان لێکرد ئیتر لادەچن، ئێوە دوژمنی خۆتان ناناسن"، ئەوانیش پێیان وتم "نا..نا، ئێمە پێشمەرگەین، لەماوەی ۲بۆ ۳ ڕۆژێکدا ئەوان لەناو

دەدەین، لەم هەرێمە دەریان دەکەین، ئەگەر بە قسەمانیان نەکرد هەموویان دەسڕینەوە". بەڵێ بەمشێوەیە ئۆپەراسیۆن و جموجۆڵە سەربازییەکەی باکوری عێراق بە هاوکاری پێشمەرگە دەستی پێکرد).

**پرسیار : (ئایا بۆچی لەناو سوپا جیابونەوە؟).**

**وەلام** :(هۆکاری سەرەکی جموجۆڵی باکوری عێراق بوو، ئەمڕۆ کە ٥ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣) یە ئایا ڕەوشی شەڕ لە تورکیا چۆنە؟، هۆکاری بەردەوامی ئەم شەڕەی ئێرە بێشک جموجۆڵە سەربازییەکەی ساڵی (١٩٩٢) ە،کەلە باکوری عێراق ئەنجامدرا، ئەم جموجۆڵە سەربازییە هەڵە بوو، بێزانیاری پێشوەختی ئەنجامدرا. تورکیا بەبێ ئەوەی لە هەرێمەکە زانیاری گشتی هەبێت و کاروباری ڕێکخستنی پێویست بکات گلایە ناو ئەم جموجۆڵەوە. من یەکێکم لەو کەسە سەرەکییانەی ناو جموجۆڵە سەربازییەکەی باکوری عێراق، هەرلە سەرەتای هاتنی جەلال تاڵەبانییەوە هەتا سەردەمی ئەشرەف بیتلیس و لە سەرەتای دەستپێکردنی جموجۆڵەکە تاکو کۆتایشی من لەناویدابووم. لەهەردوو بەشی جموجۆڵەکە من کارم دەکرد، کەمێک هاوکاری هێزی پێشمەرگەم کرد. ئێمە هەر لە دەستپێکەوە دەمانزانی جموجۆڵەکە لە ٢ی تەموزی ساڵی (١٩٩٢) دەست پێدەکات. هێزەکانی جەلال تاڵەبانی و بارزانی لە بەشی عێراقەوە و ئێمەش لەبەشی تورکیا دەستماندەکرد بە ئەنجامدانی هێرشەکان. هەندێک نیگەرانیم هەبوون و درکم بە مەترسی کردبوو، ئەوکاتە بە فەرماندە پلە باڵاکانم دەوت بەشێک لە ناوچەکانی سۆران لەژێر کاریگەری عەشیرەتی برادۆستدایە، بۆیە پێویستە و گونجاویشە شەڕەکانی ئێرە لەژێر فەرمانداریتی پێشمەرگەکانی برادوست بێت، هەروەها وتم لەبارەی بەشی زاخۆوە گومان و مەترسیم هەیە، چونکە لەو ناوچەیەدا ساڵێک لەمەوبەر پەکەکە پارتێکی دروستکردبوو بە ناوی پارتی ئازادی کوردستان، لەم ناوچەیە خەریکە پیاوێکی زوری عەشیرەتی سیندی و لایەنگرانی جەلال تاڵەبانی سوزیان بۆ پەکەکە بجوڵێت و ببن بە هاریکاریان، بەلام پیاوەکانی مەسعود بارزانی بێلایەن بوون. من دەموت "ئەو پێشمەرگانەی لە عەشیرەتی سیندین لەگەڵ گەریلاکانی پەکەکە شەڕ ناکەن"، بەداخەوە هەروایشی لێهات).

**پرسیار :**(پێش ئەنجامدانی جموجۆڵەکە، سادق عومەر سەرکردەیەکی بەرچاوی ناو عەشیرەتی سیندی بوو، بەڵام کوژرا، وتیان گوایە (میت) ئەم کارەی ئەنجامداوە، ئایا ئێوە ئەم رووداوەت وەبیردێتەوە؟).

**وەڵام :**(ئەوەی راستی بێت شەڕ گرێدراوە بە چەند باڵێکی سیاسییەوە، جموجۆڵی باکوری عێراق لەئاکامدا سیاسەتێکی دوڕاوی هەیە، چونکە لەدوای هەر جموجۆڵێکی سەربازی چاوەڕێی سەرکەوتنێکی لەسەداسەد دەکرێت. سەرکەوتنەکە ئەوەبوو پەکەکە لەناوچەکانی باکوری عێراق لەناو بدرێن، بەڵام ئەمە نەهاتەدی، لەئاکامدا گەریلاکانی پەکەکە لە شوێنەکانی وەک زەڤیری، خواکورک، شیوێ، هەفتانین و لە دەشتەکانی سنات و لە ئەشکەوتەکانەوە نێردران بۆ ناو ماڵەکانی شاری سلێمانی و هەولێر، هەروەها هێنرانە ئاستی ئەرتەشی رزگاریخوازی فەلەستین. بەداخەوە جموجۆڵی باکوری عێراق تەنها ئەو سودانەی هەبوو، دوژمنانمان رزگاریان بوو).

**پرسیار :**(ئەی باشە بۆچی پەکەکە ئەوەندە زیانی لێکەوت؟).

**وەڵام :**(سەرەتا با ئەوە بزانین ئایا ئەوەی سوپا لەناو تورکیا پێینەکرا ئایا چۆن توانیوێتی لەوێ ئەنجامی بدات. پەکەکە لەناو تورکیا هەڵەی گەورەی کرد، بەڵام عەبدوڵڵە ئۆجالان بەرەنگاری ئەمانە بووەوە. لە ٢ی تەموز ئەوکاتەی پێشمەرگە دەستیان کرد بە ئەنجامدانی هێرشەکان عەبدوڵڵە ئۆجالان لە گوندێکی سوریا لەرێی راکاڵەوە فەرمانی بۆ هێزەکانی گەریلا دەرکرد. عەبدوڵڵە ئۆجالان لەرێی فەرماندەیەکی خۆیان بەناوی (موراد قەرەیلان)ەوە رێنمایی و فەرمانی کرد بە هێزەکەیان و پێی وتن "دوژمن هێرش بۆ ناوچەکانتان دەهێنێت، بەتایبەتی ناوچەکانی بادینان و بۆتان، دەکرێت ئەو هەرێمانە بکرێن بە چەقی باڵا دستیمان، ئەو ناوچە و هەرێمانە بۆئێمە زۆر گرنگن، هەتا پێتان دەکرێت ئەو ناوچانە بپارێزن و هەرگیز شەڕی مەیدانی مەکەن"، ئەوکاتەی عەبدوڵڵە ئۆجالان ئەم فەرمانانەی دەدا لەرێی راکاڵەوە ئێمە گوێمان لێدەگرد. لە سێیەمین رۆژی جموجۆڵە سەربازییەکەدا رێککەوتن لەنێوان پەکەکە و بەرەی کوردستانی هاتەئاراوە. بۆ گەیشتن بە رێککەوتن بەناوی پەکەکە وە عوسمان ئۆجالان و کەنعان سیمۆن لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتی هەرێم کە پێکهاتبوون لە سەرۆک وەزیران فوئاد مەعسوم و جێگرەکەی بەناوی رۆژ نوری شاوەیس دانشتنیان کرد. ئێمە ئاگەداری سەروی خۆمانمان کرد رێککەوتن کراوە، پێیان وتین "نەخێر شتیوانییە"، بەڵام

ڕێککەوتنیان کرد. کاتێک پێشمەرگە لە تورکیا چەکی وەردەگرت کەچی لە بەرەی خواکورک یەک فیشەکیشیان نەدەتەقاند. لەدوای جموجۆڵە سەربازییەکە لەسەر سنورەکان بنکەی نوێ دادەمەزرێنران، هەموو پێداویستییەکانیشیان بۆدابین دەکرا، هەموو شتێکیان بۆ دەستبەر کرابوو. دوای مانگێک بەسەر ڕێککەوتنەکە ئەو سەنگەر و بنکانەی پەکەکە چۆڵی کردبوون جارێکی تر لێیجێگیر بوونەوە، حەزەکەن خۆتان برۆن تەماشاکەن. لە نێوان زاخۆ و دهۆک ماشێنی تونێتە هەیە کە هاتوچۆ دەکەن، دەوڵەتی تورک پارەی ئەو تونێتانەی داوە تاکو پێشمەرگەکان هاتوچۆی پێبکەن، گوایە ئەم تونێتانە ئەرکیان ئەوەیە لە نێوان ئەو بنکە نوێیانە هاتوچۆ بکەن و ئازووقە و پێداویستی بگوازنەوە. من خۆم چووم بۆ فەرماندارێتی کە شوێنی لێپرسینەوە و حیسابداینە، حیسابی خۆمدا، بەڵام ئەوانەی قسەکانی ئێمەیان بە هەل و بە جدی وەرنەدەگرت دەبێت ئەوانیش حیساب بدەن، ئەی بۆ لێپرسینەوەیان لەگەڵ ناکەن؟!).

**پرسیار :(لەکاتی دەستپێکردنی جموجۆڵی باکوری عێراق وترا گوایە هێزی چەکوشی نێودەوڵەتی هاریکاری باشی هەبووە؟).**

**وەلام :**(هێزی چەکوشی نێودەوڵەتی هەرگیز هاریکار نەبووە، ئەوەی پێی دەڵێن هێزی چەکوشی نێودەوڵەتی بارەگاکانیان لە شاری ئەدەنەیە. ئەوان دوو ئۆفیسی پەیوەندییان هەیە، یەکێکیان لە دیاربەکر و ئەویتریان لە باکوری عێراقە، ئەوان فڕۆکەی دەورییان هەیە و هەروەها کۆپتەرەکانیشیان بۆ هەماهەنگی و بۆ پەیوەندی بەسەر شارەکانی وەک شەقلاوە و هەولێر و سلێمانی و دیاربەکر لەفڕیندان. سەبارەت بە هێرشەکانی باکوری عێراق لەوکاتەدا هیچ دیاردەیەکی ڕژێمی سەدام نەبوو، بەپێچەوانەوە بەڵکو سەدام هێزەکانی خۆیانی کشانەوە و ناردیانی بۆ باشوری عێراق).

**پرسیار :(ساڵی پار ئەوکاتەی دەنگۆی درێژبونەوەی وادەی مانەوەی هێزی چەکوش لە تورکیا لە ناو پەرلەماندا گەنگەشەی دەکرا، لە باکوری عێراق دوو ڕووداو هاتنە ئاراوە، لۆرییەکانی تورکیا سوتێنران هەروەها هەوڵی کوشتنی خاتوو میتەران درا، هەموو دەزگا ڕاگەیاندنەکان بە تورکیاشەوە پەنجەی تۆمەتیان بۆ سەدام حوسێن ڕادەکێشا، ئایا هۆکاری هاتنە ئاراوەی ئەم ڕووداوانە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟).**

**وەلام :**(لە پرسیارەکەت حاڵی بووم، دەبا وەڵامتان بدەمەوە، بەڵام پێویستە جەلال تاڵەبانی حیسابی هەموو ئەمانە بدات. لەکاتی ڕووداوەکان ئێمە لەوێ بووین، لەڕاستیدا ڕووداوەکە

دروستکراوبوون، هەروەها تاوانەکەیان خستە مل سەدام. ئەوەی بۆردۆمانەکانی ماشینەکانی تورکیای لەیادە، ئەو لۆری تورکییانە بۆ بردنی هاوکارییەکانی {یوئێن} دەچون بۆ موسڵ. لەم کاتەدا لە پەرلەمانی تورکیا باسی ئایا هێزی چەکوش لە تورکیا بمێنێتەوە یاخود نەمینێتەوە دەخرێتە دەنگدانەوە، کەواتە تورکیا دەبێت بڕیاربدات ئایا سەدام بەلایە یاننا، بمێنێتەوە یان نەمێنێتەوە، زیانی هەیە یان قازانج لەم بارەیەوە دەبێت بڕیاربدرایە، ئێوە خۆتان بیربکەنەوە گوایە سەدام فەرمانی بە ئیستیخباراتی خۆی دەکات لۆری تورکی بسوتینن تاکو تورکیا بڕیاری مانەوەی هێزی چەکوش لە وەلاتەکەی دەربکات، ئایا کارێکی لەم چەشنە ئەقڵ دەیگرێت؟، بەلام نازانم ئایا حکومەتی تورکیا ئەم گەمەیە قەبوڵ دەکات یان نایکات. لە دونیادا درۆ نەما جەلال تاڵەبانی لەبارەی سەدامەوە نەیکات. ئەگەر دەتانەوێت بەردەوام میللەتێک بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆتانەوە بەردەوام رۆژەڤی گەرماوگەرم بڕەخسێنن تاکو سەرقاڵیان بکەن. بەمشێوەیە دەیانەوێت کورد لەوێ لە حاڵەتی نەبونی و پەشێوی بمێننەوە. بەردەوام ترسناکی سەدام وەبیری خەڵک دەهێننەوە، هەموو ئەمانە نەخشە و پیلانن، هەوڵی کوشتنی خانم میتران نمونەیەکی تری ئەو نەخشە و پیلانەیە کەباسم کرد).

## (جەلال تاڵەبانی پێشنیاری جموجۆڵی سەربازی کرد)

(ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ رۆژنامەوان (عەلی ئونجو)ی پەیامنێری رۆژنامەی (تەرجومان) کەلە ١٤ی مانگی ئابی ساڵی (١٩٩٣) ئەنجامیدابوو بەش لەدوای بەش بڵاوکرایەوە. سەبارەت بە شەڕی باشوری کوردستان مژارگەلیکی زور و زانیاری زور گرنگی درکاند، هەروەها (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) دیمانەیەکی تری لەگەڵ گوڤاری (تەفریق)ی تورکیدا کرد کە باسی لە ووردەکارییەکانی ئامادەباشی شەری باشور و بەشی لای تورکیاشی کردبوو. لەرێی ئەم دیمانەیەیدا باسی لە کەسایەتی سەرکردەکانی باشور کردبوو هەروەها زانیاری ووردی درکاندبوو، هەروەها لە بارەی ناکوکییەکانی ناو گروپی (کۆنترا گەریلا)ی سەر بە دەوڵەتی تورک دەهێنایە زمان لەمەڕ کێشەی کورد و ناوی (کونترا گەریلا)یش وەک (هەڵۆزادە) ناوزەند دەکرد، دیمانەکەی (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) لەگەڵ رۆژنامەی (تەرجومان)ی تورکی بەمشێوەیە بوو :

**پرسیار** : (**سەرکردایەتی پەکەکە لە تورکیا هەندێک رۆژنامە و رۆژنامەوانی بەکار هێنا و رایانگەیاند دەیانەوێت ئاگربەست بکەن، ئایا ئێوە وەک کەسێکی ئیستیخبارات ئەمە چۆن هەڵدەسەنگێنن و بەڕای ئێوە پەکەکە بە نیازی چییە؟**).

**وەڵام** :(لەنێوان هۆکاری سەرەکی بیرۆکەی ئەم ئاگر بەستە جموجولی سەربازی باکوری عێراق بەدیدەکرێت، پێویستە بە دوولایەن هەڵسەنگاندن بۆ جموجولی سەربازی باکوری عێراق بکرێت، ئەویش رووی سەربازی و سیاسییە. دەتوانرێت لەئاستی سەربازییەوە شەڕی باکوری عێراق بە سەرکەوتوانە لەقەڵەم بدرێت، سوپای تورک هەتا توانی و لەدەستی هات کێشای بەسەر پەکەکەدا، بەمشێوەیە ئەرکی سەرشانی خۆیانیان بەجیهێنا. سوپای تورک چی کەوتە پێش لە تێرۆریستان هەموویانی راماڵی، بەڵام هەندێک لە تیرۆریستەکان توانیان بە سوود وەرگرتن لە دەرفەتەکان خۆیان قوتار بکەن و لە گورەپانی شەڕەکان هەڵبێن و خۆیان لە مردن رزگاربکەن. لەئاکامدا جەلال تاڵەبانیش باوەشی بۆکردنەوە و لەسایەی ئەودا

٢بۆ٣ هەزار تیرۆریستێکی پەکەکە رزگاریان بوو. بۆماوەیەک کەمپەکانی پەکەکە لەسەر سنوری تورکیا چۆلکران، شوێنی مانەوە و شوێنی حەوانەوەیان تەفروتونا کرا و ناچارمان لەناو تورکیاوە بەرەو باکوری عێراق هەلّبێن. پێویستە لەمبارەیەوە لەبارەی چەند شتێکەوە هەلّوێستە بکرێت، جموجۆلّی سەربازی باکوری عێراق بۆ چەند مەرامێکی سیاسیش بەکارهێنرا. ئەم مژارانەش سیاسەتمەداران چوارچێوەی بۆ دەتاشن، کەواتە دەتوانین بلّێین تائەم ئاستە سیاسەت و دوای ئەو ئاستەش شەڕ دەدوێت، ئەم سیاسەت و شەڕکردنانە تەواوکەری یەکترین، شەڕ بێ سیاسەت و سیاسەتیش بێ شەڕ نابێت، بەلّام شەڕی باکوری عێراق بەبێ هیچ بنەمایەکی سیاسی هاتەئاراوە. تەنها ئەو بۆچونە هەبوو کە دەیانوت پەکەکە لەسەر سنور دووربخرێتەوە، کەمپەکانی پەکەکە لە باکوری عێراق لەناوبدرێت، گەریلاکانیان بۆکوێ دەچن بابچن، ئەم زهنییەتە زالّ بوو، هەربۆیە ئامانجی سەرەکی سوپای تورکیش لەناودانی تیرۆریستان بوو. پێویست بوو پێشوتر چاودێرییەکی باشی هەرێمەکانمان بکردایە و ئینجا بکەوتنایەتە سەروگوێلاکی پەکەکە و وازمان نەهێنایە هەتا تەواومان دەکردن، بەلّام ئەمە نەکرا) .

**پرسیار** :(**ئاشکرایە جەلال تالّەبانی خیانەتی کرد و بۆ هەلّاتنی تیرۆریستان ئاسانکاری کردووە و چواردەوریشیانی بە چۆلکراوەیی هێشتووەتەوە!**).

**وەلّام** :(بەڕێزم، ئەگەر یەکینەکانی سەربازی بیانتوانایە لە پشتیانەوە بە پەرەشوت دابەزن ئەوانیش نەیاندەتوانی هەلّبێن. ئەوەی لێرە زۆر مەبەستە کە باسبکرێت ئەوەیە بەگوێرەی ئەو بەلّێنەی بە ئێمە درابوو پێشمەرگەکانی جەلال تالّەبانی ئەرکەکانی خۆیان بەجێنەهێنا، بەلّام دەبوایە ژەنرالّەکانمان بیریان لەوە بکردایەتەوە دوولایەنی هاورەگەز هەربە سرووشتی لەنێوانیان لەوانەیە خیانەت نەکردن و چاوپۆشی کردن لەیەکتری لە نێوانیان بێتەئاراوە. بۆچی لەناو ریزەکانی ئەو پێشمەرگانەدا ئەفسەری تورک جێگیرنەکران؟، لەڕاستیدا ناشکرێت فەرماندە بالّاکان زۆر تۆمەتبار بکەین، ئەوەی دەولّەتی تورکی فریودا خودی جەلال تالّەبانی بوو، هەمووو ئەمانە خیانەتی جەلال تالّەبانی بوو).

**پرسیار** :(**ئایا دەتوانن کەمێک زیاتر باس لە رەوشی جەلال تالّەبانیمان بۆبکەیت؟**).

**وەلّام** :(بەوپەڕی خۆشحالّییەوە، یەکەمجار کە جەلال تالّەبانی هات بۆ ئەنقەرە وتی "عەبدوللە ئۆجالان ناتوانێت لە شامەوە بە دیموکراتیزەکردنی تێکۆشان کورد پێشبخات، تێڕوانینی

ئۆجالان تەسکە، من دەمەوێت لە شام دەریبهێنم و بیهێنم بۆ هەولێر، من دەتوانم رووی راستەقینەی سیاسەتی دەوڵەتی تورک لەمەڕ کێشەی کوردەوە نیشانی ئاپۆ بدەم، بێشک دوای بینینی هەموو ئەم راستییانە ئاپۆ دەستبەرداری شەری چەکداری دەبێت، پێش دەستپێکردنی جموجۆڵی سەربازی لە باکوری عێراق جەلال تالەبانی لە مانگی شوباتی ١٩٩٢ لە ئەنقەرە ئەو قسانەی پێووتین).

**پرسیار** :(**باشە حکومەتی تورکیا چی وەلامێکی جەلال تاڵەبانییان دایەوە؟**).

**وەلام** :(قەبوڵیان نەکرد، بەلام ئەم قەبوڵ نەکردنە قەبولکردنێکی هەروا هاکەزایی نییە، قسەکانی جەلال تاڵەبانی عەقڵ نەیدەگرت. بێشک حکومەت ئەم پێشنیارانەی قەبول نەکرد، لەڕاستیدا بەرای من دەبوایە ئەم پێشنیارە قەبوڵ بکرایە. بالەخۆمان بپرسین ئایا هۆکاری هێنانی ئاپۆ بۆ هەولێر لەلایەن جەلال تاڵەبانییەوە چییە؟، یەکەم ئامانجی ئەو ئەوەبوو ئاپۆ بێ چارە بکات، هێز و قورسایەکەی ئاپۆ لە تورکیا بگرێتە ژێر دەستی خۆیەوە. بێگومان ٩ بۆ ١٠ هەزارێک زەلام و چەکیشی دەستدەکەوت).

**پرسیار** :(**پێتان وایە ئەمە نییەتی راستەقینەی جەلال تاڵەبانی بوو؟**).

**وەلام** :(بەڵێ وابوو، ساڵانێکی دوورودرێژە جەلال تاڵەبانی لەگەڵ بنەماڵەی بارزانیدا لەناو کێشە و بگرەوبێنەدایە، دوای ئەوەی هێزی ئاپۆ دەخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە پێیوابوو دەتوانێت بارسەنگی هەرێمەکە بەلای خۆیدا بشکێنێتەوە، ئەگەر هەل هەبێت و گونجاو بێت دەتوانم بەش بە بەش باسی خیانەتەکانی جەلال تاڵەبانیتان بۆبکەم).

**پرسیار** :(**ئایا دەتانەوێت بڵێن جەلال تاڵەبانی دوژمنی تورک و کەسێکی خائینە؟**).

**وەلام** :(جەلال تاڵەبانی لە ساڵی ١٩٣٣ هاتووەتە دونیاوە، لە بەغداد کۆلێژی یاسای تەواوکردووە، لە ساڵی ١٩٥٥ لەناو حزبی شیوعی دەست دەکات بەکار، دوایش چووە ناو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە، لەگەڵ مستەفا بارزانی کاریکردووە، دوایش دژ بە مەلا مستەفا لەگەڵ گروپێکی چەپڕەودا کاردەکات، پاشان مستەفا بارزانی بەوە تۆمەتبار دەکات کە لایەنگری زایۆنیزمە، لە ساڵی ١٩٦٦ دەبێت بە پیاوی رژێمی عێراق واتا جاش، حکومەتی عێراق چییان پێیوتایە دەقاودەق جێبەجێی کردووە، هەتا ساڵی ١٩٧٤ نوێنەری پەدەکە بووە لە بەیرووت).

**پرسیار :(کەواتە ئەم پیاوە هەروەکو چۆن خەڵکی ڕۆژانە گۆرەوی دەگۆڕێت ئەویش بەرەی سیاسی گۆڕیوە؟).**

**وەڵام** :(بێگومان هەروابووە، لەدوای هەرەسی شۆڕشی بارزانی لە ساڵی ١٩٧٥ جەلال تاڵەبانی وتبوی "سلاو لە مشتەکوڵەی پۆلاینی سەدام حوسێن دەکەم"، جەلال تاڵەبانی هەتا ساڵەکانی ١٩٧٠ لایەنگری سۆڤیەت بوو، لەدوای ساڵی ١٩٧٥ بوو بە دەرویشی ماو، دوای ساڵی ١٩٧٥یش بوو بە پاڵپشتی گەریلاکانی ئەمەریکای لاتین، لە دوای ساڵی ١٩٨٠ش بوو بە لایەنگری سۆسیالیزمی ئەوروپی، لە دوای ساڵی ١٩٩٠یش بوو بە سەرکێشی دیموکراتی و جیهانگیری و باوەشی بۆ ئەو تێزە نوێیەکان کردەوە. لەناو خەباتی کوردایەتیشدا ڕێبازی جیاوازی گرتووەتەبەر، دەتوانم بڵێم لە قۆناغی جیاوازدا خزمەتی هێزی دەرەکی جیاوازی کردووە. هەمیشە لەلای زلهێزەکان چادری خۆی هەڵداوە، بەگوێرەی جەلال تاڵەبانی هەموو ئەمانە پانۆرامەی سیاسین و بەگوێرەی دژبەرەکانیشی ئەم کارانە نامەردین. ئێستا لەناو هزری فکری و چالاکی سیاسیدا ناوبانگی خۆی هەیە. جەلال تاڵەبانی بەناو تۆڕی سیخوڕی وەلاتانی وەک روسیا، کوبا، چین، بەریتانیا و ئەمریکا تێپەڕیوە، دەتوانم بشڵێم لە هەموو ئەمانەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. جەلال تاڵەبانی بوو بە پینەچییەکی باشی سیاسەت، هەمیشە جەلال تاڵەبانی ئەو ڕێگایانەی گرتووەتەبەر کە بەرەو ئەمەریکا دەچن. ئایا بەناوی کێ و بە بڕیاری کێ کار دەکات ئەمە ئاشکرایە دەزانرێت کەچی ڕێکخستنێکی ئیمپریالیزم دەیجوڵێنێت. بێشک نۆکەری بەریتانیا و ئەمەریکایە کە دەیانەوێت دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنن و ئێستاش بە هەمان جەلال تاڵەبانی دەیانەوێت لە تورکیا ئەرکی نەهێشتنی تیرۆر بگرێتە ئەستۆ. ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە لەناو رایگشتی تورکیاشدا هەر ئەو پێناسەیەی بۆدەکرێت، بمبەخشن ئەوانەی پێناسەی جەلال تاڵەبانی بەو شێوەیە دەکەن یان بێ ئەقڵن یان پیاوی پەکەکە ن).

**پرسیار :(ئایا دەتانەوێت بڵێن وەڵاتانی ڕۆژئاوا جەلال تاڵەبانی وەک مەقاش بەکار دەهێنن؟).**

**وەڵام** :(بێگومان وایە، جەلال تاڵەبانی جگە لەوەی وەکو مەقاشێک بەکاردەهێنرێت بۆ پێشخستنی چالاکییەکانی هزرە جوداخوازییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوین هیچی تر نییە. ئەو بە پارچەکانی ژێر دەوڵەتەکانی سوریا و ئێران و تورکیا دەڵێت کوردستان، ئامانجی ئەو ئەوەیە هەموو ئەوانە لەژێر چەترێکدا کۆبکاتەوە. ئێستا جەلال تاڵەبانی دەیەوێت سوود لە بێ

ئەزمونی تورکیا وەربگرێت و سوود لە جەهالەتی بەڕێوبەرانی ئیمە وەربگرێت و بەکاریان بهێنێت).

**پرسیار** :(**ئایا بالادەستانی تورک ئەمە نابینن؟**).

**وەلام** :(بێگومان نایبینن، هۆکاری نەناسینی کەسێکی وەک جەلال تالەبانی نەناسینی رۆژهەلاتی ناوینە یاخود جەهالەتییانە. هەربۆیە لەناو جموجوله تیرۆرییەکانی رۆژهەلاتی ناوین چەند کەسایەتییەکی کاریگەر پێدەگەن. ئایا تایبەتمەندی ئەمانە چۆنن؟، ئایا لەناو تورکیادا چەند کەس هەن هەموو ئەمانە بزانێت؟).

**پرسیار** :(**باشە کێ ئەم پیاوەی کرد بە بەلا بەسەر تورکییاوە؟**).

**وەلام** :(ئەمەوێت بچمە ناو ناوەڕۆکی ئەم باسەوە. ئێستا باسی پەیوەندی نێوان جەلال تالەبانی و پەکەکە تان بۆدەکەم. لەدوای ١٢ی ئەیلول ئەندامێکی زۆری پەکەکە لە سوریا بە هاوکاری جەلال تالەبانی بردران بۆ بیقاع و لەوێ جێگیرکران، ئەمە زور گرنگە. ئەندازیاری ئەوەی کە ویستبێتی پەکەکە بکات بە بەلای سەر تورکیا جەلال تالەبانییە. هەروەکو دەزانرێت جەلال تالەبانی لە لوبنان نوێنەری پەدەکە بووە، ئەوکاتە بارەگاکەی لە شام بوو. هەروەها تالەبانی کارئاسانی کرد کە حافز ئەسەد و ئاپۆ یەکتر بناسن و رۆلێکی بەرچاوی گێرا. ئەم باسە لەناو راگەیاندنەکانی تورکیا ماوەیەک قسەی لەسەرکرا. لەناو مێشکی دەولەت و کەسانی رۆژهەلاتی ناوین ئەوەی دەپرسێت ئایا چۆن حافز ئەسەد و ئاپو یەکتریان ناسی ئەوەی باسمکرد وەلامی ئەو پرسیارانەیە).

**پرسیار** :(**بێشک خیانەتەکانی جەلال تالەبانی کەلە هەموو قۆناغەکاندا کردوویەتی ئاشکران، بەلام ئێستا هەمان کەس لەهەمبەر کارمەندانی دەولەتی تورک وەکو کەسێک کە رێگری لە چالاکی تیرۆر دەکات قیت دەبێتەوە، ئایا ئەمە ناکۆکی نییە؟**).

**وەلام** :(بێگومان وایە، ناکۆکییەکانیشیان گەورە کردەوە. ئیمە وتمان ئەم پیاوە بازرگانێکی سیاسییە، هەموو شتێک روون و ئاشکراشە. ئەوەی ئاپۆی هێنا بو سوریا و ئەوەی دەیەوێت هەولبدات ماوەیەک ئاپۆ لە باکوری عێراق دالدە بدات، ئەوەیشی ئاپۆی بە حافز ئەسەد ناساند بێگومان هەر ئەم جەلال تالەبانییەیە).

**پرسیار** :(**باشە ئەم کابرایە کە پێتان وایە جامبازێکی سیاسییە لە تورکیا لە ژێر فەرمانی کێدایە؟**).

**وەڵام** :(پێشوتر باسمان کرد، وتمان تاڵەبانی پیاوی ئیمپریالیزمە، لەهەمانکاتیشدا ئیسلوبی سیخوڕی بەریتانی بەکار دەهێنێت، بەردی دامەی ئەوانە. لە رۆژهەڵاتی ناوین مەقاشی دەستی ئینگلیزە، هەرچۆنێک بێت درێژبونەوەی خوێن رشتن و پاشقولگرتن لە یەکتری لەناو خەڵکی رۆژهەڵاتی ناویندا یەکێکە لە پیشە و کردار و پیلانەکانی ئیستیخباراتی ئینگلیز. ئینگلیز لە رۆژهەڵاتی ناوین رێگایەکی زۆر ئاسانیان دۆزیوەتەوە کەلە رۆژهەڵاتی ناوین خەڵکی پێ بەکار بهێنن بێگومان ئەویش رێی پارەیە. ئەوەی سەرەتا زانی پارە و ئاڵتون لە رۆژهەڵاتی ناوین بایەخدارن هەر ئینگلیزە. بودجەی خەرجی ئیستیخباراتی ئینگلیز لە ناوچەکەدا دەگاتە ملیۆنەها دۆلار).

**پرسیار** :(**ئایا ئەو پارانە لەچیدا بەکار دەهێنرێن؟**).

**وەڵام** :(لەچیدا بەکار دەهێنرێت؟، یەکەمجار لە پێکهێنانی پەکەکە بەکارهێنراوە، دوایش لە شەڕی نەوتی باکوری عێراق بەکاریان هێنا و بۆ جەلال تاڵەبانی و بۆ پەکەکە بەکاردەهێنرێت و بۆ بردنەڕێوەی سیاسەتی تورکیا لە باکوری عێراق بەکاردەهێنرێت. کەواتە لەرێی جەلال تاڵەبانییەوە بەکار دەهێنرێت بۆ بەستنەوەی قاچ و دەستی پەکەکە، لە ئاکامدا جەلال تاڵەبانی توانی گەریلاکانی پەکەکە لە باکوری عێراق جێگیربکات و هەمووشمان دەرەنجامی ئەو جێگیرکردنەمان بینی. جەلال تاڵەبانی ئەوانەیشی فریودا کە دۆستی بوون، سیاسەتێکی تایبەت بەخۆی هەیە، لەمە زیاتر شتێکی ئەوتۆ نازانێت. بۆنمونە ئەوکاتانەی کە پەیوەندی لەگەڵ پەکەکە دا باش نەبوو، ئەو سەردەمەیە کە بەنیازن حکومەتی هەرێمەکەیان رابگەیەنن. رێگای بە ئەنجامدانی ئەمکارەش رازیکردنی تورکیایە، بەمشێوەیە دڵی تورکیا رازیدەکات و حکومەت رادەگەهێنن و لەلایەکی تریشەوە هێرشی سەر پەکەکە دەکات. لەوانیش خیانەتی کرد، لەدوایشدا هێزی سەرەکی پەکەکە ی لە مردن رزگارکرد، بوو بە ئەندازیاری سیاسەتێکی تایبەت کە کەس بە ئەقڵ و خەیاڵیدا نایەت. بابێینەوە سەر مەسەلەی ئاگر بەستەکە. من وەکو کەسێکی سەر بە ئیستیخبارات دەڵێم کێشەی پەکەکە لە زێی هێزێل دەستی پێکردووە، پێویست وابوو هەرلەوێدا کۆتایی پێبهێنرێت، جگە لەم رێگایە رێگاکانی تر وەک مەتەڵن. مەسەلەکە لە شاخەوە دەستی پێکرد و دەبوایە هەر لە شاخیش کۆتایی پێبهێنرایە. دوای رژانی ئەو هەموو خوێنی شەهیدانە کەس چاوەڕێی ئەوە نەکات ئەم کێشەیە لەناو باخ و باخات و گوڵ و گوڵزاردا کۆتایی پێدەهێنرێت، بەلام ئێستا تیرۆری پەکەکە لەژێر

باڵی جەلال تاڵەبانیدایە. لەئاستی هەموو ئەمانە تورکیا لەبارەی جیهانگیری مەسەلەکانەوە خاوەن هیچ ئامادەییەک نەبووە و لە هەرێمەکەشدا بێ ئەزموون بووە و بەسەر هەموو ئەمانەشەوە خواستیان بچنە ناو خاکی باکوری عێراقەوە).

**پرسیار** :(**لە ئاستی سیاسیشدا هەروابوو؟**).

**وەڵام** :(بەڵێ، ئەوەی دەیەوێت سیاسەتی پەکەکە لە هەرێمەکە گەشە بکات خودی جەلال تاڵەبانییە، لەلایەکی تریشەوە مەخابن بەرپرسیارانی دەوڵەت کەسیان بەباشی جەلال تاڵەبانی ناناسن و لە سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوینیشدا شارەزاییەکی ئەوتویان نییە. جەلال تاڵەبانی توانی هەموویان فریو بدات. لە ساڵی ١٩٨٤وە دەوڵەتی تورک روبەروی تیرۆری پەکەکە بووەتەوە، تەنها لەبەرئەوەی بەسەر گەریلادا دەوڵەت زاڵ ببێت و شەری گەریلا شرۆڤە بکرێت و لەبارەیانەوە شارەزایی بەدەست بخرێت، دەوڵەتی تورک سەرەرای ئەوەی بە هەزارەها شەهیدیدا و بە ملیۆنەها دۆلاریشی خەرج کرد، کاتێک توانرا هەندیک بەرامبەر بە شەری تیرۆر سەرکەوتن بەدەست بخرێت کەچی لەوبەرەوە وەلاتانی رۆژئاوا بەم چالاکییە تیرۆرانەیان دەوت بزوتنەوەی دیموکراتیخوازی کورد و لەهەمبەرمان قیتبوونەوە. لایەنێکی خراپی هەموو ئەمکارانە ئەوەیە هەندێک لە سیاسەتمەدارانمان بەبێ ئەوەی ئاگایان لەهیچ شتێک ببێت لەسەر خەباتی سیاسی خۆیان تاڵەبانییان کردە فریادرەس. تالەبانی ئاپۆی لە بیقاع جێگیرکرد و توشی سەد بەڵای کردین، ئێستاش پەکەکە ئامادەباشی بۆ سیاسەتێکی نوێی خۆیان دەکەن تاکو بتوانن لەو رێیەوە بەرامبەرمان قیت ببنەوە).

**پرسیار** :(**ئایا مەبەستتان لە بەرەی یەکگرتووی کوردە؟**).

**وەڵام** :(بەڵێ، ئێمە بەرخۆڵەمان دایە دەم گورگەوە. نیوەی خەڵکی باکوری عێراق لە پشتەوە جوێن بە جەلال تاڵەبانی دەدەن کەچی سیاسەتمەدارانی تورک سیاسەتی خۆیان لە رۆژهەڵاتی ناوین رادەستی کەسێکی وەک ئەو دەکەن. ئەوەی ئێمە و سیاسەتمەداران و کارمەندانی وەزارەتی دەرەوەمان نەیانبینی ئەوەبوو باکوری عێراق لەژێر کۆنترۆڵ و کاریگەری جەلال تاڵەبانیدا نییە، بەڵام مەسعود بارزانی و پەدەکە و سەرۆک عەشیرەتی سورچی کەسانی تایبەتن و لەناو خەڵکیدا باوەرپێکراون و قسەیان دەیخوارد. دەسەڵاتدارانی ئێمە لەئاستی ئەو کەسانە خۆیان لە گێلیدا، لەراستیدا ئەوەی جەلال تاڵەبانی کرد بە بەڵا بەسەرمانەوە و ئەوەی هیوای سیاسەتی خۆی بە نمونەکانی جەلال تاڵەبانییەوە گرێدەدا

یەکێک لە کەسە هەرە دەسەلاتداری ناو دەوڵەتەکەمان بوو. نەک تەنها لە من ئەگەر لە منداڵێکی ناو بێشکەش بپرسن ئەو سیاسەتمەدارەمان کێیە ناوەکەیت پێدەڵێت. ئەو کەسە دەیەویت کێشە پارچەکراوەکانی کورد یەک بخات و لەم پێناوەیشدا کاریشیکرد).

**پرسیار** :(**لە رۆژهەلاتی ناوین وەلات هەیە کوردی تێدا دەژین، تەنها لە تورکیا کورد نییە**).

**وەلام** :(راستە، بەلام بەهۆی هەولی جەلال تاڵەبانییەوە ئەو کوردانەی دژبەری یەک بوون ئاشتبونەوە. دروستکردنی ئەو یەککرتنە تەنها دژ بە عێراق، ئێران و سوریا نییە، بێشک دژ بە تورکییایە. کەسانی وەک کەمال بورقای، ئاپۆ، رێشۆ کە بیر لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی دەکەنەوە لە ئەنەدۆلو و رۆژهەلاتی باشوری تورکیا هەموو ئەم کەسانە بەشێکن لە سیناریۆکانی دژ بە تورکیا، لەلایەکی تریشەوە وەلاتانی ئیمپریالیزمی ئەوروپی کارتی کورد بەرامبەر بە تورکیا بەکاردەهێنن. ئێستا لە رۆژهەلاتی ناوین و بالکان و قەفقاسیا و ئاسیای ناوین کاردەکەن بۆ پێشخستنی هۆکارەکانی بەکارهێنانی ئەو کارتە).

**پرسیار** :(**هەموو ئەمانە شتگەلێکی سەیرن، باشە ئاگر بەست بەواتای چیدێت؟**).

**وەلام** :(ئەمجۆرە کارانە هەوڵدانێکی هەروا هاکەزایی نین، بەشێکن لە ستراتیژییەتی گرنگ و گەورە. جەلال تاڵەبانی قەناعەتی بە ئاپۆ کردووە ئەگەر بۆماوەیەکی کاتیش بێت ئاگر بەست رابگەیەنێت، هەربۆیە ئاپۆ یەک لایەنە ئاگر بەستی راگەیاند. ئەمە تەکتیکێکی پەکەکە یە بۆ سەرلەنوێ کۆکردنەوە و بەهۆشهێنانەوەی سەرجەم گەریلا. ئەگەر بەرپرسیارانمان بلێن گوایە لە تیرۆر رزگارمان بووە ئەمە غەفلەت و خیانەتە، ئەگەر ئێمە لە شاخ تیرۆر بنبڕ نەکەین و تەنها لە دەشت و دەوروبەری شار و گوندەکان بەگیریان بهێنین ئەوا سبەی سەرلەنوێ بەرامبەرمان قیتدەبنەوە. ئەوانەی دەیانەوێت پەکەکە یەکی تیرۆریست لەسەر مێزی گفتو دابنێن ئەوە خیانەت لە دەوڵەتی تورک و شەهیدان دەکەن، ئەگەر دەویسترێت بەناوی دیموکراسییەوە ماف بە ٦بۆ٧ ملیۆنێک کورد بدرێت ئەوا دەبێت دوای لەناودانی ٥بۆ٦ هەزار تیرۆرسیتێک بدرێت. ناکرێت قەدەری ٥بۆ٦ ملیۆنێک کورد ببەسترێتەوە بە ٥بۆ٦ هەزار تیرۆریستێک. ناکرێت ئەو تیرۆریستانە بخەینە قالبی شۆرشگێران و ببنە مایەی شانازی، ئەگەر بکرێن بە خاوەن ماف ئەوا دەڵێن ئێمە نوێنەری راستەقینەی کوردین و جارێکی تر بەرامبەرمان قیتدەبنەوە، مەخابن ئێستا لەژێر سێبەری بەناو ئاگر بەست بەرامبەرمان قیتبونەتەوە ).

**پرسیار :(کەواتە سیاسەتوانانی کورد شێوازی کارەکانیان دەگۆڕن وانییە؟).**

**وەڵام :**(بەڵێ، ئێستا دەستکراوە بە دوو ئەرکی جیاوازی کوردی، یەکێکیان باکوری عێراق بوو ئەمەیانمان بینی، دووەمیان و گرنگترینیان ناوخۆی تورکیایە واتا ڕۆژهەڵاتی باشوری تورکیا. بەڕای من گەورەترین مەترسی ئێرەیە، پێویستە زۆر بە سەرنجەوە لێرە بڕوانرێت. کێشەی بنگەیی کورد دەخرێتە دۆسیەوە و لە پاشەڕۆژدا بەرامبەر بە تورکیا بەکاریدەهێنن. لەمبارەیەشەوە کەسایەتی یەکەم بێشک جەلال تاڵەبانییە کە پییان وایە پێویستییان پێیەتی کە لەوانەیە پەیوەندی لەگەڵ پەکەکە یان بۆ ببەستێت).

**پرسیار :(باشە دەتوانن کەمێک باسی مەسعود بارزانیمان بۆبکەیت؟).**

**وەڵام :**(لەچاو جەلال تاڵەبانیدا مەسعود بارزانی خاوەن کەسایەتییەکی جیاوازە، دەتوانرێت لە کەسایەتی مەسعود بارزانیدا هەموو نیشانەیەکی عەشیرەت و نەریتە کومەلایەتییەکان بەدیبکرێت. کەسێکی سادە و خاوێنە، کورد پەروەرێکی ڕەوانە. دەتوانم بلیم مەسعود بارزانی گەمەی ساختەچییانە و جامبازی سیاسی نازانێت، نارەزایی دەرنابڕێت).

**پرسیار :(ئایا دەوڵەتی تورک دەتوانێت باوەڕ بە مەسعود بارزانی بکات؟).**

**وەڵام :**(پێویستە باوەڕ بە مەسعود بارزانی بکرێت، ئەگەر دەتانەوێت نرخی بارزانی بزانرێت بچن بۆ باکوری عێراق و لەخەڵک پرسیاری مەسعود بارزانی و جەلال تالەبانی بکەن. دەبینن کەس باوەڕی بە جەلال تاڵەبانی نییە و دەشبینن هەتا سەر ئێسقان باوەڕییان بە مەسعود بارزانی هەیە و لەپێناویشیدا دەمرن. هەموو کەسێک بە جەلال تالەبانی دەڵێت فێڵباز، نازناوەکەیشی مام جۆکەر جەلالە) .

**پرسیار :(باشە ئەم پیاوە کە لەلایەن خەڵکییەوە خۆشەویست نییە چۆن هەڵدەبژێردرێت، چۆن دەتوانێت ببێت بە یەکێک لە سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی؟).**

**وەڵام :**(ئەو هەڵنەبژێردرا، بەزۆر هەڵبژێردرا. ئەم زاتە بە توپ، تفەنگ، زرێپۆش، فڕۆکە و هێزی تایبەتی ئەمەریکاوە هات. سەرەتا ئەم هێزانە لەژێر ناوی پاراستنی هەرێمی و مرۆیی دەستیان پێکرد پاشان دەستیان کرد بە پرۆسەی هەڵبژاردن، دوایش لە ئەنجامدا وتیان نیوەی دەنگەکان بۆ فلان کەس و نیوەکەی تریشی بۆ فلان کەس، هەروەها وتیان ئەو وەزیر بۆ ئەو و ئەم وەزیر بۆ ئەم . سەرەتا مەسعود بارزانی تانەی لەمە کرد، بارزانی وتی لە هەڵبژاردنەکەدا فێڵکراوە، ئەمە سەرکەوتنی دیموکراسی نییە بەڵکو شەرمی دیموکراسییە).

**پرسیار :(ئایا هەندێک ناکۆکی لەنێوان ئەم روونکردنەوانەتدا نییە؟، هەموویان خۆیان هەڵدەبژێرن و تانەشی دەکەن؟).**

**وەڵام** :(لەسەرەتا مەسعود بارزانی تانەی کرد، لەمێژووی کوردا ئەمە یەکەمین هەڵبژاردن بوو، باشە هەڵبژاردن چۆن دەکرێت؟، ئەوان کارتی دەنگدان و دۆسیەی هەڵبژاردن و گوڵبژێری دەنگەکان شتی وا نازانن، تەنها ئەمەریکا وایویست و هەرواشیان کرد. یەکێک لە باشییەکانی مەسعود بارزانی ئەوەیە دژ بە تورکیا زەرەری نییە).

**پرسیار :(باشە لە باکوری عێراق هێز تەنها لەدەستی بارزانی و تاڵەبانیدایە؟).**

**وەڵام** :(هێزی بەرەی کوردستانی لە هێزی سێ پارتی پێکدێت، مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی و سامی عەبدولرەحمان کە پارتەکەی لە چەند پارتێک پێکدێت. ئەمەیان ناونا بەرەی یەکگرتووی کوردستانی، بەڵام چەند کەسانێک هەن پێویستە لەبیر نەکرێن. بۆنمونە سەرۆکی عەشیرەتی سورچی واتا عومەر سورچی، ئەم کابرایە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی نزیکەی ١٠٠کم پانە و ١٠٠کم یش درێژییەکەیەتی و نزیکە ٤٠٠٠ هەزار پیاوی خۆیشی هەیە. ئەم پیاوە دۆستی تورکە، تەنانەت خودی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی کاتێک بەناوچەی ئەم پیاوەدا تێدەپەڕن هەموو لەشیان دەلەرزێت. ئەندامانی عەشیرەتەکە زۆر پابەندن بەیەکەوە، ئەگەر لەبارەی کوشتنی کەسێکەوە عومەر سورچی بڕیاربدات ئەوە لە ماوەی ١ کاتژمێردا نامێنێت. لەوێدا هەموو نەریتێکی کۆمەڵایەتی پەیرەو دەکرێت، دەرەبەگێکی تەواوە. لەئاستیدا کەس ناتوانێت بکوکێت و یەک قسەش بکات، بەڵێ ئەم عومەر سورچییە لایەنگری تورکیایە و تەنانەت سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا جۆنماجۆ بانگهێشی کردبوو بۆ لەندەن و چەند رۆژێک میوانی ئەو بووە. ئەوکاتەی عومەر سورچی ویستی پەیوەندی بە بەرپرسیارانی حکومەتی ئیمەوە بکات تاکو هەندێک بەڵگەی گرنگ رادەستی حکومەت بکات کەچی کەس نەبوو پێی بڵێت ئەریّ بەخێر بێیت و تۆ کێیت و دەتوانیت بەچی شێوەیەک سوود بە دەوڵەتەکەمان بگەیەنیت؟، تەنها سەرۆکی پەرلەمان حوسامەدین جیندوروک چاوی پێکەوت و رێزی لێگرت و گوێی لێگرتبوو. لەم کاتوساتەدا جەلال تاڵەبانی کەوتە داوی خۆیەوە، لەڕاستیدا حکومەتی ئێمە هەرێم و سەرکردەکانی هەرێمەکە هەڵناسەنگێنن. ئەو کاتەی جەلال تاڵەبانی خاوەنداریتی لە پەکەکە دەکات، هەمان عومەر سورچی ئەو کادێرانەی پەکەکە دەچن بۆلای بۆ هاوکاریکردنیان، عومەر سورچی پێیان دەڵێت ئەگەر جارێکی تر

لەناو خاکی عەشیرەتەکەم بتانبینمەوە ملتان لێدەکەمەوە، عومەر سورچی پیاوێکی ئاوایە، ئەم کابرایە داوای هاوکاری مادی لە تورکیا نەدەکرد بەڵکو داوای هاوکاری مەعنەوی دەکرد. بەبێ هیچ مەرجێکیش ئامادەبوو لە هەموو روویەکەوە هاوکاری تورکیا بکات. لەهەموو شتێک گرنگتر ئەوەیە یەکەمین قسەی عومەر سورچی دوا قسەیەتی).

**پرسیار** :(**ئایا عومەر سورچی زۆر بەهێزە؟**).

**وەڵام** :(من هێشتا لەبارەیەوە کەمم وتووە، بەڵام بەرپرسیارانی حکومەت ئەمە نازانن. ئەو بەرپرسیارانە ئەوەندە کاریان هەیە کە ناتوانن گوایە گوێشی بۆبگرن. ئەو تورکمانانەی بۆ سەربەخۆیی ویلایەتی موسڵ تێدەکۆشن کە بەرەی کوردستانی قەدریان نازانێت و بە کەمایەتیشیان نازانن کەچی عومەر سورچی لە رادیۆکەی خۆی رێی پێداون رۆژی ٤ بۆ ٥ کاتژمێر بەرنامەی خۆیان پێشکەش بکەن و هاوکاریشیان دەکات. عومەر سورچی دەڵێت تورکیا وەڵاتی دووەمی منە و عاشقی دیموکراسی تورکیام و ئامادەم هەموو جورە کارێک لەگەڵ بەرپرسیارانی تورک بکەم، ئەوەی ئەم قسانە دەکات ئەو کەسەیە کە چەندین عەشیرەتی تر لە هەرێمەکە گوێی بۆرادەگرن و بەگەورەی خۆیانیان دەزانن و ئیستاش لەبارەی پاشەرۆژی باکوری عێراقەوە لەناو کاروخەباتدایە. عومەر سورچی پارتیکی بەناوی پارتی موحافیزینی دامەزراند، دوای دامەزراندنی ئەم پارتەی وەفدێک لە مەلاکانی ئێران چووبونە لای و پێیان وتبو ئامادەین بە ملیۆنەها دۆلارت بدەینێ تەنها لێرە پیشەوایەتی شۆرشەکەمان قەبوڵ بکە، لەگەڵماندا کار بکە، عومەر سورچی کابرایەکی زۆر رۆشنبیرە، ئەویش پێیانی وتبوو من عاشقی دیموکراسیم و مەرجەکانی ئێوە قورسە و نە ئێوە و نە پارەکەیشتانم ناوێت، تەنانەت لە دیمانەیەکمدا لەگەڵ رۆژنامەیەکدا لەسەر قسەی من ئەم دێرەی کردبوو بە مانشێتی رۆژنامەکەی خۆیان "لەگەڵ هاورێیانم عەلی ئونجو، ئەندامی ئیستیخباراتی سەربازی گۆزو بانتلی لە باکوری عێراقدا بووین بە میوانی عومەر سورچی" .)

**پرسیار** :(**ئەی باشە هۆیەکەی چییە تورکیای ئەوەندە بەلاوە گرنگە؟**).

**وەڵام** :(بڕوانن، لەوانەیە ئێمە درکی پێنەکەین، بەڵام تورکیا لەچاو ئەو جۆرە کەسانە زۆر بەنرخە هەروەکو ئەمەریکا و ئەڵمانیا. کەسێکی وەک عومەر کە لەلایەن وەزیری دەرەوەی وەڵاتێکی گەورەی وەک تورکیا باوەڕی پێناکرێت بەڵام کەسێکی وەک جەلال تالەبانی کە

تەنانەت لە وەلاتەکەی خۆیشیدا کەسێکی خۆشەویست نییە کەچی لای ئێمە لە بەزم و نازونوزەکانی حاڵی نابینین و ئەوکاتەی خەڵکی نەفام جەلال تاڵەبانیان لە هاوشانی سەرۆک کۆماری خوالێخۆش بوو تورگوت ئۆزال بینی ئیتر پێیان وابوو ئەمە کەسێکی زۆر مەزنە. جەلال تالەبانی توانی ئێمە بەکار بهێنێت و خەڵکیش فریوبدات).

**پرسیار :(ئایا دەتوانین بڵێین جەلال تاڵەبانی دۆستی تورکییایە؟).**

**وەلام** :(نەخێر.. نەخێر.. نەخێر، بێگومان ئەم نەخێرە بەڵگەیەکی روونی هەیە لەلای من. لە سلێمانی لەکاتی کردنەوەی قوتابخانەیەکی نوێدا بۆ وەزارەتی پەروەردە کە خەڵکێکی زۆر بەشداربوو لەگەڵ سەرکردەکانی بەرەی کوردستانی، جەلال تاڵەبانی بەتایبەتی قسەی بۆکردبوون و پێیوتبوون تورکیا لە دژی ئێمە هانی ئێران و سوریا دەدات بە گژماندا بێن، دەیانەوێت بێ ئیرادەمان بکەن، ئێمە هەرگیز ئەمە قەبوڵ ناکەین، ئەگەر شتێکیان هەیە لەبارەی ئێمەوە بابفەرمون بێنە لامان، ئێمە وەک دەوڵەتواین، پەرلەمان و کۆنگرە و سەرۆکایەتیمان هەیە، بەڵام تورکیا لە ئاستیاندا خۆیان لەگێلی دەدات، مژارێکی تریش هەیە ئەوەیە پەکەکە لەسایەی هاوکارییەکانی ئێمەوە خەبات دەکات، ئەم قسانە ناکەم کە تورکیای دۆستی ئێمە پێی نیگەران بن، ئێمە لێرە گردبوینەتەوە و کەسی غەریبمان لەنێواندا نییە بۆیە دەتوانم بە راشکاوانە بدوێم).

**پرسیار :(ئەوەی ئێستا هێناتە زمان هەمووی قسەی جەلال تاڵەبانییە؟).**

**وەلام** :(بەڵی بێگومان قسەی ئەون، ئەو بە راشکاوانە دەیسەلمێنێت کە چەندێک دۆستی ئێمەیە. ئەگەر کارمەندی باڵای ناو دەوڵەتەکەمان هەن کە باوەر بەمە ناکەن، دەبا لە رێی ئێوەوە پەیوەندی بە منەوە بکەن، ئەگەر ئارەزوو دەکەن دەتوانم گرتە ڤیدیۆی ئەو قسانەیان بدەمێ، با خۆیان بە چاوی خۆیان خیانەتی جەلال تاڵەبانی ببینن).

**پرسیار :(ئێستا تێگەیشتین کە جەلال تاڵەبانی کەسێکی چۆنە، تێبینی و بۆچونەکانت زیاتر روونی دەکەنەوە کە چۆن جەلال تاڵەبانی لە باکوری عێراق خیانەتی لە سوپای تورک کردووە، بێگومان ئێوە بەشداری ئۆپەراسیۆنەکانی باکوری عێراقتان کردووە، ئایا لەوێ چی روویدا؟، ئایا لەپشت رووداوەکانەوە نهێنییەک هەیە کە تاکو ئێستا میللەتی تورک نەیزانی بێت؟).**

**وەڵام** :(پێش سەرەتای ئەم کارانەمان جەلال تاڵەبانی جامبازی سیاسەت هات بۆ تورکیا. چەند جارێک لەگەڵ ژەنراڵ ئەشرەف بیتلیس یەکیان بینی، لەویشدا جامبازی کرد و قسەی سەیروسەمەری دەکرد. جەلال تاڵەبانی دەیوت: **پاشام من لە کۆبونەوەیەکی ئەورووپاش وتوومە، پایتەختی ئێمە بەغدادە بەڵام خۆزگە ئەنقەرە بوایە، ئێمە لە ئۆزبەک و قازاکستان نزیکترین بۆئێوە، لە شەڕی جیهانی یەکەمدا کاتێک هەموو پێکهاتەکان خیانەتیان لە عوسمانییەکان کرد تەنها کورد خیانەتی لێنەکردن، کورد شانبەشانی ئێوە شەڕیان کرد، ئێمە برا بچوکی ئێوەین، حوکمەتی فیدرالی قوبرس بۆ ئێوە چی دەگەیەنێت ئێمەش بۆ ئێوە هەمان شتین.** بەڕاستی ئەم جەلال تاڵەبانییە جامبازێکی باشی سیاسییە، باش دەزانێت کالای خۆی بفرۆشێت. بەم هەستە ناسک و بەم قسە بریقوباقانەی توانی کاریگەری بخاتە سەر ژەنراڵ و سەرکردەکانمان. لە ژیانمدا کەسێکی درۆزنم وەکو ئەم جەلال تالەبانی نەدیوە کە درۆ بکات و سیمای سوور نەبێتەوە. لەکاتی دیدارەکانماندا لەبارەی هەندیک بابەتەوە بەتایبەتی لەبارەی کەسایەتی جەلال تاڵەبانییەوە ئەشرەف بیتلیسم هۆشیار کردەوە. هەروەها کەسانی تریش بەڵام کەس نەبوو بە جدی گوێم بۆ رابگرێت. دوای ئەوەی جەلال تالەبانی ماستاوی خۆی خەستکردەوە هاتەسەر مەسەلە بنگەییەکە. رووی کردە ئەشرەف بیتلیس و ئینجا وتی: **گەورەم ئێمە زیاد لە ئێوە لە پەکەکە نارەحەتین، ئەم پارتە گوندەکانمانیان ویرانکردووە، گوندنشینەکان لەترسی ئەوان ناچنەوە گوندەکانی خۆیان، تەنانەت ئێوە خۆیشتان بەردەوام دەڵێن لە هەرێمەکە پەکەکە بوونی هەیە و بەردەوامیش بۆردۆمان دەکەن، لەکاتی بۆردۆمانەکان چەکدارەکانی پەکەکە خۆیان دەشارنەوە تەنها گوند نشینەکان زەرەرمەند دەبن، بۆلەناودانی پەکەکە پێمباشە بەیەکەوە جموجۆڵێکی سەربازی ئەنجام بدەین، ئێوە لە باکورەوە وەرن و ئێمەش لە باشور دەست دەوەشێنین، چواردەوریان دەگرین و بەیەکەوە لەناویان دەدەین یاخود هەرهیچ نەبێت لە هەرێمەکە وەدەریان بنێین.** قسەکەی ئەوەندە گونجاو و بەجێبوون کاریگەری کردە سەر هەموو ژەنراڵ و ئەو ئەفسەرانەی کە لە کۆبونەوەکە بەشداربوون).

**پرسیار** :(**ئێوەش بەشداربوون لەو کۆبونەوەیە؟**).

**وەڵام** :(بێگومان، ئێمە پەیوەندبووین بە کاروباری فەرماندارێتی ئیستیخباراتەوە و لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی باڵا بەشداری ئەو کۆبونەوەیە بووین کە هەمووومان شارەزاییەکی باشمان

هەبوو لەبارەی کاروباری دژە تیرۆر لە رۆژهەڵاتی باشوری تورکیا، تەنانەت هەموو قسە و هەڵسەنگاندنەکانی رەوشەکە پابەند بوو بە کاروبارەکانی ئێمەوە. ئەشرەف بیتلیس دوای ئەوەی گوێی لە جەلال تاڵەبانی گرت رووی کردە من و ئینجا وتی: **بەباشی گوێت بۆ تاڵەبانی گرت؟، پێشنیارت چییە؟**.دوای ئەوەی جارێکی تر باسی کەسایەتی جەلال تاڵەبانیم بۆکردەوە ئینجا پێموت **پێویستە بچین بۆ هەرێمەکە و بەباشی لێکۆڵینەوە بکەین هەروەها پیلانی جموجۆڵەکەش دوای دەرەنجامی لێکۆڵینەوەکان ئەنجامی بدەین**. سەرەتا ئەشرەف بیتلیس نەیدەهێشت من برۆم بۆ هەرێمەکە، ئەو لەوە دەترسا کە نەبا بە دیلی بگیردرێم، پێموت لە دوای نەمانی من مادام دەوڵەت ژیانیماڵومنداڵمان دەستەبەردەکات ئیتر ژیانی من زۆر گرنگ نییە، تەنانەت تەکلیفی تریشم خستە پێشیان و لەمبارەیەوە بە ئەشرەف بیتلیسم وت **بۆئەوەی توانج و گلەیی و رەخنە نەیەتە سەر دەوڵەت ئەگەر پێتباشە دەست لەکار دەکشێنمەوە و وەکو کەسێکی سەربەخۆ ئەو کارانە جێبەجێ دەکەم، ئەگەر بەقەدەری خوا کوژرام و شەهید بووم دەتوانن بڵێن سەربەخۆ بووە و پێشوتر لەناو سوپا دەستی لەکار کێشاوەتەوە**. دوای قسەکانی من ٥بۆ٦ چرکەیەک بیری کردەوە و دوایش رووی تێکردم و وتی **باشە برۆ، پێویست بە دەست لەکار کێشانەوە ناکات، ئەگەر شتێکت بەسەردابێت ئەو هەرێمە سەروبن دەکەم، خانەوادەکەت لەژێر بەرپرسیارێتی مندایە، بڕوابکە خوانەخواستە ئەگەر شتێکت بەسەرهات تۆڵەسەندنەوە بخە ئەولاوە ئەگەر لەناو ماڵی ئێمە نیسک بکوڵێنرێت ئەوا بزانە منداڵەکانی تۆ کەباب دەخۆن، کۆنترۆڵێکی ئەوێ بکە، لەگەڵ خۆتدا گروپێک بەرە بەڵام با لە کەسانێک پێکبێت کە زمانی کوردی بزانن**. دوای ئەوەی فەرمانم لە ئەشرەف بیتلیس وەرگرت، لە ئەنقەرە پەیوەندیم بە سەرچڵ قەزازی نوێنەری یەنەکە کرد. بۆسبەی رێی باکوری عێراقمان گرتەبەر، سەرچڵ بەردەوام بە شانوباڵی جەلال تاڵەبانیدا دەهات و مەدحی دەکرد و ئێمەش بە قسەکانی پێدەکەنین).

**پرسیار: (ئایا سەرچڵ قەزازیش وەکو جەلال تاڵەبانی وایە؟)**.

**وەلام** :(بەڵێ، قسەیەک هەیە دەڵێت **ئەسپ بەرامبەر بە خاوەنەکەی دەحیلێنێت**. سەرچڵیش لە قەوارەی تاڵەبانییە، شارەزای هەموو رێگا تاریکەکانە. ئەم کابرایە لەناو دڵی ئەنقەرە هەموو جۆرە ئالەتێکی پەیوەندی لە ئۆفیسەکەی دامەزراندووە، لەگەڵ خۆیاندا دەمانچە و کلاشینکۆف هەڵدەگرن، گوایە پەکەکە هەرەشەیان لێدەکات. ئەم بیانویەشیان بەشێکە لە

سیناریۆکانیان، سەرچڵ قەزاز لەسەر بنەمای پەروەردەی ئینگلیزی جۆشکراوە و شتێکی سەیریشە کە هاوژینەکەی ئینگلیزە. لە بەریتانیا دەدانیشێت، هاولاتی بەریتانیشە. بەهیچ شێوەیەک لە دوورو نزیکەوە پەیوەندی بە ژیانی ئەو هەریمەوە نییە کە پێی دەڵێن کوردستان. چەندین ساڵە کاروبارە بازرگانییەکانی جەلال تالەبانی دەبات بەڕێوە، ئەو پارەی رەش سپی دەکاتەوە و خۆی بە وەزیری دارایی جەلال تالەبانی دەزانێت. بەناوی نوێنەرایتی یەنەکەوە بەشێوەیەکی فەرمی سەرقاڵی کاروباری قاچاخچێتییە، ئەو شتومەکانەی لە تورکیاوە بەناوی کورد دەستی دەکەوێت دەینێرێتەوە بۆ باکوری عێراق و لەوێ دەیفرۆشێتەوە و میللەتەکەی خۆی هەڵدەخەڵەتێنێت و پارەیەکی زوریش قازانج دەکات. ئەو شتومەکانی رەوانەی دەکاتەوە بۆ باکوری عێراق و دەیفرۆشێت پێکهاتووە لە ئەشیای ئەلەکترۆنی، جلوبەرگ، ئازوقە، جگەرە و پەڕەسیغار، تەنانەت ئالەتی گوێگرتنیش لەرێی قاچاخەوە رەوانەی باکوری عێراق دەکات).

**پرسیار :(ئایا دەوڵەت هەیە هاوکارییان بکات؟).**

**وەلام** :(لایەنە خراپەکە ئەمەیە، تورکیا پێش دەست پێکردنی جموجوڵە سەربازییەکەی هاریکاری وەک مەتارە، چەک، تەقەمەنی، حەربە، دەمانچە، چادر، بەتانی. کیسە خەو، کلاشینکۆف، ئاربیجی و گوولە هاوانیان نارد بۆ ئەوەی پێشمەرگەکانی جەلال تالەبانی و مەسعود بارزانی بەکاری بهێنن، بەڕاستی ئەگەر بزانن کە ئەمانە چۆن جورە کەسانێکن بەڕاستی گریانتان دێت).

**پرسیار :(مەبەستت چییە؟).**

**وەلام** :(هەموو ئەو شتومەک و کۆمەکانە لەلایەن پارتەکانی بەرەی کوردستانییەوە فرۆشرایەوە بە میللەتەکەی خۆیان. سەرچڵ قەزازیش ئەمکارانە ئەنجام دەدات، ئەگەر ئێستا بچن بۆ زاخۆ لەسەر هەموو جادەکان کەلوپەل و شتومەکی دەولەتی تورک دەبینن کە دەفرۆشرێت).

**پرسیار :(ئەگەر پێتان باشە بابچینەوە سەر مەسەلەی ئامادەباشییەکانی جموجۆڵە سەربازییەکەی باکوری عێراق؟).**

**وەلام** :(لەگەڵ سەرچڵ قەزاز لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیلەوە چوینە باکوری عێراق، لەو کاتەدا لە دەوروبەری خواکورک کەمپی پەکەکە هەبوون کە ناوچەی عەشیرەتی برادۆستە.

ماوەیەک لەماڵی کەریم خانماینەوە، لەبارەی بارودۆخەکەوە هەڵسەنگاندنمان کرد، دوایش لە شەقڵاوە چوینە ماڵی جەلال تاڵەبانی. من و دوو ئەفسەری ئیستیخباراتی سەربازی بوین، لەماڵی جەلال تاڵەبانی دوو وەزیر و چەند فەرماندەیەکی پێشمەرگەی لێبوون. ئەوکاتەی باسمان لە چۆنیەتی بارودۆخەکە کرد جارێکی تر جەلال تاڵەبانی بۆئەوەی کاریگەری بخاتە سەرمان وتی **دەزانن ئێمە کورد بە رەچەڵەک تورانین؟!**. لەبەرئەوەی پێشوتر کەسایەتی جەلال تاڵەبانیم باش دەناسی هەربۆیە فریوم نەخوارد و پێموت **ئەی بۆ ئەم قسانە لە گردبونەوەیەکی جەماوەری ناکەیت یاخود لە کتێبێکدا بینوسیتەوە یان لەکاتی بانگەشەی هەڵبژاردندا ئەم قسەیە بۆ ناکەیت؟)**.

**پرسیار :(ئایا جەلال تاڵەبانی لەبەرچاوی هەموو دانیشتوانی ئەوێ وتی ئێمەی کورد بە رەچەڵەک تورانین؟)**.

**وەلام** :(بەڵی، بەڵی، لەبەردەم هەموو ئامادەبوان ئەم قسەیەی کرد، دوایش بە زمانێکی ناسکی دیبلۆمەتکارانە بابەتەکەی گۆڕی. ماوەی مانگێک لە ماڵی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی ماینەوە، دوایش گەڕاینەوە بۆ تورکیا. پاشان لەبارەی دیدە و بۆچون و رەوشەکەوە راپۆرتم نوسی پێشکەشم کرد بە فەرماندەکانم و بە زارەکیش باسی رەوشەکەم بۆکردن، بەڵام لەبارەی ئەندێشەکانمەوە بە ئەشرەف بیتلیسم وت **هەندێک نیگەرانیم هەیە، یەکەمیان سەبارەت بە مەسعود بارزانییە، ناوچەی زاخۆ زۆر ئاڵۆزە، لە رۆژهەڵاتی ئەو ناوچەیە پەکەکە جێگیربووە، پێشمەرگەکانی بارزانی دەتوانن بەباشی پشتی ناوچەکە بگرن، بەڵام لایەنگری پەکەکەن، یەکێک لە گرنگترین و بەهێزترین عەشیرەتی ئەوێ عەشیرەتی سیندییە، ئەم عەشیرەتانەی ئێرە بەتەواوەتی پشت و پەنای یەکترن، پەکەکە توانیویەتی دزە بکاتە ناویانەوە و زۆربەباشی بە رێکخستنی کردوون، ئەمەشیان بەناوی پارتی ئازادی کوردستانەوە کردووە، پەکەکە لەسەر عەشیرەتی سیندی کاریگەرییەکی زۆریان دروست کردووە، وەک دەزانن پارتی ئازادی کوردستان لە باکوری عێراق پارتێکی فەرمی سەر بە رێکخستنەکانی پەکەکە یە، هەربۆیە پێموانییە ئەو پێشمەرگانە دژی پەکەکە شەڕ بکەن، پێویستە لەناویان ئەفسەری خۆمان جێگیر بکەین، ئەگەر ئەمە نەکەین کۆنترۆڵکردنیان زۆر زەحمەت دەبێت، لەلایەکی تریشەوە ناوچەکە زۆر چەتوونە، بۆئەوەی رێگری لە هەڵاتنی گەریلاکانی پەکەکەش بکەین پێویستیمان بە زرێپۆش و دەبابە و تۆپی دوور هاوێژ هەیە،**

**لەوێ کەریم خان هەیە جێگەی بڕوایە، بەڵام جەلال تاڵەبانی زۆر ترسناکە، پێویستە زۆر بەباشی سەری حەبلەکە بەدەستی خۆمانەوە بێت، ئەگەر ئەمە نەکەین لەوانەیە سەرکەوتنێکی باش بەدەست نەخەین.** دوایش بۆ ئەنجامدانی کارێکی تر چووم بۆ شاری ئەدیەمان. فەرماندارێتیمان زانیارییەکانی منیان هەڵسەنگاند، لە ۲ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۲ جموجوڵی سەربازی دەستی پێکرد. لە ڕۆژی ۹ی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۹۲ کەلە شاری باتمان بووم فاکسێکم بۆهات، نوسرابوو **لە باکوری عێراق هەندێک ئاڵۆزی هەیە، پێویستە بچیت بۆ ئەوێ.** ئەمە فەرمانی ژەنڕاڵ یوسف سۆیباش بوو، ڕاستەوخۆ پەیوەندیم کرد و پێیانم وت **بەسەرچاو.** چووم بۆ شارۆچکەی زاخۆ. لە زاخۆ گروپێکی سەربازمان هەبوون بەشێوەی سڤیلی ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکرد. پەیوەندیم پێیانەوە کرد. بەراستی کە چوومە بنجو بنەوانی جمۆجۆلەکەوە بینیم بێ سەروبەرییەکی زۆر هەیە. ئەو ئەفسەرانەی نێردراون ئەرکی پەیوەندی بگێڕن لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگەدا تەنانەت کوردییەکی باشیشیان نەدەزانی. ڕەوشێکی زۆر خراپ و نابەجێ بوو، هەریەکە و سەرقاڵی ڕزگارکردنی گیانی خۆی بوو. هەموویان یەکتریان دەپاراست، هەموویان نیگەرانی ئەوەبوون ئایا پەکەکە دەگاتە شوێنەکانی ئەمان یاننا، ئەمە یەکەم هەڵەی سەرکردایەتی سوپای تورک بوو. ئەوکەسانەیان لەوێ ئەرکدار کردبوو کە شارەزای باکوری عێراق نەبوون، چۆن دەکرێت بەرپرسیارێتی بدرێتە دەست کۆمەڵە ئەفسەرێک تەنانەت شارەزای نەریتی کوردیش نین. ئەو ئەفسەرانەی لەوێ بوون تەنانەت ناوی پارتەکانی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانیشیان نەدەزانی).

**پرسیار :(ئەم قسانە زۆر گرنگن، ئایا بۆچی ڕەوشەکە وابلێهات؟).**

**وەڵام** :(نازانم، ئەمە لە فەرماندەکان بپرسن. بەگشتی بردنەڕێوەی جموجولەکە باش نەبوو، لەبەرئەوەی مانگی کانونی یەکەم بوو کاتی بارینی باران بوو، لەدوای بارانیش لەو هەرێمە بارینی بەفر دەست پێدەکات. ئەگەر بەفریش بباریایە نارەحەتی بۆ سەربازەکان دروست دەبوو، هەروەها نەیاندەتوانی لەو شاخانە هەڵبکەن. لەو ناوچانە بە شەوان پلەی گەرما دەگاتە ۲بۆ۳ پلە. لە بارەگاکەمانەوە چووم بۆ بەرەی شەڕەکە، ئەوێ دونیایەکی تر بوو. دەمەوبەیان پێشمەرگەکان چەکەکانیان هەڵدەگرت و دەچوونە پشت شاخەکانەوە و ئەو فیشەکانەی سوپای تورک دابوی پێیان بە چەپ و ڕاستدا دەیانتەقاند. ئەگەر لە دەوروبەرەکانیشت بڕوانایە هیچ گەریلایەکی پەکەکە بەدی نەدەکرا، ئێوارانیش دەگەڕانەوە

بۆ شوێنەکانی خۆیان و فەرماندەکانیشیان دەچوون بۆ شارەکان و لە ئوتێلەکان دەنوستن. لەڕاستیدا ئێرە لە بەرەی شەڕی نەدەکرد لە شوێنێکی فەرمانگەی دەوڵەتی دەکرد. ئەرکەکەی من پەیوەندی بە پێشمەرگەوە بوو، کارەکەم ناردن و ئیداری و هاوکاریکردن و هەماهەنگی نێوان ئێمە و پێشمەرگە بوو. لەناوەوە رەوشەکە هیچ دڵخۆشکەرە نەبوو، راستەوخۆ لە بارەی ئەم رەوشەوە ئەنقەرەم ئاگەدار کردەوە. ئەگەر رەوشەکە بەمشێوەیە درێژە بخایەنێت ئەوا ماوەیەکی تر رێککەوتن لە نێوان پەکەکە و پێشمەرگە دێتە ئاراوە).

**پرسیار** :(**باشە وەڵامی ئەنقەرە چی بوو؟**).

**وەڵام** :(راستەوخۆ لە فەرمانداریێتی ئەو شوێنەی جموجۆلەکەی دەبرد بەرێوە وەڵامم درایەوە. دەیانوت **مەحاڵە شتێوا بێتە ئاراوە، زانیارییەکانی تۆ هەڵەن. هیچ** کەسێک لەبارەی ئەم رەوشەوە هیچی نەوت. تەنها رووداوەکان روویاندەدا و بە ملیارەها لیرەی پارەی دەوڵەت بە هەدەر دەدرا، لەدوایدا هێزی خۆماڵی خۆمم بەکار هێنا. پێش ئەوەی بچم بۆ بەرەکە زانیبووم ماوەی ٥ رۆژە جەلال تاڵەبانی و پەکەکە دەیانەوێت رێکبکەون، دوایش رێکەوتنەکە ئەنجامدرا و لە نێوان عوسمان ئۆجالان و بەرەی کوردستانی واژۆ کرا. ئەم رێککەوتنە رێی لە ناوچونی پەکەکەی دەگرت، بەمشێوەیە پێشمەرگەکانی تاڵەبانی رێیان بۆ گەریلاکان خۆشکرد بەئارەزووی خۆیان جێگۆڕکێ بکەن. دوایی ناوەڕۆکی ئەو رێککەوتنەتان ئەدەمێ، هیوادارم فەرماندەکان ببینن. دوایش لەبارەی فەرماندەکانی زاخۆوە لێکۆڵینەوەم کرد، دەرکەوت فازڵ موتنییە، ئەم کابرایە بەرپرسی شارۆچکەی زاخۆ بوو، ئەمە قەبوڵ نەدەکرا. من ووردەکاری هەموو کار و رەوشەکەی هەرێمەکەم نارد بۆ فەرمانداریێتی ئاسایشی هەرێمەکە کە ژەنراڵ نەجاتی ئۆزکان بوو. بەڵێ من و کەسانی وەک من چاوەڕێی تەدبیر و بەرگری پتەومان دەکرد، بەڵام هەموو شتێک هەروەکو خۆی بەردەوامی پێدرا. کەس لەبارەی ئەم مەسەلانەوە نەهات و نە چوو، کەسیش پرسیاری نەکرد، کەسیش هەواڵی هیچی نەپرسی. ئەوەی پێویست بوو ئێمە بیکەین ئەوەبوو ووردەکارییەکان زۆر بە ووردی بنوسرێن و رەوانەی ئەنقەرەی بکەین، بەڵام دوایی زانیمان ئەم راپۆرتانەی ئێمە ووردەکارییەکانی تێدا دەردەکرێت و تەنها رووکەشییەکەی دەدرێتە دەستی بەرپرسیاران. ئامانجەکان ئاشکران، ئەوانەی ئەم کارانەیان دەکرد دەردی ئەوان پاراستنی پلەوپایەی خۆیان بوو، ئەوان دەترسان مەسەلەکان گەورە بکرێنەوە و ئەمانیش تێدا بگلێن. دوایی

فەرمان هات فەرمانداریتی بگرمە دەست، ئەم فەرمانەش لەلایەن ئەشرەف بیتلیسەوە هات. لەڕاستیدا بوونی من لەوێ هەندێک کەسی ناڕەحەت کردبوو، بەڵام لەبەرئەوەی فەرمان لە شوێنێکی باڵاوە هاتبوو کەس نەیتوانی هیچ بڵێت. لەوکاتانەدا لە ئەنقەرەوە پەیام لەدوای پەیام دەهات، دەوترا **لەلایەن فەرمانداریتی ئاسایشی هەریمەکەوە زانیاریمان بۆنایەت.** کە ئەمەم زانی راستەوخۆ فاکسم کرد بۆ ئەنقەرە، بۆیانم نوسی **ئەو فاکسانەی پێشوتر ناردم بۆ فەرمانداریتی لە دیاربەکر ژمارەکانیان ئەمانەن..... تکادەکەم داوای نوسخە ئەسڵێکەی بکەن، کە بەدەستان گەیشت بۆتان دەردەکەویت کە من زانیاری ووردم بۆناردوون.** بێگومان دوای ئەم فاکسەی من هەموو لایەک شڵەژا. کەوتمە ناو ئەو رەوشەوەی گوایە ئیستیخباریتیم بەسەر فەرماندەکانەوە کردووە، بەڵام ناچاربووم راستییەکان بدرکێنم. بەرژەوەندی وەلات بۆ من لە پێش هەموو شتێکەوەیە. لەوکاتەدا مەتا سەبیار هێزێکی گەورە و چاونەترسی پێکهێنا، مەتا سەبیار بەوە مەشهورە کە لە بێتەلەوە ماچی بەرامبەرەکەی دەکات. کابرا بەتەواوەتی فەرماندەیەکی راستەقینەیە، لەناو شەڕەکاندا بەردەوام لەریزی هەرە پێشەوەیە. ۳بۆ٤ جارێک لە کلکی مردن گەڕاوەتەوە، فەرماندە دەبێت وەک ئەو بێت. ئەو گۆرانکارییانە کە بەو شێوەیە بەردەوام بوو، ئەشرەف بیتلیس بۆ گەشتێک چوو بۆ رووسیا. لەشوێنی خۆی نەجاتی ئۆزکانی دانا، لەم کاتەدا پەیامێکم پێگەیشت، پەیامەکە ئەوەبوو لەسەر کار دوورخراومەتەوە. کاتێک ئەم پەیامەم وەرگرت راستەوخۆ پەیوەندیم کرد بە ئەنقەردوە و لەگەڵ فەرماندەی گشتی جموجوڵە سەربازییەکە قسەم کرد. چیتان لی بشارمەوە کەمیک تورە ببووم، لە نێوانماندا هەندیک قسەوباس کرا و تەنانەت ئادابی زمانی سەربازیشمان شکاند. پێموت من بووم فاکسم ناردووە بۆ فەرمانداریتی و باسی رەوشەکەم بۆکردوون، لەمبارەیەوە پێویستە پەیوەندی بەوانەوە بکەیت، ئەم پەیوەندییەمان لەریی تەلەفونەوە کرد، بە سەرۆکی جموجوڵە سەربازییەکەم وت **بڕوانن، هەتا ئێستاش داواکاری پێشمەرگە کە چەک و تەقەمەنییە بەهیچ شێوەیەک بۆیان دابین نەکراوە، بۆردۆمانەکان هەدەفی خۆیان ناپێکن، کۆپتەرەکان فریای هەموو شوێنێک وهەموو شتێک ناکەون، ئەگەر هاریکاری نەکرێن ئەوا پێشمەرگە لە شوێنەکانی خۆیان ناتوانن بچنە پێشەوە، پێویستیمان بە هاوانی ١٢٣ملیم بوو بەڵام نەیاننارد، باشە پێشمەرگە چۆن شەڕی پێدەکرێت؟.** ئەویش بە منی وت گوایە ناردویانە، بەڵی ئەو پێداویستییانەی کەلەریی نەجاتی ئۆزکانەوە دەستەبەر کران و نێردران

بۆ پێشمەرگە خرانە ناو عەمبارەکانی جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانییەوە. بە فەرماندەی گشتی جموجۆڵەکەم وت من لێرە کار دەکەم و هەوڵدەدەم بۆ ڕێکخستنەوە و چاککردنەوەی ڕەوشەکە، بێگومان شتی بچوکم حیساب نەکردووە، ئەگەر تۆمەتبارم دەکەن تکادەکەم لێپرسینەوەم لەگەڵ بکەن و لەبارەی لادانیشم لەسەر کارەکەم هۆیەکەی نازانم، لەگەڵ فەرمانەکەت دەگونجێم لە هەرێمەکە جیادەبمەوە، بەڵام دوای کۆتایی شەڕەکان وەکو فەرماندەیەکی تورکی بەشەرەف حیسابی ئەمە دەپرسم، پێموابێت بەمشێوەیە ناتوانم لەمە زیاتر لەناو سوپا بمێنمەوە و خۆم خانەنشین دەکەم).

پرسیار :(پێموابێت دوای ئەم گۆڕانکارییە هەموو لایەک شڵەژاوە؟).

وەڵام :(ئێوە ئازادن چۆنی هەڵدەسەنگێنن، بەڵام لە بەرەکە جیابومەوە. هەموو کارەکان وەکو خۆیان مانەوە. دوای تێپەڕبوونی ٤ ڕۆژ فەرماندەی ئاسایشی هەرێم ژەنراڵ دورسون تەلەفونی کرد، ئەزانن چی بە من وت؟، پێی وتم لەو هەرێمە ڕوبەڕوی بەرپەرچ دانەوەیەکی زۆر دەبینەوە، پێمباشە بچیت بۆئەوێ و هێزی پێشمەرگە ڕێکبخەیتەوە و هەوڵبدە هێرشیان پێبکەیت و بەربەستەکان مەهێڵە. ئەو پێی وابوو ئێمە شەڕ ناکەین وگەمە دەکەین، یەک بۆ دواوە و دوو بۆ پێشەوە. جارێکی تر سنوری ئادابم شکاند و پێموت داوای لێبوردن دەکەم کاری من ئیستیخباراتە، کەمێک لەمەوبەریش خۆتان منتان بەو ناوە بانگکرد، لەسەر فەرمانی سەروی خۆم پەیوەندی لەگەڵ بەرەی شەڕدا نەما، هەرچۆنێک بێت شەڕەکە هەرلەخۆیەوە بەرەو کۆتایی دەچێت، بڕیاربدەن فەرماندەیەکی زاخۆ بچێت بۆ بەرەی شەڕەکە، با ئەوان پێشمەرگەکان ڕێکبخەن و شەڕیان پێبکەن. لەسەر ئەم قسانە ئەویش وتی بەڵام ئەوان ئەم کارەیان پێناکرێت و سەرکەوتنیش بەدەست ناهێنن. منیش پێموت ئەگەر دەزانن ئەوانەی ئەوێ ئەم کارانەیان پێناکرێت بۆچی لەوێ دایاندەنێن و ئەرکیان پێڕادەسپێرن؟، بۆچی منتان لەسەر ئەم کارە لابرد؟. ئەویش وتی ئەوە چییە ئەڵێی دڵت شکاوە؟، ئێمە ئەم فەرمانەمان دەرکرد هەتا ڕەوشی تۆمان بۆ روونبێتەوە. دوایش بە ئاشکرا پێموت لە ئاکامی بڕیارە هەڵەکانتان ئەم ڕەوشە هاتووەتە ئاراوە، دوا قسەشم بەمشێوەیە بوو من پێموابوو لەناو سوپاکەماندا تەنها یەک فەرماندەی گشتی هەیە، بەڵام دەرکەوت کێ هەڵدەستێت خۆی بە فەرماندە لەقەڵەم دەدات. من ئەفسەرێکی بەشەرەفم، چیکاتێک کاتی هات قسەی خۆم دەکەم و چیش پێویست بکات دەیکەم، بەڵام ئێستا هیچ ناڵێم، چونکە بەرگی سەربازیم پۆشیوە.

ئەگەر ئێستا قسەم بکردایە بەگوێرەی پلەوپایە بێت دەتوانێت قسەم پێببڕێت. ئەم سوپایە سوپای منە، باوکیشم ئەفسەر بوو. لەوکاتەوەی لە دایک بوومە نانی سەربازی دەخۆم، بە بڕیار و بە کردەوەی هەندێک کەسی ناو سوپا غرورم ناشکێنرێت، ئەو بڕیارە هەڵەبوو کە شەڕەکەی گەیاندە ئەو ئاستە).

**پرسیار** :(**لە کەناڵەکان ڕیپۆرتاژێک بڵاوکرایەوە، لەدوای ئەم ڕیپۆرتاژە جموجۆڵی سەربازی باکوری عێراق دەستی پێکرد، دەمەوێت لەبارەی ئەو ڕیپۆرتاژەوە رای تۆ بزانم**).

**وەڵام** :(ئەو ڕیپۆرتاژە لە زەلێ ئەنجامدرا. ئەگەر بە ئەنقەست نەبوبێت بڕوابکەن ڕیپۆرتاژێکی زۆر نەشیاوبوو، لەلایەکی تریشەوە کاتەکەی باش نەبوو. کاتێک دەوڵەت دەڵێت {ئێمە پەکەکەمان تەواوکرد} لەهەمانکاتیشدا عوسمان ئۆجالان لە کەناڵەکان دەردەچێت و دەڵێت **ئێمە لەناونەچوین و لێرەین**. ئەم دیمەنە مانای وایە ئەوانەی لە پەکەکە ترساون لە ڕوژهەلاتی باشوری تورکیا جارێکی تر ناخیان بهەژێنرێت).

بەڵێ، (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) ئەگەرچی باسی لە ناکۆکییەکانی ناو سوپای دەکرد لە ڕاستیدا هەوڵیدەدا هاوکارییە ڕاستەقینەکان بۆ کێ چوونە بشارێتەوە و ئەگەرچی ویستیبێتی مەسەلەکانیش بچوک بکاتەوە بەلام ڕوونکردنەوەی گرنگی کرد و زۆرشتی گرنگیشی درکاند و کەسیش خۆی نەدەکرد بە خاوەنی.

## (سەرەڕای هەڵەی تەکتیکیشمان ئێمە شەڕەکەمان بردەوە)

بە درێژایی شەڕوپێکدادانەکانی باشور (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر) کە ماوەیەکی زۆر یەکینەکانی سوپای تورک و پێشمەگەکانی دەبرد بەڕێوە، هەروەها (جەمیل بایک) کە فەرماندەی هێزەکانی گەریلا بوو لە بەرەکاندا، لە دیمانەیەکیدا بەرەی شەڕی لای خۆیانی بەمشێوەیە هەڵدەسەنگاند :

**پرسیار :(شەڕی باشوری کوردستان چۆن دەستی پێکرد؟، چی وای لە بەرامبەرەکەتان کرد هەست بە پێویستی هەڵگیرساندنی ئەم شەڕە بکات؟).**

**وەلام:** (لە تورکیا هەردوو سەرکردە سلێمان دیمیرال و ئەردال ئینونو کە حکومەتێکی هاوبەشیان پێکهێناوە، پێیان وایە ئەگەر بڕیاری کوشتن، بڕین، تۆقاندن و شەڕکردن بدەن ئەنجام وەردەگرن، ئەوان بەو خەیاڵەوە دەژین. تورکیایان خستە ناو ئەم گێژاوەوە، دەیانویست لەڕێی ئەم کارەیان هەستی نەتەوەپەرستی و نیشتیمان پەروەری خەڵکی تورک بووروژێنن. لەهەمانکاتیشدا لە ئاستی نێودەوڵەتیدا قورساییاندا بە کاری دیبلۆماسی، لەئاکامی ئەم کارانەیاندا کوشتارکاری شارۆچکەی (شڕناخ)یان پێکهێنا. کوشتار و تۆقین و پەلامارییەکانی سەر خەڵکی شارۆچکەکانی وەک (شڕناخ، لیجە و خانی)یان ئەنجامدا و بەمشێوەیە ئامادەباشییان بۆ شەڕی باشوری کوردستان کرد. بەم کوشتار و تۆقینانەیان لەو شارۆچکانەدا دەیانویست بە شەڕی باشور هەنگاوەکانیان کۆتایی پێبهێنن. لەم بارەیەوە هەندێک پشتیوانی نێودەوڵەتیشیان بەدەست خست و بەتایبەتی لەگەڵ ئەو وەلاتانە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ تورکیا یەک دەگرێتەوە. ئەو تێکۆشانەی پەکەکە دەستی پێکردووە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی ئەوان ناکات، هەربۆیە لەناودانی پەکەکە لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانیانە. لەبەرئەوەبوو شەڕی باشوری کوردستانیان دەست پێکرد. ئامانجیان ئەوەیە بەتەواوەتی پەکەکە لەناوبدەن، لەهەمانکاتیشدا هەموو لایەک پێیان وابوو پەکەکە بەرگەی ئەم هێرشانە ناگرێت. پێش دەستپێکردنی ئەم هێرشانەیان بیریان لەوە دەکردەوە

**ئێمە پەکەکە لەناو دەبەین و دوایش حیساب و کیتابی دوای نەمانی پەکەکە دەکەین.** بۆئەم مەبەستەش هەوڵێکی زۆریاندا. بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان وەکو دەزانن لە خواکورک، چوکورجە و هەفتانین هەتا سنوری ئێران و لە نزیک سوریاشەوە لەهەمبەر ئێمە بە پاڵپشتی هێزەکانی پەدەکە و یەنەکە سوپای تورک لەهەمبەر هێزی گەریلا شەڕێکی سەرتاسەریان دەست پێکرد. بە رواڵەت هێزەکانی ئێمە تەنها لەهەمبەر هێزەکانی پەدەکە و یەنەکە و سوپای تورک شەڕیان کردووە بەلام راستییەکە وانییە. هەربۆیە دەتوانین بڵێین هێزێکی تری زۆری نێودەوڵەتی بەرامبەر بە ئێمە هاریکاری تورکیایان کردووە. ئەو هێزانە لە بواری سیاسی و سەربازی هاریکاری تورکیایان کرد، بەگشتی ئێمە لەهەمبەر ئەو هێزانە جەنگاوین. لەهەمانکاتدا هێزێکی تری نێودەوڵەتیش هەبوون لە پشت پەردەوە کە دەرنەدەکەوتن، هەربۆیە ئەم شەڕەی باشوری کوردستان شەڕێکی مێژووی بوو. هێزەکانی ئێمە لە باشوری کوردستان بە گشتی خۆیان دەدا لە ٢٥٠٠ بۆ ٣٠٠٠ هەزار گەریلایەک. تێکڕای ئەم هێزەمان پێکهاتبوون لەوانەی کە سەرقاڵی مەشقکردنی سەربازی بوون، زۆربەشیان گەریلای نوێ بوون. تیاشیاندا هەبوو کە مەشقیشی نەکردبوو، ئەمەیان دەزانی، هەربۆیە پێیان وابوو نارەحەتییەکی ئەوتۆیان بۆ دروست نابێت و لەماوەی چەند رۆژێکدا گوایە پەکەکە لەناودەبەن. ئەگەر پێیان بکرایە لە باشوری کوردستان گورزی کوشندە لە ئێمە بدەن ئەوا لە باکوریش گوایە بەگیرمان دەهێنن، بەمشێوەیە بەگوێرەی لۆژیکی ئەوان کۆتاییان بە ئێمە دەهێنا).

**پرسیار** :(**پاشان چی روویدا؟**) .

**وەڵام**: (لەم شەڕەدا لۆژیکی پیلانی سەربازی ئەوان ئەمەبوو **دوای ئەوەی پەکەکە لەناو دەدەن گۆڕانکاری نوێ دەکەن.** بەگوێرەی پیلانەکەیان بەرنامەی لەناودانی پەکەکە پیلانێکی زۆر بەرفراوان بوو، ئەمە لەلایەن ئێمەوە درکی پێکرابوو، بەتایبەتی رێبەر ئاپۆ هەرزوو درکی بەم رەوشە و ئەم پیلانانە و ئەم نیازانەیانی کردبوو. ئێمەش لە شرۆڤەکانی رێبەر ئاپۆ درکمان بەمە کردبوو، رێبەریش زوو، زوو رێنمایی و پێشبینییەکانی خۆیمانی بۆدەنارد و پێمانی دەوت پێویستە بەرامبەر ئەو رەوشەی دێتە ئاراوە چی جۆرە رێگرییەک بگرینە بەر، ئێمەش لەم بارەیەوە کەوتبوینە ناو کاروخەباتەوە. مانگێک لەمەوبەر لە شارۆچکەی زاخۆ دۆستێکمان بە ناوی سادق عومەر کوژرا، ماوەیەکی زۆر بوو سادقمان دەناسی و

پەیوەندی نێوانمان زۆر باش بوو. ئەو یەکێک بوو لە کەسەکانی هەرە پێشەوەی راپەڕینی زاخۆ. لەرزگارکردنی زاخۆ دەستێکی بالآی هەبووە، پەدەکە و تورکیا لەم پیاوە نارەحەت بوون، هەربۆیە کوشتیان. لەدوای کوشتنی سادق نێوان ئێمە و پەدەکە درزی تێکەوت، تەنانەت سەنگەریشمان لەیەک گرت، بەلآم لە نێوانمان شەڕ نەهاتە ئاراوە. لەڕاستیدا ئەوکاتە پەدەکە دەیویست شەڕی ئێمە بکات، بەلآم یەنەکە ئەوکاتە هێشتا لەهەمبەر ئێمە شەڕیان رانەگەیاندبوو. پەدەکە دەیویست یەنەکە بەلای خۆیاندا رابکێشێت و رازیان بکات، بەلآم لەبەرئەوەی یەنەکە یان رازی نەکردبوو نەیاندەویست هێرشمان بۆبهێنن. ئێمەش لایەنگری شەڕ نەبووین. لەودۆخە ناهەموار و ئالۆزەدا لەگەڵ حکومەتی هەرێم چاوپێکەوتن دەستی پێکرد، داخوازی ئێمە لەم چاوپێکەوتنە هاتنەئاراوەی رێککەوتن بوو. ئەو پێشنیار و مەرجانەی ئێمە روبەڕویانمان کردەوە بەبێ یەکودوو بەشێکیان قەبوڵکرا. لەبەرئەوەی ئەم رێکەوتنە هاتەئاراوە ئێمەش ویستمان هەندێک هەنگاو بنێین، بەلآم دوو دڵ بووین. هەرچەندە لە نێوانمان رێککەوتن هەبوو ئەمانزانی ئەمە تەکتیکە و پەدەکە دەیەوێت کات بەدەست بخات و لەهەمانکاتیشدا دەشمانزانی ئەم هێرشانە دێنە ئاراوە. یەکێک لەوانەی ئەم پێشبینیانەی بینی من بووم، بەڵێ رێککەوتن هەبوو بەلآم ئامانجیان بەدەست خستنی کات بوو، هەروەها تەکتیکە و سەرقاڵیکردن بوو. لەهەمانکاتدا بۆ ئەنجامدانی هێرشەکانیان هێزیان کۆدەکردەوە، سەرەتا من درکم بەمەکرد و دەمویست مەسەلەکان بە روونی ببینرێن و بە گوومانەوە لە پێشهاتەکانم دەڕوانی. هێشتا کاتێکی ئەوتۆ بەسەر پێشهاتەکاندا تێنەپەڕی بوون هێرشەکان هاتنە ئاراوە. بەکورتییەکەی ئەوان پابەندی رێککەوتنەکە نەبوون، ئەگەر پابەندبونایە بە رێککەوتنەکەوە ئەم شەڕەی باشور نەدەهاتە ئاراوە).

**پرسیار** :(**ئایا دەتوانن زیاتر روونی بکەنەوە بۆچی پابەندی رێککەوتنەکە نەبوون؟**)

**وەلآم** :(ئەمە ئەوە دەگەیەنێت خۆیان خاوەن بڕیار نین و لە شوێنێکی ترەوە بڕیارەکان دەدرێن و ئەوانیش وەکو بەردی دامە دەجوڵێنرێن. دڵنیاین لەمبارەیەوە زەختیشیان لێکراوە، دوای مانگێک هەموو رێککەوتنەکەیان وەلانا و هێرشیان بۆهێناین. لەهەمبەر ئەمەش ئێمە بەرگرییمان کرد بە بنەمای خۆمان و لەهەمانکاتیشدا دەرگایەکمان بۆ رێککەوتن کردەوە. بە گشتی درکمان بە مەترسییەکە کردبوو کە دەیانەوێت چی بهێننە سەر کورد، دوژمن دەیانویست تەکتیکی کورد بە کورد کوشتن پێشبخەن. مەخابن ئەوانەی شەڕی ئێمەیان

دەکرد درکیان بەم مەترسییە نەدەکرد، دوژمن بەڵێنی هەندێک شتی پێدابوون و باوەڕیان بە دوژمن کردبوو هاتنە سەر خەتی گەمەی دوژمن. بە بەردەوام بوونی ئەوان لەسەر ئەو خەتە بەمانای ئەوەدەهات ئەم مەترسییانە بەردەوام دەبن، بێگومان پێویست بوو ڕێگری لەم پیلانانە بکرێت. هەرلەسەرەتاوە ئێمە ئەم بەرگرییەمان بۆخۆمان کردبوو بە بنەما و بەرگرییمان کردبە بەرنامەی سەرەکی خۆمان. ئێمە نەکەوتینە ناو حاڵەتی هێرشکردنەوە، دوای ئەوەی ڕێڕەوێک کرایەوە و هەوڵدان هاتەئاراوە لەگەڵ یەنەکە کەوتینە ناو کەشوهەوای ڕێککەوتنەوە. لەسەرەتای دەستپێکردنی شەڕەکاندا تورکیا لەگەڵ پەدەکە و یەنەکە بوو، پێش دەستپێکردنی شەڕەکان ئەفسەرە تورکەکان چوبونە ناو هێزەکانی پەدەکە و یەنەکە وە، بەیەکەوە ئامادەباشییان کردبوو پاشانیش هێرشیان کرد. ئەفسەرە تورکەکان بە جلوبەرگی پێشمەرگەوە لە ناوچەکان دەگەڕان، هەربۆیە دەتوانین بڵێین هەموو ئامادەباشییەکان لەلایەن تورکیاوە ئەنجام درابوو. تورکیا ئازوقە، کەلوپەل و چەکی دانێ و تەنانەت بیتەلەکانی دەستی پێشمەرگەش لەلایەن تورکیاوە دابینکرابوون. شەڕەکان بە هاوبەش دەیانبرد بەڕیوە، پەدەکە و یەنەکە و ئەفسەرە تورکەکان کۆمیتەیەکی هاوبەشیان پێکهێنابوو. توپ و هاوەنەکان لەلایەن ئەفسەرە تورکەکانەوە بەکار دەهێنران، هەروەها بۆردۆمانە ئاسمانییەکان و توپە دوورهاوێژەکان لەلایەن ئەم ئەفسەرانەوە ڕێنمایی دەکران. بەڵێ بەو شێوەیە شەڕەکان تولیان کێشا. یەکێک لەو شوێنانەی کە شەڕوپێکدادانی سەختی لێهاتەئاراوە هەفتانین بوو، لەهەمانکاتیشدا لەبەرەی ئێمە و لەبەری دوژمنیش زۆرترین زیان هەر لە هەفتانین هاتەئاراوە. ئێمە لەبواری سیاسی و سەربازیدا نەدۆڕاین، بەڵام ئەو ئەنجامەی دەمانویستیش بەدەستمان نەخست. بردنەڕێوەی شەڕێک دوور لە خواست و تەکتیکی خوازراو ئەو ئەنجامەی لێدێتەئاراوە و دەبێت بەچاوێکی هاکەزایی لێیبڕوانرێت. ئەگەر بمانتوانییایە تەکتیکەکانی خۆمان بەباشی بەڕێوە بەرین لەوانەبوو ئەنجامی باشترمان بەدەست بخستایە، دەتوانین لە خۆمان بپرسین ئایا بۆچی نەمانتوانی تەکتیکە سەرەکییەکانمان بەکاربهێنین؟، بێگومان ئەمە پەیوەندی بە پێشوەختی شەڕەکەوە هەیە. پێش دەستپێکردنی شەڕەکان هەندێک تەدبیر هەبوون کە دەبوایە وەرمانبگرتنایە. لەبەرئەوەی تەدبیرەکانمان وەرنەگرت ناچارماین تەکتیکی تر بەکاربهێنین، ناچارماین شەڕێک بکەین کەلە دەرەوەی خواستی تەکتیکی خۆمان بێت. تەکتیکی ئێمە تەکتیکی گەریلایەتییە، بەڵام ئێمە ئەمەمان نەکرد و چوینە

ناو شەڕی سەنگەر و مەیدانییەوە. لە مێژووی ئێمەدا ئەمە یەکەمین جارمان بوو شەڕێکی لەو شێوەیە بکەین، ئەم شێوازە شێوازی شەڕی پەدەکە و یەنەکە بوو. لەسەر تەکتیکی ئەوان شەڕکردن بەرامبەر بە تەکتیکی ئەوان شێوازی شەڕکردنی ئێمە نەبوو، هەربۆیە نەکرا ئەنجامی خوازیار بەدەست بخەین. سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەنجامی باشمان بەدەست خست، هەربۆیە دەڵێم سەرەڕای ئەوەی شەڕێکمان بردە رێوە کە لەدەرەوەی تەکتیکی ئێمەدا بوو بەتایبەت لە هەفتانین توانیمان هێزی بەرامبەرمان ببەزێنین، هەربۆیە تورکیا ناچارما بەشێوەیەکی خێرا بەرەیەکی تری شەڕ بکاتەوە. هۆی سەرەکی کردنەوەی بەرەی دووەمی شەڕەکان بەتەواوەتی پەیوەندی بەم شتانەوە بوو کە باسم لێوەکردن، ئەگەر بمانتوانیایە تەکتیکی خۆمان بەکاربهێنین بێشک ئامانجی زیاترمان بەدەست دەخست. ئەوان هەرلە سەرەتای شەڕوپێکدادانەکانەوە پێیان وابوو بەچەند رۆژێک بەتەواوەتی ئێمە لەناودەبەن، بەڵام کە شەڕ دەستی پێکرد حاڵی بوون کارەکانیان بە ئاسانی ئەنجام وەرناگرێت. بۆشیان دەرکەوت بە ئاسانی پەکەکە یان پێ لەناو نادرێت، نەک لەناودانی پەکەکە بەڵکو بەچاوی خۆیان زیانە گەورەکانی خۆیانیان بینی. ئیتر بیریان لەوە دەکردەوە چۆن گیانی خۆیان رزگار بکەن، روبەڕوی بەرخودانێکی سەرسوڕێنەر بوونەوە کە هەرگیز چاوەڕێی نەبوون).

**پرسیار :(ئایا دەتوانن مەسەلەی هەڵەی تەکتیکیتان زیاتر روون بکەنەوە؟)**

**وەلام :**(هەڵەی سەرەکی ئێمە ئەوەبوو پێش دەستپێکردنی شەڕەکان ئەو تەدبیرانەی پێویست بوو وەربگیردرێن مەخابن نەکران. دەمانزانی هێزی هەمبەرمان هێرشمان بۆدەهێنن و دەبوایە ئێمە تەدبیری پێویستی پێشوەختمان وەربگرتایە بەڵام ئێمە ئەمەمان نەکرد. دەبوایە پێشوتر کەمپەکانمان چۆڵبکردایە، کۆمەڵە هەڤاڵێک هەبوون نوێ بوون و بەئەزمون نەبوون، هەروەها مەشقی سەربازیشیان نەکردبوو دەبوایە بەخێرایی ئەو هەڤاڵانانەمان دوور بخرایانەتەوە. پێویست بوو زووتر پێداویستییە سەرەکییەکانمان وەک ئازوقە لەشوێنی جیاواز بشاردایەتەوە، هەروەها دەبوایە هەڤاڵە بە ئەزمونەکانمان بەگوێرەی تەکتیکەکانی خۆمان رێکبخرانایە و بکەوتنایەتە ناو جوڵەوە. ئەگەر هەموو ئەمانەمان بکردایە بێشک نەدەکەوتینە ناو شەڕی سەنگەر و مەیدانییەوە، بەڵێ لەبەرئەوەی ئەم تەدبیرانەمان وەرنەگرت و هێرشمان بۆهات ناچارماین ناوچەکانمان بپارێزین و کەوتینە ناو شەڕی مەیدانییەوە. لەهەمانکاتیشدا پێویست بوو خەمی هەڤاڵە نوییەکانمان بخۆین کە ئەزمونیان

نەبوو، هەروەها پێمان وابوو هەموو ئەمانە لەیەککاتدا بپاریزین دەتوانین لەو ناوچانە زیاتر بمێنینەوە. ئەگەر ئەو هەڤاڵەنەمان نەپاراستایە و پێداویستییەکانمان نەپاراستایە هەموو شتێمان لەدەستدەدا، هەربۆیە ناچارماین بۆ پاراستنی شوێنەکانی خۆمان بکەوینە ناو شەڕی مەیدانییەوە. ئەمەش هەڵە بوو، نەمانتوانی تەکتیکی گەریلایەتی خۆمان پەیڕەو بکەین. دەکرا هەرلە سەرەتاوە کۆتاییمان بەم جۆرە شەڕە بهێنایە، بەڵام لەبەرئەوەی درەنگ کەوتبووین نەمانتوانی پەردەی شەڕەکە دابدەینەوە، ئەم هەڵانەش قوربانی لێکەوتەوە. زیانەکانمان چین؟، بەدرێژایی شەڕەکان لە خواکورک ٣٤ هەڤاڵمان شەهید بوون، لە چوکورجەش ١٣ هەڤاڵمان شەهید بوون، هەروەها لە هەفتانینیش ١١٤ شەهیدماندا، بەگشتی لە شەڕوی باشوری کوردستان ئەمە ژمارەی گشتی شەهیدەکانمان بوون. ژمارەی شەهیدانی هەفتانیمان بەگشتی ئەو شەهیدانەن کە پێش شەڕ و دوای شەڕەکەش شەهید بوون، ٤ بۆ ٥ شەهیدمان هەرلە پێش دەستپێکردنی شەڕەکانەوە لە زاخۆ لەلایەن پەدەکە وە شەهید بوون. دوای ئەوە شەڕەکان لەئاکامی رێککەوتن کۆتایی هات، دوای ئەم رێکەوتنەش ٣ هەڤاڵمان لە ناوچەی موتنی لەئاکامی بۆسەیەکی پێشمەرگەکانی پەدەکە شەهید بوون، هەروەها ٤ هەڤالیشمان کاتێک دەیانەوێت بپەڕینەوە بۆ باکوری کوردستان لە ئەنجامی تەقینەوەی لوغم شەهید بوون، هەموو ئەو شەهیدانە لەناو ژمارەی شەهیدانی هەفتانینن، بەگوێرەی ئەو شەڕوپێکدادانە سەخت و چڕەی هاتە ئاراوە قوربانییەکانمان زۆر نین). ([٢٤٤]). بەڵام کاتێک

---

[٢٤٤] فەرماندارێتی باڵی سەربازی (پەکەکە) (ئارگەکە) ئاماری شەهیدانی (چوکورجە) و باشوری کوردستانی راگەیاند کە (١٩٣) گەریلا بوون. لە مانگی ئابی ساڵی (١٩٩٣) ئۆرگانی سیاسی پەکەکە (سەرخوەبون) بە پشتبەست بە ئامارەکانی (ئارگەکە) ئەو گەریلایانەی لە (چوکورجە و هەفتانین) شەهید بوونە ناوەکانیان ئەمانەن :

(رۆزا، لوقمان ئیبراهیم عەبدۆ، موراد، لەیلە قاپلان، محەمەد تۆنەر، عزەدین ئەیبەک، محەمەد ئەرسۆی، ساکینە ئیمام، عەبدوللە مالگاز، حوسێن چەلەبی، مەعاس جانسو، ئەحمەد عایرلماز، شوکور ئاکبولوت، ئەلیف، حەسەن میحۆ خەلیل، فازل تۆنجو، حەربییە، محەمەد ئالۆ، مەروان محەمەد، کەمال ئونەلە، عیسا یوسف گولی، شەوکەت توریێ، عەبدوللە نوراک، سینان سۆیسال، عەتییە ئەغتاش، زەکییە سلێمان، سیامەند شک، چاغڵەیان کایک، رەجەب، هۆشەنگ خەڵەف ئیسەن. بەختیار یەشیلتەپە، خالد سلێمان، تۆرهان چوکورقایە، کاوە، شوکرو موراد، ئیسماعیل سەلیم مەمۆ، محەمەد عەبدۆ، بەهرەدین گوزال، لوقمان ئایقاز، شەهریستان ئۆغوز، مەمدوح گۆکهان، فاتیح، گورگین یامان، مەجید، ئەنوەر ئێکسیم، شوکور ئەحمەد، مریەم ئێفەتورک، عەبدولکەریم عەبدە، شەمسەدین گونەش، لوقمان ئونوشتو، بریندار، سینان ئاڵتون، محەمەد سەعید ئیبراهیم، تۆزلەم تاش، شاکر حەسەن، عەللا، یڵماز

بیر لە هەڤاڵان دەکەینەوە پێمانوایە زەرەرێکی زۆرمان کردووە، دەمانتوانی هەوڵی زیاتر بدەین و ئەوەندە زیانمان لێنەکەوێت، هەموو ئەمانە لە ئاکامی وەلانانی تەکتیکەکانمان بوون لە شەڕەکاندا. ئەگەر تەکتیکەکانمان پەیڕەو بکردایە دڵنیام زیانمان بەو شێوەیە نەدەبوو. لەوانەیە کەمتربوایە، بەڵێ یەکێک لەو هەڵانەمان بوونە هۆکاری ئەو ئەنجامانە، ئەتوانم بڵێم ئەم ئەنجامە مێژووییە بواری تری گرنگی خستە پێشمان. یەکێک لەو هەلانەی هاتە پێشمان لەناودانی خیانەتکاران بوو، بێگومان ئەگەر بمانتوانیایە تەکتیکەکانمان بەکار بهێنایە، دەشمانتوانی شۆڕشی باکور و باشور بکەین بەیەک. لە باشوری کوردستان توانیمان خەتێکی نوێی شۆڕشگێڕی پێشبخەین، لەگەڵ گەشەکردنی ئەم شۆڕشەش هزر و فەلسەفەمان بڵاوتر دەبووەوە، نەمانتوانی ئەمە بەباشی هەڵسەنگێنین. لەکاتی شەڕەکاندا

---

قایە، محێدین، عەلی ئیحسان ئۆزلەهان، عەبدولرەحمان ئێلیز، نوعمان، ئەبوبەکر ئۆنەچ، رەمەزان دیار، عەبدولرەحمان، عەبدولرەحیم حەسەن، ئیسماعیل ئینجەسو، فوئاد ئاڵتورک، بەیرەم، جەلال چۆبانئۆغڵو، ئەنوەر یڵدز، محەمەد عیسا سایگی، رەمەزان ئەدسەن، رەحیم گۆکمان، شوکرو ئۆزێن، سینان، ئایدن تورگوت، شەریف، فیکرەت یەکان، موراد تونچ، حەسەن جەنیش، سلاحەدین ئاڵپتەکین، ئیبراهیم کەمال عەبدۆ، ساڵح ئیرەن، فەرهاد، بەشیر، مەعسوم، عەلی حەیدەر، جەمال، حاجی محەمەد خێلۆ، سەعید ئێلچی، مستەفا، خالید ئەران، م، سیراج، شێخ موس، سەیفەدین چیچەک، باقی حوسێن سلێمان، محەمەد ئۆزگول، جەسور، سادق قەرە، کامەران قەرە، سادق، محەمەد حەنەفی، شێرزاد جومعە، محەمەد چەلیک، حەسەن ناسر، بەنگین ئاکسو، ئەرداڵ، ئەرکان ئاکا، محەمەد حوسێن، سادق، دەڤریم، ئیدریس تورمان، شۆڕش، رێزان، جەعفەر ئاجەر، زاهیدە قڵچ، مەحمود، ئەشرەف، رەمەزان یورەک، مەعسوم، ماهیر، شوکرییە ئینان، عەلی یوکسەل، فورات، تۆفان، هۆزان، محەمەد ئەمین حاجی، تەحسین چەتین، رەفیق یوسف، شیار، ئاشوت، کەرەم، شیڤان، تۆفیق بۆزان، موراد، تاهیر عایار، رێناس، حەسەن ئاغاداش، داوود، مەقبولە ئۆزێن، رێزان، محەمەد، سادق توران، تەکین ئۆزجان، یەشاری جێرکی، مەزڵوم، ئەحمەد .

شەهیدانی خواکورک :

گوڵناز قەرەتاش، ئەحمەد ئۆکچو، سەبری، موزەفەر کۆک، م شەکر زۆربایی، عزەدین ئۆسێز محەمەد، تەکین تەنەرقولو، ئوفوق ئاتامان، ئەژدەت ئۆکتای، موزەفەر بۆزکورت، عەبدوللە ئەناسەڤان، محەمەد بەکان، یەشار ئوبگۆر، ویداد، مەتین ئارک، کامەران قاردان، سەعید دەمیر، حەسەن دەروێش، مەحمود ئەمەک، بەرخودان، محەمەد دینچ، ئایتەکین دەغیرمەنجی، یوسف سلێمان، عەلی ئۆکدەمیر، جاهید دەنیزخان، مەحمود شاهین، ئەحمەد ئایلانچ، ئەرداڵ قارای، ئەجاتی گونەش، باشور، محەمەد سەعید، نایف مەناف مزوری، ئەحمەد ئەنوەر، موحسن عەبدولکەریم، جەلال، هۆشەنگ، حەمید خەلیل، مەسعود پارلاک، عومەر شوکری عوسمان، چیراو، فەرمان، شەرەفخان سوورە، ساحیبە مارکۆچ، فوئاد دەمیرباغ، سەباحەدین دۆغان، یوکسەل ئەکسەمان.

هەندێک شوێنی ئازوقەمان دەستیان بەسەردا گیرا، ئەو ئازوقانەش نەک تورک بەڵکو پێشمەرگەکان بردیان بۆخۆیان).

**پرسیار (ئایا ئەم شەڕە چی دەستکەوتێکی بۆ ئێوە هەبووە؟).**

**وەلام** (بێشک شەڕ تەنها پێکنایە لە زیان، ئەم شەڕە هەندێک ئەنجامی باشیشی لەگەڵ خۆیدا هێنا. پێش هەموو شتێک ئەو شەڕەی پێیدەڵێن شەڕی سەنگەر بە ئێمە نامۆ بوو، هەروەها لەگەڵیدا رانەهاتبووین، ئەزمونیشمان لەگەڵیدا نەبوو. سەرەڕای بێ ئەزمونیشمان شەڕمان کرد و ئەزمونی نوێمان بەدەست خست، ئەمە پێی دەڵێن دەستکەوت و قازانج. لەهەمانکاتیشدا لەم شەڕانەدا ئەوەمان سەلماند ئەو شوێنانەی رزگارمان کردوون دەشتوانین بیانپارێزین، دەتوانین ئەمە بە تەکتیکی نوێ پێشبخەین، ئەمە یەکێک بوو لە دەستکەوتەکان، هەروەها ئەوەشمان بۆ دۆست و نەیار سەلماند کە پەکەکە ئەو هێزە نییە بتوانرێت بە ئاسانی لەناوبدرێت و ئەوەشمان سەلماند لەناوچەکە هیچ چارەسەرییەک بێ پەکەکە نابێت و هەموو کەسێکیش ئەم راستییەی بۆدەرکەوت. راستییەکی تریش دەرکەوت ئەوەبوو خەڵکی بۆیان دەرکەوت هێزەکانی باشور ئەگەر هاوکاری هێزی بیانی نەبێت ناتوانن یەک رۆژیش بەرگە بگرن، سەلمێنرا ئەو هێزانەی باشور بەهاوکاری دەرەکی دەتوانن بە پێوە بمێننەوە. ئەو خەباتەی گوایە بەناوی وەلاتپارێزییەوە دەیکەن ئەگەر هێزی دەرەکی دەستی یارمەتییان بۆ درێژ نەکات خۆیان ناتوانن بیبەن بەڕێوە، لەم شەڕەدا بۆخەڵکی ئاشکرابوو ئەم هێزانەی باشور هیچ پەیوەندییەکیان بە وەلاتپارێزییەوە نییە و ئاوێتەی دوژمنن و دەمامکی روویان داماڵرێنرا. زۆر کەس بەهۆی ئەم شەڕەوە راستی ئەوانی بۆدەرکەوت، ئەم شەڕە کاریگەرییەکی زۆری خستە سەر خەڵکی باشور. یەکەمجارە خەڵکی باشور بینییان هێزێک هەیە دەتوانێت بەرامبەر ئەم هێزانەی باشور بێتەوە و ئەمەش بوو بە ئومێدێک بۆئەوان. شەڕەکە هەڵە و کەموکوڕی ئێمەی خستە روو، بەتایبەتی لەبارەی رێنماییەکانی سەرۆک ئاپۆوە گوێمان لێنەگرت و ئەو تەکتیکەی ئەو خوازیاری بوو ئەنجامبدرێت مەخابن ئێمە نەمانکرد و سەرۆک تەکتیکی نوێی شەڕی پێشخست. سەرۆکیش توانی لەڕێی ئەم شەڕەوە تەکتیک و چارەسەری نوێ پێشبخات و ئێمەش سودی لێوەربگرین، بێگومان ئەمە مژارێکی گرنگە بۆ ئێمە، هەروەها ئەزمونمان وەرگرت لەبارەی نەگونجانی جموجۆڵ پێکردنی گەریلا و خراپی کۆکردنەوەیان لەیەک شوێندا و دانەبڕانیان لەیەکتری و بە رێبردنیان بەیەک

ئاراستە. ئەو شەڕە ئەو سودانەی بە ئێمە گەیاند، هەموو ئەمانەشمان بەباشی بینی. زانیمان هەڵە و کەموکوڕی بەرەو چی ئاقاریمان دەبات و زیانێکی چۆنمان لێدەدات. ئەگەر هاوسەنگی لە نێوان زیان و قازانجەکانمان بکەین بۆمان دەردەکەوێت دەستکەوت و قازانجەکانمان لە زیانەکانمان زۆرترن. ئەگەر خۆڕاگری و بەرخودانیشمان نەکردایە ئەوە بارسەنگی شەڕەکان بەلای دوژمندا دەشکایەوە و زیانمان زۆر زیاتر دەبوو، هەروەها دوژمن دەیتوانی کۆنترۆڵمان بکات، لەم بارەیەوە رێبەر ئاپۆ رەخنەیەکی زۆر جدی هێنایە زمان. دوژمن ویستی ئەم رەخنانەی رێبەر ئاپۆ هەلاودیو بکات و بە ئاراستەیەکی تر بیبات و بە شێوەیەکی تر بەکاریان بهێنێت و بۆ مەرامێکی تر بیقۆزێتەوە و رایگشتی پێ فریو بدات. ئەوان دەیانویست لەسایەی رەخنەکانی رێبەر ئاپۆوە بە جیهان بڵێن گوایە ئێمە زیانێکی زۆرمان کردووە، نەخێر ئەمە راست نییە. لەم شەڕەدا ئەوەی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا خودی تورکیا بوو، هەروەها ئاشکراش بوو خودی تورکیا ئەم هەموو شەڕوپێکدادانەیان بردووە بەڕێوە. تورکیا لە ئاستی سیاسی و لە ئاستی سەربازیش سەرکەوتنیان بەدەست نەخست، بگرە زیانیشیان کرد. ئێمە وەکو ئەوەی خۆیان بۆ دڵخۆشکردبوو نە زیانێکی گەورەی چاوەڕوان لێکراومان کرد و نە لە ناوچوین و برینی قولیشمان لێنەکەوتەوە و بگرە قازانجی جدییشمان کرد، بێگومان هەموو ئەمانە راستین. تورکیا بۆ ئەوەی زیانەکانی خۆیان پینە بکەن و هەروەها بۆ ئەوەی رایگشتی جیهان فریو بدەن دەستیان کردووە بە سیاسەتی درۆ هەڵبەستن و چەواشەکاری. پروپاگەندەی ئەوە دەکەن گوایە پشتی پەکەکەیان شکاندووە و بە هەزارەها گەریلایان کوشتووە و جارێکی تر پەکەکە ناتوانێت پشتی خۆی قیتبکاتەوە، هەروەها گوایە پەکەکە هێزی شەڕکەریان نەما. دەیانەوێت بەم درۆودەلەسانە زیانەکانی خۆیان بشارنەوە، دەیانەوێت لەڕێی ئەم درۆیانەوە خەڵکی چەواشە بکەن. هەردوای ماوەیەکی کەم بەسەر ئەم پروپاگەندەیان دەزگاکانی خۆیان دەڵێن پەکەکە پشتی نەشکاوە، بەپێچەوانەوە بەڵکو هێزی زیاتریان بۆخۆیان پەیداکردووە، بەمشێوەیە خۆیان هەر خۆیان فریو دەدەن. بۆ وورە بەرزکردنەوەی خۆیان پەنایان برد بۆ ئەمجۆرە چەواشە کارییە، بەلام ئەمرۆ راستییەکان بۆ هەموو کەسێک ئاشکرابووە، هەروەها ئەوەی وتمان خودی راستییەکانن)[٢٤٥].

---

[٢٤٥] ٥ای ئەیلولی ١٩٩٣ ( سەرخوەبون ) .

## براکوژی شەڕی بەردەوامی ناوخۆیە

لە مێژوودا شەڕی باشوری کوردستان گەورەترین شەڕی ناوخۆی مۆدرێنی گەلی کوردە. خوێن ڕشتنی برا بە دەستی برا لە ئاکامی ڕێککەوتنێک کۆتایی پێهێنرا، بەڵام دوای چەند مانگێک هەوڵی ئاژاوە و گێرەشێوێنی و قوڵکردنەوەی ناکۆکییەکان بەردەوامی پێدرا. ڕەوشی نالەبارەی هەرێمەکە بەردەوام وەکو بۆمبێکی چێنراو بۆ گیرسانەوەی سەرلەنوێی شەڕی براکوژی ئامادەبوو بۆ تەقینەوە. دوای ئەوەی شەڕی نێوان (پەکەکە) لەگەڵ (پەدەکە و یەنەکە) لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٢) لەئاکامی ڕێککەوتنێک کۆتایی پێهات، بەڵام هێرشی نهێنی و بەرنامەڕێژراوی (میت) و (پەدەکە) بۆسەر (پەکەکە) و لایەنگرانی لە هەرێمەکە کۆتاییان پێنەهات.

لەدوای ڕاگرتنی هێرشەکانی پێشمەرگە بۆ سەر سەنگەرەکانی گەریلای (پەکەکە) بەڵام دەستگیرکردن و تۆقاندنی لایەنگرانی (پەکەکە) و ئازادیخوازان لە هەرێمەکە بەردەوام بوو، یەکێک لە نیشتیمان پەروەرەکانی خەڵکی باکوری کوردستان بەناوی (محەمەد تان) کە لە ژێر زوڵمی دەوڵەتی تورک هەڵاتبوو لە زاخۆ گیرسابووە و لەوێ وەکو کەسێکی سادە ژیانی خۆی بەسەر دەبرد، ناوبراو لەلایەن پاراستنی (پەدەکە)وە لە (زاخۆ) ڕفێنرا و دوای ئەشکەنجەدانی کوشتبوویان و لە ٦ی نیسان تەرمەکەیان لە کەناری ئاوی (خابور) فڕێدابوو. (محەمەد تان) بە کەسێکی وەڵاتپارێزی لایەنگری (پەکەکە) ناسرابوو، هەروەها وەڵاتپارێزێکی تری باکور بەناوی (ئیسماعیل) کە خەڵکی گوندی (نێرافی) سەر بە (شرناخ) بوو ئەویش لەکاتی نوستنیدا بە گوولە کوشتبویان و ئەویش کەسێکی وەڵاتپارێز و بە لایەنگری (پەکەکە) ناوزەند دەکرا. ئەمجۆرە کوشتارانە لە ماوەی قۆناغی ئاگر بەستی یەک لایەنەی (پەکەکە)وە لە باکور زیاتر پەرەی سەندبوو. لە دەرەوەی باکوری کوردستان ئەم جۆرە کوشتارانە ببوو بە سێیەمین بازنەی کوشتارییەکانی وەڵاتپارێزانی باکوری کوردستان. لە دوای ڕۆژانی مانگی نیساندا لە دەوروبەری زاخۆ ٤ تەرم دۆزرانەوە، دووان لەو کوژراوانە دوو گەریلای (پەکەکە) بوون بەناوی (سەبری و لەزگین). ئەم دوو گەریلایە ئەندامی کۆمیتەی دانوساندن

و چاودێریکردنی ڕێککەوتنەکەی نێوان پەکەکە و بەرەی کوردستانی بوون، دوایی زانرا ئەم دوو گەریلایە پێشوتر لەلایەن ئاسایشی (پەدەکە) دەستگیر دەکرێن و پاشان دەیانکوژن. تەرمی یەکێکی تری لەو ٤ کوژراوە گەریلایەکی تر بوو کە پێشوتر لەکاتی شەڕوپێکدادانەکاندا بە دیلی کەوتبووە دەستی پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە و گوولە باران کرابوو. چوارەمینیشیان کەسێکی نەناسراوبوو. لەبارەی ئەم کوشتارەوە لەبەرئەوەی لە ناوچەکە تەنها (پەدەکە) باڵا دەست بوو خەڵکی و لایەنەکان جگە لە (پەدەکە) گومانیان لە کەس و لە هیچ لایەنکی تر نەبوو.

لە مانگی نیسان لە ئاکامی ئۆپەراسیۆنەکان لە سلاحەدین و دهۆک ئاسایشی (پەدەکە) بریندارێکی (پەکەکە)یان گرتبوو. فەرماندەیەکی (پەکەکە) لەم بارەیەوە دەیوت (ئەمجۆرە کارانە لەلایەن چەند بەرپرسێکی باڵای پەدەکە و میت وە پیلانیان بۆدارێژراوە و دەیانەوێت گرژی و ئاڵۆزی بنێننەوە تاکو کۆتایی بە ڕێککەوتنی نێوان پەکەکە و بەرەی کوردستانی بهێنرێت و نەیەڵن خواستی یەکێتی نەتەوەیی بەدیبێت). بەرپرسیارانی (یەنەکە و پەدەکە) دەیانوت گۆڕانکارییەکانی بادینان و ڕووداوەکان لە دەرەوەی خواستی ئەمان گەشەدەکەن و هێزی دەرەکی ئەمجۆرە کارانە ئەنجام دەدەن. لەم قۆناغەدا لە سەروبەندی ئاگر بەستی یەکلایەنەی (پەکەکە)دا ڕێکخراوە کوردییەکانی باکوری کوردستان سەرقاڵی ئەوەبوون بەرەیەکی توکمە لەنێوان خۆیان پێکبهێنن و هەروەها دەوترا هێزەکانی باشوریش بەتەمان کەلەناو ئەو بەرەیەدا جێبگرن. هەموو لایەنەکان بەگشتی لەم ڕەوشەی باشور ناڕەحەت و نیگەران ببوون، بەڵام هیچ کەس و لایەنێک چۆنییەتی ڕێگری لەم جۆرە کارانەیان نەدەزانی. لەڕاستیدا ئەوەی دەبوایە ڕێگاچارەیی مەسەلەکانیان بدۆزیایەتەوە بە دەرەجەی یەکەم (پەدەکە و یەنەکە) بوون، بەڵام ئەوان ئەمکارەیان نەدەکرد و ناڕەزاییەکانی ڕوو لەوان تادەهات زیادیان دەکرد.

(فازل موطنی) کە بەرپرسی یەکەمی شاری دهۆک بوو بەبێ ئەو چۆلەکەیش نەیدەتوانی بفرێت لەهەمبەر ئەم ڕووداوانە بێدەنگی بۆخۆی هەڵبژاردبوو. لەلایەکی تریشەوە دەسەڵاتی حکومەت لە باشور ئەو توانا سازییەی لەئاستی سیخوڕەکانی عێراق و ئێران هەیانبوو بۆ ڕێگریکردن، کەچی بەرامبەر بەم جۆرە کارانە هیچیان نەدەکرد و مەخابن هەوڵی جدییان نەدەدا تاکو بکوژانی کوشتنی نادیار بدۆزنەوە.

## کابینەی نوێی حکومەت و سووربونیان لەسەر رێککەوتننامەی ٣٠ی تشرینی یەکەم

دوای ٤ مانگ لە هاتنەئاراوەی شەڕی باشور پەیوەندییەکانی نێوان (پەکەکە) و هێزە باشورییەکان بەباشی بەسەرچوو. لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩٩٢) ئەو پەلامارانەی (پەدەکە) کەلە چواردەوری (زاخۆ) بۆسەر (پەکەکە)و لایەنگرانیانی دەستیان پێکرابوو، لەناو کابینەی حکومەتی هەرێمدا ئەندامانی (یەنەکە) بەدواچوونیان بۆ رووداوەکان دەست پێکرد. دوای ئەوەی نارەزاییەکانی ناو (یەنەکە) لەهەمبەر کارەکانی (پەدەکە) پەرەیان سەند، سکرتێری گشتی (یەنەکە) جەلال تاڵەبانی بەبریارێکی تایبەت کە پەیوەندی بەو مەسەلەیەوە هەبوو (فوئاد مەعسوم)ی لە سەرۆک وەزیرانی لادا و لە شوێن ئەو (کۆسرەت رەسول)ی دانا. لەکاتی شەڕوپێکدادانەکاندا (کۆسرەت رەسول) فەرماندەی شەڕەکانی بەرەی (خواکورک) بوو، دەوترا (کۆسرەت رەسول) خوازیاری ئەوە نییە دژایەتی (پەکەکە) بکات. لەبەر ئەوەی (کۆسرەت رەسول) فەرماندەیەکی بەتوانای ناو هێزی پێشمەرگەی (یەنەکە) بوو لەناو (پەدەکە) کەسێکی خۆشەویست نەبوو، سەرەرای هەموو باشییەکیشی کەچی (کۆسرەت رەسول) گوێرایەڵێکی زۆر باشی (جەلال تاڵەبانی)بوو، هەروەها بەبێ یەک و دوو هەموو داخوازییەکانی جەلال تاڵەبانی بەجێدەهێنا، هەربۆیە (جەلال تاڵەبانی) کردی بە سەرۆک وەزیران.

گۆرینی کابینەی حکومەت و قورسایی زیاتری (پەکەکە) لە ناوچەکەدا و قەبوڵنەکردنی پەلامارییەکانی (پەدەکە) لە (زاخۆ) و دەوروبەری روو لە (پەکەکە) پەیوەندییەکانی نێوان

هێزە باشورییەکانی پێگەیاند، بۆ رەچاوکردنەوەی پەیوەندییەکان و بۆ تەییدکردنەوەی ڕێکەوتنی ساڵی (١٩٩٢) پرۆتوکۆلێکی نوێ واژۆ کرا.

لە ئاکامی دانوساندن و دانیشتنەکانی نوێنەری (پەکەکە) عوسمان ئۆجالان و بەرەی کوردستانی، لە ٢٧ی نیسانی ساڵی (١٩٩٣) سەرۆک وەزیران (کۆسرەت رەسول) رێککەوتنی نێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێمی واژۆکرد، سەرلەنوێ رێککەوتنەکەی کۆنیان خستەبواری ژیانەوە و ئەم رێککەوتنە خۆی لە ٤ مادەی سەرەکی دەبینییەوە کە ئەمانە بوون :

**١/ (پەکەکە پابەندی ئەو رێککەوتنەیە کەلە ١٩٩٢/١٠/٣٠ واژۆکراوە).**

**٢/ (رێگانادرێت لە سەر سنورەکان چالاکی ئەنجام بدرێت).**

**٣/ (کێشەکانی پەکەکە چارەسەر دەکرێن و پێداویستییەکانیان دابیندەکرێت).**

**٤/ (بۆ هاتووچۆکردنی گەریلاکانی پەکەکە بۆ زەلێ و ناوچەکانی تر دەبێت حکومەت ئاگەدار بکرێنەوە و مۆڵەتی تایبەتییان بۆبکرێت).**

لەسەر ئەم رێککەوتنە نوێکراوەدا (کۆسرەت رەسول) وەک سەرۆک وەزیران و (ناسح غەفور) وەک جێگری سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێم و (عوسمان ئۆجالان) وەک پەکەکە واژۆیان کردبوو.

## دهۆک شاری کوشتاری نادیار

(پەکەکە) بە نیشاندانی نییەت باشی و واژۆکردنی ڕێککەوتن لەگەڵ دەسەلاتی باشور و ڕاگەیاندنی ئاگر بەستی یەکلایەنە لە باکوری کوردستان و ئەو هەنگاوە بەرچاوانەی دەنران بۆ پێکهێنانی یەکێتی نەتەوەیی کوردستان لەهەمبەر هەموو ئەمانەدا دەستێکی ڕەش و نەزانراو دەیویست گێرەشێوێنی دروست بکات و یەکڕیزی ماڵی کورد تێک بدات، هەربۆیە دەستکرا بە ئەنجامدانی کوشتاری سیاسی نادیار.
ئەم کوشتارانە زیاتر لەو ناوچانە دەهاتنە ئاراوە کەلەژێر دەسەلاتی (پەدەکە)دا بوون، زیاتر لە شوێنەکانی وەک (زاخۆ و دهۆک) دەهاتنە ئاراوە کە ڕاستەوخۆ لەژێر دەسەلاتی (فازل موطنی)دا بوون کە ئەویش بەبێ (مەسعود بارزانی) نەیدەتوانی یەک هەنگاو بنێت. هەرئەم شوێنانە ببوونە لانکەی ئەندامانی (میت)ی تورک و بە ئارەزووی خۆیان لەوشوێنانەدا جریدبازیان دەکرد.
ئەم پەلامار و کوشتارانە تەنها و تەنها لە ئاستی ئەندامان و لایەنگرانی (پەکەکە) ئەنجام نەئەدران، بەشێوەیەکی گشتی هەموو ئازادیخوازێک هەدەفی سەرەکی ئەوان بوون. گەورەترین و بەرچاوترین کوشتاری سیاسی لە ساڵی (١٩٩٣) لە دهۆک ئەنجامدرا، لە ٢٦ی ئایار سەرۆکی ڕێکخستنی (تێکۆشانی ڕەنجدەرانی کوردستان) (ڕەئوف کامل ئاکرەیی) کوژرا، ڕەئوف و ڕێکخراوەکەی بە نزیکایەتی لە (پەکەکە) دەناسران.
(ڕەئوف کامل ئاکرەیی) بەهەمان شێوە لەلایەن بکوژی (سادق عومەر)ەوە کوژرابوو کە ناوی (ڕەجۆ گەرماڤی)بوو. یەکێکی تر بەناوی (فاتیح) کە سەرۆکی لیژنەی پیاو کوشتنی

پاراستنی (پەدەکە)بوو. ئەوەی ئەم لیژنەیەی دەبرد بەڕێوە خودی (نێچیرڤان بارزانی)بوو، (رەئوف کامل ئاکرەیی) لەهەمانکاتیشدا نوسەر بوو، رەئوف لە هەولێر خۆپیشاندانێک بەڕێوە دەبات کە دژی کۆمەڵکوژی شرناخ ئەنجامیاندابوو، دوای ئەم خۆپیشاندانە (رەئوف) لەبەردەم ماڵی خۆی گوولە بارانکرا، شایەنی باسە هەمان (رەجۆ گەرماڤی) بکوژی (رەئوف کامل ئاکرەیی) کە پیاوێکی پاراستن بوو بەشداری لە چلەی ماتەمینی رەئوف کردبوو کە یەکێتی نوسەران سازیاندابوو. گومان لە خوێندەواری (رەجو) دەکرا کەچی ئێستا بەشداری کۆڕێکی یەکێتی نوسەران بووە، ئامادەبوانی چلەی ماتەمینەکە گومانیان هەبوو کە (رەجۆ) رەئوفی کوشتبێت بەڵام ئەوەی سەریان لێدەرنەدەکرد ئەوەبوو کەلە چلەی ماتەمینەکەیدا بەشداربیبوو.

نوێنەری ئاشورییەکان لە پەرلەمان (یونادم یوسف یونادم) دوای ٦ رۆژ بەسەر کوشتنی (رەئوف)دا ئەوکاتەی لە باڵەخانەی رێکخراوەکەی خۆیان دەردەچێت و بەرەو ماڵەوە دەڕوات دوو کەس دوای دەکەون و لەئاکامدا دەیکوژن، مەخابن یونادم ئەندامی پەرلەمانیش بوو، ئەم کوشتنە لەناو ئاشورییەکاندا ناڕەزاییەکی زۆری لێکەوتەوە.

دوای تێپەڕبونی ١٣رۆژ بەسەر کوشتنی (یونادم یوسف یونادم) ئەمجارەیان قوربانییەکی تر کەسێکی کۆمەنسیت بوو. لە ١٤ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٩٣) ئەندامی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست و بەرپرسی بادینان (ئەبونەسیر) کاتێک لە ئوتێلی (بابل) دەردەچێت و دەڕواتەوە بۆ ماڵی خۆی لەلایەن چەند کەسێکی نەناسراوە و لەناوەڕاستی شەقام لێدەدرێت و دەیکوژن، وەکو دەوترێت بکوژی ئەبونەسیر (وەحید کوڤلی) بوو کە سەربە عەشیرەتی (دۆسکی)بوو، ئەم وەحیدە هەتا راپەڕینەوەی ساڵی (١٩٩١) جاشی سەدام بوو، دوای راپەڕینەکە دەچێتە ناو (یەکێتی)یەوە، بەڵام بەهۆی کارە قێزەوەن و نەشیاوەکانییەوە (یەکێتی) دەریدەکات و ئەویش ئەچێتە ناو (پەدەکە)وە، لەناو خەڵکیدا ئەم وەحیدە بە کەسێکی سەرسەری و دز دەناسرا و پاشانیش ببوو بە پیاوکوژی دەزگای (پاراستنی) پەدەکە.

دوای ئەوەی ئاشکرابوو (وەحید) ئەبونەسیری کوشتووە بەناچاری هەڵدێت بۆ موسڵ و پەنا دەبات بۆ سەرۆک جاشێک بەناوی (حاجی هەمزانی)، لەبەر ئەوەی وەحید هەڵاتبوو پاراستن توانی زۆربەی کوشتارە نەدیارەکان کە ئەنجامیاندابوو بخاتە ئەستۆی وەحید و خۆیان لەو تۆمەتانە بەدوور بگرن، بەرپرسیارانی (پەدەکە) بە ئاشکرا دەیانووت (وەحید) بەرپرسی

یەکەمە لە کوشتنی یونادم یوسف و کوژراوانی تر، بەمشێوەیە پاراستن توانی مەلەفی کوشتنی چەندین کەس لەسایەی وەحیدەوە لەخۆی دوور بخاتەوە.

بێگومان کوشتارەکان هەرئەوەندە نەبوون، کوشتارێکی زۆری تریش ئەنجام دەدران کە دەنگدانەوەیان نەبوو. لەو ماوەیەدا لەو ناوچانەی کە (پەدەکە) بالا دەست بوو وەک (زاخۆ و دهۆک) نزیکەی (١٥) کوشتاری تر هاتبووە ئاراوە. لە ١٧ی تەموز لە (زاخو) کەسێک کوژرا بەناوی (حاکیمۆ)، ئەم حاکیمۆیە ناوە سیانییەکەی (تەحسین نایف عەلی)بوو، ئەم حاکیمۆیە دوو کەسی زیندانی کردبوو کەلە تورکیاوە مادەی هۆشبەریان هێنابوو، سەرەڕای ئەوەی بەرپرسیارانی (پەدەکە) زۆر لە حاکیمۆ دەکەن ئەو دوو کەسە بەربدات بەلام حاکیمۆ بەریانی نەدابوو، هەربۆیە بە خوێنی خۆی بەدەلی ئەم کارەیدا. بەگوێرەی قسەی خەڵکی بێت بەرپرسی یەکەمی کوشتنی (حاکیمۆ) فازل موطنی بوو کە بەرپرسی یەکەمی بادینان بوو. وەکو سەرچاوەکان باسیان دەکرد لە دەوروبەری دهۆک پیاوەکانی (فازل موطنی) دوو مەزرەعەیان بۆ دروستکردنی حەشیش دروست کردبوو کە دەیانفرۆشت بە مسرییەکان و کورە دەوڵەمەند و بازرگانە عەرەبەکان.

کوشتارێکی تر لە ٢٩ی تەموزی ساڵی (١٩٩٣) هاتە ئاراوە، ئەندامی ناوەندی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان (قەیس محەمەد ئەحمەد) ناسراو بە (رێناس) لەماڵەکەی خۆیدا کوشتیان، سکرتێری حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان (قادر عەزیز) لەمبارەیەوە روونکردنەوەی کرد و وتی (تاوانبارانمان دۆزیوەتەوە و زانیارییەکانمان داوە بە حکومەت)، هەروەها لەم بارەیەوە دەیوت (پێویستە حکومەت بە زووترین کات بکەوێتە خۆی و بکوژان دەستگیر بکات)، دوای کوشتنی (رێناس) بۆ سوکایەتی پێکردنی لە ماڵەکەیدا ئالای (پەدەکە)یان هەڵواسی بوو.

دوای کوشتنی (رێناس) تەلەفزیۆنی زەحمەتکێشان (پەدەکە)یان تۆمەتبار دەکرد، دوای ئەم تۆمەتبارکردنە دەوترێت (نێچیرڤان بارزانی) هەڕەشەی لە بەرپرسیارانی زەحمەتکێشان کردووە دەستبەرداری ئەم جۆرە تۆمەتبارکردنە ببن. بەڵی (پەدەکە) لە رێی دەزگای (پاراستن)ەوە زۆر بێ دەربەستانە و بەبێ هیچ ترسێک ئەوەی دەیانویست دەیانکرد و ئەوەی بیانویستایە دەیانکوشت.

دواهەمین کوژراو کەسێک بوو کە دژبەری (پەدەکە)بوو، ئەویش (نەزیر عومەر عەلی مستەفا)بوو کە بە (ئارام) ناسراوە، نەزیر کەسێکی رۆشنبیر و دژ بە دەرەبەگایەتی و گەندەڵی بوو، نەزیر بە شێوەیەکی نهێنی لە سلێمانی و هەولێر و دەوروبەریان کاری رێکخستنی بۆ حزبی کۆمۆنیستی کرێکارانی عێراق کردووە و دوای ئەوەی چەندینجار ئاسایشی (پەدەکە) دەیخەنە ژێر لێپرسینەوە، لە ئاکامدا دەیرفێنن و لە (١٩٩٣/٧/٢٨) تەرمەکەی لە نزیک (سێمێل) بە سوتاوی دەدۆزرێتەوە.

دوای ئەم کوشتارە کۆمیتەی دەرەوەی حزبی کۆمۆنیستی کرێکاری عێراق راگەیاندنێکیان بڵاوکردەوە کە تێیدا (پەدەکە) یان تۆمەتبار دەکرد و خەباتی (ئارام)یشیان بە بەرزی دەنرخاند.

## له هەرێمی بادینان هێزی تر بوونی نییە

هۆکاری سەرەکی ئەم کوشتاری سیاسییانە ئەوەبوو (پەدەکە) لە هەرێمی بادینان جگە لە خۆی نەیدەهێشت و قەبوڵی نەدەکرد هێزێکی سیاسی تر گەشە بکات و بوونی هەبێت. بەگشتی راوبۆچونەکان لەسەر ئەوەبوو کە خودی سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی ئاگەداری هەموو ئەم کارانەیە و ئەم کارانەش بە (فازل موطنی) ئەنجام دەدات. هەمیشە (پەدەکە) بادینانی بە باخچەی خۆی زانیوە و نەیهێشتووە هێزی تر لەوێدا بوونیان هەبێت. (پەدەکە) لە بادینان وەکو (حزبی بەعس)ی لێهاتووە، بنەماڵەی بارزانی دەیانەوێت بەوشێوە رفتارەی ئێستا دەیکەن درێژە بە دەسەڵاتی خۆیان بدەن، مەسەلەیەکی سەرنج راکێشەری تر ئەو کوشتارانە بوون کە دەنگیان نەدەدایەوە. هەندێک لەو کوژراوانە مەلەفەکانیان سەیر بوو، زۆربەی ئەوانەی کوژرابوون پێشمەرگە و کادێری کۆنی (پەدەکە)بوون کە پەیوەندیان لەگەڵ (پەکەکە) باش بوو، بەمشێوەیە لەبارەی کوشتاری نادیار شارەکانی (زاخۆ و دهۆک) وەکو شارەکانی (باتمان و نوسەیبین)ی باکوری کوردستانیان لێهاتبوو. باشور وەکو باکوری لێهاتبوو، هەرکە ئێوارە دادەهات خەڵکی وەکو مریشک لەترسی گیانی خۆیان دەگەڕانەوە کولانەکانی خۆیان، بێشک بەگوێرەی پێویست هیچ بکوژی کوژراوێک نەدەگیردرا. کاتێک بەرپرسیارانی (یەنەکە) ئەم کوشتارانەیان لەگەڵ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خویان بەراورد دەکرد بەم رەوشە زۆر ناڕەحەت بوون، بەڵام سەرۆکایەتی (یەنەکە) وەکو سەرکردایەتییان بیری نەدەکردەوە. هەرچۆنێک بێت (جەلال تاڵەبانی) ئەم کوشتارانەی بەخەیاڵدا نەدەهات و بەلایەوە زۆر گرنگ نەبوون. ئەوکاتەی (رەئوف) کوژرا، سەرۆک وەزیران (کۆسرەت رەسول) بۆ چارەسەری کێشەی گومرکی ئیبراهیم خەلیل هاتبوو بۆ دهۆک کە (پەدەکە)

دەستی بەسەر داهاتەکەیدا گرتبوو. لە کوشتنی کەسایەتی (رەئوف)دا لەڕاستیدا پەیامێک بە (کۆسرەت رەسول)درابوو ئەگەر زیاد پێداگری بکات هەمان چارەنوسی پێدەبڕدرێت. دەگێڕنەوە ئەو کاتە (کۆسرەت رەسول) بە چواردەوری خۆی دەڵێت (**ئەگەر سەرۆک وەزیران نەبومایە فازل موطنیم بەدەستی خۆم دەکوشت**)، بەڵام ئەم قسەیە تورێکی قوڕاوی نەدەهێنا.

لەبارەی کوشتنی کەسانی سیاسی و رۆشنبیر و وەڵاتپارێز باشوری کوردستان زۆر لەدواوەی تورکیا نەبوو. لەباشوری کوردستان (پەدەکە) توانی شەرعییەت بەم جۆرە کوشتاری سیاسییانە بدات. پارتەکانی تریش لەوانەوە فێری هەمان کردار بوون، لە (هەولێر) مەلایەکیان کوشت بەناوی (مەلا عەبدولرەحمان حەمزە کۆری)، دەوترێت ئەم مەلایە بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان کوشتوویانە، (مەلا عوسمان) سەرۆکی بزووتنەوەی ئیسلامی لە هەرێمی سۆران لەبارەی جڵەوی سیاسییەوە دەیویست شان بدات لە شانی (یەنەکە)، بەڵام (مەلا عەبدولرەحمان) کە دژبەری بزوتنەوەی ئیسلامی بوو لەهەمبەر بزووتنەوە وەک رێگر هەژماردەکرا. وەک دەوترێت کوشتارەکانی باشوری کوردستان ئەوەندە زیاد و ئاڵۆز بوون تەنانەت کۆنترا گەریلای تورکیاش بە سەرۆکایەتی (ئەحمەد جەم ئەرسەڤەر)یش دەستی تێوەردابوو[٢٤٦].

(حازم یوسفی) کە ئەندامی پەرلەمانی باشور بوو لەسەر لیستی (یەنەکە)، سەبارەت بە کوشتارە سیاسییەکان دەیوت (**ئاشکرایە هەندێک لایەن هەن لە ئازادی و دیموکراسی دەترسن، ئەو رۆشنبیرانەی نوێنەرایەتی بیری ئازادیخواز دەکەن مەخابن دەکوژرێن، ئەمجۆرە کوشتارانە شەرمەزار دەکەم، ئەگەر بەڕاستی دەمانەوێت دیموکراسی بەرجەستە بکەین پێویستە بکوژان دەستگیر بکرێن و رادەستی دادگا بکرێن**).

مەخابن ئەم قسانەش سکی برسی تێرنەدەکرد و ئاوی بە ئاگری ناخ و دڵی کەسوکاری کوژراوەکاندا نەدەکرد.

---

[٢٤٦] ١٠ی ئەیلول ١٩٩٣ گۆڤاری ( ئایدنلک ) .

## بارزانی (کەمپی پەکەکە نییە)

دوای ئەوەی ماوەی ئاگربەستی یەکلایەنەی (پەکەکە) لە باکور کۆتایی پێهات، دەوڵەتی تورک لە هەرێمەکەدا شاڵاوێکی تری نوێی پەلاماریان دەست پێکرد. ئەم شاڵاوانە زیاتر بە ئامانجی شەڕی دەروونی بوون، بەبێ بەرنامەی پێش وەخت لەلایەن فەرماندەیەکی (پەکەکە)وە (٣٣) جەندرمەی سوپای تورک کوژران، ئەمەش بووە مایەی گڕگرتنی سوپای تورک. سەرەتا دەوڵەت هەدەفە ئاشکراکانیان کرد بە ئامانج، بۆ ئەم مەبەستەش ئاسانترین هەدەف شوێنەکانی گەریلا بوون لە باشوری کوردستان. سوپای تورک لە ٧ی حوزەیرانی (١٩٩٣) ئۆپەراسیۆنێکی نوێیان دەست پێکرد بە ناوی (ئۆپەراسیۆنی ئەو دیو سنور)، سوپای تورک لە شوێنەکانی وەک (شێنویسف، ئشکڤێران، شەمزینان، چوکورجە و چایەرلی) چوونە باشوری کوردستانەوە. هەروەکو هەموو جارێکیان سەرەتا فڕۆکە و کوپتەری جەنگییان بۆردۆمانی ناوچەکانیان کرد، دوایش هێزی پیادەیان چووە باشوری کوردستانەوە، بەڵام ئەمجارەیان گەریلاکانی (پەکەکە) وەکو پێشو بەرەنگارییەکی باشی سوپای تورکیان نەکرد. رێککەوتنی نێوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) بەردەوام بوو، بەگوێرەی رێککەوتنەکە گەریلا بە فەرمی بنکە و بارەگایان لە زۆر شوێندا چۆڵکردبوو. ئەگەر لەو شوێنانە شەڕی سوپای تورکیان بکردایە مانای وایە پێشێلکاری رێککەوتنەکەیان کردووە. لە هەواڵێکی رۆژنامەی (تەرجومانی تورکی) لە ١١ی حوزەیرانی (١٩٩٣) دەوترا دەوڵەتی تورک بوونی گەریلاکانی (پەکەکە)یان لە هەرێمەکە بۆ (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) سەلماندووە بەڵام هەردوکیان وتویانە (لەگەڵ پەکەکە هیچمان پێناکرێت)، ئەمەش مانای وابوو هەردوو سەرکردەی کورد (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) بە دەوڵەتی تورکیان وتووە (**کاری**

**خۆتان، خۆتان بیکەن و ئەگەر بە نیازی ئۆپەراسیۆنیشن ئەنجامی بدەن )**. ئەم ئۆپەراسیۆنەی ئەمجارەی سوپای تورک کەسانی وەک (نەجاتی ئۆزگین) کە بەرپرسی ئاسایشی فەرمانداریێتی سەربازی بوو، (مەتە سەیار) ئەفسەری ئیستیخباراتی سەربازی بوو لە شڕناخ، ژەنراڵ (کۆرکماز تاغمە) کە فەرماندەی گشتی هێزی زرێپۆش و دەبابە و تۆپخانەکانی (تاتوان) بوو سەرپرشتی ئۆپەراسیۆنەکانیان دەکرد. بە هەزارەها جاش و جەندرمە بەشدارییان لەم ئۆپەراسیۆنە کرد، لەهەمانکاتیشدا رۆژنامە تورکییەکان لەبارەی گەریلاوە ئەوەی بەدەمیان بهاتایە لە قسەی نەشیاو دەیانکرد بە مانشێتی خۆیان، بەلاّم دوای چەند رۆژێک ئۆپەراسیۆنەکەی سوپای تورک نقەی نەما، هەموو هێزەکانیان کشانەوە بۆ بارەگا سەرەکییەکانی خۆیان.

بەمشێوەیە خۆیان وتەنی لە (باکوری عێراق) روبەڕوی گەریلاکانی (پەکەکە) نەبوونەوە. ئەو رۆژانەی ئۆپەراسیۆنەکە بەردەوام بوو، سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی دوای ماوەیەکی زۆر جارێکی تر لە ١٥ی حوزەیرانی (١٩٩٣) گەیشتە ئەنقەرە، (مەسعود بارزانی) لە ئەوروپاوە هاتبوو، مەسعود بارزانی لە ئوتێلی (شیراتۆن) لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا (حیکمەت چەتین) چەندین چاوپێکەوتنی ئەنجامدابوو، لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ رۆژنامەوانەکان، قسەیەکی سوپاسالاری تورکیایان هێنابووە یاد (مەسعود بارزانی) کە وتبووی **(ئەگەر بارزانی و تاڵەبانی تەدبیر وەرنەگرن ئێمە تەدبیری خۆمان وەردەگرین)**، لەبارەی پرسیاری ئەوەی (ئایا ئێوە تەدبیرێکی چۆن وەردەگرن) دوای دەموچاو گرژکردن، مەسعود بارزانی وتی **(تەدبیری چی وەربگرین لەناو خاکی ئێمەدا کەمپی پەکەکە نییە)**.

سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لەبارەی مەسەلەی ئابوریی باشورەوە قسەی لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیا (حیکمەت چەتین) کردبوو، بارزانی بە حیکمەتی وتبوو بۆهاوکاری باشوری کوردستان تکا لە دەوڵەت بکات تاکو دەستی هاوکاریان بۆ درێژ بکەن، (حیکمەت چەتین)یش بەڵێنی بە (مەسعود بارزانی) دابوو ئەوەی لەدەستی بێت دەیکات. دەوڵەتی تورک لەبارەی هێرشی دژ بە (پەکەکە) هیچ کاتێک بە نیاز نەبوو مۆڵەت لە وەزیری دەرەوەی حکومەتی خۆیان وەربگرێت. مەسەلەی (پەکەکە) حیکمەت چەتینیشی تێدەپەڕاند، ئەوەی سەرقاڵی ئەم کارە و بەرپرسی یەکەمی ئەم کارە بوو بێشک سوپاسالاری تورک بوو، لەهەمانکاتدا (مەسعود بارزانی) سەردانی گۆڕی (تورگوت ئۆزالی)یش کرد، هەروەها لەم

گەشتەیدا لەگەڵ خانەوادەی تورگوت ئۆزال و سەرۆک وەزیرانی ئەوسا (تانسۆ چیللەر) و سەرۆک کۆماری ئەوسا (سلێمان دیمیرال) دیداری ئەنجامدا.

ئەوەی راستی بێت گەشتەکەی (مەسعود بارزانی) بۆ تورکیا لەکاتێکی نەخوازیار و نەگونجاودا ئەنجامدرابوو. ئەو کەسەی پێویست بوو بچێت بۆ تورکیا (جەلال تاڵەبانی) بوو چونکە ئاگربەست تێکچوبوو، (جەلال تاڵەبانی)یش رۆڵی ناوبژیوانی گێرابوو هەربۆیە (جەلال تاڵەبانی) بەشێوەیەکی زانایانە گەشتەکەی خۆی بۆ تورکیا هەڵوەشاندبووە. لەراستیدا هەموو پەیوەندییەکانی سەرکردەکانی باشور لە گەڵ تورکیادا گرێدراوبوو بە دۆزی (پەکەکە)وە.

لە رۆژی ٢٤ی حوزەیرانی (١٩٩٣) رەوەندی کورد لە وەڵاتی سوید بەرامبەر بە قۆنسوڵخانەی تورکیا کوشتارەکانی کوردستانیان پرۆتێستۆکرد، لەکاتی خۆپێشاندانەکاندا تەقە لە خۆپێشاندەران کرا و کەسێک کوژرا و چەند کەسێکیش بریندار بوون، لەسەر ئەم رووداوە حکومەتی سوید باڵیۆزی تورکیایان سنورداش کردەوە کە ناوی (قایە توپەری)بوو، قایە کە سنورداش کرایەوە بۆ تورکیا لەبارەی رووداوەکەوە روونکردنەوەی سەیروسەمەرەی دەکرد. پێش ئەوەی رەوانەی تورکیا بکرێتەوە قایە ماوەی مانگێک لە سەفارەت دەستبەسەر بووە، خۆی وتەنی ٤ کەس بەردەوام تەلەفونیان بۆیکردووە و دڵیان داوەتەوە، دوان لەو ٤ کەسە یەکێکیان (جەلال تاڵەبانی) و ئەویتریان (مەسعود بارزانی) بووە، قایە لە دیمانەیەکیدا بۆ رۆژنامەی (حورییەتی تورکی) لە ٢٦ی ئابی (١٩٩٣)، لەبارەی بارزانییەوە دەیوت گوایە پێیووتووە **(ئەگەر حەز دەکەیت ئێمە دەتوانین لە هەمبەر پەکەکە بتپارێزین)**، قایە لە سەردەمی سەرۆک کۆماری تورکیا (تورگوت ئۆزال) ووتەبێژی سەرۆک کۆمار بووە، هەرئەو کاتە ئاشنایی لەگەڵ (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی)دا پەیدا دەکات، قایە لەبارەی بارزانی دەیوت **(بارزانی لە دەوڵەتی تورک زیاتر ویستویەتی خاوەندارێتی لێبکات)** .

## دەنگی زەنگی شەڕی دووەمی باشور

ئاگر بەستی یەکلایەنەی (پەکەکە) لە باکوری کوردستان هەڵوەشایەوە و لەگەڵ ئەمەشدا ئاڵۆزی و گرژییەکان پەرەیان سەند و دەوڵەتی تورکیش بە ئیشاراتکردنی (پەکەکە) ئەوەیان نیشان دەدا مەیلیان هەیە جارێکی تر لە باشوری کوردستان ئۆپەراسیۆن ئەنجام بدەن، هەربۆیە دەوڵەتی تورک دەیویست سەرکردە و پارتەکانی باشور لەگەڵ خۆیدا بۆ ئۆپەراسیۆن جوڵەیان پێبکات و دژی (پەکەکە) شەڕ بکەنەوە. بەمشێوەیە جارێکی تر لە باشوری کوردستان کێشەکان گەورەتر دەبوونەوە. لە ٢٦ی حوزەیرانی (١٩٩٣) حکومەتی هەرێم دەستیان گرت بەسەر چەند ماشینێکدا گوایە چەک و تەقەمەنی بۆ گەریلاکانی (پەکەکە) دەگواستەوە بۆ هەفتانین. حکومەتی هەرێم بیانوکەیان ئەوەبوو ئەم ماشێنانە بەبێ مۆڵەت جوڵێنراون، حکومەتی هەرێم دەیانویست بۆ گواستنەوەی چەک و تەقەمەنی (پەکەکە) مۆڵەت و ڕەزامەندی ئەوان وەربگرێت. حکومەتی هەرێم بە بەرپرسیارانی (پەکەکە)یان دەوت (**بە ئێمە بڵێن و ئێمەش چەک و تەقەمەنییەکانتان هەتا نزیک بارەگاکانتان دەگوازینەوە**)، بەرپرسیارانی (پەکەکە)ش دەیانوت (**حکومەتی هەرێم دەیانەوێت کۆنترۆڵی هێزەکانمان بکەن، بەڵام ئێمە ئەمە قەبوڵ ناکەین**)، (پەکەکە) لەبارەی کارە ناوخۆییەکانیانەوە نەیدەویست کەس موداخەلەیان بکات و وەکو حزبیش بە پێویستیان دەزانی دەبێت کارەکانیان زۆر بە نهێنی ئەنجام بدرێن، هەربۆیە لەبارەی کارەکانیانەوە لە سوریا، لوبنان، ئەوروپا، ئێران و عێراق زۆرجار کێشەیان بۆدروست دەبوو. بەگشتی ئەو وەلاتانە و وەلاتە زلهێزەکانیش

دەیانویست (پەکەکە) وەکو حزبەکانی باشور دەستەمۆ بکەن، بەڵام (پەکەکە) هەرگیز ئەمەی قەبوڵ نەدەکرد و خۆی رادەستیان نەدەکرد، هەربۆیە زیندانەکانی ئەو وەڵاتانە بەردەوام بەلای کەمەوە ٢ ئەندامی پەکەکەی تێدابوو.

دوای شەڕ و پێکدادانەکانی باشور و دوای رێککەوتنەکەی نێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێم چەند مانگێک بە ئارامی بەسەرچوو، بەڵام لە مانگی تەموزی (١٩٩٣) گرژی کەوتە نێوانیانەوە. لەدوای نەمانی ماوەی ئاگر بەستی یەکلایەنەی (پەکەکە)، لە تورکیا لە مانگی حوزەیراندا، شەڕی گەریلاکانی (پەکەکە) لە باکوری کوردستان زۆر سەخت بووەوە. لەدوای دژواربونەوەی هێرشەکانی (پەکەکە) لەباکور دەوڵەتی تورک زەختی لە پارتەکانی باشور دەکرد هەڵویست لە دژی (پەکەکە) نیشان بدەن، هەربۆیە لە گەشتەکەی (مەسعود بارزانی) بۆ تورکیا لە مانگی حوزەیراند ناچارما بەڵێن بە دەوڵەتی تورک بدات کەلە ئاستی چالاکییەکانی (پەکەکە) چاوپۆشی نەکەن، تورکیاش بەردەوام بۆ چاوترساندنی سەرکردەکانی باشور هەمیشە باسیان لە ئۆپەراسیۆنی ئەو دیو سنور دەکرد کە هیچ ئەنجامێکیشی بەدەستەوە نەدەدا. لەڕێی ئەم چاوسورکردنەوەیەدا دەوڵەتی تورک دەیانویست بەردەوام وەبیر سەرکردەکانی باشور بهێننەوە کە هێشتا گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەفتانین و خواکورک و زەلێ بونیان هەیە، ئەو زەنگەی لە ئەنقەرە لێدەدرا بۆ گیرسانەوەی شەڕێکی نوێی باشوری کوردستان دەنگەکەی دەگەیشتە هەولێریش!.

## (پەدەکە) پاسەوانی سنوری تورکییایە

بەگوێرەی ئەو رێککەوتنەی لەنیوان (پەکەکە و حکومەتی هەرێم) واژۆکرابوو گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەر خاڵە سنورەییەکان هێرشیان ئەنجام نەدەدا، بەڵام لە (هەفتانین، خواکورک و زەلێ) گەریلا هەروەکو جاری جارانیان کارەکانی خۆیان دەکرد. گەریلا لەو ناوچانە ئاسایشی خۆیان دەپاراست و سەنگەرەکانیان توندتر دەکرد، یەکێک لە کارە نەگبەتییەکانی کوردی باشور ئەوەبوو لەسەر سنورەکان بارەگایان بۆ پێشمەرگە دروست کردبوو، لەهەمانکاتیشدا تورکیا بەردەوام چاودێرییانی دەکرد.

حکومەتی هەرێم لە نزیک سنورەکانی تورکیا ئەو ٦٢ رەبیەی کەلە سەردەمی سەدامدا پێشوتر دروست کرابوون و ئێستا لەژێر دەسەڵاتی ئەماندابوون نوژەنیان کردبووە و ئەرکی پاراستنی سنوری تورکیایان خستبووە ئەستۆی پێشمەرگەی حکومەتی هەرێم. لەهەر رەبایە یان هەرسەنگەرێک بەلای کەمەوە (١٠٠) پێشمەرگەیان لێدانابوو، موچە، چەک، خواردن، جلوبەرگ، تەقەمەنی و پێداویستییەکانی تری ئەم پێشمەرگانە لەلایەن دەوڵەتی تورکەوە دابیندەکرا. هەریەک لەو پێشمەرگانە مانگانە (٢٧٠) دیناریان وەردەگرت کە دەگەیشتە (١٥٠) لیرەی تورکی. بێتەلەکانی پێشمەرگە راستەوخۆ بە فەرماندەکانی تورکەوە گرێدرابوون. لەو سەنگەر و رەبییانەی شوێنەکانیان ستراتیژی بوو ئەفسەری تورکی لێدانرابوو، هەروەها ئەرکی پاراستنی ئەم رەبایانەش زیاتر بە عەشیرەتی (دوسکی) سپێردرابوون کە ژمارەیان دەگەیشتە ٧ هەزار کەسێک. ئەم بارەگایانە دژ بە گەریلاکانی (پەکەکە) دانرابوون و

راستەوخۆ (پەدەکە)ش ئەرکی پاراستنیانی خستبوە ئەستۆی خۆیان. گەورەترین نارەزایی پێشمەرگەکان لەبارەی کەمی موچەکەیانەوە بوو، هەربۆیە داوایان لە تورکیا دەکرد موچەکانیان زیاد بکەن. جیاوازی پێشمەرگەکانی ئەم عەشیرەتە لەگەڵ جاشەکانی عەشیرەتەکانی ناو تورکیا تەنها ئەوەبوو کە ئەمان ناسنامەی تورکییان پێنەبوو.

سەرەرای ئاوەدانکردنەوەی ئەو سەنگەر و رەبایە کۆنانە لەلایەن (پەدەکە)وە بەڵام گەریلاکانی (پەکەکە) دەستبەرداری هاتوچۆی سەر سنورەکان نەبوون. ئەگەرچی لە چاو ئەو شوێنانەی لەناو باشوری کوردستان قورساییان تێدا هەبوو لێرە کە نەیانهێشتبوو، بەڵام لەهەمانکاتدا هەیبەتی خۆیان لەدەست نەدابوو. ئەم مەسەلانە هەندێکجار لەلایەن چاپەمەنی تورکەوە باسدەکرا و زۆرجاریش ئەم مەسەلەیە لەلایەن رایەداری سوپای تورکەوە بە گوێی سەرکردە باشورییەکان دەدرا. دەوڵەتی تورک سوور بوو لەسەر ئەوەی هاتوچۆی گەریلاکانی (پەکەکە) لەسەر سنورەکان نەهێڵێت هەربۆیە زۆریان لە حزبەکانی باشور دەکرد و (پەدەکە)ش بۆ رازی کردنی دەوڵەتی تورک زۆرجار لە سەنگەر و رەبایەکانی خۆیانەوە تەقەیان لەو گەریلایانە دەکرد کە دەیانویست سنور ببڕن. زۆرجار لەو شوێنانەی کە گەریلا بەکاریان دەهێنا یان بەشێوەی گرووپ لێکۆدەبونەوە پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بە هاوان لەو شوێنانەیان دەدا، زۆرجاریش پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بۆئەوەی ئەشیای عەمبارەکانی گەریلا بدۆزنەوە و بۆخۆیان بیبەن جەولەیان دەکرد. ئەوەی دەدۆزرایەوە پێشمەرگەکان لەناو خۆیاندا دابەشیان دەکرد. لە (هەفتانین) لەمانگی نیسانی (١٩٩٣) عەمبارێک دۆزرایەوە و لەسەر دابەشکردنیشی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەنێوان خۆیان ببوو بە شەڕیان و لەئاکامدا پێشمەرگەیەک کوژرابوو.

تەقەی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بۆ رێگریکردنی هاتوچووەکانی گەریلاکانی (پەکەکە) لەناوچەکە بەردەوام بوو. لە ٢ی تەموز گەریلاکانی (پەکەکە) لە (قەسرۆ)ی سەربە (هەفتانین) چواردەوری بارەگایەکی پێشمەرگەی (پەدەکە)یان گرتبوو کەناوی (دەرێشیشێ) بوو، لەئاکامدا پێشمەرگەیەکیان بە دیلی گرتبوو، هەروەها دەستیان بەسەر چەکێکی زۆریشدا گرتبوو، بەمشێوەیە گەریلاکانی (پەکەکە) بڕیاردەدەن هەر بارەگایەک تەقەیان لێبکات هێرشی بۆدەبەن.

کێشه لەم هەرێمەدا کۆتایی نەدەهات، لەهەمانکاتیشدا (یەنەکە) نەیدەویست ببێت بە پارچەیەک لە کێشەکان. دوای هێرشی بارەگای دەرێشیشی، (یەنەکە) بارەگایەکی خۆیان لە (دەشتەتەخێ) گواستەوە بۆ شوێنێکی تر.

لەدوای ئەم رووداوە جارێکی تر (پەدەکە) پێشمەرگەی خۆی رەوانەی بادینان کردبوو، ئامادەباشییان کرد بۆ شەڕێکی نوێ. ١٦ گەریلای کچ کە بێ چەک بوون و دەیانویست لە باشورەوە بپەڕێنەوە بۆ سوریا لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە) وە دەستبەسەر کران و رەوانەی دهۆک کرابوون. دوای دانوساندن لەنێوان (پەکەکە و پەدەکە) پەکەکە چەکەکانی (پەدەکە)ی دایەوە و (پەدەکە)ش گەریلا کچەکانی ئازاد کرد.

بەمشێوەیە کێشە لە باشوری کوردستان جارێکی تر دواخرایەوە، ئاڵۆزی و گرژییەکانی سەر سنورەکان (پەکەکە و پەدەکە)ی لەهەمبەر یەکتر زیاتر قیتدەکردەوە.

## سیاسەتی (یەنەکە و پەدەکە) بەرامبەر بە (پەکەکە)

(یەنەکە و پەدەکە) هیچ کاتێک سیاسەتێکی دیاریکراوی هاوبەشیان بەرامبەر بە (پەکەکە) نەبوو، هەردووکیان حکومەتی هەرێمیان پێکهێنابوو، هەروەها هیچ کاتێک پەیوەندییەکی پۆزەتیفانەیان لەنێوانیاندا نەبوو. هەڵوێستی هەردووکیان بەرامبەر بە (پەکەکە) بەگوێرەی مامەڵەی سیاسی دەگۆڕدرا. بێشک هێڵی ئەم سیاسەتەشیان روون بوو، ئەگەر (پەکەکە) هەتا ئەو سنورەی ئەوان دیاریان کردبوو نەبوایە بە بەڵا ئەوا دۆستیان بوو، بەڵام لەوە دەچوو ئەم بەڵایە لەکۆڵیان نەبوایەتەوە. جارێکی تر گەریلاکانی (پەکەکە) هێرشیان بۆسەر سوپای تورک دەست پێکردەوە. بەڵایەکی تری گەورەی (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی) بێشک سوپای تورک بوو. پەرلەمانی هەرێمی کوردستان لە ٢٢ی حوزەیرانی (١٩٩٣) لەبارەی کێشەی (پەکەکە)وە دانیشتنێکیان ئەنجامدا کە (مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی)یش بەشداربوون، ئەم دانیشتنە لە تەلەفزیۆنی (یەنەکە)وە راستەوخۆ پەخش دەکرا. جەلال تاڵەبانی لەم دانیشتنەدا باسی لە دەسەڵاتی موتڵەقی پەرلەمان و حکومەتەکەیانی دەکرد کە هیچ پێویستیشی نەدەکرد و هەروەها باسی لە تیرۆری (پەکەکە)ی دەکرد.

بەگوێرەی (مام جەلال) ئاگر بەستی یەکلایەنەی (پەکەکە) لە باکوری کوردستان دەبوایە درێژەی بکێشایە، بەڵام (پەکەکە) دەیانوت ئێمە ئامادەنین لەئاستی ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک خۆمان بکەین بە قوچی قوربانی و بێدەنگ بین. لەدوای (مام جەلال)یش سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی لە پەرلەمان وتی (**خاکی باشوری کوردستان شوێنی هەموو کوردێکە، هەموو کوردێک دەتوانێت لێرە سەربەستانە کار بکات، ئەوەیشی ئاژاوە و ناکۆکی بخاتە ناو ماڵی کوردەوە دەبێت ئەم خاکە جێبهێڵێت**).

لەسەر ئەم قسەیەی مەسعود بارزانی، جەلال تاڵەبانیش بە پێکەنینێکەوە وتی (**دەتەوێت بڵێیت پێویستە ئێمەش بڕۆین؟**) بەڵام (مەسعود بارزانی) وەڵامی ئەم قسەیەی نەدایەوە. لەکاتی

ئەم قسەیەدا تەلەفزیۆن پەخشی راستەوخۆی بڕی. بەمشێوەیە ناکۆکی نێوان ئەم دوو سەرکردەیە بەدەرکەوت، لەبارەی سیاسەتیشیان لە ئاستی (پەکەکە) هەردوکیان واتا (کاکە و مامە) بەهیچ شێوەیەک باوەڕیان بەیەک نەبوو، هەروەها گومانیشیان لەیەکتری هەبوو.

لەڕاستیدا ئەم دیمەنە تەسادوف نەبوو، پارتی سێیەمی باشوری کوردستان کە (پارتی گەل) بوو لە ٢٥ی ئادار خۆی هەڵوەشاندەوە و چووە ناو (پەدەکە)وە ، بەمشێوەیە بالانسی سیاسی و سەربازی نێوان (پەدەکە و یەنەکە) تێکچوو. (جەلال تاڵەبانی) لەدوای چوونی (پارتی گەل) بۆناو (پەدەکە) دەیویست ریگری لە پێشکەوتن و بەهێز بوونی (پەدەکە) بگرێت. بەگوێرەی گوتنی چەند فەرماندەیەکی (پەکەکە) دوای چوونی (پارتی گەل) بۆ ناو (پەدەکە) چەند بەرپرسێکی (یەنەکە) بەردەوام لە مانگەکانی حوزەیران و تەموزدا نامەی رینمایی و ئاگەدارکردنەوەیان بۆ (پەکەکە) بردووە، بەگوێرەی ئاگەدارکردنەوەکان بێت (پەدەکە) بەنیازە هێرش بۆسەر گەریلاکانی (پەکەکە) بهێنێت، بەلام فەرماندەکانی (پەکەکە) دەیانوت لەوانەیە ئەم ئاگەدارکردنەوەیە بە ئامانجی ئاژاوەگێڕی بێت و بیانەوێت ناوبەری (پەکەکە و پەدەکە) زیاتر ئاڵۆزتر بکەن. لە دانیشتنی پەرلەماندا (مەسعود بارزانی) باسی لە تێکچوونی یەکڕیزی و ماڵی کورد دەکرد، بەلام نەدەزانرا ئایا باس لەو رێنمایی و ئاگەدارکردنەوانە دەکات کە دەگەیشتە دەستی (پەکەکە) یاننا. لەهەمانکاتدا ئەوەی نەدەشاردەوە کەلە کردارەکانی (یەنەکە) بێ ئاگا نەبێت، لەهەمانکاتدا (مەسعود بارزانی) جورئەتی ئەوەی نەدەکرد بەتەنیا شەڕی (پەکەکە) بکات.

## لەو سیخوڕانەی خرابوونە ناو پەرلەمانی کوردستانەوە

لە هەرێمەکەدا ئاڵۆزییەکان بەردەوام بوون، هەواڵەکان لەبارەی نوێنەرە فەرمییەکانی (پەکەکە)وە لە هەولێر لە زیاد بوندابوون و لەو شوێنانەی دەمانەوە بەردەوام دەیانویست وێنەیان بگیردرێت. لە گەڕەکی (عەینکاوە)ی شاری هەولێر کۆمیتەی دانوساندن و دەزگای میزۆپۆتامیای (پەکەکە)ی لێبوو. لە ١٩ی تەموز لەلایەن سێ کەسی چەکدارەوە دەویسترا وێنەی بارەگاکە بگرن، بەڵام لەلایەن پاسەوانە گەریلاکانەوە دەستبەسەر کران. هەرسێکیان رادەستی ئاسایشی هەرێم کرانەوە و (پەکەکە) داوای دەکرد لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکرێت و دەرفەت نەدرێت ئاژاوەگێری بخوڵقێنرێت. پاشان هەرسێکیان دانیان بەوەدا هێنابوو کە کار بۆ (میت)ی تورک دەکەن، جگە لە ئەندامانی (پەکەکە) کەسی تر نەیدەتوانی لە بارەگاکە نزیک ببێتەوە و بچێتە ناو بارەگاکەوە.

لەسەر ئەم رووداوە حکومەتی هەرێم پێشنیاریان بۆ (پەکەکە) کردبوو شوێنی بارەگاکەی خۆیان بگۆڕن، ئەگەر شوێنەکەیان نەگۆڕن لەحاڵەتی هاتنە ئاراوەی هەر رووداوێکی نەخوازیاردا حکومەتی هەرێم بەرپرس نییە، بەمشێوەیە ئەو دڵنیاییەی لە ئاکامی رێککەوتنی نێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێم کەلە (١٩٩٢/١٠/٣٠) هاتبووە ئاراوە حکومەتی هەرێم وەلای نا. دوای ئەم رووداوە و هەڵوێستی نادۆستانەی حکومەتی هەرێم، (پەکەکە) درکیان کرد دڵنیا نین و نوێنەرەکانی خۆیانی گەڕاندەوە بۆ شاخ. ئاڵۆزییەکان پەیتا.. پەیتا زیادیان کردبوو، دەستێکی رەشی نەبینراو هێواش،هێواش رەوشەکەی تێکدەدا. لەم بارەیەوە فەرماندەیەکی (پەکەکە) بەناوی فەرهاد (عوسمان ئۆجالان) بۆ رێگریکردن لە هاتنە ئاراوەی رووداوی نەخوازیار لە رۆژانی ٦ بۆ ١٠ی مانگی تەموز چاوی کەوت بە (مەسعود بارزانی

و جەلال تاڵەبانی و کۆسرەت رەسول) کە سەرۆک وەزیرانی حکومەت بوو، بەڵام بەهۆی زیادبوونی گرژی و کێشەکانەوە ئەم چاوپێکەوتنانە هیچ دەستکەوتێکییان نەبوو. لەهەمانکاتدا لە هەولێر ئاربێجی نرا بە باڵەخانەیەکەوە کە (میت)ی تورک بە نهێنی بەکاریان دەهێنا، چەند کەسێک لە ناو ئەم باڵەخانەیەدا بریندار بوون و لەسەر هاتنە ئاراوەی ئەم رووداوەش (پەدەکە) لە (دهۆک) ٦ گەریلایان دەستبەسەر کرد، ئەم گرتنە بە بڕیاری (فازل موطنی) ئەنجامدرابوو، لەناو گیراوەکاندا یەکێکیان نوێنەری فەرمی (پەکەکە) بوو لە باشور و یەکێکی تریان یاریدەدەری بوو هەروەها سیانیشیان بریندار بوون و تەداوییان دەبینی.

## ڕۆژنامەی (دەنگی وەڵات) دادەخرێت

ئاڵۆزییەکان و گرژییەکان کۆتاییان نەدەهات. هەموو ڕۆژێک هەواڵی دڵتەزێن و ناخۆش بڵاودەبووەوە. دوای شەڕوپێکدادانەکان و دوای ئەو ڕێککەوتنەی لەنێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێم هاتە ئاراوە، (پەکەکە) لە باشور هەفتەنامەیەکی دەرکرد بە ناوی (دەنگی وەڵات- ناوی ڕۆژنامەکە وەڵات بوو— وەرگێر)، بەڵام دوای دوو مانگ بەسەر دەرچونی ئەم هەفتەنامەیەدا بە بڕیارێکی تایبەتی حکومەتی هەرێم لە (١٩٩٣/٨/٤) داخرا. ئەم هەفتە نامەیە ئۆفیسەکەی لە هەولێر بوو، هەروەها بە زمانەکانی کوردی و عەرەبی بڵاو دەبووەوە، ئەم هەفتە نامەیە بەبڕیارێکی تایبەت و خێرای پارێزگای هەولێر بە ناوی (شێخ سلێمان عەبدولموهەیمەن بارزانی) داخرا کە ئەویش پشتی بە ڕێنمایی و بڕیاری حکومەتی هەرێم بەستبوو. لەبەرئەوەی لەناو خەڵکیدا خۆشەویست نەبوو پێیان دەوت (عەبدولمەیمون)، وەکو خۆی وتبووی لەلایەن خودی (مەسعود بارزانی)ەوە پێیوتراوە کە دەبێت ئەو هەفتە نامەیە دابخرێت. بیانوی داخستنی ئەم هەفتە نامەیە ئەوەبوو گوایە ئەو مۆڵەتەی لە وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە پێیاندراوە کەموکوڕی هەیە، بەڵام ئەمە بەهانە بوو. فەرمانی داخستنی هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات) لەلایەن خودی (مەسعود بارزانی)یەوە دەرکرابوو، (مەسعود بارزانی) لە کۆبونەوەیەکی لایەنگران و ئەندامانی خۆیدا وتبووی (**هەتاکو سیاسەتی پەکەکە لە بناغەوە نەگۆڕدرێت مۆڵەت بە چالاکییەکانیان نادەین**)، بەڵام (مەسعود بارزانی) لەهەمبەر ڕایگشتیدا دەیوت گوایە مۆلەتی هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات) کەموکوڕی هەیە.

یەکێک لە ئۆرگانی سیاسی پارتێکی باشوری کوردستان باسی لەوە دەکرد دیموکراسی باشوری کوردستان بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوین وەکو مۆدێلێکی نمونەییە و باسی لەوە دەکرد ئەم

سیاسەتە مۆدرێنەی باشوری کوردستان دەبێت بە نمونە لە هەرێمەکەدا. وەزیری رۆشنبیری هەرێمی کوردستان کە (شێرکۆ بێکەس) بوو لەکاتی سەردانێکی بۆ تورکیا، ئەوکاتەی رۆژنامەوانە کوردەکانی باکور لەبارەی داخستنی هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات)ەوە پرسیاریان لێکرد، ئەویش لەبارەی کوشتاری سیاسی نادیار و لەبارەی داخستنی ئەم هەفتە نامەیەوە دەیوت (دوو کاری ناخۆشن)، هەروەها رەخنەی داخستنی ئەم هەفتە نامەیەی دەکرد و ئەوەشی دەوت لەبارەی داخستنی ئەم هەفتە نامەیەوە خۆی بەرپرسیار نییە و بە دەرەجەی یەک پاریزگای هەولێر بەرپرسیارە.

مۆڵەتی دەرکردنی هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات) بەتایبەتی لەلایەن شێرکۆ بێکەسە دەرکرابوو کە وەزیری رۆشنبیری بوو، هەروەها شیرکۆ بێکەس بەهۆی کارە نا دیموکراتییەکانی حکومەتی هەرێمەوە لە مانگی تشرینی دووەمی (۱۹۹۳) دەستی لە کار کێشایەوە، شێرکۆ بێکەس نەیدەویست بەهۆی کارە نابەجێ و نا دیموکراسییەکانی حکومەتەوە ناوی لەکەدار ببێت.

لەڕاستیدا بەرپرسیارانی (پەدەکە و یەنەکە) لە سیاسەتی ئەم هەفتەنامەیە دەترسان، لەماوەیەکی کەمدا هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات) لەناو باشوری کوردستاندا لە چاو رۆژنامە حزبی و ئەهلییەکانی تردا زۆرترین کڕیاری هەبوو. ئەم هەفتەنامەیە بەگشتی باسی لە خەباتی گەریلای دەکرد لە باکوری کوردستان و بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتی باشوری پەیرەو نەدەکرد و زیاتریش دژی دەوڵەتی تورک بوو.

هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات) لەناو خەڵکی و لەناو رۆشنبیرانی باشور بە سەرنجەوە دەخوێنرایەوە و بەرپرسیارانی (پەدەکە و یەنەکە) حەزیان بەچارەی ئەم هەفتەنامەیە نەبوو. سەرەڕای ئەوەی نەدەگەیشتە هەموو شوێنێکیش بەڵام بەگشتی ٥ هەزار دانەی لێدەفرۆشرا، رۆژنامەی (کوردستانی نوێ) کە ئۆرگانی (یەنەکە) بوو نزیکەی ٤ هەزاری دەفرۆشت و رۆژنامەی (برایەتی) کە ئۆرگانی (پەدەکە) بوو نزیکەی ۲ بۆ ۳ هەزارێکی دەفرۆشت، رۆژنامەی برایەتی لەبەرئەوەی دەمایەوە کە ئێوارە دادەهات بۆ ئەوەی بفرۆشرێت نرخەکەیان دادەشکاند، بەرپرسیارانی (پەدەکە) لەم بەراوردەدا زۆر نیگەران بوون.

یەکێک لە مادەکانی رێککەوتنی نێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێمی کوردستان کەلە (۱۹۹۲/۱۰/۳۰) هاتبووە ئاراوە ئەوەبوو (پەکەکە) دەتوانێت رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆن

دابمەزرێنێت، بە داخستنی هەفتەنامەی (دەنگی وەلات) ئەم مادەیەیان پێشێلکرد. دوای ئەم گۆڕانکارییە (پەدەکە) لە ترسی ئەگەری هاتنەئاراوەی شەڕ لە مانگی ئاب هێزی خۆیان رەوانەی بارەگاکانی سەر سنور کرد، (پەکەکە)ش لەو شوێنانەی لە (هەفتانین) لەدوای رێککەوتنەکە چۆڵیان کردبوو جارێکی تر گرتیانەوە و بە درێژایی سنورەکانیش گەریلاکانی خۆیانیان جێگیرکرد.

گەریلاکانی (پەکەکە) لەناوچە دابڕاوەکاندا بە گروپی ١٠ بۆ ١٥ کەسی جێگیرببوونەوە، (پەدەکە) بە شێوەیەکی جدی و بەرچاو هێزەکانی خۆی رەوانەی سەر سنورەکانی ئێران و تورکیا دەکرد و دەشیانویست هەموو رێگاکانی (ئامێدی)یەش بگرن، هەموو ناوچەکانی سەر سنور رەوشی جەنگیان وەرگرتبوو، ئەم دیمەنانە لە دیمەنی مانگەکانی پێش شەڕی باشوری کوردستانی دەکرد لە ساڵی (١٩٩٢)دا.

## له بارودۆخێكی ئازاددا بەستنی كۆنگرە

پارتی دیموكراتی كوردستانی عێراق (پەدەكە)لە ساڵی (١٩٤٦) لەكاتی دامەزراندنییەوەی تاكو ئێستا یەكەمین كۆنگرەی خۆی بەشێوەیەكی فەرمی لە ١٦ی ئاب لە هەولێر بەست، ئەم كۆنگرەیە ماوەی (٨)رۆژی خایاند، بەگوێرەی مەرجەكانی تایبەتمەندی خۆی هەبوو ئەم كۆنگرەیە.

هەرچەندە ئەم یانزەمین كۆنگرە بوو، هەروەها هەرچەندە لە زەمینەیەكی ئازاددا ئەنجامدرا بوو بەڵام ئەو راستیانەی لێبەدی نەدەكرا كەلە كۆنگرە بچێت. كۆنگرەكە لەژێر سێبەری وێنەیەكی گەورەی (مەلا مستەفا)دا بەڕێوەبرا، ئەنجام و دەرهاویشتەكانی كۆنگرەكە سەرنج راكێشەر بوون. ئەوكاتەی كۆنگرەی (پەدەكە)بەردەوام بوو سوپای توركیش لە (چوكورجە و شەمزینان) دژ بە گەریلاكانی (پەكەكە) ئۆپەراسیۆنی پیادەییان دەست پێكرد و لەهەمانكاتیشدا هاتبوونە ناو خاكی باشوری كوردستانەوە، هەروەها سوپای ئێرانیش روو لە بارەگاكانی (پەدەكە ئێران) لە ناوچەكانی (پێنجوێن، هەڵەبجە، رانیە و قەلادزێ) هێرشی ئاسمانییان بەردەوام بوو.

حكومەتی عێراقیش لە هەمانكاتدا هەڕەشەی سەربازی و ئابوری لە كوردستان دەكرد، حكومەتی عێراق كارەبای بادینانی بڕیبوو، هەروەها رێگاشیان نەدەدا لە رێگاكانی ئەوانەوە خۆراك و سوتەمەنی بچێت بۆ باشوری كوردستان. حكومەتی هەرێمی كوردستانیش دوای گوشارەكانی دەوڵەتی ئێران و توركیا بۆ ئەوەی پێشمەرگەكانی (پەدەكە ئێران) و (پەكەكە) لە هەرێمەكە دەربكەن دەستیان كرد بە نارەحەت كردنیان و بیانویان بۆ دەهێنانەوە و گوشاریان زیاتر كردبوو. كاتێك پێشمەرگەكانی (پەدەكە ئێران) لە ئەنجامی گوشارەكان

بارەگاكانی سەر سنوریان چۆلكرد و دەیانگواستەوە بۆناو جەرگەی خاكی باشوری كوردستان، بەڵام گەریلاكانی (پەكەكە) زیاتر خۆیان جێگیردەكرد و لەهەمانكاتیشدا لەكاتی هاتوچۆكانیاندا روبەروی پەلاماری پێشمەرگەكانی (پەدەكە) دەبونەوە، بەمشێوەیە شەڕ هاتبووە بەردەرگای گەریلاكانی (پەكەكە).

بەگوێرەی مادەی رێككەوتنەكانی نێوان (پەكەكە) و حكومەتی هەرێم، (پەكەكە) مافی ئەوەی هەبوو رۆژنامە دەربكات، بەڵام حكومەت رۆژنامەی (دەنگی وەڵات)ی داخستبوو، هەروەها ئاسایشی حكومەتی هەرێم دەیانوت بەرپرسیارێتی ئەو هێرشانە ناگرینە ئەستۆ كە روبەڕوی (پەكەكە) دەبێتەوە. بەكورتییەكەی دەیانویست نوسینگەكانی (پەكەكە) دابخەن. لەو دواییانەدا بەتایبەت لە (دهۆك) و دەوروبەری پەرلەمانتارێك و سەرۆكی رێكخراوێك و كارمەندی دوو رێكخراو و جگە لەوانیش (٢٠) كەسی تریش كوژرابوون كە بكوژەكانیان دیارنەبوون. پێش (٤) مانگیش (٤) گەریلای (پەكەكە) لەلایەن (پەدەكە)وە دەستبەسەركرابوون و دوای ئەشكەنجەكردنیان كوژرابوون، مەخابن بكوژی ئەم (٤) گەریلایە بەهیچ شێوەیەك نەدۆزرانەوە.

رەوشی دارایی خەڵكی زۆر خراپ بوو. نزیكەی (٤٠٠) هەزار خەڵكی (كەركوك، موسڵ و خانەقین) لە زێدی خۆیان دابڕابون و پەنایان هێنابوو بۆ (سلێمانی، هەولێر و دهۆك)، زۆربەیان بێ خانوو بوون و لە دەرەوە ژیانیان بەسەر دەبرد و لەناو ژیانێكی زۆر سەختدا دەژیان. حكومەتی هەرێمیش بەهیچ شێوەیەك دەستی یارمەتی بۆ درێژ نەدەكردن، لە هەرێمەكەدا هیچ داهاتێكی ئابوری نەبوو، بەروبومی كشتوكاڵ بەبێ بەرهەم مابووەوە، بە هەزارەها تەن گەنم دەمایەوە و نەدەفرۆشرا و خراپ دەبوون و ئامرازێكیش نەبوو بتوانن سوودی لێوەربگرن.

حكومەت و پەرلەمانی باشور جگە لە خۆدەرخستن كارێكی تریان نەدەكرد. بە شێوەیەكی جدی كاریان نەدەكرد و برینەكانیان سارێژ نەدەكرد. نەیاندەتوانی خەڵكی بەخێو بكەن و بیانبەن بەڕێوە. حكومەت تەنها پێكهاتبوو لە ئۆرگانێكی بەڕێوەبەری و هیچی تر، تەنها دەیانتوانی لەبواری سەربازیدا خۆیان بنوێنن. بەگشتی حكومەت و پەرلەمان بەرژەوەندییە باڵاكانی (پەدەكە و یەنەكە)یان دەپاراست. دزی و قاچاخچێتی بێژومار بوون، هەر لە سەرۆك وەزیرانەوە هەتا بچوك ترین كارمەندی حكومەت بە دزی تۆمەتبار دەكران، دزی و گەندەڵی

لەناو ئەندامانی حزبەکان وایلیهاتبوو ببوو بە ئامراز کەلە ناو حزبدا پلەی بەرزی پێوەربگیردرێت، بە کورتییەکەی کێ دزی زیاتری بکردایە بۆ حزبەکەی پلەی بەرز دەبووەوە. لەنێوان چینەکاندا جیاوازییەکی بەرچاو هەبوو، بەرپرسیارانی (پەدەکە و یەنەکە) کە دزی یەکەمی هەرێمەکە بوون لەناو ژیانێکی زۆر بەختەوەردا دەژیان، لەهەمانکاتیشدا خانەوادەی شەهیدان نەدار بوون و بەدوای پەیداکردنی نانێک وێڵبوون. خەڵکی هیچ باوەڕییەکیان بە بەرپرسیارانی حزبەکان نەمابوو، ئەوانەی لە سەردەمی سەدامدا ئیستیخبارات و سەرۆک جاش بوون ئیستا لەناو حکومەتی هەرێم و لەناو حزبەکانی باشوردا خاوەن پێگەی گرنگ بوون. نمونەی کەسێکی وەکو پارێزگای هەولێر (شێخ سلێمان عەبدولموهەیمەن) کرابوو بە وەکیلی بارزانی، زۆر لە مستەشار و سەرۆکی مەفرەزە خاسەکانی سەدام ببوون بە ئەندام سەرکردایەتی حزبەکان و تیاشیاندا هەبوو ببوو بە پەرلەمانتار، تەنانەت لەناویاندا هەبوو کرابوو بە وەزیریش. کەسانێکی زۆری تریش کە ساڵەهای ساڵ بوو پێیان نەنابووە کوردستانیشەوە لە ئەمەریکا و ئەوروپا دەژیان گەڕانەوە و لە جومگە گرنگەکانی ناو حکومەت و حزبەکان کران بە بەرپرس.

سەرکردایەتی و سەرۆکەکانی (پەدەکە و یەنەکە) هیچ گرنگیان بە پاشەڕۆژی وەڵات نەدەدا، لەهەمانکاتیشدا ئەمەریکا و ئەوروپا لەبارەی پاشەڕۆژی کوردستانەوە سیاسەتێکی دیاریکراو و روونیان نەبوو. مانەوە و بوونی حکومەتی کوردی باشور بە گوێرەی سیاسەتەکانی ئەوان هاوکێشەکەی دیاریدەکرا. سیاسەتی ئەمەریکا و ئەوروپا بەتەواوەتی تەمومژاوی بوون، سەرکردەکانی باشور زوو، زوو هانایان بۆ ئەوروپا و تورکیا دەبرد، بەگشتی لەجیاتی یارمەتی راستەقینە کەچی تەنها (بەڵێن)یان وەردەگرت، بێگومان بەڵێن و پەیمانیش سکی برسی خەڵکی کوردستانی تێر نەدەکرد، هەموو مانگێک بە سەدان منداڵ و ئەختیار لە برساندا و لەبەر نەبوونی دەرمان دەمردن.

دەسەڵاتی باشور لەگەڵ سەدام هەلی گونجاندنیان بەدەستەوە نەمابوو، هەرچەندە (مەسعود بارزانی) مەیلی ئەوەی هەبوو کەمێک بەلای سەدامدا لابدەن بەڵام وەڵاتانی ئەوروپا ئەمەیان قەبوڵ نەدەکرد. سەدام حوسێنیش ئەگەر بۆ بەرچاویش بوبێت پردی نێوان خۆی و بەرەی کوردستانی رووخاندبوو. ناحەزی و ناکۆکی و گرژی نێوان (پەدەکە و یەنەکە)ش بەردەوام بوو، هەروەها لە نێوان خودی (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)دا لەبارەی مەسەلەیەکی

زۆرەوە ناکۆکییان هەبوو هەردوکیان ناتەبابوون، لەئاکامدا کێشەکانیان پەرەی سەند و تەنانەت لەهەندێک شوێنیشدا شەڕ لە نێوانیاندا هاتە ئاراوە.

دواجار لە ١٤ی مانگی ئاب پێشمەرگەکانی (پەدەکە) ٣ پێشمەرگەی (یەنەکە)یان کوشت و هەروەها برینداریکی تریشیان لەبەرچاوی خەڵکی گوولە باران کرد، ئەم رووداوەش لەئاکامی گوایە پێشمەرگەکانی (یەنەکە) لە شوێنی پشکنینی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) رانەوەستاون.

لە رووداوێکی تری گرژی نێوان پێشمەرگەکانی (پەدەکە و یەنەکە) لە مانگی تەموز لە شارۆچکەی (رانیە) هاتەئاراوە، لەم ئاڵۆزییەشدا ٣ پێشمەرگەی (یەنەکە) لەلایەن پێشمەرگەکانی (پەدەکە)وە کوژرابوون، بەرامبەر ئەم رووداوانە بەرپرسیارانی باڵای (یەنەکە) نارەزاییان نیشاندا و تەنانەت خودی (جەلال تاڵەبانی)یش بۆ ئەوەی دایانمرکێنێتەوە نامەیەکی نارد بۆ (مەسعود بارزانی) و لەبارەی هاتنەئاراوەی ئەم جۆرە کارانە ووریای کردبووە و ئەوەیشی وتبوو ئەمجورە کارانە زیاد بکەن لەوانەیە رێ بۆ شەڕی ناوخۆ خۆشبکات.

(یەنەکە و پەدەکە) هەردوکیان بەشەراکەت حکومەتیان پێکهێنابوو کە هەردووکیان زل هێزی باشوری کوردستان بوون. هەردوکیشیان بۆ وەرگرتنی بەشی زیاتری دەسەلات و داهات لەنێوان خۆیان کێشمەکێشیان بوو، ئەمەش وایکردبوو بۆ ئاگر خۆشکردنی زیاتری نێوانیان وەلاتانی دەوروبەریشیان بەنزین بکەن بە ئاگری نێوانیان، لەهەمانکاتیشدا بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک لەبارەی ئەم رەوشەی باشوری کوردستانەوە لێدوانیان دەدا و ئەوەیان نەدەشاردەوە کە لایەنگری (مەسعود بارزانی)ن، بەمشێوەیە دەیانویست ناکۆکی نێوان (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) قوڵتر بکەنەوە.

لە سێیەمین رۆژی کۆنگرەی (پەدەکە) جەلال تاڵەبانی لە سلێمانی خۆپێشاندانێکی سازدا و نزیکەی (١٠٠) هەزار لایەنگری خۆیان تێیدا بەشداربوو دەیویست عەرزی عەزەلاتی خۆی بکات.

## لەو کۆنگرەیەی تەنها (پەکەکە) بانگێش نەکرا

کۆنگرەی (پەدەکە) لەو بارودۆخە ئازادەی باشوری کوردستان ئەنجامدرا، (مەسعود بارزانی) کەلە نێوبەری نوێنەرانی پارتەکانی تورکیا دانیشتبوو و بریتی بوون لە (سەهەپە.. پارتی گەلی سۆسیال دیموکرات و ئاناپ واتا پارتی دایکی نیشتیمانی )، نوێنەرانی ئەم دوو پارتە تورکە لە دووری نوێنەرانی پارتی (دەپ ... پارتی دیموکراسی) دانیشتبوون کە کورد بوون، (مەسعود بارزانی) زیاتر رووی بە میوانە تورکەکان و رۆژئاواییەکان دەدا. (مەسعود بارزانی) لەم کۆنگرەیەدا بەبێ ئەوەی باسی کێشەی وەڵات بکات داخوازی ئەو یارمەتیانەی دووبارە کردەوە کە پێشوتریش لەلای تورکەکان و رۆژئاواییەکان باسی کردبوو، هەروەها باسی لە دڵخۆشی خۆیدەکرد کە (پارتی گەل) هاتبوونە ناو پارتەکەیەوە، زوو، زوو (مەسعود بارزانی) باسی دیموکراسی باشوری کوردستانی دەکرد، بۆ توانج لێدان و بەرد گرتنە (پەکەکە) دەیوت خەباتی چەکداری باوی نەماوە و وەک (تیرۆر) پێناسەی دەکرد. (مەسعود بارزانی) بەهیچ شێوەیەک باسی لە چاکە و خراپی سەدام حوسێن نەکرد. پارتی لەم کۆنگرەیەدا بانگێشی زۆربەی پارت و رێکخراوەکانی ئێران و عێراق و تورکیای کردبوو، بەڵام لەناو هەموویاندا تەنها بانگێشی (پەکەکە)ی نەکردبوو، ئەمەش زیاتر بۆ دڵخۆشکردنی دەوڵەتی تورک بوو، بەمشێوەیە گوێی خۆی لە گازندەی (میت) و دەوڵەتی تورک رزگار کردبوو. بە کورتییەکەی ئەم کۆنگرەیەی (پەدەکە) تەنها قوڕی شەڕی باشوری دەشێلا، (مەسعود بارزانی) لەبارەی بانگێشنەکردنی (پەکەکە) بۆ کۆنگرەکەیان بە رۆژنامەوانەکانی وت (**رێز لە تورکیا دەگرین**)، ئەگەر ئەم قسەیە پێچەوانەوە بکەینەوە ئەوە دەکرێت بوترێت مەسعود بارزانی مەبەستێتی بڵێت (**لەبەرئەوەی رێز لە تورکیا دەگرین رێز لە پەکەکە**

**ناگرین**). لەکاتی بەردەوام بوونی کۆنگرەی (پەدەکە) پرۆفیسۆر (عیسمەت شەریف وانلی) کە یەکێک بوو لە میوانەکان، هەلی بۆ رەخسا و سەردانی (زەلێ)ی کرد، دوای ئەم سەردانەی (عیسمەت شەریف وانلی) لەلایەن (پەکەکە)وە پەیامی ئاشتی و برایەتی و تەبایی هێنابووەوە، (عیسمەت شەریف وانلی) ئەم پەیامەی دابوو بە خودی (مەسعود بارزانی)، بەلام وەلامی (نەخێر)ی بۆ پەیوەندییەکان وەرگرتبووە .

بەمشێوەیە (پەدەکە) میوان پەروەری کوردایەتی و مەیلی بوونی بە پارتێکی سیاسی کوردی خستبوو بەلایەکدا، (پەکەکە) لەئاکامی ئەو رێککەوتنەی لەگەڵ حکومەتی هەرێم کردبووی لە ناو خاکی باشوری کوردستان دەیتوانی بمێنێتەوە و نوێنەرەکانیشیان بەشێوەیەکی فەرمی لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە دەناسرا، (پەدەکە) کە بانگێشی (پەکەکە)یان نەکردبوو، لەهەمانکاتدا رێکخراوی (ڤەژین) کە لەلایەن (پەکەکە)وە بە خائین لەقەڵەم درابوو بانگێشی ئەم کۆنگرەیە کرابوون کە ژمارەیان بەگشتی خۆی دەدا لە ١٥ بۆ ٢٠ کەسێک. ئەمە نیشانەی سیاسەتی داهاتووی (پەدەکە)بوو کەلە داهاتوودا لە هەرێمەکە رچاویدەکرد.

## (هەروەکو هەموو جارێک ئایا پەدەکە قازانجی کرد یان گەل؟)

(مەسعود بارزانی) وەکو ستراتیژییەت لە کۆنگەرەکەدا گرنگی دابوو بە لایەنی رۆژئاوا، (یەنەکە)ش هەمان ڕێچکەی گرتبووەبەر، تەنانەت (یەنەکە) لۆگۆی حزبەکەیان گۆڕی بە گوڵ. سەرۆکی ئەوسای ئەمەریکا (بیل کلینتۆن) پەیامێکی نارد بۆ کۆنگرەکەی (پەدەکە) و لە کۆنگرەکە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکرا. نزیکەی (١٥٠٠) میوان بانگێشی ئەم کۆنگرەیە کرابوون، لەم کۆنگرەیە (سامی عەبدولڕەحمان) کرا بە ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە)، کە پێشوتر سەرۆکی (پارتی گەل)بوو، بەمشێوەیە ئەندام و لایەنگری (پەدەکە) زیادیان کردبوو، بەڵام قازانجی هەرە گەورەی (مەسعود بارزانی) لە هاتنی (پارتی گەل) بۆناو حزبەکەی بێشک (حەمەی حاجی مەحمود)بوو کە خاوەن پێگەیەکی بەرچاو بوو لە باشوری کوردستان. کاتی خۆی (پاسۆک و حزبی سۆسیالیستی کوردستان و پارتی گەل) بەیەکەوە (پارتی یەکگرتن)یان پێکهێنابوو، کاکە حەمە لەهەمانکاتدا خاوەن هێزێکی چەکداریش بوو.
ژمارەیەکی زۆری بەرچاوی کوردی فەیلی سەدام مەنفایانی کردبوو بۆ ئێران کە ژمارەیان دەگەیشتە نزیکەی (٢٥٠) هەزار کەسێک، (عەلی سنجاری) لە ساڵی (١٩٨٠) لەگەڵ (تەڤگەری فەیلی ئیسلامی) لە (پەدەکە) جیاببونەوە، جارێکی تر لەگەڵ (یەکێتی دیموکراتی کوردستان) چوونەوە ناو (پەدەکە). زۆرینەی ئەندامانی ئەم پارت و ڕێکخراوانە کاریان بۆ ساواکی ئێران و موخابەراتی سوریا دەکرد. کۆمەڵێک لە رۆژنامە و دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییە بییانییەکان بەشدارییان لە کۆنگرەی (پەدەکە) کردبوو، ئاسایشی هەمووشیان لە ئەستۆی (پەدەکە)دا بوو، هەروەها هەموو پێداویستییەکانی وەک شوێنی نوستن و خواردن و خواردنەوەیان بۆ دابیندەکرا. هۆڵی کۆنگرەکە بە رەنگی زەرد و شین رازانرابووەوە، بەڵام ئەگەر بۆ نمونەیش بێت ئاڵای کوردستانیان هەڵنەواسی بوو.

سکرتێری (یەنەکە) مام جەلال درکی بەوە کردبوو لەگەڵ بەهێزبوونی (پەدەکە) دەیانەوێت سنوری دەسەلاتی خۆی و رێکخراوەکەی تەسک بکەنەوە. مام جەلال لە قسەکانی ناو کۆنگرەی (پەدەکە) جەختی لە یەک ریزی نێوان کورد دەکردەوە، کەرکوکیشی وەک (قودس)ی کوردستان ناوزەند دەکرد، دەشیوت مەحاڵە ئەو خاکەمان بۆ سەدام حوسێن بەجێبهێڵین. لەدوای دوو رۆژ لەو قسانەی لە گردبونەوەیەکی جەماوەریدا (جەلال تاڵەبانی) بانگەشەی بۆ خەڵک دەکرد خاکی کەرکوک و موسڵ رزگار بکەن، ئەگەرچی ئەم قسانەی (جەلال تاڵەبانی) بە ئامانجی پروپاگەندەش بوو، بەلام بەتەواوەتی خۆی لە بیروبۆچونەکانی (مەسعود بارزانی) جیادەکردەوە. سەرۆکی (پەدەکە) مەسعود بارزانی ئەگەرچی بە زمانی خۆیشی نەیوتایە بەلام دەردی رزگارکردنی کەرکوک و موسڵی هەرگیز نەبوو. (جەلال تاڵەبانی) بە (رێوی) سیاسەت ناوزەند دەکرا، چونکە هەرکاتێک گەشتی بکردایە شەڕ دەهاتە ئاراوە یان شتێکی نەخوازیار لە کوردستان دەقەوما.

لەناو کۆنگرەکەدا ئەوەی زۆر بەختەوەر بوو بێشک (سامی عەبدولرەحمان) بوو، سامی یەکێک بوو لە ئەندامە کۆنەکانی (پەدەکە)، لەم کۆنگرەیەدا پشکێکی باشی دەسەلاتی پێبرابوو، ئەمەیش بە خەندەکەی سەر لێوانییەوەی دیاربوو، کورد وتەنی (بزکەی سمێڵی دەهات)، پێشمەرگەیەکی دێرینی (یەنەکە) کە میوانی کۆنگەرەکە بوو بە رۆژنامەوانەکانی دەوت (**هەروەکو هەمووجارێک ئایا پەدەکە قازانجی کرد یان گەل**).

## حیسابەکانی دوای کۆنگرەدا

لە کۆنگرەی (پەدەکە)دا راستییەکی زۆر هەبوون نەدەبینران، کارەکان ئەوەیان دەسەلماند ناکۆکی هەیە لەگەڵ هەواڵی ناو کۆنگرەکە. بێشک نەهێنانە زمانی ناوی (سەدام حوسێن) لە کۆنگرە لەلایەن (مەسعود بارزانی)یەوە تەسادوف نەبوو، بێگومان بوونی پەرلەمانتار و سیاسەتمەداری تورک و پیاوی دەوڵەتی تورک لەناو کۆنگرەکەی (پەدەکە) ئەمەیش تەسادوف نەبوو، هەروەها ئاڵۆزی نێوان (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)ش لە کۆنگرەکە رەنگی دابووەوە.

(پەدەکە) و (مەسعود بارزانی) بەهۆی ئەو جوگرافییەی تێیدا دەژیان و تێیدا باڵادەست بوون لەبارەی زۆر شتەوە ئاسانکارییان بۆ دەلوا و بەتایبەتی تورکیا لە زۆر حاڵەتدا ئیشی بە (پەدەکە) و (مەسعود بارزانی) دەکەوت، بێشک (مەسعود بارزانی)یش ئەمەی دەزانی هەربۆیە لە کۆنگرە زۆر بەجوانی دێڕی قسەکانی هەڵبژاردبوو. (مەسعود بارزانی) لە قسەکەیدا سەرنجی دەخستە سەر ئەو ئابلۆقەیەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بەسەر عێراقدا سەپاندبویان و باسی لە زیانەکانی تورکیا دەکرد و ئەوەشی دەوت سەرەڕای هەموو نارەحەتییەک توانیویانە بەپێوە بمێننەوە و دەشیوت دەبێت تورکیا هەوڵبدات بڕیاری ئابلۆقەی سەر عێراق نەهێڵێت. بێگومان دەوڵەتی تورک بەم قسانەی (مەسعود بارزانی) بەختەوەر بوون و ئەمە هەڵکردنی گڵۆپی سەوز بوو بۆ هەموو هاوکاری و هەماهەنگی و رێککەوتنێک لەگەڵ تورکیادا و تورکیاش ئەمەی دەزانی هەربۆیە بۆئەوەی رایگشتی ناوخۆی خۆیان تاقی بکەنەوە فەرمانیان دابوو بە دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکان ئەم قسانەی (مەسعود بارزانی) بکەن بە مانشێت.

نوسەرێکی رۆژنامەی (حورییەتی تورکی) بەناوی (ئەرتوغرول ئۆزتورک) لە گۆشەکەی خۆیدا نوسی بووی (بۆئەوەی نەوتی کەرکوک و ئیسکەندەرون زیانیان بەرنەکەوێت پێویستە بە زووترین کات پەمپی بۆرییە نەوتەکانی تورکیا نوژەن بکرێنەوە)، لەدوای ئەم نوسینە، وەزیری دەرەوەی تورکیا (حیکمەت چەتین) چاوی کەوت بە سەفیری عێراق بەناوی

(ئەلتكریتی) و پێشنیاری ئەوەی بۆکردبوو بەزووترین کات بۆرییە نەوتەکان بکەونەوە کار، بێگومان حکومەتی عێراقیش بەمە رازی بوو. باشە عێراق لە رێی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ئابلۆقەی ئابوریان بەسەریدا سەپێندرابوو ئەم کارەی چۆن دەکرد؟، بێشک چارەی ئەمەشیان دۆزیبووەوە. باشترین کار دەیانکرد بەتاڵ کردنی بۆرییە نەوتییەکانی کەرکوک و موسڵ بوو لەلایەن تورکیاوە، کە چەندین کم بوو، بەمشێوەیە تورکیا کوونی دەخستە بریاری ئابلۆقەی سەپێندراوی سەر عێراق کەلەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بریاری لەسەردرابوو، هەروەها تورکیا نەوتەکانی بۆخۆی دەبرد و بە جیهانیشی دەوت گوایە بۆرییە نەوتەکان پاکدەکاتەوە. ووتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی تورکیا (فەرهاد ئەتەمان) لە کۆبونەوەیەکی رۆژنامەوانیدا لەبارەی مژاری نەوتەوە هەندێک قسەی بۆ ئامادەبوان کرد، دەیوت نەوتەکانی ناو بۆرییەکان بێ کەڵکن و مەترسیدارن و ئەمەشیان بە نەتەوە یەکگرتووەکان وتووە، لەهەمانکاتدا نەتەوە یەکگرتووەکان بریاریاندا بوو عێراق دەتوانێت بەرێژەی (١٠٦) ملیار دۆلار نەوت بفروشێت. (فەرهاد ئەتەمان)لەم بارەیەوە دەیوت لەبارەی گواستنەوەی نەوت لەرێی تورکیاوە قسەیان لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان و وەزیری دەرەوەی عێراق (تارق عەزیز) کردووە، بەگوێرەی قسەکانی (فەرهاد ئەتەمان) بێت دەیانویست ئەو (٦٠)ملیار دۆلارە زیانەی بەهۆی ئابلۆقەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە تورکیا بینیوێتی بیگێرنەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت.

هەمان نوسەری رۆژنامەی (حورییەتی تورکی) لە نوسینێکی تریدا لە ٣ ی ئەیلولی (١٩٩٣) دەیوت (تورکیا بە رێککەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا و بە کونکردنی بریاری نەتەوە یەکگرتووەکان لەوانەیە نارەزایی ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی بەرامبەر بە خۆی زیاد بکەن، سەرۆک وەزیرانیش تانسو چیللەر لە مانگی تشرینی یەکەم بەنیازە گەشتێک بکات بۆ ئەمەریکا لەوانەیە لەم گەشتەیدا لەلایەن ئەمەریکا روبەڕوی نارەزایی توند ببێتەوە، ئەمریکایەک کە بیر لە روخانی سەدام حوسێن دەکاتەوە باوەشکردنەوەی تورکیا بۆ سەدام حوسێن لەوانەیە زیان لە بەرژەوەندییەکانی تورکیا بدات)، بەڵام بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک پێیانوابوو مانەوەی هێزی چەکوش لە تورکیا دەتوانن لەهەمبەر ئەمەریکا وەکو کارتێکی فشار بەکاری بهێنن.

وەزیری بازرگانی عێراق (مەهدی ساڵح) کە بۆ کۆبونەوەیەکی بازرگانی هاتبوو بۆ ئیستەنبوڵ دەیوت (**ئەگەر هەناردەی نەوتی کەرکوک بخرێتە بواری کردارییەوە قەوارەی**

**بازرگانیمان لەگەڵ تورکیا دەگاتە ١٠ ملیار دۆلار)**، دۆلارە چەورەکانی ناو بۆرییە نەوتەکان بۆ تورکیا وەکو دەرمان وابوون، بەهۆی شەڕی سەرتاسەری دەوڵەتی تورک بەرامبەر بزاڤی کورد ئابوری تورکیا تێکڕا هەرەسی هێنابوو، بێگومان عێراق و باکوری عێراقیش رەوشی داراییان لە تورکیا باشتر نەبوو. ئەنقەرە لەم حیسابوکیتابەیدا لەگەڵ عێراق حیسابی بۆ باشوری کوردستان نەکردبوو، لەم کاتوساتەدا ئەمەریکا ئامادەنەبوو تەنانەت گوێی لە ووشەی لادانی ئابڵوقەش ببێت. سەرۆک وەزیرانی تورکیا (تانسو چیللەر) لەسەردانەکەی بۆ ئەمەریکا بە فەرمی نارەحەتییەکانی خۆیانی بۆ رایەدارانی ئەمەریکا هێنابووە زمان، دەوڵەتی تورک دەیانویست ئەمەریکا قەرەبوی زیانی ٢ ملیار دۆلارەکەیان بۆ بکاتەوە کەبەهۆی ئابڵوقەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە تورکیا گەیاندرابوو بەڵام ئەمەریکا تەسبیحی بۆ بادابوون.

لەهەمان قۆناغدا بەرپرسیارانی شۆڕشی فەلەستین لە ئوردن لەگەڵ حکومەتی ئیسرائیل سەرقاڵی دیدار بوون، دەیانویست لەبارەی مافی ئۆتۆنۆمییەوە بگەنە ئەنجام. بەگوێرەی چاودێرانی سیاسی دوای چارەسەرکردنی کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل لە رۆژهەڵاتی ناوین نۆبە دەهاتە سەر کێشەی کورد.

هەموو ئەمانە ئایا چی پەیوەندییەکیان بە کۆنگرەکەی (پەدەکە) وە هەبوو؟، بێگومان هەبوو. تورکیا دەیویست لەڕێی (مەسعود بارزانی)یەوە نەوتی کەرکوک لە رێی دهۆک و زاخۆوە بگوازێتەوە بۆ تورکیا و لەوێوە بۆ جیهانی بگوازێتەوە، هەربۆیە خودی (مەسعود بارزانی) و (پەدەکە)ش بۆ تورکیا کلیلی کردنەوەی زۆر دەرگای داخراوبوون، هەربۆیە تورکیا پێویستیان بە (مەسعود بارزانی)بوو، بەمشێوەیە هەرسێ کەسەکە واتا (تانسو چیللەر، سەدام حوسێن و مەسعود بارزانی) لەبارەی داهات و قازانجی نەوتەوە رێککەوتبوون. ئەوەی خۆی بەم کەینوبەین و ناوبژیوانییەوە سەرقاڵ کردبوو پێشک پاشای ئوردن (مەلیک حوسێن) بوو، لەکاتی قسەوباسی بۆری نەوتەکاندا مەلیک حوسێن گەشتێکی بۆ ئەنقەرە ئەنجامدا و پەیام و پێشنیاری سەدام حوسێنی بۆ دەوڵەتی تورک هێنابوو. دەوڵەتی تورک دەبوایە لەنێوان (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی)دا هەڵبژاردنی بکردایە، دوایی دەرکەوت سوربونی (مەسعود بارزانی) لەسەر هێرشکردنە سەر (پەکەکە) و باسنەکردنی زوڵمی سەدام حوسێن لە کۆنگرەکەیدا بێ هۆکار نەبووە، هۆکاری ناردنی وەفدی نهێنی بۆ بەغداد لەلایەن

مەسعود بارزانی بێشک هۆکارەکەی نەوت بوو. دوای ماوەیەک لە باشوری کوردستان هەڵبژاردنی پێش وەختە ئەنجام دەدرا، هەربۆیە تورکیا و بەغداد هەوڵیاندەدا مەسعود بارزانی و پارتەکەی براوەی یەکەم بن و بەمشێوەیە کێشەیەکی زیادەی وەکو جەلال تاڵەبانییان لەکۆڵی خۆیان دەکردەوە. ئەگەر (مەسعود بارزانی) بیتوانایە سەرکەوتوی یەکەمبوایە لەگەڵ ئەنقەرە و بەغداد بەباشی ڕێکدەکەوت و هەردوکیشیانی بە هاوسێی باش دەهێنایە زمان، بەڵام ئەمەریکا ئاگەداری هەموو کەینوبەینەکان بوو، هەربۆیە هەندێکجار ناچاردەما چاوسورکردنەوەیەک لە مەسعود بارزانی و لە تورکیاش بکات. تورکیا و بەغداد دەیانویست چارەنوسی بۆرییە نەوتەکانی عێراق بخەنە ناو مشتی مەسعود بارزانییەوە کە ئەمەش لەئاکامی ڕێککەوتنێکی نهێنی ژێربەژێر هاتبووە ئاراوە، ئەگەر کاتیش هەبوایە لایەنەکان لەناو خۆیاندا ڕێککەوتنێکی وایان جێبەجێ دەکرد.

بێگومان کاریگەری و تایبەتمەندێتی ئەم کۆنگرەیە هەرئەوەندە نەبوو، لەهەمان کاتوساتدا رایەدارانی دەوڵەتی تورک کەسانی وەک (ئەشرەف بیتلیسی و ئەتەمان ئۆرگ و ئایدن ئیلکەر) لەگەڵ (مەسعود بارزانی)دا دیداریان ئەنجامدا. نوسەری ڕۆژنامەی (حورییەتی تورکی) ئەرتوغرول ئۆزتورک دەیوت ئەوەی مایەی نیگەرانی رایەدارانی دەوڵەت بووە لەگەڵ مەسعود بارزانی و باسیان لێوەکردووە و مایەی ئەندیشەیان بووە هێناویانەتە زمان، ئەوەیش پەیوەندی بە کاروبارەکانی بەرەی نەتەوەیی کورد بووە کەلەوانەبوو دوای قوناغی ئاگربەست لەنێوان کوردی باشور و باکوردا ئەم یەکێتییە بێتە ئاراوە. (ئایدن ئیلکەر) تکای لە (مەسعود بارزانی) کردبوو ڕێگری لەم گۆڕانکارییە بکات، بێشک ئەم کاریگەرییە لەدوایدا دەردەکەوت، خودی (مەسعود بارزانی)یش لەم یەکێتییەی ناو کوردانی باکور خۆشحاڵ نەبوو، بێشک بانگکردنی ڕێکخراو و پارتەکانی باکوری کوردستان بۆ کۆنگرەکە جگە لە (پەکەکە) کە ئەمەش خۆیلەخۆیدا ئاماژەیەک بوو. ئەو ڕێکخراو و پارتانەی باکور کە باسیان لە بەستنی کۆنگرە و یەکێتی نەتەوەیی کوردیان دەکرد لە ئاستی ناو کۆمەڵگا و لەچاو (مەسعود بارزانی)شدا کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو، هەمویان لەلایەن (مەسعود بارزانی)یەوە دەتوانرا بە ئاسانی دەمکوت بکرێن، ژەنراڵ (ئایدن ئیلکەر) بەتەواوەتی بە پەنجەی خۆی مەلاژووی (مەسعود بارزانی) هەڵدابووەوە.

## (دوا ئاگەدارکردنەوەی پەدەکە)

ئالۆزی و گرژییەکانی باشوری کوردستان بۆنی شەڕێکی نوێی (**براکوژی**) لێدەهات. لەو کاتەی کۆنگرەی (پەدەکە) بەردەوام بوو، سەرۆکی (پەکەکە) (عەبدوللە ئۆجالان) لە دیمانەیەکیدا لەگەڵ رۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم) لەبارەی ئالۆزی و پێشهاتەکانی باشوری کوردستان قسەی کرد و دەیوت (رێککەوتنی نێوان ئێمە و حکومەتی هەرێم کەلە ۱۹۹۲/۱۰/۳۰ هاتە ئاراوە رێککەوتنێکی بەرژەوەندی بووە و بەردەوام بونیشی پەیوەستە بە مەرجی جیاوازەوە) لەمبارەیەوە عەبدوللە ئۆجالان دەیوت :

**(مەرجی سەرەکی ئێمە ئەوەیە پەدەکە لەگەڵ سوپای تورک هێرشی سەر ئێمە نەکات، دەیانەوێت بەدرێژایی سنور شریدێک لە بنکە و بارەگای پێشمەرگە و جەندرمە دروست بکەن، ئەمە مایەی قەبولکردن نییە و ئێمە ناهێڵین وەلاتەکەمان بە چەقۆی دوژمن لەتبکرێت. مەخابن دەیانەوێت عەشیرەتی بارزان بەرامبەر بە ئێمە بدەن بە شەڕ، بنەماڵەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی تورک دەستیان تێکەڵ کردووە و لەدژی بزاڤی ئێمە دەجەنگن. بەداخەوە کەسانی وەلاتپارێز و دیموکراتیخواز دەکوژن، پێویستە کۆتایی بەمجۆرە کارانە بهێنن. ئەگەر لەبارەی ئەم رووداوانە گۆڕانکارییەکی بنگەیی هەبوایە ئەوا بێشک رێککەوتنی بەرژەوەندی دەگۆڕدرا بۆ رێککەوتنێکی ریشەیی ئاشتیخوازانە، بەلام مەخابن هێشتا لەم بارەیەوە هیچ تروسکاییەک بەدیناکرێت. ئەوان خۆیان دەڵێن بەنیازن پەرەبە پەیوەندییەکانیان بدەن لەگەڵ تورکیا و ئەوروپا، ئەوان بەنیازن گەریلاکانی ئێمە لە بۆتان و کوردستان دەربکەن و پارتێکی تەزویر لە شوێنی ئێمە دابمەزرێنن. بۆئەم کارەش لە تورکیا هەندێک دۆستیان هەیە پشتی پێدەبەستن، هەندێک پەیامیمان پێدەگات گوایە پەیامی دۆستانەیە بەلام لە پراکتیکدا وانییە. ئێمە دەتوانین چاوەڕێی گۆڕانکارییەکان بکەین، ئەگەر ئەوان بەردەوام بن لەسەر ئەم سیاسەتە ترسناکەی خۆیان، بێگومان روبەڕوی هەمان بەرخودانی پێشوی گەریلاکانمان**

دەبنەوە. بۆئەم مەبەستە ئامادەباشیشمان هەیە، یان ئەوان دێنە سەر خەتی سیاسەتێکی وەلاتپارێزی و کوردپەروەرانە و دیموکراتخوازیانە یان روبەڕوی بەرخودانی ئێمە دەبنەوە، ئەمە دوا بڕیاری ئێمەیە. وەکو جاران ئەمەریکاش لە عێراق بەهێز نییە، ئەوان ئەو هەلومەرجەی جارانیشیان نییە رێککەوتن بەسەرماندا بسەپێنن، ئەوان پێیانوایە هێزیان هەیە و دەتوانن پەکەکە لەناوبدەن کە ئەمە خەیاڵێکی خاوە. وەکو وتم پێیانوایە ئێمەیان پێ لەناو دەدرێت و لەشوێنی ئێمە پارتێکی ساختە دروست دەکەن و مەسعود بارزانیش رابەرایەتی ئەو پارتە دەکات. ئێمە ئاگەدارین ماوەی ٥ بۆ ٦ ساڵێکە سەرقاڵی ئەم پیلانەیانن. سەرەتا پێیانوابوو دەتوانن بە ئاسانی ئەم کارەیان جێبەجێ بکەن، کەزانیان لەم کارەیان سەرکەوتو نابن مەخابن هەندێک بەکرێگیراو و خائینیان هێنایە ئاراوە. ئێمە دەڵێین دەبێت پەدەکە دەستبەرداری هاوکاریکردنی دوژمنان ببێت، ٤٠ ساڵی هەڵە و خیانەتەکانی پارتەکانی باشور شۆڕش و گەلی کوردی لە باکور بەگیرهێنا و خەساندی. ماوەیەکە پەدەکە بەگژماندا دێت و لەسایەی ئێمە لەگەڵ دوژمناندا کاروباری دیبلۆماسی دەکەن، دژ بە بزاڤی کورد قیتدەبنەوە و لەم رێیەشەوە پارەیەکی زۆر قازانج دەکەن. لەسایەی دژایەتی کردنی بزاڤی کوردییەوە لەلایەن دوژمنانەوە رێزێکی زۆریان لێدەگیردرێت. ئێمە دەڵێین دەبێت دەستبەرداری ئەم کارانە بن، لە ئێران شۆڕشی کوردیان فرۆشت، لە عێراق فرۆشتیان، ئێستاش دەیانەوێت لە تورکیا شۆڕشی کورد بفرۆشن، ئەگەر دەستبەرداری ئەم کارانەیان نەبن کۆتاییان پێدێت)[247].

---

[247] ٢٨ی گوڵانی ١٩٩٢ دیمانەی (محەمەد نوغوز) لەگەڵ (عەبدوڵە ئۆجەلان) رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

## ژەنەڕاڵەکانی تورک لە هەولێر

ژەنڕاڵ (ئایدن ئیلکەر) کەلە شوێنی (ئەشرەف بیتلیس) هاتبووە سەرکار، بەردەوام لەگەڵ سەرکردەکانی باشور دیداری ئەنجام دەدا و بەردەوامیش هەر لەوانەوە لەبارەی جموجۆڵەکانی (پەکەکە)وە زانیاری وەردەگرت. هەمان ژەنڕاڵ لە ١ی ئەیلول چوو بۆ هەولێر و چاوی بە (مەسعود بارزانی) کەوت و (مەسعود بارزانی) لەچاو (جەلال تاڵەبانی) راشکاوانە تر قسەی بۆکردبوو. بەهۆی هەڵوێستە دوژمنکار و ناحەزییەکانیانەوە بەرامبەر بە (پەکەکە)، (مەسعود بارزانی) و (پەدەکە) لە تورکیا خۆشەویست ببوون، بەڵام نەدەکرا هەمانشت لەبارەی (جەلال تاڵەبانی)یەوە بوترێت. نوسەرێکی تورک بەناوی (تەها ئەکیۆڵ) لە هەواڵێکیدا لە رۆژنامەی (میللییەتی تورکی) کەلە ٦ی ئەیلول بڵاوببووەوە لەبارەی دیداری ژەنڕاڵ (ئایدن) لە باشوری کوردستان دەیوت (لە دیدارەکاندا جەلال تاڵەبانی بۆئەوەی باوەڕی خۆی لە تورکیا بەدەست بخاتەوە باسی چۆنییەتی رێزگرتن لە تورکیای کردووە و باسی ئەوەشی کردووە کەچۆن دژ بە تیرۆر بونەتەوە).

دوای ئەوەی ئاگر بەستی یەکلایەنەی (پەکەکە) کۆتایی پێهات سوپای تورک شەڕوپێکدادانەکانی زیاتر چڕکردەوە. تورکیا پێشوتر بڕیاریدابوو بڕی ١٣ ملیۆن دۆلار هاوکاری باکوری عێراق بکات و لە سەرەتای ساڵدا بڕیاریاندا بیکەنە بواری جێبەجێکردنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش وەفدێکی حکومەتی تورکیا بە سەرپەرشتی یاریدەدەری راوێژکاری وەزیری دەرەوەی تورکیا (ئولوچەلیک) لەبارەی چۆنییەتی خەرجکردنی ئەو بڕە پارەیە لە ٨ی ئەیلول هات بۆ باشوری کوردستان تاکو چاویان بە بەرپرسی لایەنە کوردییەکان بکەوێت. ئەم هاوکارییانە پێکهاتبوون لە خواردن و دەرمان و پێداویستی پەروەردە و بۆ ئەم مەبەستەش لە باشوری کوردستان عەمباریان دامەزراند.

ئەم وەفدەی تورکیا کەبە سەرۆکایەتی (ئولوچەلیک) بوو لەگەڵ خۆیدا (موحسین دزەیی) هێنابوو کە کاتی خۆی سەفیری عێراق بووە لە (پراگ) و هەروەها وەفدێکی پارتی میللی

تورکمانی عێراقیشیان لەگەڵدابوو. (ئولوچەلیک) هەتا رۆژی ١١ی ئەیلول لە باشوری کوردستان مایەوە، (ئولوچەلیک) کە کەسێکی سەربازیش بوو بە پلەی ژەنراڵ جارێکی تر لە مانگی نیسان گەڕایەوە بۆ باشوری کوردستان. لە گوندی (بارزان) بە دهۆڵ و زورنا پێشوازیان لێکرد، ئەمجارەیان لە هەولێر لەلایەن لایەنە کوردییەکانەوە پەیمانی بەهێز تر و باشتری وەرگرتبوو کە باشتر شەڕی (پەکەکە)یان بۆدەکەن.

ئەوەی راستی بێت ئەم هاوکارییەی تورکیا بۆ باشوری کوردستان بە گرانی بەسەریاندا ساغ دەبووەوە، ئەوەی تورکیا بەرامبەر بەم هاوکارییە لە دەسەلاتی باشوری دەویست بێشک رژانی خوێنی برا بوو بە دەستی برا ، واتا (**براکوژی**).

## هەرلایەو کوردی خۆی بۆردۆمان دەکات

دوای گەشتەکەی ژەنراڵ (ئولوچەلیک و ئایدن ئیلکەر) لە ١٤و١٥ی ئەیلول فرۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک باشوری کوردستانیان بۆردۆمان کرد، لەم بۆردۆمانەدا لە گوندی (بێزنۆر) و دەوروبەری (٣) گوندنشین کوژران و هەروەها لە (١٦)ی ئەیلولیش گوندی (تینەختە، ئەلامشی و گەلیەپساغا)ی سەربە کانیماسی بۆردۆمان کران، لەم بۆردۆمانەدا خانوویەکی زۆری گوندەکان ویران بوون، نزیکەی (٢٠) سەر مەڕ تەلەف بوون، لەهەمانکاتیشدا تۆپخانەکانی سوپای عیراق تۆپبارانی گوندەکانی ناوچەی شوان و گەرمیانیان دەکرد، هەروەها پاسداری ئێرانیش گوندی (هاوبەر، کانی داروهان و شیرزات)یان بۆردۆمانکرد، بەمشێوەیە سوپاکانی فارس و عەرەب و تورک هەریەکەیان بەهۆکاری جیاواز بەیەکەوە و لەیەککاتدا کوردییان بۆردۆمان دەکرد.

هاوکارییە (١٣) ملیۆن دۆلارییەکەی تورکیا بۆ باشوری کوردستان لە ٢٣ی ئەیلول یەکەم بەشی گەیشت و ئەم هاوکارییە بەری گرت و (پەدەکە) و (مەسعود بارزانی) نەیانویست لەژێر باری ئەم هاوکارییەی تورکیا قەرزبار بمێننەوە و بۆئەوەی سوپاسگوزاری خۆیان بەرامبەر ئەم هاوکارییە دەرببڕن پێشمەرگەکانی (پەدەکە) هاوشانی جەندرمەکانی تورکیا لە ئاوەشینی (شەمزینان) و ناوچەکانی (چارچەل، گۆڤەندە و گەلییە باسیا) هێرشیان بۆ سەنگەرەکانی گەریلا برد.

لە ٢٠و ٢٥ی ئەیلول شەڕوپێکدادان جارناجارێک دەهاتنەوە ئاراوە و ئەو پێشمەرگانەی بریندار ببوون بە کۆپتەر گواسترانەوە بۆ نەخۆشخانەکانی هەککاری. (پەدەکە) لە سەردەمێکی نوێدا ئەرکی نوێی بۆ دەوڵەتی تورک لە ئەستۆ گرتبوو، بەمشێوەیە (پەدەکە) تەنها لەناو خاکی باشوری کوردستان نا بەڵکو پێشمەرگەکانیان دەنارد بۆناو خاکی تورکیا

و شەڕی گەریلاکانی (پەکەکە)یان پێدەکردن. نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) دەیوت (**پێشمەرگەکانی ئێمە بەشدارییان لە ئۆپەراسیۆنەکانی ناو تورکیا نەکردووە!**)[٢٤٨].

بەمشێوەیە ئیتر نەدەکرا نکۆڵی لە ئۆپەراسیۆنی هاوبەشی سوپای تورک و پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بکرێت، تەنانەت دوای ماوەیەک لە ئەنجامدانی ئۆپەراسیونە هاوبەشەکان بەرپرسێکی باڵای حکومەتی هەرێم دانی بەو راستییە هێنا.

لەسەرەتای یەکەم رۆژانی مانگی تشرینی یەکەم لە نزیک گوندی (دەشتە تەخی) لە بادینان سوپای تورک و پێشمەرگە بەیەکەوە ئەو هێرشانەی لەهەمبەر سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە) ئەنجامیاندابوو، لەئاکامی هەموو ئەم هاوکاری و بەشداربونەی پێشمەرگە و ئەم پیاوەتییانەی (پەدەکە) لەگەڵ دەوڵەتی تورک کەچی نەدەزانرا چی حیکمەتێک بوو تەنها گوندەکانی باشوری کوردستان زیانیان دەبینی و بۆردۆمان دەکران، لەئاکامی بۆردۆمانەکاندا ژنێکی (٥٠) ساڵە بەناوی (شەمی گورگیس) خەڵکی گوندی (سناتی) کە کلدانی بوون کوژرا و هەروەها کەسانی کلدانی تری وەک (سەلاح هانا، سەلیم میکائیل، یوسف ئیشۆ، روڤەل قوتۆ و بونیامین قوتۆ) بریندار ببوون، ئەم برینداارانەیان گواستبووە بۆ نەخۆشخانەی ئازادی لە (دهۆک). شاهید حاڵەکان دەیانوت دوای بۆردۆمانەکان ئەفسەرە تورکەکان هاتوون بۆ گوندەکەیان و پێیانوتوون (**ئێوە هەمووتان تیرۆریستن**)[٢٤٩].

ئەم کردەوانەی ئەفسەرە تورکەکان کەلە باشوری کوردستان دەیانواند ببووە مایەی نارەزایی یەکێک لە بەرپرسە ئاسایشەکانی زاخۆ کە سەر بە (یەنەکە) بوو بە ناوی باران، لەم بارەیەوە باران دەیوت (**بۆردۆمانکردنی گوندەکان کارێکی نامرۆڤانەیە، ناوچەیەک ١٠٠کم بارەگای پێشمەرگەی لێبێت و لەژێر دەسەلاتی پێشمەرگەدا بێت پەکەکە لەوێ چیدەکات، هەموو کەسێک دەزانێت گەریلاکانی پەکەکە لەو ناوچانەدا نین، دەوڵەتی تورک هەربە نێرەکەری سنورەکانمانیان بەزاندووە**)[٢٥٠].

سوپای تورک هەرلە دێرزەمانەوە بەدوای کەلێنێک دەگەڕان لە هەرێمی بادینان خویان جێگیر بکەن، سەرەڕای ئەوەی زوو،زوو ئەم داخوازییانەیان لەلای سەرکردەکانی باشوری

---

[٢٤٨] ٢٥و ٢٨ی ئەیلولی ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

[٢٤٩] ٣ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە

[٢٥٠] ٣ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ هەمان سەرچاوە

کوردستان باسکردبوو بەلام بەهۆی نارەزاییەکانەوە ئەمەیان بۆنەدەچووەسەر. بۆ بەدەست خستنی ئەم ئامانجەی خۆیان زوو،زوو ناوچەکانیان بۆردۆمان دەکرد و دەیانویست خەلکی بێزار بکەن و ناوچەکانی خۆیان چۆلبکەن و ناوچەیەکی سەربازی بەرفراوان دروست بکەن. ئەم بۆردۆمانە چڕانەی سوپای تورک دەستیان پێکردبوو لە هەفتەی یەکەم و دووەمی مانگی تشرینی یەکەم زیانێکی زور لە گوندەکانی هەردوو بەشی باکور و باشوری کوردستان کەوت، ([٢٥١])، گوندنشینێکی زۆری گوندەکانی باکوری کوردستان مالوحالی خۆیان جێهێشت و گواستبویانەوە بۆ (زاخۆ، بارزان، دهۆک و ئامێدییە)، پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقیش (پەدەکە) ١٢ گوندی سنورەکانی خۆیانی چۆلکرد کە زۆربەیان گوندەکانی سەر بە ناوچەی (مەتینا) بوون.

ئامانجێکی سەرەکی دەولەتی تورک هەبوو لە هەرێمەکەدا کە هەر لە سەرەتای سالی (١٩٩٢)وە دەستیان پێکردبوو ئەویش ئەوەبوو خەلکی دژ بە (پەکەکە) بوروژێنن و بە ئاشکرا و بە نهێنی بە خەلکیان دەوت (لەبەرئەوەی پەکەکە لێرەن ئێمەش بۆردۆمانتان دەکەین و ئەگەر دەریان بکەن ئێمەش هیچتان لێناکەین). هەرلە سەرەتای سالی (١٩٩٢)شەوە (جەلال تالەبانی و مەسعود بارزانی) کەچی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد (پەکەکە) بەزۆر ئەو گوندانەیان بە خەلکی چۆلکردووە، ئەم بۆردۆمانە چڕانەی دەولەتی تورک روو لە ناوچەکانی باشوری کوردستان ئەوەندە دڕندە و بێ بەزیانە بوون تەنانەت (سەفین دزەیی)یش مەحکومی دەکرد، (سەفین دزەیی) لەبارەی ئەم رووداوانەوە کە قسەیشی نەیدەخوارد و ئەوەندەی تورێکی قوراویش بایەخی نەبوو لە روونکردنەوەیەکیدا بۆ ئاژانسی (رۆیتەرس) بانگەشەی ئەوەی دەکرد لەئاکامی بۆردۆمانەکانی تۆپ و فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک بەگشتی (٩) هاولاتی سڤیل کوژراون کە (٤) یان ژنن و (٧) هاولاتی تریش بریندار‌بوونە، (سەفین دزەیی) دەیوت بۆردۆمانەکان روو لە گوندەکانی عەشیرەتی نێروەیی ئەنجام دراون

---

[٢٥١] گوندەکانی سنور کەبەهۆی بۆردۆمانەکانەوە بەشێکی زۆری چۆلکرا، پێکهاتبوو لە گوندەکانی وەک ( سێدار، کاوێ، بێتکار، بالەکا، گێی، ئافارکە، تالخیستە، بەربییە، سەزاری، تیروانیش، بیراودا، خەدەنە، سەرزۆرە، ماوە، دەشەر، ئەدیتێ، دانیشکێ، بەدوهێ، یورێ، گەلێک، باتونێی، سومالێی، خاتێ، دوێی، بینافێی، کانیسارکە، دودەلە، باتوزە، خوشخاشا، راڤینە، تورماداویدا، ئورمانە، ئاسۆهێ، یەکمالە، مەکچیا، خەسێ، خیراباش، شەلازێ، گولکە، دێگەلە، نیسکا، کانی ماسی، بایسیا، بازێ، بارژانە، سەفەریە، جیددیکە، بێکۆکێ، دەرکەلێکە، تیشەسێ، ئاخاسوریا، خرورە، کالکا، ئاقاچەلکا، گەرگونێ، باپیرا، بیریڤا، چەقەلە و هەنووێ) .

كە بەرامبەر چوكورجە و سناتی باكوری زاخۆیە، لەبارەی ئەو ڕووداوانەوە (سەفین دزەیی) دەیوت **(پەیوەندیم بە بەرپرسیارانی حكومەتی توركیاوە كرد و پێیانم وت لەبارەی پێشهاتەكانەوە هیچ خۆشحاڵ نین، چاوەڕێی ڕوونكردنەوەی فەرمی دەكەین، هەروەكو پێشوتریش هێنابومانە زمان لە ناوچەكەماندا پەكەكە بونیان نییە، بێگومان نكوڵی لەوە ناكەین گرووپی گەڕۆكیان هەیە لە ناوچەكە و جەولە دەكەن، بەڵام ئێمە هەوڵ دەدەین بیانخەینە ژێر كۆنترۆڵی خۆمانەوە، ئەم هێرش و پەلاماربیانە هیچ سودێكیان نییە، تەنها خەڵكی سڤیل زەرەرمەند دەبن)**.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمان بوو هێرشەكانی سوپای تورک و بۆردۆمانەكانیان بەهاوكاری پێشمەرگەكانی پارتەكەی (سەفین دزەیی) ئەنجام دەدران. لەهەمان ڕۆژاندا وتە بێژێكی سەربازی سوپای تورک لەبارەی بۆردۆمان و گۆڕانكارییەكانەوە بە ئاژانسی (ڕویتەرس)ی دەوت (شوێنی حەشارگاكانی تیرۆرسیتانمان بە هەدەف گرتووە)، بەمشێوەیە دەردەكەوت حكومەت و ڕایەدارانی تورک قسەكانی (سەفین دزەیی)یان بە جدی وەرنەگرتبوو. لە هەمان ڕۆژاندا ڕۆژنامەكان قسەیەكی سەرۆک وەزیران (تانسو چیللەر)یان بڵاوكردەوە كە وتبووی **(ئەگەر پێویست بكات جارێكی تر ئۆپەراسیۆنی ئەو دیو سنور ئەنجام دەدەینەوە)**، دوای ئەم لێدوانەی (تانسو چیللەر) فڕۆكە جەنگییەكانی سوپای تورک جارێكی تر ناوچەكەیان بۆردۆمان كردەوە.

لە ٥ی مانگی تشرینی یەكەم لە چواردەوری دەشتان (ئوزوملی) سەربە (چوكورجە) لە نزیک (كانیماسی) لە نێوان گەریلاكانی (پەكەكە) و سوپای تورک شەڕوپێكدادان هاتە ئاراوە كە بە سەدان پێشمەرگە بەشداریان تێداكردبوو، لەم شەڕانەدا (٦) پێشمەرگەی (پەدەكە) و (٤) سەربازی تورک كوژران و (١٨) سەربازیش بریندار بوون هەروەها (٢) گەریلاش ژیانیان لەدەستدا. پێشمەرگە بریندارەكان بە كۆپتەر گواسترانەوە بۆ نەخۆشخانەی هەككاری. بەگوێرەی والی هەرێمی نائاسایی و قەدەغەكرا لە ناوچەی (سنات)، (٤) گەریلا كوژراون.

لەم هێرشانەدا فڕۆكە جەنگییەكانی سوپای تورک جۆری (ف١٦) و كۆپتەری كۆبرا بەشداریان تێداكرد و دەوروبەری گوندەكانی وەک (چیمەنلی، ئوزوملی، چنارلی، كاڤاكلی، كاڤشاک، چایەرلی و ئیشكلی) سەر بە (چوكورجە)یان بە خەستی بۆردۆمان كرد. دانیشتوانی گوندی (چیمەنلی) دەیانوت گوندەكەیان زیانێكی زۆری لێكەوتووە و هەروەها دەیانوت

(هەفتەیەک لەمەوبەر ئۆپەراسیۆنەکە بە هاوکاری پێشمەرگەکانی پەدەکە دەستی پێکردووە و پێداویستی سەربازی بۆ باشوری کوردستان بەڕێدەکەن و کاتێک بینیمان گوندەکانی باشوری کوردستان بۆردۆمان دەکرێن خەڵکی حیسابی خۆیان کرد و سەرەڕای ئامادەکارییەکانیشمان ٨ ماڵ لە گوندەکە زیانیان بەرکەوت و نزیکەی ٢٠٠ سەر مەڕیشمان لەناو چوون).

لەهەمان رۆژاندا گوندەکانی (گۆچکە و فەراشین)ی سەر بە شارۆچکەی (بەیتولشەبابی) سەربە (شڕناخ) لەلایەن فرۆکە جەنگییەکانی تورکەوە بە خەستی بۆردۆمان کران، لەم بۆردۆمانەدا کەسێک بەناوی (خورشید یالچین) کە (٢٨) ساڵ بوو لەگەڵ ژنێک کە ناوەکەی نەدەزانرا کوژران، هەروەها (٤) کەسی تریش بریندار بوون.

جەندرمەکانی سوپای تورک لە سنورەکانی (سلۆپی) تاکو (یوکسەکئۆڤە) واتا (گەوەر) جێگیربوون، سوپای تورک هەرشوێنێک شوێنی گومانیان بووایە کە لەوانەیە گەریلاکانی (پەکەکە)ی لێبێت و بیانویستایە خەڵکی چۆڵی بکەن بە خەستی بۆردۆمانیان دەکرد.

لە (٨)ی مانگی تشرینی یەکەم (٣) قاچاخچی بەناوی (سەدام، سەزیک و شەعبان) کە دەیانویست لە ئاوی (خابور) بپەڕێنەوە و بچن بۆ (سلۆپی) لەلایەن جەندرمەی تورکەوە کوژران و هەروەها لە رۆژی (١٥)ی هەمان مانگ خێزانێکی باشوری کە دەیانویست بچنە (سلۆپی)یەوە لەلایەن جەندرمەوە تەقەیان لێکرا و لەئاکامدا منداڵێکی (٥) ساڵییان کوژرا، لە مانگی ئاب و ئەیلولی ساڵی (١٩٩٣) نزیکەی (٣٠) باشوری کە دەیانویست بچن بۆ تورکیا روبەڕوی تەقەی جەندرمە ببوونەوە و لەئاکامدا هەموویان کوژران و لە روونکردنەوەیەکی فەرمی حکومەتی تورکیا ئەم کوژراوانەیان بە (تیرۆریست) لە قەڵەمدا.

سوپای تورک لە رۆژە جیاوازەکاندا روو لە باشوری کوردستان ئۆپەراسیۆنیان ئەنجامدا بوو، ئەمجارەشیان ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی دووەمیان دەستپێکرد. لەم ئۆپەراسیۆنەدا (٣) هەزار کۆماندۆ بەشداربوون، ئەم ئۆپەراسیۆنە ناوچەکانی (مازێ، مەتینا و ئامێدییە)ی گرتبووەوە، لەم ئۆپەراسیۆنەدا بە سەدان پێشمەرگە بەشداریان کردبوو، بە قوڵایی (٣٠) کم لەناو خاکی باشوری کوردستاندا گوایە بەشوێن حەشارگا و سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە) دەگەڕان.

ئەم ئۆپەراسیۆنە بە چاوساغی و بە ڕێبەرایەتی پێشمەرگەکانی (پەدەکە) بەڕێوە چووبوو، لەئاکامی ئەم ئۆپەراسیۆنەدا پێشمەرگە و جەندرمەکان لە بناری (ئاڤەشین و زاپ) دوو عەمباری گەریلاکانیان دۆزیبووەوە، یەکێکیان تەقەمەنی تێدابوو ئەویتریان ئازوقە، ئەم ئۆپەراسیۆنە بە فەرمانداریتی ژەنراڵ (عوسمان پەموکئۆغلو) دەستی پێکرابوو. پێشمەرگەکانیش بێ دەربەستانە پۆزیان دەدا بە ڕۆژنامە تورکەکان و حەزیان لێبوو وێنەیان بگرن و وەفای خۆیان بۆ دەوڵەتی تورک نیشان بدەن[٢٥٢].

فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک بەتایبەتی ناوچەکانی (ئاڤەشین و هەفتانین)یان بۆردۆمان دەکرد، لە (١٥)ی تشرینی یەکەم فڕۆکە جەنگییەکان گوندەکانی (ئامێدییە)یان بۆردۆمانکرد، لەئاکامی ئەم بۆردۆمانەدا دەیان کەس کوژران و بریندار بوون، لە ئاکامی بۆردۆمانە فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورک گوندەکانی وەک (شێروان و بێپۆ) وێران بوون، لە میانەی ئۆپەراسیۆنەکەدا زوو، زوو شەڕ لە نێوان پێشمەرگە، جەندرمە و گەریلاکانی (پەکەکە) دەهاتە ئاراوە، بەگوێرەی سەرچاوەکانی گەریلا لە نێوان ڕۆژانی ٨ بۆ ١٥ی مانگی تشرینی یەکەم لەو شەڕانەی بەتایبەتی پێشمەرگە تێیدا بەشدار بووە (٩) گەریلایان گیانی لەدەستداوە.

---

[٢٥٢] ٣ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ڕۆژنامەی (نوزگور گوندەم)

## سەفین دزەیی (لە ١٣ای مانگی تشرینی یەکەم هێرشمان لەنجامدا)

ئەو دیمەنە تازەیەی لە باشوری کوردستان بەدیدەکرا هەمان دیمەنی دووبارە بووەی ساڵێک لەمەوبەر بوو، بەڵام ئەمجارەیان کەمتر و جیاوازتر بوو لەهەمانکاتدا چڕوپڕتر بوو. پێشمەرگەکانی (پەدەکە) و جەندرمەی سوپای تورک لەئاستی هێرشکردنە سەر بنکە و سەنگەری گەریلاکانی (پەکەکە) بەهیچ شێوەیەک هەلیان لەدەست خۆیان نەدەدا، هێرشەکانی پێشمەرگەی (پەدەکە) لە ١ی مانگی تشرینی یەکەم لە (بادینان) دەستی پێکرد و خوێناویترین شەڕوپێکدادانیش لە ١٣ی تشرینی یەکەم هاتە ئاراوە.

گروپێکی پێشمەرگەی (پەدەکە) لە چیاکانی (مەتینا) هێرشیان برد بۆ گروپێکی گەریلای (پەکەکە)، لەئاکامی ئەم شەڕەدا بە گشتی (٢٤) فەرماندە و پێشمەرگەی (پەدەکە) کوژران [٢٥٣]،لەهەمانکاتدا فەرماندەیەکی تری (پەدەکە) بەناوی (فایەق هەرگوشی) لەڕێی کۆپتەری تورکییەوە لە ناوچەی (مێرۆز) کە دائەبەزێت بە فیشەکی گەریلاکانی (پەکەکە) دەکوژرێت.

ئەم شەڕوپێکدادان و ڕووداوانە کۆتایی سەرەتاییەکان بوون، لەدوای ڕووداوەکانی ١٣ی تشرینی یەکەم، (سەفین دزەیی) بۆ ئاژانسی (rueters) دوا و دەیوت (**بۆ دەرکردنی گەریلاکانی پەکەکە لە کوردستانی عێراق پێشوتر و ئێستاش واتا لە ١٣ی مانگەوە جموجۆڵمان دەست پێکردووە**)، بەمشێوەیە (سەفین دزەیی) دانی بە بوونی جموجۆڵەکان دەهێنا، نوێنەری (پەدەکە) سەفین دزەیی دەیوت سوورن لەسەر دەرکردنی پەکەکە لەسەر سنورەکانی تورکیا و ئەوەشی دەووت گەریلاکانی پەکەکە مەجبورن ناوچەکان چۆڵبکەن و ئەگەر چۆڵیشی نەکەن ناچارین بەزۆر دەریان بکەین و خوێنێکی زۆریش دەڕێژرێت.

---

[٢٥٣] ١٦ای تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

دزەیی لە قسەکانیدا باسی ئەوەی دەکرد (پەکەکە) لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیشیان کەمپەکانیان چۆڵکردووە، هەروەها (پەکەکە )ی بەوە تۆمەتبار دەکرد کە پێشمەرگەکانیان کوشتووە و پەلاماری گوندەکانیان دەدەن و رێککەوتنەکەی ساڵی رابوردویان هەڵوەشاندووەتەوە و دەشیوت لەوانەیە لە ناوچەکە (١٠٠) گەریلایەکیان هەبێت و بەنیازن ئەوانیش دەربکەن. کاتێک نوێنەری (پەدەکە) سەفین دزەیی دەیوت لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە حکومەتی تورکیامان ئاگەدار کردووەتەوە، هەروەها دەشیوت ئێمە لە تورکیا زیاتر مەبەستمانە هەرێمەکەمان بپارێزین. هێزەکانی پێشمەرگەی (پەدەکە) بەشێوەیەکی فەرمی دژ بە گەریلاکانی (پەکەکە) کرابوونە جوڵەوە، حکومەتی تورکیاش لەهەمبەر ئەم هاوکارییەی (پەدەکە) لە ١٠ی مانگی تشرینی یەکەم (٢٥٦) تەن خۆراک و خواردەمەنیان وەکو هاوکاری نارد بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان[٢٥٤].

ئەم هاوکارییەی تورکیا ببوو بە قەرزێک بەسەر کوردەوە بەهەر شێوەیەک بوایە دەبوایە کورد ئەم قەرزەی بدایەتەوە!.

لە ١٥ی مانگی تشرینی یەکەم (کانی یڵماز) نوینەری (ئەرنەکە)ی باڵی سیاسی (پەکەکە) لە ئەوروپا لەبارەی گۆڕانکارییەکانەوە روونکردنەوەیەکیدا کەلە چاپەمەنییەکانی تورکیاش بڵاوبووەوە، کانی یڵماز دەیوت (**پێشمەرگەکانی پەدەکە بەشداری لە ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک دەکەن، بێگومان بەرامبەر بە پارە ئەم کارە دەکەن، لەبەرئەوەی شارەزای ناوچەکەن رابەرایتی بۆ سوپای تورک دەکەن و کاریگەری خۆیشیان هەیە**).

کانی یڵماز دەیوت زۆرجار (پەدەکە)مان لەمبارەیەوە هۆشیار کردووەتەوە، هەروەها دەیوت لەهەمبەر سوپای تورک گەریلا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و لەمبارەیەوە دەیوت (**هێزی گەریلامان لەهەمبەر سوپای تورک خۆڕاگری دەکەن و لە هەندێک شوێنیشدا پێشمەرگەی پەدەکە کوژراون و تەنانەت یەکێک لە فەرماندەکانی پێشمەرگە کەلەناو کۆپتەری سوپای تورک بووە لەئاکامی تەقەی گەریلاکانمان پێککراوە و کوژراوە**).

---

[٢٥٤] ٣٠ تشرینی یەکەم ١٩٩٣ ( ئاژانسی ئانادۆڵو ) .

## پەدەکە ڕێککەوتنی ۱۹۹۲/۱۰/۳۰ هەڵدەوەشێنێتەوە

لە دوای هاتنەئاراوەی گۆڕانکارییەکان ئەو ڕێککەوتنەی حکومەتی هەرێم لەگەڵ (پەکەکە) کردبوویان کەلە (۱۹۹۲/۱۰/۳۰) هەردوولا واژۆیان کردبوو (پەدەکە) هەڵیوەشاندەوە [٢٥٥].
رۆژی (۱۹۹۳/۱۰/۱۵) بەرپرسیارانی ئاسایشی هەولێر چوونە سەر بارەگای (پەکەکە) لە گەڕەکی (عەینکاوە) و بە بەرپرسیارانی (پەکەکە)یان ڕاگەیاند ڕێککەوتنەکەی نێوانیان هەڵوەشێندراوەتەوە و پێویستە ئەم نوسینەگەیە چۆڵ بکەن. (پەدەکە) داوایان لە (پەکەکە) دەکرد هەموو بارەگاکانیان دابخەن و دەشبێت ئەو گەریلا زامدارانەی لە نەخۆشخانەکانن بە زووترین کات بیانگوازنەوە!
بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکە هەروەکو هەڵوەشانەوەی پرۆتوکۆڵی ساڵی (۱۹۸۷) دوای هاتنە ئاراوەی ڕووداوەکان هاتە ئاراوە و تاماوەیەکیش لە ڕایگشتی شاردرایەوە و بە فەرمی ئەمەیان ڕانەگەیاند. دوای ماوەیەک بە فەرمی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکە ڕاگەهێنرا، لە ڕۆژی ١٦ی تشرینی یەکەم ڕۆژنامەی (برایەتی) کە ئۆرگانی فەرمی (پەدەکە)یە ئەم هەواڵەی بڵاوکردەوە. لەسەر بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکە (یەنەکە)ش واژۆی کردبوو، جموجۆڵی گەریلاکان لەسەر سنور و هێرشی گەریلاکان بۆسەر پێشمەرگە وەک بیانوو هێنرابوونەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک باسیان لە هێرشەکانی (پەدەکە) نەکردبوو بۆسەر گەریلاکانی (پەکەکە). ئەم بڕیارە لەلایەن ئۆفیسی بەڕێوبەرایەتی ئاسایشی گشتی حکومەتی هەرێمەوە واژۆ کرابوو، ڕۆژنامەی (برایەتی) بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکەی بڵاوکردووە کە بەمشێوەیە بوو :

---

[٢٥٥] ١٧ی تشرینی یەکەم ١٩٩٣ ڕۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

**١/ گەریلاکانی پەکەکە لە ١٩٩٣/٧/٣ لە (مێرگەشین) گروپێک پێشمەرگەیان دیلکردووە و دەستیشیان گرتووە بەسەر چەکەکانیاندا.**
**٢/ لە مانگی ئەیلولدا گەریلاکانی پەکەکە ڕێگای گوندی سونێیان لە زەلێ داخستووە و ڕێگایان نەداوە گوندنشینەکان هاتوچۆ بکەن.**
**٣/ گەریلاکانی پەکەکە لە ١٩٩٣/٩/١٢ ڕێگایان نەداوە دانیشتوانی گوندی پێداو بگەڕێنەوە زێدی خۆیان.**
**٤/ گەریلاکانی پەکەکە لە ١و٢ی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٣ دەستیان گرتووە بەسەر ١٤٠٠ مەڕومالاتی گوندەکانی هەرکی و پێداوە.**
**٥/ لە ١و٢و٣ مانگی تشرینی یەکەم ١٩٩٣ فڕۆکە جەنگییەکانی تورک بەهۆی هاتوچووەکانی گەریلاکانی پەکەکە لەسەر سنورەکان گوندەکانی زاخۆ و دەوروبەریان بۆردۆمانکردووە و لەئاکامدا ٩کەس گیانی لەدەستداوە و ٢٠ کەسی تریش بریندار بوونە.**
**٦/ لە ١٩٩٣/١٠/١٢ لەناوچەی ئاکرێ (ئەحمەد خان عزەت) و (عەلی خان عزەت) کە هەردووکیان پێشمەرگە بوون لەلایەن گەریلاکانی پەکەکە وە رفێنراون.**
**٧/ لە ١٩٩٣/١٠/١٢ لە ناوچەی بارزان لە ئەنجامی بۆسەیەکی گەریلاکانی پەکەکە پێشمەرگەیەک بەناوی (فایەق هەرگوشی) کوژراوە و هەروەها چەند کەسێکی تریش بریندار بوونە.**

بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکە لەلایەن (پەدەکە)وە هەروەکو داخستنی هەفتەنامەی (دەنگی وەڵات— ڕۆژنامەی وڵات — وەرگێر) بە بڕیاری تایبەتی (مەسعود بارزانی) بوو کە (یەنەکە) هیچ کاردانەوەیەکی لەوبارەیەوە نەبوو، بەناچاری بە بڕیارەکانی (مەسعود بارزانی) رازی ببوون. ئەم بڕیارە گوایە بڕیارێکی هاوبەشی حکومەتە بەلام بەردەوام لەناو خۆیاندا ناکۆکییان پێوە دیاربوو. ئەندامی سەرکردایەتی (پەکەکە) نوعمان ئۆچار (ماهیر) کە لە شوێنی فەرهاد (عوسمان ئۆجالان) کرابوو بە فەرماندەی گشتی کەمپەکانی (پەکەکە) لە باشور، بەگوێرەی (ماهیر) (یەنەکە) بەهۆی داسەپاندنەکانی (پەدەکە)وە ناچارماوە واژۆ لەسەر ئەو بڕیارە بکات، لەمبارەیەوە (ماهیر) دەڵێت **(بەگشتی هەڵوێستەکانی یەنەکە خراپ نین، لەبارەی زۆر شتەوە پەدەکە زۆریان بۆدەهێنێت، یەنەکە دژی داخستنی ئۆفیسی نوێنەرەکانمان بوو، بەڵام پەدەکە ئەمە دەسەپێنێت، تەنانەت یەنەکە لایەنگری شەڕیش نییە،**

**بەگوێرەی ئەو هەواڵەی بەدەستمان گەیشتووە پەدەکە زۆر لە یەنەکە دەکەن پێشمەرگە بهێنن بۆ ناوچەکانی ئاڤاشین)**[٢٥٦].

بەرپرسیارانی (یەنەکە) زۆر بێدەنگانە تەماشای گۆڕانکاریەکان و بەتایبەتی گۆڕانکارییەکانی دوای ١٣ی مانگی تشرینی یەکەمیان دەکرد، بەرپرسیارانی (یەنەکە) زوو، زوو دەیانوت بۆ نەهاتنە ئاراوەی شەڕ ئەوەی لە دەستمان هاتبێت کردومانە، شەڕکردن لەگەڵ (پەکەکە) نامانگەهێنێتە هیچ ئەنجامێک، هەروەها دەیانوت پێویستە کێشەکان لەڕێی دیالۆگەوە چارەسەر بکرێن[٢٥٧].

بەرپرسیارانی (یەنەکە) نەیاندەویست ببن بە پارچەیەک لە شەڕی نێوان (پەدەکە و پەکەکە). (پەدەکە) پیلانی هەبوو (یەنەکە) بەدوای خۆیدا بەلکێشی ناو شەڕی (پەکەکە) بکات و بەیەکەوە پەلاماری (پەکەکە) بدەن. ئەوان دەیانزانی ئەگەر (یەنەکە) لەگەڵیاندا نەبێت ئەنجامێکی بەرچاو بەدەست ناخەن، (یەنەکە و پەدەکە) لە دەسەڵات و لەناو حکومەتدا شەریک بوون و لەبارەی شەڕی (پەکەکە) لە ١٨ی تشرینی یەکەم لە هەولێر کۆبونەوەیەکیان ئەنجامدا و لەئەنجامدا نەگەیشتنە هیچ رێککەوتنێک.

ئەو هاوکاری و هەماهەنگییەی لە (یەنەکە) چاوەڕوان دەکرا و (پەدەکە) بەدەستی نەدەخست ببووە مایەی نیگەرانی و نارەحەتییان، لەدوای گۆڕانکارییەکان بەتایبەتی لە بادینان (پەدەکە) زۆری بۆ (یەنەکە) دەهێنا هاوکاریان بکات چونکە لە دەسەڵات و لە حکومەتیشدا شەریکە بەش بوون.

لە ١٦ی تشرینی یەکەم لە گوندی (دەرکار) (پەدەکە) بەناوی ئەوەی گوایە هاوکاری (پەکەکە)ی کردووە پێشمەرگەیەکی (یەنەکە) دەست بەسەر دەکەن، دوای چەند کاتژمێرێک بەسەر ئەم رووداوەدا لەهەمان گوند بۆ رەددانەوەی ئەم کارەی (پەدەکە)، (یەنەکە) دەستی گرت بەسەر پێشمەرگەیەکی (پەدەکە). یەکێک لەو هۆکارانەی کۆتایی بە ئاڵۆزییەکانی نێوان (پەدەکە و یەنەکە) هێنا ئەوەبوو دوو فەرماندەی (پەدەکە) بەناوی (شڤان سندی و سلێمان

---

[٢٥٦] ١٧ی تشرینی یەکەم ١٩٩٣ گۆڤاری ( ئایدنلک )

[٢٥٧] ١٦ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم )

سندی)، ([٢٥٨]) لە ١٧ی تشرینی یەکەم بە خۆیان و ١٠٠٠ پیاوی خۆیانەوە چوونە ناو (یەنەکە)وە.

نوینەری (پەکەکە) لە هەولێر (حوسنی حاجۆ) بڕیاری هەڵوەشانەوەی ڕێککەوتن لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە بە (لاوازی) دەهێنایە زمان و دەیوت (**ئەم بڕیارە بەهۆی دۆڕاندن و سەرنەکەوتنەکانی ئۆپەراسیۆنەکانیانەوە هاتووەتە ئاراوە، ئەمە ئەنجامی بێچارەییانە**)، هەروەها حوسنی وەڵامی بیانووەکانی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتنەکەی دەدایەوە و لەمبارەیەوە دەیوت (**لە هەموو ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک لە ناوچەکانی میرۆز و ئاڤاشین و گۆفەندێ و ناوچەکانی تر پێشمەرگەکانی پەدەکە لە ریزی پێشەوەن و ئەتوانم بڵێم ژمارەیان لە ژمارەی جەندرمەکان زیاترن و بەشداری هەموو شەڕوپێکدادانەکانیان کردووە، وەکو دەڵێن گوایە پەکەکە زیانی بە پێشمەرگە گەیاندووە ئەمە ڕاست نییە، ئەو پێشمەرگانەی کوژراون و دیلکراون و بریندار بوونە هەموویان ئەوانەن کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەناو ئۆپەراسیۆنەکاندا جێگایان گرتووە، بێشک ئەوە دوورە لە ڕاستی پەدەکە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە گەریلاکانی ئێمە هێرشیان بۆ گوندەکان هێناوە، لە ڕاستیدا گوندەکانی هەرکی سەر بە باشور نین، ئەم گوندانە گوندی جاشەکانی شەمزینانن کەلە سنوری باکوردان، ماوەی مانگێکە ئۆپەراسیۆنی سوپای تورک بەردەوامە و پوچەڵکراونەتەوە، بانگەشەکانی بڕیاری هەڵوەشانەوەی ڕێککەوتنەکە ئاکامی ڕەوشی خراپبووی دەروونی دەسەڵاتی باشورە، ئەوکاتەی دەرگای ئۆفیسی نوێنەرایەتی ئێمە دادەخەن لەهەمانکاتدا لەژێر ناوی دروستکراو دەرگا بۆ ئۆفیسی میت دەکەنەوە، وەکو ئەوان دەڵێن لە سنورەکان کەمپی زەبەلاحمان نییە، بەشێوەیەکی گشتی گرووپەکانمان گەڕۆکن و لەهەموو لایەکی کوردستان گروپمان هەیە و کەمپێکی ڕاستەوخۆمان نییە بەڵام بەشێوەیەکی**

---

[٢٥٨] شڤان و سلێمان سیندی کەبەهۆی کێشەی ماسیەوە لە (پەدەکە) جیابوونەوە و چوونە ناو (یەنەکە)وە مۆڕاڵی ( پەدەکە) بەمە تێکچوبوو، بەرپرسی شاری دهۆک کە ( فازل مو×نی) بوو بە تێکچونی مۆڕاڵیان فەرمانی بە پێشمەرگەکانی خۆیان کردبوو لە زاخۆ لە ١٧ی مانگی تشرینی یەکەم گوندی دەرکار بڕوخێنن کە مەڵبەندی عەشیرەتی سیندی بوو، بەڵام پێشمەرگەکان گوێیان لەم فەرمانە نەگرت، (فازل مو×نی میرانی) لەسەر ئەم مەسەلەیە لە دهۆکەوە هێزی هێناو پێیانی وتبوو گوندەکە دەسوتێنێت، بەڵام ئەمەش سەری نەگرت، شڤان سیندی کەلە شەڕی باشوردا دژ بە پەکەکە شەڕی کردبوو هەروەها زەرەری گیانیشی لێکەوتبوو، دوای ماوەیەک بەرامبەر بە پارەیەکی زۆر جارێکی تر گەڕایەوە ناو پەدەکە .

**گشتی گروپەکانمان لە جەولەدان، ئەو خزمەتەی پەدەکە بە دەوڵەتی تورکی دەگەهێنێت بەهیچ شێوەیەک خزمەت بە گەلی کورد و باشوری کوردستان ناکات)**[٢٥٩].

فەرماندەکانی (پەکەکە) لە باشوری کوردستان دەیانوت لەو شەرە تازەیەی هاتوونەتە ئاراوە و یەخەی کوردی گرتووە تەنها دەوڵەتی تورک قازانجی لێدەکات، دەیانوت بەردەوام ویستوومانە خۆمان لەمجۆرە کارانە بەدوور بگرین، بەڵام (پەدەکە) رابەرایەتی بۆ سوپای تورک دەکات و هەموو رۆژێک بە بیانوی جیاواز...جیاواز هێرشی گەریلا و لایەنگرانمان دەکەن[٢٦٠].

لەگەڵ راگەیاندنی بڕیاری هەڵوەشانەوەی رێککەوتنی حکومەتی هەرێم، بەهۆی ئەگەری هێرش بۆهێنان هێزەکانی گەریلا لە (زەلێ) کەوتنەناو ئامادەباشییەوە، بەدرێژایی بەرزی و پانتاییەکانی شاری (قەلادزێ) سەنگەریان گرت، دوای ئەوەی لە (زەلێ) و ناوچەکانی تر بە درێژایی سەدان کم گەریلاکان خۆیان دامەزراند بەهۆی ئەگەری هێرشی پێشمەرگەی (پەدەکە)وە سەنگەرەکانی نزیک لە جادە چۆڵکرد، دوای ئەوەی تارادەیەک ئاڵۆزییەکان هێور بوونەوە گەریلاکان پاشەکێشیان کرد بۆ دەوروبەری گوندی (سونێ).

---

[٢٥٩] ١٧ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ نوچەی ( کورد خەبەر )

[٢٦٠] ١٦ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئۆزگور گوندەم ) .

## لەزاخۆ بۆگرتنی باکورییەکان ئۆپەراسیۆنیان دەست پێکرد

لەگەڵ دەست پێکردنی ئۆپەراسیۆنەکانی سوپای تورک لەهەمبەر گەریلاکانی (پەکەکە)بە هاوکاری پێشمەرگەکانی (پەدەکە)، لەهەمانکاتیشدا (پەدەکە) دەستیکرد بە ئەزیەتدانی ئەو کوردە باکوریانەی لە باشور دەژیان. (پەدەکە) بەهۆی ئەو زیانە زۆرەی لەدوای ١٣ی تشرینی یەکەمەوە لێیکەوت بۆ تۆڵە سەندنەوە هێرشی کردە سەر سڤیلە باکورییەکان، پارتی چنگی پێهەڵدەچنین سەرانە بدەن. ئەوەی راستی بێت باکورییان لەژێر زوڵموزۆری دەولەتی تورک پەنایان هێنابوو بۆ باشور کەچی ئێستاش لەلایەن برا باشورییەکانیانەوە روبەروی ئازار و سەرانە و نارەحەتی ببوونەوە.

ئۆپەراسیۆنی گرتنی باکورییەکان لەلایەن (پەدەکە) دەستی پێکرابوو، لە گەڕەکەکانی (شێخ نیسان، شابانێکی و هێزۆڤا) لە زاخۆ بەلای کەمەوە (٢٠) باکوریان دەستبەسەر کرد، لە ئۆپەراسیۆنەکانی ١٢و١٥ی تشرینی یەکەم لەماڵێکی باکوری گەریلایەکی برینداریان گرت و کەس نازانێت بۆکوێیان برد.

کاتێک ئۆپەراسیۆنی گرتنی باکورییەکان بەردەوام بوو، لە ١٤ی تشرینی یەکەم کابرایەک لەناو شاری زاخۆ بریندارکرا، ئەوەی ئەمکارەی کرد کەسێک بوو کە بە دوو ناو ناسرابوو پێیان دەوت (رەمەزان و رەشۆ) هەروەها پەیوەندییەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ (میت)ی تورک و فازل موطنی دا. کەسوکاری گیراوەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد (میت)ی تورک و پاراستنی (پەدەکە) ئەمکارانە دەکەن، لەکاتی کوتانە سەر ماڵان ئەو چەکانەی لە خاوەن ماڵەکانیان دەسەند بەبێ هیچ بیانویەک و بەبێ هیچ ناوێک و هۆکارێک پێشمەرگەکان دەیانبردن، زۆربەی ئەو خەڵکانەی روبەڕوی ئەم مامەڵەیە دەبوون خەڵکی دەوروبەری

(چوکورجە، ئولودەرە، شەمزینان و یوکسەکئۆڤا) بوون، ئەوان دەیانوت (سوپای تورک ماڵوحاڵمانیان سوتاند و پەنامان هێنا بۆ زاخۆ، کەچی حکومەتەکەی ئێرە دێنە سەرماڵمان و منداڵەکانمان دەگرن، هەڕەشەمان بەوە لێدەکەن رادەستی تورکیامان دەکەنەوە، لەژیانی خۆمان و کەسوکارمان دەترسین، ئێمە ئێرەمان بە وەڵاتی خۆمان زانیوە و کەسانی ئێرەشمان بە کەسوکاری خۆمان و بە خوێنی خۆمان زانی بۆیە هاتووین)[٢٦١].

لەدوا رۆژانی مانگی تەموز هێرشیان کردە سەر نوسینگەی (پەکەکە)و لەناویاندا نوێنەری (دهۆک) و جێگرەکەی هەبوون کە بەگشتی هەموویان (٦) کەس بوون و سیانیان کچ بوون. لەو رۆژەی دەستبەسەر کران هەتا رۆژانی دوایش هەموویان چالاکی مانگرتنیان لە خواردن دەستپێکرد، لەسەر بڕیاری (فازل موطنی) هەموویان بران بۆ ئەو باڵەخانەیەی کەکاتی سەدام باڵەخانەی ئیستیخبارات و شوێنی ئەشکەنجەدان بوو، ئەم چالاکی مانگرتن لە خواردنە لە ٣ی مانگی تشرینی یەکەم دەستی پێکرد هەتا ١٥ی هەمان مانگی خایاند[٢٦٢].

لە رۆژی ١٥ی تشرینی یەکەم لە (چوکورجە) لەسەر سنوری تورکیا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) گروپێک گەریلای (پەکەکە)یان خستە ناو بۆسەی خۆیانەوە و لەئاکامدا (٢) گەریلا بە بریندار بە دیلی گیرابوون، لەدوای ئەم رووداوە گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەندێک شوێن هێرشی سەر پێشمەرگەکانی (پەدەکە)یان کرد.

لە ١٦ی تشرینی یەکەم لەو شەڕەی لە شاری (رانیە) هاتبووە ئاراوە، فەرماندەیەکی (پەدەکە) بەناوی (عەلی بارزانی) و (٤) پێشمەرگەی تری (پەدەکە) کوژران، لەدوای ئەم رووداوە لە ترسی هاتنەئاراوەی شەڕی ناوخۆ پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لە نێوان (دهۆک و زاخۆ) هەر ٣ بۆ ٤ کم یێک پاسەوان و خاڵی پشکنینیان دانا و دەیانویست پاراستنی ناوچەکانی خۆیان بکەن.

---

[٢٦١] ١٧ی تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

[٢٦٢] ١٧و ٢٤ی هەمان سەرچاوە .

## جارێکی تر فازل موطنی میرانی

هەروەکو هەموو جارێک لەبارەی رووداوە سەرنج راکێشەکانەوە پەنجە دەچووە سەر ئەندامی سەرکردایەتی (پەدەکە) و بەرپرسی موتڵەقی دهۆک (فازل موطنی)، سەبارەت بە رووداوەکانی دوایی (فازل موطنی) کە زوو زوو دەچوو بۆ سلۆپی و چاوی بە بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک دەکەوت، لەبارەی (فازل موطنی)یەوە تەنانەت لەناو خودی (پەدەکە)ش کەسان هەبوون دەیانوت ئەم (فازل)ە لەبارەی زۆر شتەوە زانیاری هەڵە بە پارتەکەی خۆیشی دەدات، فەرماندەکانی (پەکەکە) ئەوەیان دەوت (فازل موطنی) زیادەڕۆی لە پارتەکەی خۆیشی دەکات و لەگەڵ بەرپرسیارانی دەوڵەت رێکەوتنی ژێربەژێر دەکات و لە رێی دەسەڵاتەکەیەوە کاری بازرگانی دەکات و خۆی تێردەکات. (فازل موطنی) جگە لەوەی بە بەرپرسی کوشتنی (سادق عومەر) دادەنرا هەروەها بە بەرپرسی سەدان کوشتاری سیاسی تریش لە بادینان تۆمەتبار دەکرا، لە شەڕی باشوری کوردستاندا (فازل) فەرمانداریتی هێزەکانی (پەدەکە) ی دەکرد لە بادینان، ئەم پیاوە ئەندامی عەشیرەتی (میران)ە و کاتی خۆی لە سلۆپییەوە کۆچیان کردووە بۆ فیشخابور.( [٢٦٣] ).

لەبارەی (پەدەکە)وە راستییەک هەیە ئەویش ئەوەیە دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی لەناو (پەدەکە) گەنگەشەی ناکرێت، بەڵام کە باس بێتە سەر پەیوەندی (پەدەکە) لەگەڵ تورکیا لەبارەی نزیک بونەوەی (پەدەکە) لە شێوازی ستراتیژییەت ئەوکاتە لەناو (پەدەکە) کێشەی کەسایەتی تر و رابەرایەتی کەسانی تر دیتە ئاراوە، حکومڕانی خێڵەکی (پەدەکە) لەهەندێک حاڵەتدا دەچووە ئاستی ناوەندییانەوە، بەگشتی سیاسەتی گشتیشیان بەگوێرەی زۆرهێنانە

---

[٢٦٣] (فازل مو×نی میرانی) لە مانگی کانونی یەکەمی ساڵی (١٩٩٣) بۆ ئەوەی ماڵ و خێزان و منداڵەکانی ببینێت بۆماوەیەکی نۆر گەڕایەوە بۆ وەڵاتی ئەمەریکا، نەک هەر ئەو، زۆربەی بەرپرسە باڵاکانی (پەدەکە) ئەمجۆرە گەشتەی دەرەوەی وەڵاتیان دەکرد، وەکو دەڵێن فازل مو×نی میرانی پەروەردەی دەستی دەزگای موخابەراتی ئەمەریکییە کەبە ( سی ئای ئەی) ناسراوە.

هەرێمییەکانەوە دیاریدەکرێت، هەربۆیە لەهەندێک حاڵەتدا لەناو (پەدەکە) کەسانی وەک (فازل موطنی میرانی) لەئاستی ناوەندیتی پارتەکەیان باڵا دەست دەبێت و هەندێک جاریش لە خودی (مەسعود بارزانی)یش زیاتر موداخەلەی پەیوەندییە دەرەکییەکان دەکات.
ئەو ئۆپەراسیۆنەی لە ١٣ی تشرینی یەکەم بۆ گرتنی باکورییەکان لە زاخۆ و دەوروبەری دەستیان پێکردبوو بە فەرمان و بە چاودێریتی (فازل موطنی) ئەنجامدرابوو، هەروەها پەیوەندییەکانی (پەدەکە) لەگەڵ بەرپرسیارانی دەوڵەتی تورک لە ناوچەکە هەر (فازل موطنی) دەیبرد بەڕێوە. هەندێک فەرماندەی (پەدەکە) لە بادینان سکاڵای ئەوەیان لە (فازل موطنی) هەبوو گوایە گوێ بۆکەس ناگرێت، هەروەها پێیانوابوو پەیوەندییەکانی (فازل موطنی) لەگەڵ دەوڵەتی تورک خستووەتە خزمەتی شەخسی خۆیەوە.
چەند فەرماندەیەکی (پەدەکە) کە بەرپرسی بارەگاکانی خۆیان بوون لە سەر سنوری تورکیا، کە پێکهاتبوون لە کەسانی وەک (محەمەد موسی، فەتاح عوسمان، کەمال کەرکوکی و ساڵح حەیدەر) هەموو ئەمانە لە تورکیاوە موچەیان وەردەگرت و پشکۆی شەڕی دژی (پەکەکە)یان خۆشدەکرد، خەڵکی شارەکانی وەک (هەولێر، دهۆک و زاخۆ) هەرگیز لایەنگری شەڕی براکوژی نەبوون. (پەدەکە) نەیدەتوانی شەڕی سەرتاسەری لەهەمبەر (پەکەکە) رابگەهێنێت، هۆکارەکەیشی ئەوەبوو پاڵپشتیتی (یەنەکە) و گەلی کوردستانی بەدەست نەخستبوو.
هەندێک لە بەرپرسیارانی ناو (پەدەکە) و حزبەکانی تریش دەیانزانی شەڕکردن بەرامبەر (پەکەکە) ئەنجام وەرناگرێت و زیانەکانیشی گەورە دەبن، ئەوانیش لەهەمبەر (پەکەکە) لایەنگری شەڕی سەرتاسەری نەبوون. لەناو (پەدەکە) ئەوانەی بەشێوەیەکی موتڵەق لایەنگری شەڕی (پەکەکە) بوون خودی (مەسعود بارزانی) و (فازل موطنی)بوون، بەڵام یەکێک لەناو (پەدەکە) کە ئەم رەوشەی بەدڵ نەبوو لەبارەیەوە نیگەران بوو بۆ ئاژانسی (کورد خەبەر)دوا و دەیوت (**شەڕکردن لەگەڵ پەکەکە لە بەرژەوەندی گەلەکەماندا نییە، فەرماندەیەکی زۆری تر هەن وەک من بیردەکەنەوە، هێشتا برینی ساڵی پارمان ساڕێژ نەبووە، بەڵام دیارە هەندێک پەیوەندی نهێنی نێودەوڵەتی ئێمە بەرەو ئەو ئاقارە دەبات، پەکەکە پارتێکی کوردییە، پێمووانییە زیانیان بۆ ئێمە هەبێت، بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەوان نەبونایە لەوانەبوو ئەم رەوشەی ئێمە ئێستا وانەبوایە**).

## توركيا داواى ئەو باكوريانە دەكاتەوە كەلە باشور جێگيربوونە

يەكێ لە رووداوە جەرگ برەكانى ئەو قۆناغە ئەوەبوو دەولەتى تورك داواى ئەو باكوريانەى لە دەسەلاتى باشور دەكردەوە كە گوندەكانيان سوتێنرابوون و هەلاتبوون بو باشورى كوردستان و پەنايان بۆ براكانيان بردبوو. دانيشتوانى گوندێكى زورى سەر سنور مالوحاليان جێهێشتبوو كە خەلكى دەوروبەرى (شەمزينان)بوون، زوربەى ئەم باكوريانە هەرلە سەرەتاى سالى (١٩٨٩)وە لەبەرئەوەى جاشايەتييان بۆ دەولەتى تورك قەبول نەكردبوو لەترسى گيانى خۆيان لەڕێى قاچاخەوە هاتبوونە باشورى كوردستان و ئيستاش توركيا داواى دەكردنەوە.

ژمارەى ئەم هەلاتوانە دەگەيشتە هەزار كەسێك و بەبيانوى ئەوەى لايەنگر و ياريدەدەرى (پەكەكە)ن دەولەتى تورك داواى لە (پەدەكە و يەنەكە) دەكرد رادەستيان بكەنەوە. دەولەتى تورك ئەم داخوازييەى لە مانگى تشرينى يەكەم بەرامبەر بە حكومەتى هەولير چرتر كردبووەوە، (پەدەكە) لەبەر ئەوەى گومانى هەبوو ئەم باكوريانە لەوانەيە هاوكارى و چاوساغى بۆ (پەكەكە) بكەن بە بونيان لە باشور نارەحەت بوو.

زوربەى ئەم باكوريانە لەگەل خەلكى باشور خزمايەتييان هەبوو، بيگومان رادەستكردنەوەيان بە توركيا كارێكى هەروا ئاسان نەبوو. بەهۆى زۆربۆهێنانەكانى توركيا، (پەدەكە) لە بادينان دەستيان كرد بە سەرژمێرى ئاوارە باكورييەكان و هەروەها دەيانويست بزانن چەنێك چەكيان هەيە و چييان هەيە و چييان نييە، باكورييەكانيش دەيانوت (**ئێمە سەرمان بۆ دەولەتى تورك نەوى نەكرد ئيستا بۆئەمانى نەوى ناكەين!**)[٢٦٤]. بوئەم مەبەستە

---

[٢٦٤] ١٥ى تشرينى دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەى ( نوزگور گوندەم )

دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی تورک لە یەکەم هەفتەی مانگی تشرینی یەکەم هاتن بۆ باشوری کوردستان و لەبارەی چۆنیەتی گێڕانەوەی باکورییەکان لە (دهۆک) لەگەڵ (پەدەکە و یەنەکە) کۆبونەوەیان ئەنجامدا و لە نێوانیان مامەڵەیەکی چڕیش هاتبووە ئاراوە، هەروەکو هەمووجارێک بەرپرسیارانی تورک بەرامبەر بە (پەدەکە و یەنەکە) بۆچاوترساندنیان داخستنی دەروازەی (ئیبراهیم خەلیل)یان بەکار هێنابوو، هەروەها باسیان لە هاوکارییە (١٣) ملیۆن دۆلارییەکەشیان کردبوو. لەناو باسەکانیاندا تکایەکی بچوکیشیان روبەڕوی بەرپرسیارانی (پەدەکە و یەنەکە) کردبووە، تکاکە ئەوەبوو لەبەر ئەوەی سوپای تورک زۆری لەکەس نەکردووە وەڵاتی خۆی جێبهێڵێت و هەرگیز گوندی نەسوتاندووە و بە هەزارەها کەسیش لە تورکیاوە کۆچی نەکردووە دەبوایە ئەم مەسلەیە بە نهێنی بیانهێشتایەتەوە.

(پەدەکە و یەنەکە) بەرامبەر ئەم داخوازییەی تورکیا لەجیاتی گێڕانەوەیان کە بە مەحاڵیان زانی بوو پێشنیاری ئەوەیان کردبوو باکورییەکان بخەنە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵی خۆیانەوە، ئەمەش هەر خواستێکی تورکیا بوو، بەمشێوەیە ئەو خەڵکە لە ناو کەمپ دەستبەسەر دەکران. (یەنەکە) پێشنیاری دەکرد ئەو باکوریانە لە شوێنێ نزیک لە (ئاکرێ) لەژێر دەسەلاتی (پەدەکە) کۆبکرێنەوە، هەروەها (پەدەکە)ش پێشنیاری (قەلادزێ)ی ژێر کۆنترۆڵی (یەنەکە)ی دەکرد. هەروەکو چۆن سەدام حوسێن ئۆردوگای زۆرە ملیی بۆ خەڵکی دروست کردبوو هەموو خەڵکی لەوێ کۆکردبووە ئێستاش (پەدەکە و یەنەکە) دەیانویست هەمان سیاسەتی سەدام دووبارە بکەنەوە.

نوێنەری (پەدەکە) لە ئەنقەرە (سەفین دزەیی) هەروەکو پیشەی هەمووجارێکی ئەم هەواڵەی بە درۆ دەخستەوە، (سەفین دزەیی) دەیوت پەیوەندییان لەگەڵ تورکیا باشە و بیرۆکەی کردنەوەی ئۆردوگایان کوردستان بوبێتن، ئەو دەیوت بۆ ئەوەی باکورییەکان لە (پەکەکە) جیابکرێنەوە کۆنترۆڵی ناسنامەکانیان کردوون، هەروەها دەیوت ئەم کارانەیان بە مەبەستی پاراستنی ئاسایش ئەنجامداوە[٢٦٥].

(سەفین دزەیی) نوێنەری (پەدەکە) لەبارەی هەڵسەنگاندن و گۆڕانکاریەکانەوە ئیسلوبی دیبلۆماسی ئینگلیزیانەی بەکار دەهێنا. بەرپرسیارانی (پەدەکە) بەناوی هاوکاری وەرگرتنەوە وەرەقەیان ناردبوو بۆ هەموو ئاوارە باکورییەکان ناوی سیانی خۆیان بنوسن لەگەڵ

---

[٢٦٥] ٥ای تشرینی دووەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( ئوزگور گوندەم )

ناونیشانیان، بەمشێوەیە دەیانتوانی هەموو باکورییەکان بناسن و بزانن لەکوێ دەژین. لە ١٧ی تشرینی یەکەم بەرپرسیارانی (پەدەکە) باکورییەکانیان کۆکردبووە و پێیانیان وتبوو **(ئەوەی دەیەوێت دەتوانێت بڕواتەوە بۆ تورکیا یان دەتوانێت بچێت بۆ وەلاتێکی تر، ئەوەیشی دەمێنێتەوە ڕەوانەی کەمپی ئاکرێ دەکرێت)**، ئەو کۆبونەوەی لەنێوان سەرانی باشور و (میت)ی تورک بەسترابوو لەبارەی باکورییەکانەوە کەسانی وەک قایمەقامی زاخۆ (نزار بەرزنجی) و بەڕێوبەری ئاسایشی زاخۆ (باران) کە سەربە (یەنەکە)بوو، بەڕێوبەری ئاسایشی دهۆک نەقیب (خەلیل) و سەرۆکی ئەنجومەنی کۆمیتەی زاخۆ (محەمەد موسۆ) کە سەر بە (پەدەکە)بوون بەشداریان کردبوو، قایمەقامی زاخۆ (نزار بەرزنجی) لەکۆبونەوەکە وتبوی (**بە باکورییەکان دەڵێین جگەلەوە پێمان باشە بتان بەین بۆ ئۆردوگا شتێکی ترمان لەدەست نایەت، وەکو دەزانن ئێمە دەوڵەت نین، ئێمە ناتوانین لەهەمبەر دەوڵەتی تورک بتانپارێزین، هەربۆیە ناچارین بتانبەین بۆ ئاکرێ، هەموو پێداویستییەکانتان دابین دەکەین، پێیان دەڵێن دەبێت چەکەکانتان لە دهۆک دابنێن، دوای جێگیربونتان دەتاندەینەوە، لە ئۆردوگاکە پاسەوانیتان دەکەین، بۆ دەرچونیشتان بۆ ناو شار بەردەوام مۆڵەتان دەدرێتێ**).

قایمەقامی زاخۆ (نزار بەرزنجی) لە ٢١ی تشرینی یەکەم لەگەڵ (جەمال یوسفی) کە سەر بە (یەنەکە) بوو چوون بۆ سلۆپی، لە سلۆپی لەگەڵ قایمەقامی سلۆپی و فەرماندەکانی سوپا کۆببونەوە و سەبارەت بە دوا ڕووداوەکانی نێوان ئەوان و (پەکەکە) بەڵگە و زانیاریان دابوو، هەروەها لەبارەی باکورییە ئاوارەکانەوە زانیاری ووردیان دابوو بە ئامادەبوانی کۆبونەوەکە. بەرامبەر هەموو ئەمانەش (نزار بەرزنجی) بە (١٠) لۆری بارهەڵگری هاوکارییەوە گەڕایەوە بۆ زاخۆ[٢٦٦].

کاتێک نیاز و هەڵوێست و بەرنامەی دەوڵەتی تورک بەرامبەر بە ئاوارە باکورییەکان ئاشکرابوو نارەزاییەکی زۆری لێکەوتەوە، ئەم ڕووداوە لە ڕۆژنامەی (ئۆزگور گوندەم) زۆر بە چڕی باسی لێوەکرا، هەربۆیە دەسەلاتدارانی باشور ناچارمان هەنگاو بەرەو دواوە بنێن. سەرەتا (سەفین دزەیی) کە نکوڵی ئەم کارەی دەکرد، بەهۆی زۆربۆهێنانەکانەوە بۆ

---

[٢٦٦] ٢٤ی هەمان سەرچاوە

لێکۆڵینەوە لە مەسەلەکان و بۆ زانیاری وەرگرتنی ووردتر ناچارما بچێتەوە بۆ باشوری کوردستان[٢٦٧].

ئەم هەڵوێستەی حکومەت و سەرانی (پەدەکە و یەنەکە) بەرامبەر بە باکورییە ئاوارەکان کارەساتی (١٩٨٨)ی هەڵەبجە و رەوە مەزنەکەی (١٩٩١)ی باشوری کوردستانی وەبیر دەهێنایەوە کە پەنایان بردبوو بۆ باکور و رۆژهەلاتی کورستان. پەنابەرە باشورییەکان هەروەکو ئەوەی ئیستا کە دەسەلاتی باشور دەیانەوێت بەکاریان بهێنن کاتی خۆیشی حکومەتی تورکیا بەرامبەر بە خۆیان لە کەمپەکانی (قزلتەپە، دیاربەکر و موش) هەمان شتیان لەگەڵ کردبوون، هەر خۆشیان ئەو سەردەمە لەناو ناخۆشترین ژیان هێشتبویاننەوە، ئەوەی ئێستا حکومەتی باشور بۆ باکورییەکان بە رەوایان دەبینی و بیریان لێکردبووە کاتی خۆیشی سەدام لەهەمبەریان هەمان کاری کردبوو، سەدامیش ئۆردوگای بۆیان دروست کردبوو، هەروەها بۆ گەڕانیشیان مۆڵەتی کاتییانی بۆ دەرکردبوو.

ئەوەی عەرەب و تورک دەیانکرد بەرامبەر بە کورد ئەمڕۆ کورد بە کوردی دەکردەوە، ئەمڕۆ لە هەمان شوێندا قەدەر و مێژوو دووبارە دەبووەوە!

لەکاتی کۆچی کوردی باشور لە ساڵەکانی (١٩٨٨ و ١٩٩١)دا باکورییەکان بۆ هاوکاریکردنی برا باشورییەکان بە ملیارەها لیرەی ئەوسای تورکییان خەرج کردبوو، هەروەها بەهۆی مامەڵەی خراپی دەوڵەتی تورکەوە لە ئاستی باشورییەکان ،باکورییەکان بەرامبەر بە حکومەتی تورکیا چەندین چالاکی پرۆتێستۆی وەکو خۆپێشاندان و ڕێپێوانیان ئەنجامدابوو، لەمبارەیەوە خودی سەرکردەکانی باشور بەهۆی ئەم هەڵوێستە جوامێرانەی باکورییەکانەوە چەندینجار سوپاسیانیان کردبوو. وەکو رۆژنامەی (ئوزگور گوندەم) لە شەقلاوە دیدار لەگەڵ سکرتێری گشتی (یەنەکە) ئەنجامدرا و لەبارەی هاوکارییەکانی برا باکورییەکان بۆ برا باشورییەکان کە ئەوکاتەی لێیان قەومابوو چۆن هەڵدەسەنگێنیت، لە وەڵامدا (جەلال تاڵەبانی) وتبووی (**ئێمە مەمنونییەتی خۆمان ئاراستەی برا باکورییەکانمان کرد لە تورکیا، بەڕاستی هاوکاری برا عێراقییەکانیان کرد، بەڵام ئەمە کارێکی ئاساییە، ئێمە براین، ئەگەر ئەوانیش روویان لە عێراق بکردایە ئێمەش هەمان هەڵویستمان دەبوو**)[٢٦٨].

---

[٢٦٧] ٢٠ی هەمان سەرچاوە

[٢٦٨] ١٩و ٢٥ی گولانی ١٩٩١ رۆژنامەی ( یەنی ئالکە )، ئیمانەی فەیسەل داغلی و ئارسۆی لەگەڵ ( جەلال تاڵەبانی ) .

بەلام وەکو (جەلال تالەبانی) باسی لێوەدەکرد مەسەلەکە بەو شێوەیە دەرنەچوو، ئەو وتبووی (**ئەگەر ئەوانیش روویان لە عێراق بکردایە ئێمەش هەمان هەلوێستمان دەبوو**) وادەرنەچوو!.

ئەگەر پیلانی بە ئۆردوگا کردنی باکورییەکانیش سەریشی نەگرتایە مەخابن ئاسەواری مەترسییەکانی شەڕی (**براکوژی**) نەدەسڕایەوە.

## (بارزانی و تاڵەبانیمان بەکارهێنا)

سەرۆک وەزیرانی تورکیا (تانسو چیللەر) لە ئیستەنبوڵ لە ٤ی تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٩٣) لە کۆبونەوەیەکی رۆژنامەوانیدا کە بەناوی (روونکردنەوە لەبارەی دەرەنجامەکانی خەباتی دژە تیرۆر) ئەنجامیدا، (تانسو چیللەر) دەیوت (**تاڵەبانی و بارزانیمان دژ بە پەکەکە بەکارهێنا**)، ئەم قسەیە راستگۆترین قسەی پێناسەکردنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەنقەرە و هەولێر بوو. کاتێک (تانسو چیللەر) باسی لە سیاسەتی خۆیان دژ بە شەڕی (پەکەکە) دەکرد و باسی لە گرنگی کۆنترۆڵکردنی خاڵە سنورییەکان دەکرد و لەبارەی پرسیاری ئایا سەرکردە کوردەکانی عێراق چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟، (تانسو چیللەر) وتی (**ئێمە پاڵپشتی بەرنامەی ئاسایشی نەتەوەیی دەکەین دژ بە سەدام حوسێن، لەمبارەیشەوە هەندێکجار جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانیمان بەرامبەر بە شەڕی دژ بە پەکەکە بەکارهێناوە، بەلام هێشتا تەواوکەر نین و لەئاستی گۆڕانکاریەکاندا دوودڵین**)، هەموو دەزگا راگەیاندن و چاپەمەنییەکانی تورکیا ئەم قسانەی (تانسو چیللەر)یان کرد بە مانشێت، (تانسو چیللەر) شرۆڤەی زیاتری گۆڕانکاریەکانی دەکرد و دەیوت لەحاڵەتی ئەوەی (جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی) لە شەڕی دژ بە (پەکەکە) هاوکاری پێویستیان نەکرد ئەوا هۆشیار دەکرێنەوە یاخود لە ئاستیاندا هەڵوێستی توند دەنوێنرێت، بەلام سەرکردەکانی باشور گوێیان لەئاستی ئەم قسانەی (تانسو چیللەر) گرتبوو. (تانسو چیللەر) هەتا پێیبکرایە رێزی لە سەرکردەکانی باشور گرتبوو، باسێکی کورتیشی لەبارەی پەیوەندییەکانی نێوانیانی کرد. ئۆپەراسیۆنی ئەو دیو سنوری سوپای تورک کەلە ٢٧ی تشرینی یەکەم دەستی پێکردبوو

بەردەوام بوو، لە رۆژانی مانگی تشرینی دووەم ئۆپەراسیۆنەکە زیاتر لە ناوچەکانی (شەمزینان و چوکورجە) چڕبووەوە، بەلام هیچ ئەنجامێکیان بەدەست نەخستبوو.

جێگری قایمەقامی (چوکورجە) کە ناوی (بەدرەدین کوتوک)بوو بەمشێوەیە باسی لە ئۆپەراسیۆنەکەیانی دەکرد، (**ئۆپەراسیۆنی ئەودیو سنور هەفتەیەک لەمەوبەر دەستی پێکرد، لەناوچەی پەرینچەکانەوە نزیکەی ٢٠ کم چوینەتە ناو خاکی باکوری عێراقەوە، لەوێ کەمپی پەکەکەی لێیە، تاکو ئێستا روبەڕوی هیچ شتێک نەبوینەتەوە، لە هەندێک شوێندا لوغم دۆزراونەتەوە و تەقێنراونەتەوە، تیرۆریستەکان دێنە ناو قسەی بێتەلەکانی ئەفسەرەکانەوە، فڕۆکە جەنگییەکانیشمان بەردەوام بۆردۆمانی ئەو ناوچانە دەکەن، بەلام هەتا ئێستا هیچ ئەنجامێک بەدەست نەخراوە**)[٢٦٩].

هێزەکانی سوپای تورک لە ٣ی تشرینی دووەم پەلاماری ناو شارۆچکەی (چوکەرجە و هەککاری)یان دا، بەهۆی ئەم رووداوەوە خەڵکی زیانێکی زۆریان بەرکەوتبوو، دوای ئەم رووداوە نزیکەی هەزار کەسێک کۆچیان کرد بۆ باشوری کوردستان.

---

[٢٦٩] ٥ی تشرینی یەکەم ١٩٩٣ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم ) .

## (میت)ەکانی ناو شارۆچکەی زاخۆ

لە رۆژی ٢٣ی تشرینی دووەم لە گەرەکی (عەباسیک)ی شارۆچکەی (زاخۆ) دەویسترا تانکییەکی ئاو بتەقێنرێتەوە، ئاسایشی زاخۆ گروپێکیان گرت کە دوایی دەرکەوت (میت)بوونە و بەهەڵە گرتبویانن، بەمشێوەیە دەردەکەوت لە باشوری کوردستان کەس نەیدەزانی دەستی کێ لە گیرفانی کێدایە! (میت)ی تورک لەرێی پارت و رێکخراوە تورکمانەکانەوە کەسانی سەرسەری و بێ کارە و چەقاوەسوریان پەیدا دەکرد و بەرامبەر بە پارە بۆمەرامی خۆیان بەکاریان دەهێنان.

ئەوانەی مایەی سەرنجی (میت)بوون دەبران بۆ (ئیستەنبوڵ و شەرناخ) پەروەردەیان دەکردن و لە هەرێمی بادینان بەناوی (پەکەکە)وە کاری خراپیان پێدەکردن. ئەو کەسانەی دەیانویست پەلەماری نەخۆشخانەی (زاخۆ) و تانکی ئاوی (دهۆک) و پەلاماری رێکخراوی خێرخوازی (ئێم سی سی) بدەن کەسەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بوو گیردران و وەرەقەی مۆڵەتی (پەکەکە)شیان بۆکرابوو، ئەم شەبەکەیە لەلایەن پارتی قەومی تورکمانییەوە سەرپرشتی دەکران و هەروەها لەناو (پەدەکە) کەسێک بەناوی (شڤان سندی) کارئاسانییانی بۆدەکردن[٢٧٠].

لە ٢ی تەموزی (١٩٩٣) (میت)ی تورک رێکخراوێکی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانیان ئاگادار کردبووە بەناوی (ئێم سی سی) گوایە (پەکەکە) بەنیازن پەلاماریان بدەن، لەسەر ئەم ئاگەدارکردنەوەی (میت) رێکخراوەکە فەرمانی بە کارمەندەکانی خۆیان دابوو ئاگەداری خۆیان ببن، بەڵام بەرپرسیارانی (پەکەکە) ئەم هەواڵەیان بەدرۆ دەخستەوە و دەیانوت ئەوان ئاگەداری شتێکی لەوجۆرە نین و پیلانی شتێکی وایان نەکردووە، دەشیانوت ئەگەر هەر

---

[٢٧٠] ٢٧ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ رۆژنامەی ( نوزگور گوندەم )

ڕووداوێکی نەخوازیاری لەوجۆرە بێتە ئاراوە بە دەرەجەی یەکەم (میت)ی تورک بەرپرسیارە[٢٧١].

ئەو شەبەکەیەی کەشف ببون و لە زاخۆ گیرابوون، دانیان بەوەدا هێنابوو لەناو پیلانەکەیاندا پەلاماری سەر ڕێکخراوی (ئیم سی سی) هەبووە.

ئەم شەبەکەیە لە کەسانی بێ کەڵک و سەرسەری پێکهاتبوو کە سەرقاڵی کاری دزی و قۆڵبڕین و سەرانە وەرگرتن و ڕووتکردنەوەی خەڵکی بوون و هیچ کەسێکیشیان نەیاندەتوانی لەژێر سێبەری (پەدەکە) دەربچن، نەدەزانرا چۆن و بەچی هەڵەیەک ئەم دەستە ڕەشەی (میت) لە باشور کەشفکرابوو!.

---

[٢٧١] ٩ی تەموزی ١٩٩٣ ڕۆژنامەی ( دەنگی وەڵات ) .

## جارێکی تر شەڕ

شەڕی باشوری کوردستان هەر لە شوێنەکەی خۆیەوە بەردەوام بوو، بەڵام ئەمجارەیان لەچاو ئەوەی پێشوتر دژوار نەبوو، بەگشتی دانوساندن و ڕێکەوتنی لایەنەکان بێ سوود بوون و هیچ واتایەکی پەیوەندییەکان نەمابوو. لەدوا ڕۆژانی ساڵی (١٩٩٣) لەهەندێک شوێندا شەڕوپێکدادان هاتە ئاراوە، جگە لەمە بە گشتی ڕەوشەکە ئارام بوو. لەهەمان کاتیشدا بۆ بواری سیاسی لە باشوری کوردستان ڕەوش لەباربوو، بەتایبەتی هەڵویستی دوژمنانەی ئێران و تورکیا لەهەمبەر (یەنەکە) بوون بە هۆکار (یەنەکە) دوژمنایەتی (پەکەکە) نەکات. تورکیا لەڕێی (پەدەکە) ئەسپی سەرشێتی شەڕەنگێزی خۆی تاودابوو، ئەوەی مابوو (جەلال تاڵەبانی) و (یەنەکە) بوو، هەربۆیە دەیانوسیت لەڕێی شەڕی (بزووتنەوەی ئیسلامی)یەوە گۆشەگیریان بکەن. لەدوا ڕۆژانی (١٩٩٣) ئاڵۆزی و گرژییەکانی نێوان (پەدەکە و یەنەکە) وەکو ڕۆژی ڕووناک دەبینران، بەڵام لەجیاتی ئەوەی ڕاستەوخۆ شەڕی یەک بکەن هەندێک ئامرازی جیاوازتریان لە دژی یەکتر بەکار دەهێنا. (پەدەکە) دژ بە (یەنەکە) هاوکاری بزووتنەوەی ئیسلامی دەکرد، (یەنەکە)ش دژ بە (پەدەکە) هاوکاری (حسک)یان دەکرد کە ماوەیەک لەمەوبەر هاتبوونە ناو (پەدەکە)وە دوایش لێیان جیاببونەوە، پێشوتریش لە هەندێک شوێنی جیاوازدا ئاڵۆزی و گرژی لە نێوان (پەدەکە و یەنەکە) هاتبووە ئاراوە تەنانەت لە یەکتریشیان کوشتبوو، توانیبویان کۆنترۆڵی ڕەوشەکە بکەن، بەڵام ئاشکرابوو (پەدەکە) وەکو ساڵی ڕابردو بەخت یاوەریان نەبوو، بەهۆی هێرشەکانی گەریلاکانی (پەکەکە)وە نزیکەی (١٠) بنکەی سەر سنوریان چۆڵکردبوو، ئەوانەیشی لەسەر سنور مابوون ناچارمابوون لەگەڵ گەریلاکانی (پەکەکە) دانوساندن بکەن و ڕێککەوتبوون پەلاماری یەکتر نەدەن.

دوای تێکچونی ڕێککەوتنی نێوان (پەکەکە) و حکومەتی هەرێمی کوردستان، (یەنەکە) لەناو بارەگایەکی خۆی ڕێگای دابوو (پەکەکە) ئۆفیسی خۆیان بکەنەوە.

سیاسەتی نوێی ئێران و تورکیا بەرامبەر بە (یەنەکە) بوونە هۆکار (یەنەکە) لەهەمبەر (پەکەکە) سیاسەتێکی نوێ ڕچاوبکات. لێرە بەدواوە هێزەکانی (پەدەکە) لەکوێ پێیان بکرایە و بۆیان بڕەخسایە هێرشی گەریلاکانی (پەکەکە)یان دەکرد، ئەگەرچی هێرشەکان وەکو جاران دژوار نەبوون، بەڵام حاڵەتێکی رۆتییان وەرگرتبوو. لە ١٨ی تشرینی دووەم لە نزیک گوندی (ئێگالتە)ی سەر بە (شەمزینان) گەریلاکانی (پەکەکە) هێرشیان کردبووە سەر بنکەیەکی پێشمەرگەی (پەدەکە)، لەئاکامدا (٨) پێشمەرگەی (پەدەکە) کوژران و (٧)یشیان بە دیلی گرتبوون[٢٧٢].

لەم ڕووداوەدا دەست بەسەر چەکێکی زۆردا گیرابوو، حکومەتی هەرێمی کوردستان داوایان لە (پەکەکە) کردبوو ئەو گەریلایانەی ئەو چالاکییەیان کردووە لەگەڵ ئەو چەکانەی گرتویانن رادەستی ئاسایشی حکومەتیان بکەنەوە، بەڵام بەرپرسیارانی (پەکەکە) وتوبویان کێشەیان لەگەڵ حکومەت نییە و بەتایبەتی حکومەتێک کە (یەنەکە) شەریکە بەشێتی، هەروەها وتوبویان کێشەیان لەگەڵ حکومەتدا نییە ئەوان لەگەڵ (پەدەکە) کێشەیان هەیە. بەمشێوەیە دەستیان نا بەڕووی داخوازییەکەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە.

گەریلاکانی (پەکەکە) لە هەمان رۆژاندا لە (کنیانیش)ی سەربە (چوکورجە) هێرشیان کردە سەر بنکەیەکی سەربازی و لەهەمانکاتدا سوپای تورکیش لە هەرێمی بوتان گەورەترین ئۆپەراسیۆنی پیادەییان دەست پێکرد و بە فڕۆکەش بۆردومانی ناوچەکەیان دەکرد و لەو شەڕ و پێکدادانەی لە نێوان گەریلا و سوپای تورک هاتبووە ئاراوە لە (بەستە) چەندین سەربازی سوپای تورک کوژران. (پەدەکە) بۆ تۆڵە سەندنەوەی ڕووداوەکانی ٢١ی تشرینی دووەم لەناو شاری (رانیە) دوو لایەنگری (پەکەکە)یان بە ناوەکانی (حاجی موسا و فەرحان) کە خەڵکی باشور بوون گرت و هەردوکیانیان گوولە باران کرد.

لە ناوچەیەکی هەرێمی (بۆتان) لە ٢٢ی هەمان مانگ لەسەر ڕێگای (هەرگوش) گەریلاکانی (پەکەکە) بۆسەیەکیان دانا و لە ئاکامدا (٣) پێشمەرگەی (پەدەکە) کوژران و (٣) تریشیان بریندار بوون. فڕۆکە جەنگییەکانی سوپای تورکیش بەردەوام ناوچەی (زاپ) و دەوروبەری (چوکورجە)یان بۆردومان دەکرد، لەهەمان رۆژانیشدا پێشمەرگەکانی (پەدەکە) لەڕێی (زەلێ) دەستییان لە گەریلاکانی (پەکەکە) وەشاند کە سەرقاڵی هاتوچو بوون. سەرچاوە و

---

[٢٧٢] ٢١ی تشرینی یەکەم ١٩٩٢ ڕۆژنامەی ( گونایدن ) .

هەواڵەکانی (پەکەکە) لەو رۆژگارە بەدواوە هەروەکو باکور باسیان لە چالاکی و خەباتی گەریلایان دەکرد لە باشوری کوردستان، بۆنمونە هەواڵێکیان دەیوت (ئەمرۆ لە ناوچەی ئاڤاشین لەو شەڕو پێکدادانەی لەنێوان هێزەکانمان و خائینان‌دا هاتبووە ئاراوە........).

قەدەری کورد لە رۆژگارێکی ڤێتنامییەکان دەچوو، ئەو شەڕەی کەلە نێوان باکور و باشور بە فووی دوژمن هەڵگیرسابوو پێویست بوو کۆتایی پێبهێنرێت، پێویستیش بوو ئاورێک لە زیان و قازانجی گەلی کورد بدرێتەوە.

# کۆتایی

## دەستەی باڵای سەرپەرشتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ساڵی ١٩٩٢

[ هەلبژاردنی رابەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی كوردستان ]

تێبینی:

بەکێك لەم بەربژێرانەی خوارەوە هەڵبژێرەو بەپێنووس دەست نیشانی بکە.




## دەستەی باڵای سەرپەرشتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان ساڵی ١٩٩٢

تێبینی:

بەکێك لەم لیستانەی خوارەوە هەڵبژێرەو بەپێنووس دەست نیشانی بکە.






Türkiye'nin SABAH en iyi gazetesi

17 OCAK 1997 CUMA



# PKK'ya karşı ittifak

**Çiller, Ankara'ya gelen Kuzey Irak'lı Kürt lider Talabani ile görüştü. Görüşmeye Türkmen Cephesi lideri Çelebi de katıldı. Çiller, "PKK'ya karşı beraberce karşı koymada prensip olarak anlaşma sağladık" dedi.**

İbrahim GÜNDÜZ-Ankara

Kuzey Irak'lı Kürt lider Celal Talabani'yi Dışişleri Bakanlığı Konutu'nda kabul eden Dışişleri Bakanı Tansu Çiller, "Herkes Kuzey Irak'da barış istiyor. Burada yapılanlar barış için önemli adımlar" diye konuştu. Türkmen Cephesi lideri Sinan Çelebi'nin bu kısmına katıldığı Çiller-Talabani görüşmesi yaklaşık bir saat sürdü

## Preface

The 'Fratricidal' is a documentary book. It is very significant that people are aware of the details of the two ruling parties; the Kurdistan Democratic Party (KDP) and the Patriotic Union of Kurdistan (PUK), especially how the KDP has carried out plots of the invaders of Kurdistan and how it has been involved in killing Kurds and creating obstacles for the Kurdish liberation movement.

The author of this book has unfairly penned it 'Fratricidal' -Bırakuji-, in fact, these wars have not been war between the brothers, they have rather been wars of the invaders of Kurdistan carried out by the so-called leaders of the KDP and PUK for killing the Kurds. Unethical Kurds have been used as proxies of the invaders of Kurdistan to kill the ethical and revolutionary Kurds.

Former Turkish Prime Minister Tansu Ciller once said in an official statement: 'We, as the state, were able to use Masoud Barzani and Jalal Talabani against the Kurdistan Workers' Party (PKK), however, we are not yet convinced, they should have done their tasks better.'

Tansu Ciller's statement is true, these two so-called leader did their best to eliminate the PKK; however, they failed. Their failure are due to:

The high morale and confidence of the guerrilla of themselves and their people. - Lack of morale of the KDP and PUK Peshmerga in the fight against the PKK because the - Peshmerga knew that the war against the PKK had no benefit for the Kurdish nation, and they know

the war was upon orders of the invaders of Kurdistan. The KDP and PUK had understood so well that they were being used as mercenary for the invaders; therefore,

they avoided fighting against the PKK.

Meanwhile, in this book, the essence of the two so-called leaders - Barzani and Talabani- are being well depicted what kind of human beings they are.

It is also clear that the Turkish state has been able to completely control the KDP and all its moves. Several powerful KDP officials in the past and present cannot even take a single move without returning to Turkey.

In this book, the KDP is appeared as a terrorist group that has always used terror and blackmail against advocates of freedom and democracy. Tens of documents are being presented to prove this.

The book also describes and deconstructs the Turkish state media manipulations and fake news, and how the Turkish army commanders were embarrassed in front of the international media when they were claiming unfounded victories in their fight against the PKK. Before the October ١٩٩٢ war, which is known as the betrayal war, the Turkish state was not aware of anything; however, upon the request of the so-called two leaders, the Turkish state intelligence apparatus held meetings with them to launch the Sandwich Operation. They agreed that the Turkish army would advance from the north of Kurdistan and the KDP and PUK gunmen would advance in the south of Kurdistan so that both can eradicate the PKK guerrillas in the middle.

Both leaders of the KDP and PUK promised the Turkish army to eradicate the PKK in three or four days, there was even an agreement with Iran so that Iran would also prepare its army on the borders so

as not to arrest and extradite the PKK guerrillas if any tried to enter the country. However, nothing happened as they had planned. The PKK guerrillas hurt the Turkish army and the KDP and PUK gunmen heavily. In the result of that war, an agreement was signed on ٣٠ October ١٩٩٢ where the Kurdistan Regional Government recognized the PKK, and the PKK further advanced its resistance.

I hope this book, which is the book of betrayal war, helps to open up the disgraceful acts of the thugs who have always served the invaders of Kurdistan, and I hope one day this book will be used as a document to bring about justice for those who involved in treason and helping the invaders.

**Niyazi H. Braim**

Faysal Dağlı

# Brothers' Bloodshed

## Kurdish Civil War

Translated by: Ribwar Hamawandi

هەتا وەک ئاگری بن (کا) لەگەڵ یەک
ئەگەر تۆفان بێت لەشکرتان بێ پوشەک
تا ڕێک نەکەوێت قەومی ئەکراد
هەروا دەبێت خراپە ئاباد

( حاجی قادری کۆیی )

ISBN 9781838434427

نرخ

٦٠٠٠ هەزار دینار